# پێڕست

## ئاماژەدان بەڕەچەڵەکی ڕەسوولی خواوەند وگێڕانەوەی بەسەرهاتی باوکان و باپیرەکانی ئەو

ناوی پێغەمبەر(د.خ)، محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەبدولموتەلیبە.

عەبدوالله باوکی پێغەمبەر(د.خ) بچوکترین منالی باوکی و لەهەموو منالەکانی عەبدولموتەلیب، عەبدوالله و زوبەیر و عەبدمەناف کەهەمان ئەبوتالیبە، لەیەك دایك بوون. دایکیان فاتیمە کچی عەمرۆ کوڕی عائیز کوڕی عیمران کوڕی مەخزومە.

ئەمە لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە.

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: عەبدوالله کوڕی عەبدولموتەلیب و باوکی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەبوو تالیب کەناوی عەبدمەنافە، و زوبەیر و عەبدولکەعبە و عاتیکە و بەرە و ئەمیمە، منالەکانی عەبدولموتەلیب، هەموویان لەیەك دایك بوون و دایکیان، فاتیمە کچی عەمرۆ کوڕی عائیز کوڕی عیمران کوڕی مەخزوم کوڕی یەقزەیە.

لەقەبیزە کوڕی زوەیب دەگێڕنەوە: ژنێك نەزری کرد ئەگەر کارێك ئەنجام بدات، کوڕەکەی خۆی لەنزیك کەعبە سەر دەبڕێت. کارەکەی ئەنجامدا و ڕۆشتە مەدینە تا سەبارەت بەنەزرەکەی خۆی، پرسیار و لێکۆڵینەوە بکات. ڕۆشتە لای عەبدوالله کوڕی عومەر کەپێی وت: خواوەند فەرمانیداوە، بەرابەر بەنەزرەکانی خۆتان ئەمەکدار بن.

ژن: وتی: کەواتە دەبێت کوڕەکەم سەر ببڕم؟

کوڕی عومەر وتی: خواوەند ڕێگەی کوشتنی نەفسی گرتووە. زیاتر لەمە هیچی نەوت.

ژن ڕۆشتە لای عەبدوالله کوڕی عەباس و داوای فتوای لێکرد. وتی: خواوەند فەرموویەتی نەزرەکانی خۆتان بەجێبێنن بەلام دەستتان بەکوشتن پیس مەکەن. عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم نەزری کردبوو ئەگەر خواوەند دە کوڕی پێببەخشێت، یەکێکیان سەردەبڕێت. کاتێك دەکوڕی بۆ هاتە دنیا، تیروپشکی لەناو کوڕەکانی هەڵدا بۆ ئەوەی یەکیان سەر ببڕێت. بەناوی عەبدوالله دەرچوو. عەبدولموتەلیب ئەوی لەهەموو منالەکانی زیاتر خۆش دەویست. وتی: خواوەند ئەو بەسەد وشتر دەگۆڕمەوە. تیر وپشکی لەنێوان عەبدوالله و سەد وشترەکە هەڵدا و بەناوی سەد وشترەکە دەرهات.

کوڕی عەباس بەژنەکەی وت: بۆچوونی من ئەوەیە لەجیاتی کوڕەکەی خۆت، سەد وشتر سەر ببڕیت.

ئەم داستانە بەگوێی مەروان گەیشت، وتی: فتواکەی کوڕی عومەر و کوڕی عەباس ڕاست نییە چوونکە نەزر لەسەر گوناح ڕەوا نییە. بەژنەکەی وت: داوای بەخشین لەخواوەند و تۆبە بکە، خێر بکە و تا ئەو جێگەی دەتوانیت، کاری چاکە ئەنجام بدە، بەڵام خواوەند ڕێگەی سەربڕینی کوڕەکەتی لێگرتوویت.

خەڵکان خوشحاڵ و وتەکەی مەروانیان پەسەند کرد، وتیان: فتواکەی ڕاست و بەردەوام فتوایان دەدا کەنەزر لەسەر گوناح، ڕەوا نییە.

بەڵام گێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق سەبارەت بەنەزرەکەی عەبدولموتەلیب، گرنگی زیاتری هەیە ودەڵێت:

(( عەبدولموتەلیب کاتێك سەبارەت بەهەڵکەندنی چاڵی زەمزەم، ناڕەوایی لەخەڵکانی قوڕەیش بینی، نەزری کرد ئەگەر ببێتە باوکی دەکوڕ و کوڕەکان بتوانن ببنە پشتیوانی و بەرگری لێبکەن، یەکیان لەنزیك کەعبە سەر دەبڕێت. کاتێك دە کوڕی هێنایە دنیا و زانی دەتوانێت پشتیان پێببەستێت، هەموویانی کۆکردەوە و لەنەزرەکەی خۆی، ئاگاداری کردنەوە و وتی دەبێت وەفا بەنەزرەکەم بکەم. هەموویان گوێرایەڵ بوون و وتیان: دەبێت چی بکەین؟))

عەبدولموتەلیب وتی: هەرکامتان تیرێك هەڵبگرێت و ناوی خۆی لەسەر بنووسێت و تیرەکان بێننە لای من.

منداڵەکانی عەبدولموتەلیب ئەو کارەیان کرد و تیرەکانیان هێنا. ئەو، ڕۆشتە لای هوبەل کە لەدڵی کەعبەدا بوو. هوبەل گەورەترین بتی قوڕەیشە و لەسەر چاڵێك لەدڵی کەعبە دانرا بوو. دیارییەکانی کەعبەیان دەخستە ناو ئەو چاڵە. حەوت تیر لای هوبەل دانرابوو، لەسەر هەرکامیان نووسراوێك: لەسەر یەکیان خوێنبایی و کاتێك لەسەر خوێنبایی کێشەیان بۆ دروست دەبوو بۆ ئەوەی بزانن کێ دەبێت خوێنبایی بدات، بەتیرەکان، تیروپشکیان دەکرد، لەسەر تیرێك ((بەڵێ)) بوو و کاتێك مەبەستی ئەنجامدانی کارێکیان دەکرد، تیروپشکیان دەکرد و ئەگەر تیری (بەڵێ) دەهاتەدەر، کارەکەیان ئەنجامدەدا، لەسەر تیرێکی دیکە نووسرا بوو ((نە)) و کاتێك مەبەستی ئەنجامدانی کارێکیان دەبوو، دەیانخستە ناو تیرەکان. لەسەر تیرێك نووسرابوو، ((هیٚ ئێوەیە)) و لەسەر تیرێکی دیکە نووسرا بوو: ((بێگانەیە)). تیرێکی دیکە ((ئاوی))

لەسەر نووسرا بوو. کاتێك دەیانویست چالاوێك هەڵکەنن، بەتیرەکە، تیروپشکیان بۆ دەخست و گرنگیان بەئەنجامەکەی دەدا.

کاتێك دەیانویست کوڕێك خەتێنە یا ژنێك مارە بکەن و یا ئەوەی مردووێك بەخاك بسپێرن، یا ئەگەر گومانیان لەڕەچەڵەك و نەژادی کەسێك بوایە، لەگەڵ سەد درەم و وشترێك دەیانبردە لای هوبەل و بەتیردارەکەیان دەسپارد، دواتر کەسی گومانلێکراویان دەبردە پێش و دەیانوت:

((خوای ئێمە، ئەمە فلان کوڕی فلانە کە سەبارەت بەو فلان و فیسارە گومانمان هەیە، ڕاستییەکانمان نیشانبدە)).

دواتر بەتیرداریان دەوت: تیروپشك بکە. ئەو کارەی دەکرد و ئەگەر ئەنجام (لەئێوەیە) بوایە، لەوان بوو وئەگەر پەیوەست بەوان بوایە، هاوپەیمان و ئەگەر بێگانە بوایە، نەلەوان بوو نەهاوپەیمان.

ئەگەر سەبارەت بەو کارەی دەیانویست ئەنجامی بدەن وەلام (بەڵێ) بوایە، کارەکەیان ئەنجامدەدا وئەگەر وەلام (نە) بوایە، ئەو کارەیان بۆ ساڵێکی دیکە دوادەخست و جارێکی دیکە تیروپشکیان ئەنجامدەدا و فەرمانی تیرەکەیان بەکار دەبرد.

عەبدولموتەلیب بەتیردارەکەی وت: تیری منداڵەکانی من دەربێنە. نەزرەکەی خۆی لەگەڵدا باس کرد. هەرکام لەمنداڵەکانی تیرەکەی خۆیان تەسلیم کرد کەناوی خۆیانی لەسەر نووسرا بوو. عەبدوالله بچووکترین منداڵی ئەو و وەك دەڵێن: لەهەموان خۆشەویستتر بوو. عەبدولموتەلیب دەیخواست تیرەکە بەناوی ئەو دەرنەچێت. کاتێك تیردار تیرەکانی وەرگرت و تیروپشکی خست، عەبدولموتەلیب ڕۆشتە لای هوبەل و لەخوا پاڕایەوە. تیرەکە بەناوی عەبدوالله هاتەدەر و عەبدولموتەلیب کێردی هەڵگرت. دەستی عەبدواللەی گرت و بەرەو ئەساف و نائیلە بەرێکەوت تا سەری ببڕێت. ئەساف و نائیلە دوو بتی قوڕەیش بوون وقوربانیان لای ئەوان سەردەبڕی. خەڵکانی قوڕەیش لەشوێنی خۆیان هەستان و وتیان: ئەی عەبدولموتەلیب دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: سەری دەبڕم.

قوڕەیشییەکان و منداڵەکانی وتیان: سوێند بەخوا نابێت سەری ببڕیت مەگەر ئەوەی هیچ پاساوێك نەمێنێتەوە چوونکە ئەگەر ئەم کارە بکەیت، خەڵکان منداڵەکانی خۆیان

دێنن و هاوشێوەی تۆ، سەریان دەبڕن و بەمشێوە کەس نامێنێتەوە.

موغەیرە کوڕی عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی مەخزوم کە لەدایکەوە پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ عەبدولموتەلیبدا هەبوو، وتی: سوێند بەخوا نابێت بیکوژیت مەگەر ئەوەی هیچ پاساوێك نەمێنێتەوە، ئەگەر دەبێت قوربانی بکرێت. بەسامانی خۆمان بەهای خوێنی ئەو دەدەین.

خەڵکانی قوڕەیش و منداڵەکانی وتیان: ئەو کارە مەکە و بەرەو حیجاز بڕۆ چوونکە لەوێ ژنێکی غەیبزانی لێیە کەشەیتانی هەیە، لەو بپرسە بۆ ئەوەی لەکارەکەی خۆت دڵنیا بیت. ئەگەر وتی سەری ببڕە ئەو کارە دەکەیت و ئەگەر فەرمانی ئەنجامدانی کارێکی دیکەی پێکردیت، رازی ببە.

بەرێکەوتن تا گەیشتنە مەدینە. وەك دەڵێن ژنەکە لەخەیبەر بوو. بەرەو خەیبەر ملی رێگەیان گرتەبەر، ژنەکەیان بینی و داوای چارەیان لێکرد. عەبدولموتەلیب بەسەرهاتی خۆی و کوڕەکەی و نەزرەکەی باس کرد.

غەیبزان وتی: ئەمڕۆ بڕۆن تا شەیتانەکەی من بێت و لەو بپرسم.

ڕۆشتن. عەبدولموتەلیب لەخوا پاڕایەوە و ڕۆژی دواتر گەڕانەوە بۆ لای ژنەکە، وتی: بەڵێ، خەبەر هات، خوێنبایی ئێوە چەندە؟

وتیان: دە وشتر.

وتی: بۆ دیاری خۆتان بگەڕێنەوە و کوڕەکە و دە وشتر ببەن و تیرپشك بخەن، ئەگەر ناوی کوڕەکە دەرچوو، ژمارەی وشترەکان زیاد بکەن و کاتێك بەناوی وشترەکان دەرچوو، سەریان ببڕن. بەم شێوەیە خواکەتان رازی و کوڕەکەتان رزگاری دەبێت.

بۆ مەککە گەڕانەوە و کاتێك بۆ ئەم کارە خۆیان ئامادە دەکرد، عەبدولموتەلیب لەخواوەند پاڕایەوە. عەبدوالله و دە وشتریان هێنا. عەبدولموتەلیب لای هوبەل دانیشتبوو و لەخواوەند دەپاڕایەوە.

کاتێك تیروپشکیان خست، ناوی عەبدوالله دەرچوو.

دەوشتر زیاد کرد و ژمارەیان گەیشتە بیست.

عەبدولموتەلیب لەشوێنەکەی خۆیدا سەرقاڵی پاڕانەوە بوو.

تیروپشکیان خست و دووبارە ناوی عەبدوالله دەرچوو.

دە وشتری دیکەیان زیاد کرد.

دووبارە ناوی عەبدوالله دەرچوو.

هەرجار کە ناوی عەبدواللە دەردەچوو دەوشتریان زیاد دەکرد و دەجار و تیروپشکیان هەڵدا و ژمارەی وشترەکان گەیشتە سەد و عەبدولموتەلیب بەردەوام لەخوا دەپارایەوە.

کاتێك بۆ سەد وشتر و عەبدواللە تیروپشکیان خست، ناوی وشترەکان دەرچوو. خەڵکان و ئامادە بووان وتیان: خواوەند رازی بووە.

دەڵێن: عەبدولموتەلیب وتی: بەمشێوە نابێت و دەبێت سێ جار تیروپشکەکە دووبارە بکرێتەوە.

تیروپشکیان دووبارە کردەوە و بەناوی وشترەکان دەرچوو.

جارێکی دیکە دووبارەیان کردەوە و ئەنجامەکە پەسەندی عەبدولموتەلیب لەئاو دەرهات.

جاری سێیەمیش بەناوی وشترەکان دەرچوو. وشترەکانیان کوشت و لاشەکانیان لەشوێنێکدا کەڵەکە کرد بۆ ئەوەی مرۆڤ و ئاژەڵەکان بەدڵخوازی خۆیان لێی هەڵبگرن.

عەبدولموتەلیب دەستی عەبدواللەی گرت و وەك دەڵێن لەنزیك کەعبە لای ژنێکی منداڵەکانی ئەسەد تێپەری بەناوی دایکی قەتال کەکچی نەوفل کوری ئەسەد کوری عەبدولعوزەی و خوشکی وەرەقە کوری نەوفل کوری ئەسەدە.

کاتێك دایکی قەتال سەیری روخساری عەبدواللەی کرد، پێی وت: ئەی عەبدواللە بۆ کوێ دەرۆیت؟

عەبدواللە وتی: لەگەڵ باوکمدام.

دایکی قەتال وتی: بەهەمان ئەندازە کردیانە بەهای تۆ، وشتر دەدەم بۆ ئەوەی هەر ئێستا لەگەڵ مندا بخەویت.

عەبدواللە وتی: ئێستا باوکم لەگەڵدایە و ناتوانم لێی جیا ببمەوە.

عەبدولموتەلیب عەبدواللە بۆ لای وەهب کوری عەبد مەناف کوری زوهرە برد کە لەو کاتەدا بەتەمەن و شەرەف، سالاری منداڵەکانی زوهرە بوو. ئامینە کچی وەهبی کردە هاوسەری ئەو کەپێگەی باشترین ژنی قورەیشی پێبڕابوو. ئامینە، کچی بەرە و ئەو کچی عەبدولعوزەی کوری عوسمان کوری عەبدولدار کوری قوسەی بوو. دایکی، دایکی حەبیب کچی ئەسەد کوری عەبدولعوزەی کوری قوسەی بوو، دایکی حەبیب، بەرە کچی عەوف کوری عوبەید کوری عوەیج کوری عودەی کوری کەعب کوری لوئەی بوو.

دەڵێن: هەمان سات کەئامینەی وەك هاوسەر هەڵبژارد. لەگەڵی خەوت و بەمحەممەد، دووگیانی کرد

دوای ئەوە. عەبدوڵڵە لای ئامینە گەڕایەوە و ڕۆشتە لای دایکی قەتال، پێی وت: بۆ ئێستا وتەکەی دوێنێکەت دووبارە ناکەیتەوە؟

دایکی قەتال وتی: ئەو نوورەی دوێنێ لەگەڵ تۆدا بوو. ئەمڕۆ بەروخساری تۆوە دیار نییە و چیتر پێوستم بەتۆ نەماوە.

بەمشێوە بوو کەدایکی قەتال لەوەرقە کوڕی ئەوفل براکەی خۆی کەباوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنابوو، بیستبووی ئەم ئومەتە لەمناڵەکانی ئیسماعیل، پێغەمبەرێکیان دەبێت.

لە محەممەد کوڕی ئەیسحاق دەگێڕنەوە: عەبدوڵڵە ڕۆشتە لای ژنێکی دیکە کەهاوەرێی ئامینە کچی وەهب کوڕی عەبدمەناف بوو. عەبدوڵڵە کاری قوڕکاری و شوێنەواری تەپ و تۆز بەروخسارییەوە دیار بوو. داوای لەژنەکە کرد ڕێگەی نزیك بوونەوەی پێبدات بەڵام ژنەکە نارازی و عەبدوڵڵە ڕۆشت و خۆی شۆرد وگەڕایەوە و لەگەڵ ئامینە خەوت. ئامینە بەپێغەمبەر دووگیان بوو.

دوای ئەوە ڕۆشتە لای ژنێکی دیکە و وتی: ئامادەیت؟

ژن وتی: ئەو کاتەی هاتیت نوورێك بەروخسارتەوە بوو، من رازی نەبووم، ڕۆشتیتە لای ئامینە و چیتر نوورەکە بەروخسارتەوە نەماوە.

دەڵێن: ئەو ژنە بەردەوام دەیوت، کاتێك عەبدوڵڵەی بینی، سپییەتییەکەی هاوشێوەی سپییەتی تەوێڵی ئەسپ بەناوچاویەوە ئاشکرا بوو. هیوادار بووم ببمە خاوەنی، بەڵام ڕۆشتە لای ئامینە و بەپێغەمبەر دووگیانی کرد.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: کاتێك عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵەی برد بۆ ئەوەی ژنی بۆ بێنێت، لای ژنێکی کاهین لەهۆزی خەسعەم تێپەڕی بەناوی فاتیمە کچی موڕ. ژنەکە جوولەکە و لەخەڵکانی تەبالە کەکتێبی خوێندبوویەوە. نووری لەروخساری عەبدوڵڵەدا بینی و پێی وت: ئەی گەنج، ئێستا لەگەڵ من جووت ببە و سەد وشترت پێدەبەخشم.

عەبدوڵڵە وتی: لەگەڵ باوکمدام و ناتوانم لێی جیا ببمەوە.

عەبدولموتەلیب ئەوی برد و ئامینە کچی وەهب کوڕی عەبدمەناف کوڕی زوهرەی کردە هاوسەری ئەو. عەبدوڵڵە سێ ڕۆژ لای ئەو مایەوە. دواتر گەڕایەوە و لای ژنی خەسعەمی تێپەڕی و داوای نزیك بوونەوەی لێکرد و پێی وت: ئامادەی بۆ ئەو کارەی

داوت کرد؟

ژن وتی: سوێند بەخوا، ژنێکی خراپەکار نیم، بەڵام نوورێکم لەروخساری تۆدابینی و مەبەستی ئەوەم کرد ببمە خاوەنی بەڵام خواوەند لەشوێنێکی دیکە داینا، دوای ئەوەی منت بەجێهێشت، چیت کرد؟

عەبدوالله وتی: باوکم ئامینە کچی وەهبی کردە هاوسەری من و سێ ڕۆژ لای ئەو مامەوە.

لەزوهری دەگێڕنەوە: عەبدوالله کوڕی عەبدولموتەلیب یەکێك بوو لەجوانترین پیاوەکانی قورەیش. باسی جوانی ئەویان بۆ ئامینە کچی وەهب کرد و وتیان: دەبیتە هاوسەری ئەو؟

ئامینە کچی وەهب بوو بەهاوسەری عەبدوالله و کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، بە پێغەمبەر(د.خ)، دووگیان بوو. دوای ئەوە، عەبدولموتەلیب عەبدوالله‌ی بۆ مەدینە نارد تا خورما بێنێت. عەبدوالله لەمەدینە مرد و کاتێك گەڕانەوەی ئەو زۆری خایاند، عەبدولموتەلیب حارسی کوڕی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد و بۆیان دەرکەوت عەبدوالله مردووە.

واقدی دەڵێت: ئەمە هەڵەیە، گێڕانەوەیەك سەبارەت بەهاوسەرگیری عەبدوالله کوڕی عەبدولموتەلیب کەهەمووان لەسەری کۆکن، لەگێڕانەوەی دایکی بەکر کچی مەنسووردا هاتووە، دەڵێت: عەبدولموتەلیب لەگەڵ کوڕەکەی هات و بۆ خۆی و کوڕەکەی خوازبێنی کرد. پێکەوە ژنیان هێنا. عەبدولموتەلیب، هالە کچی ئەهیب کوڕی عەبدمەناف کوڕی زوهرەی کردە هاوسەر وعەبدوالله کوڕی عەبدولموتەلیب، ئامینە کچی وەهب کوڕی عەبدمەناف کوڕی زوهرەی کردە هاوسەری خۆی.

دەڵێت: لای ئێمە ئاشکرایە و هاوەڵانی ئێمە سەبارەت بەم خاڵە هیچ ناکۆکییەکیان نییە کەعەبدوالله کوڕی عەبدولموتەلیب لەگەڵ کاروانێکی قورەیش لەشامەوە هات و لەمەدینە دابەزی و لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی مرد و لەماڵی نابیغە و بەوتەیەك تابیعە، لەماڵێکی بچوکدا بەخاك سپێردرا. کاتێك دەڕۆیتە ناو ماڵەکەی، گۆڕی ئەو لای چەپە. لەم گێڕانەوەیە هیچ ناکۆکییەك نییە.

## عەبدوالله کوڕی عەبدولموتەلیب بوو

ناوی عەبدولموتەلیب شەیبە و بەم ناوە بانگ دەکرا لەبەر ئەوەی پەڵەیەك قژی سپی لەناو سەریدا دەبینرا. عەبدولموتەلیب بۆیە ئەم ناوەی پێبڕا چوونکە لەگەڵ باوکی هاشم لەرێگەی مەدینەوە بۆ بازرگانی کردە دەڕۆشتە شام و کاتێك گەیشتە مەدینە، لای عەمرۆ کوڕی زەید کوڕی لوبەید دابەزی و کچەکەی ئەو، سەلمای بینی.

بەلأم بەپێی گێڕانەوەی باوکی ئیسحاق، سەلما کچی زەید کوڕی عەمرۆ کوڕی لوبەید کوڕی حەرام کوڕی حەداس کوڕی جوندەب کوڕی عودەی کوڕی نەجار بوو، هاشم عاشقی بوو و سەلمای لەباوکی خوازبێنی کرد و ئەوی کردە هاوسەری خۆی. باوکی سەلما مەرجی ئەوەی بۆ دانا کە لەکاتی منالّ بوون، دەبێتە هاوسەرەکەی لەناو کەسەکانی خۆیدا بێت.

هاشم پێش ئەوەی بڕواتە لای ژنەکەی خۆی، ڕۆشت و کاتێك لەشام گەڕایەوە، لەگەڵ ژنەکەی خەوت و دووگیانی کرد. دواتر هاشم لەگەڵ ژنەکەی گەڕایەوە بۆ مەککە و کاتێك، کاتی منالّبوونی ئەو نزیك کەوتەوە، ئەوی بۆ لای کەسەکانی برد و خۆی رێگەی شامی گرتەبەر و لەغەزە، چاوی لەجیهان بەست.

سەلما عەبدولموتەلیبی هێنایە دونیا و بۆ ماوەی حەوت یا هەشت سالّ لەمەدینە مایەوە. دوای ئەوە، یەکێك لەخەڵکانی منالّەکانی حارس کوڕی عەبدمەناف لەیەسرب تێپەڕی و چەندین منالّی بینی کەسەرقالّی تیر هاویشتن بوون. کاتێك شەیبە ئامانجی دەپێکا، دەیوت: من کوڕی هاشمم، من کوڕی سالاری بەتحام.

حارسی پێی وت: تۆ کێیت؟

وتی: شەیبە کوڕی هاشم کوڕی عەبدمەناف.

کاتێك پیاوی حارسی گەڕایەوە بۆ مەککە، موتەلیبی بینی لەحوجرەدا دانیشتووە، پێی وت: لەیەسرب چەند منالّێکم بینی سەرقالّی تیر هاویشتن بوون و لەناویاندا یەکیان کاتێك ئامانجەکەی دەپێکا دەیوت: من کوڕی هاشمم، من کوڕی سالاری بەتحام.

موتەلیب وتی: سوێند بەخوا ناگەڕێمەوە بۆ لای کەسەکانی خۆم، تا دەیهێنمەوە.

پیاوی حارسی پێی وت: وشترەکەی من ئامادەیە، سوار بە و بەرێکەوە.

موتەلیب سوار وشترەکە بوو و لەشەودا گەیشتە یەسرب. ڕۆشتە لای منالّەکانی عودەی کوڕی نەجار و چەند منالّێکیان بینی کەکایەیان دەکرد. برازاکەی خۆی لەناو

ئەواندا ناسییەوە و پێی وتن: ئەمە برازای منە.

وتیان: بەڵێ، برازای تۆیە و ئەگەر دەتەوێت بیبەیت، ئێستا بیبە بۆ ئەوەی دایکی نەزانێت چوونکە ڕێگە نادات بیبەیت و ئێمەیش ناتوانین ڕێگەی لێبگرین.

موتەلیب بەشەیبەی وت: برازاکەم، من مامی تۆم و دەمەوێت بتگەڕێنمەوە بۆ ناو خەڵکەکەی خۆت.

وشترەکەی خەواند و شەیبە سوار وشتر بوو، موتەلیب ئەوی برد. دایکی تا درەنگانێکی شەو نەیزانی و کاتێك بەدوایدا گەڕا، پێیان وت کەمامەکەی ئەوی بردۆتەوە.

موتەلیب بەرەبەیان شەیبەی گەیاندە مەککە. کەس و کارەکەی لێیان پرسی: ئەوە کێیە لەگەڵ تۆدا سواری وشتر بووە؟

موتەلیب وەڵامی دایەوە: کۆیلەی منە.

ڕۆشت تا گەیشتە لای هاوسەرەکەی خەدیجە کچی سەعید کوڕی سەهم. کاتێك پرسی ئەمە کێیە؟

وتی: کۆیلەی منە.

موتەلیب ڕۆشتە بازار و حیلەی((جلێکی درێژە))بۆ شەیبە کڕی و لەشەودا ئەوی بردە ناو کۆڕی منداڵەکانی عەبدمەناف. لەوەدا شەیبە بەحیلەوە لەناو کۆڵانەکانی مەدینەدا دەگەڕا وپێیان دەوت ئەمە عەبدولموتەلیبە. لەبەر ئەوەی سەرەتا موتەلیب وتبووی: کۆیلەی منە.

بەڵام گێڕانەوەی محەممەد کوڕی ئەبوبەکری ئەنساری بەمشێوەیە: هاشم کوڕی عەبدمەناف ژنێکی لەمناڵەکانی نەجار کردە هاوسەری خۆی کەشەریف بوو و مەرجی لەگەڵ خوازبێنیکەرانی خۆی دەبەست لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی بمێنێتەوە و هاوسەری هاشم، شەیبەی ئەلحەمدی هێنایە دنیا. ئەو لەناو خاڵەکانی خۆی پەروەردە و گەورە بوو. ڕۆژێك گەنجە ئەنسارییەکان سەرقاڵی تیرهاویشتن بوون. ئەو، ئامانجی دەپێکا و دەیوت: من کوڕی هاشمم.

ڕێبوارێك ئەمەی بیست و کاتێك گەڕایەوە بۆ مەدینە، بەموتەلیب کوڕی عەبدمەناف مامی وت: لای گەڕەکی هۆزی قیلە تێپەڕیم و گەنجێکم بەم تایبەتمەندییە بینی کە لەگەڵ گەنجەکانی دیکە سەرقاڵی تیرهاویشتن بوو. شانازی بەبراکەی تۆوە دەکرد. ڕەوا

نییە ڕێگە بدەیت لەغەریبیدا گەورە ببێت.

موتەلیب بەرەو مەدینە بەرێکەوت و مەبەستی ئەوەی کرد شەیبە لەگەڵ خۆی بۆ مەککە ببات بەڵام پێیان وت: ئەوە، دایکی ئەوە. کاتێك لەگەڵ دایکی قسەی کرد، توانی ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنێت. ئەوی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و لەدوای خۆیەوە سواری کردبوو. کاتێك کەسێك لێی دەپرسی: ئەمە کێیە؟ دەیوت: ئەمە، کۆیلەی منە. لەبەر ئەمە ناوی عەبدولموتەلیبی پێبڕا.

کاتێك گەیشتنە مەککە، موتەلیب هەموو سامانەکانی باوکی بۆ گەڕاندەوە.

نەوفل کوڕی عەبدمەناف زەوییەکی لەسامانی ئەو بەزۆر داگیر کردبوو. عەبدولموتەلیب بۆ لای کەسەکانی خۆی ڕۆشت و دژی مامەکەی خۆی داوای هاوکاری لێکردن، وتیان: ئێمە بەشداری نێوان کێشەکانی تۆ و مامت ناکەین.

کاتێك عەبدولموتەلیب ئەمەی بینی، نامەی بۆ خاڵۆکانی خۆی نووسی و کێشەکەی لەگەڵ نەوفلدا باس کرد و داوای هاریکاری لێکردن.

باوکی ئەسعەد کوڕی عەدەسی نەجاری لەگەڵ هەشتا سوار هات تا گەیشتە ئەبتەح. عەبدولموتەلیب ئاگادار بوویەوە و پێشوازی لێکرد و وتی: خاڵە، با بڕۆینەماڵەکەی من.

باوکی ئەسعەد وتی: نا، دەبێت نەوفل ببینم.

عەبدولموتەلیب وتی: ئەو لەگەڵ شێخەکانی قورەیش لەحوجرەدا دانیشتووە.

ئەسعەد ڕۆشت و لەسەر سەری نەوفل وەستا و شمشێری دەرهێنا و وتی: سوێند بەخواوەندی ئەم ماڵە، ئەگەر ماڵی خوشکەزاکەم نەگەڕێنیتەوە، بەشمشێر دەتکوژم.

نەوفل وتی: سوێند بەخواوەندی ئەم ماڵە، زەوییەکەی بۆ دەگەڕێنمەوە. ئامادەبوانی کردە شایەت.

دواتر بەشەیبەی وت: بابڕۆینە ماڵەکەی تۆ. سێ ڕۆژ لای ئەو مایەوە و حەجی عەمرەی ئەنجامدا.

دەڵێت: دوای ئەم ڕووداوە نەوفل لەگەڵ مناڵەکانی شەمس دژی مناڵەکانی هاشم پەیمانی بەست.

محەممەد کوڕی ئەبوبەکر دەڵێت: ئەم حەدیسەم بۆ موسا کوڕی عیسا گێڕایەوە، وتی: ئەی کوڕی ئەبوبەکر، ئەمە وتەی ئەنسارییەکانە تا لەگەڵ ئێمە (مناڵەکانی عەبدولموتەلیب) کەخواوەند ڕێزداری کردووین، خۆیان نزیك بخەنەوە. عەبدولموتەلیب

لەناو خەڵکەکەی لەوە رێزدارتر بوو پێویستی بەهاوکاری منداڵەکانی نەجار بێت.

دەڵێت: وتم: ئەی ئەمیر، خواوەند رێگەی چاکەت نیشان بدات، ئەوەی لەعەبدولموتەلیب باشتر بوو، پێویستی بەهاوکاری منداڵەکانی نەجار بوو.

دەڵێت: موسا کەپاڵی دابوویەوە، توورە دانیشت و وتی: باشتر لەعەبدولموتەلیب کێ بوو؟

وتم: محەممەدی پێغەمبەر(د.خ).

وتی: راست دەکەیت و تورەییەکەی دامرکایەوە.

موسا کوڕی عیسا بەمنداڵەکانی خۆی وت: ئەم حەدیسەی کوڕی ئەبوبەکر بنووسنەوە.

لەعەلاقەی تەغلەبی کەسەردەمی جاهلیەتی بینیبوو، دەگێڕنەوە: سەرەتای ئەو پەیمانەی نێوان منداڵەکانی هاشم و خوزاعە کە پێغەمبەر بەهۆی ئەو پەیمانە توانی دەست بەسەر مەککەدا بگرێت، لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کەنەوفل کوڕی عەبدمەناف دوایین منداڵی عەبدمەناف، ستەمی لەعەبدولموتەلیب کوڕی هاشم کوڕی مەناف کرد و بەشێك لەزەوییەکانی ئەوی زەوت کرد. دایکی عەبدولموتەلیب، سەلما کچی عەمرۆ لەمنداڵەکانی نەجاری خەزرەج بوو. عەبدولموتەلیب داوای زەوییەکەی لەمامی کردەوە بەڵام نەوفل رازی نەبوو. عەبدولموتەلیب نامەی بۆ خاڵۆکانی خۆی نووسی و داوای هاوکاری کرد کەهەشتا سوار هاتن و لەدەروی کەعبە دابەزین. کاتێك نەوفل کوڕی عەبدمەناف ئەوانی بینی، وتی: رۆژتان خۆش بێت.

وتیان: ئەی پیاو، رۆژت خۆش نەبێت، زەوی خوشکەزاکەی ئێمە بگەڕێنەرەوە.

وتی: لەبەر رێز و خۆشەویستی ئێوە ئەو کارە دەکەم. زەوییەکەی گەڕاندەوە و منداڵەکانی نەجار بۆ ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە.

دەڵێت: عەبدولموتەلیب مەبەستی بەستنی پەیمانێکی کرد. بەسرە کوڕی عەمرۆ و وەرقاء کوڕی فلاّن و چەند کەسێکی دیکەی کۆکردەوە و لەکەعبەدا پەیمانێکیان واژۆ کرد.

دوای مەرگی موتەلیب کوڕی عەبدمەناف، کاری ئاودان و خزمەت کردنی خەڵکان کە لەدەستی منداڵەکانی عەبدمەنافدا بوو، کەوتە دەستی عەبدولموتەلیب. بەمشێوەیە دەسەلاّت و گەورەیی لەناو خەڵکەکەی زیادی کرد و کەس هاوشێوەی ئەو نەبوو. ئەو

بوو چاڵی زەمزەمی دۆزییەوە کەئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم هەڵیکەند. گەنجەکانی دەرهێنا کەبریتی بوو لەدوو ئاسکی زێڕین و چەندین شمشێر و زرێ کەجورهەمییەکان لەکاتی ڕۆشتنەدەر لەمەککە، لەو چاڵەدا، چاڵیان کردبوو. لەشمشێرەکان دەرگایەکی بۆ کەعبە دروست کرد. دوو ئاسکە زێڕینەکەی بۆ ڕازاندنەوەی دەرگای کەعبە بەکار برد. وەك دەڵێن: ئەمە یەکەم زێڕ بوو بۆ ڕازاندنەوەی کەعبە بەکار برا.

نازناوی عەبدولموتەلیب باوکی حارسە لەبەر ئەوەی گەورەترین منداڵی ناوی حارس بوو. وەك وتمان عەبدولموتەلیب، شەیبە کوڕی هاشم بوو.

## عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم بوو

ناوی هاشم عەمرۆ بوو. لەبەر ئەوە پێیان دەوت هاشم چوونکە یەکەم کەس بوو لەمەککە بۆخەڵکەکەی خۆی، تریتی ورد کرد. هاشم بەمانای وردکەرە.

دەڵێن: خەڵکەکەی لەقوڕەیش گیرۆدەی وشکەساڵی و قاتوقڕی بوون. هاشم ڕۆشتە فەلەستین و ئاردی کڕی و وتی بیکەن بەنان. وشترێکی کوشت و لەئاوگۆشتەکەی تریتی بۆخەڵکەکەی دروست کرد.

دەڵێن: هاشم یەکەم کەس بوو ڕێچکەی سەفەری زستان و هاوینەی بۆ بازرگانی کردن لەشام و یەمەن بۆ خەڵکەکەی شکاند.

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: هاشم و عەبدشەمس کەگەورەی منداڵەکانی عەبدمەناف و موتەلیب کە لەهەموویان بچوکتر بوو، لەعاتیکە کچی مورەی سولەمی لەدایك بوون و نەوفل لەواقیدە چاوی بەدنیا هەڵهێنا. هەموویان دوای باوکیان سالاریان پێبڕا و یەکەم کەسان بوون بۆ خەڵکانی قوڕەیش پەیمانیان لەدەرەوەی حەرەم بەست. هاشم بۆ ئەوان لەگەڵ پاشاکانی شام وڕۆم و غەسان پەیمانی بەست، عەبدشەمس لەگەڵ نەجاشی گەورە پەیمانی بەست بۆ ئەوەی بتوانن هاتوچۆی حەبەشە بکەن، نەوفل لەگەڵ خوسرەوەکانی ئێرانی واژۆ و بەهۆیەوە دەیانتوانی سەردانی عێراق وسەرزەمینی پارسەکان بکەن. موتەلیب لەگەڵ پاشاکانی حەمیر پەیمانی واژۆ کرد و دەیانتوانی سەردانی یەمەن بکەن و بەمشێوەیە دەسەڵاتی قوڕەیشییەکان فراوانی بەخۆیەوە بینی.

دەڵێن: عەبدشەمس و هاشم دوانە بوون و ئەوەی یەکەم جار چاوی بەدنیا هەڵهێنا، پەنجەی بەناوچاوی ئەوەی دیکەیانەوە لکا بوو. جیایان کردەوە و خوێن ڕژا.

بەشێوەیەکی خراپ ئەمەیان لێکدایەوە و وتیان: خوێن لەنێوان ئەواندا دەڕژێت.

هاشم دوای عەبدمەنافی باوکی ئاودان و خزمەت کردنی خەڵکانی گرتەئەستۆ و وەهب کوڕی عەبدقوسەی سەبارەت بەو کەتریتی بەخەڵکەکەی دابوو، هۆنراویەکی هۆنییەوە و ئومەییە کوڕی عەبدشەمس کوڕی عەبد مەناف کەپیاوێکی دەوڵەمەند بوو، ڕژدی برد و مەبەستی ئەوەی کرد لاسایی هاشم بکاتەوە بەڵام نەیتوانی. کەسانێك لەقورەیش بۆ ئەم کارەی سەرکۆنەیان کرد. ئومەییە توڕە بوو و وتی: هاشم کێیە، داوای داوەری کرد بۆ ئەوەی بزانن کامیان بەرێزتر و گەورەترە. هاشم لەبەر پێگە و تەمەنی خۆی حەزی بەم کارە نەدەکرد بەڵام قورەیشییەکان ئەویان هاندا و وتی: لەسەر پەنجا وشتر گرێو دەکەین تا لەناو مەککەدا سەریان ببڕین و دە ساڵ لەمەککە دوور کەوینەوە.

ئومەییە رازی بوو. کاهینێکی خوزاعیان کردە داوەر کەهاشمی بەگەورەتر و رێزدارتر ناساند. وشترەکانی سەربڕی و دەرخواردی خەڵکەکەی دا و ئومەییە بەرەو شام کەوتە ڕێ وبۆ ماوەی دەساڵ لەوێ مایەوە. ئەمە یەکەم دوژمنایەتی نێوان هاشم و ئومەییە بوو.

دەڵێن: عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم و حەرب کوڕی ئومەییە بۆ ئەم مەبەستە ڕۆشتنە لای نەجاشی بەڵام رازی نەبوو لەنێوان ئەوان داوەری بکات و نوفەیل کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی ریباح کوڕی عەبدوالله کوڕی قورەز کوڕی رەزاح کوڕی عودەی کوڕی کەعبیادم کردە داوەر. ئەو، بەحەربی وت: ئەی باوکی عەمرۆ لەگەڵ کەسێك کەبالآی لەتۆ بەرزتر و سەری لەتۆ گەورەتر و روخساری لەتۆ جوانتر و لەتۆ دەست ئاوەڵاتر و منالی زیاتر هەیە، گرێو دەبەستیت؟ لەپێشی بەهاشم بەخشی.

حەرب وتی: لەبەدبەختی رۆژگار بوو تۆمان کردە داوەر.

یەکەم کەس لەمناڵەکانی عەبدمەناف کەمرد، هاشم بوو. لەغەزە لەشام چاوی لەجیهان بەست. دوای ئەو عەبدشەمس لەمەککە ماڵئاوایی لەجیهان کرد و گۆڕەکەی لەئەجیادە، دوای ئەو نەوفل لەسەلمان لەرێگەی عێراق مرد، موتەلیب لەرەدمانی یەمەنی کۆچی دوایی کرد.

دوای هاشم کاری ئاودان و خزمەت کردنی خەڵکان، بەموتەلیب کوڕی عەبدمەناف گەیشت.

## هاشم کوڕی عەبدمەناف بوو

ناوی عەبدمەناف موغەیرەیە. ئەویان بەمانگ ناو دەبرد لەبەر ئەوەی زیاد لەڕادە جوان و قۆز بوو.

دەڵێن: قوسەی وتبووی: چوار کوڕم هێنایە دنیا و دوانیانم بەناوی بتەکانی خۆمەوە ناونا و یەکیان بەناوی ماڵەکەم و ئەوی دیکەیان بەناوی خۆم. ئەم چوار کوڕە، عەبدمەناف و عەبدولعوزەی و عەبدئەلدار و عەبدقوسەی بوون و دایکی هەموویان حەبی کچی حەلیل کوڕی حەبیشە کوڕی سەلوول کوڕی کەعب کوڕی عەمرۆ کوڕی خوزاعە بوو.

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: عەبدمەنافیان بەمانگ ناودەبرد و ناوی موغەیرە بوو، دایکی حەبی ئەوی بەمەناف پەیوەست کردبوو کەیەکێك بوو لەگەورەترین بتەکانی مەککە و حەبی ئەو بتەی زۆر خۆشدەویست و لەبەر ئەمە بەعەبدمەناف ناوی دەرکرد.

## عەبدمەناف کوڕی قوسەی بوو

ناوی قوسەی زەیدە. بۆیە بەقوسەی ناوی دەبەن چونکە باوکی کەلاب کوڕی مورە، فاتیمە کچی سەعد کوڕی سەیل،دایکی قوسەی ، وەك هاوسەری خۆی هەڵیبژارد و ناوی سەیل، خێر کوڕی حەماله کوڕی عەوف کوڕی غەنەم کوڕی عامر کوڕی ئەلجادرین کوڕی عەمرۆ کوڕی جەشمە کوڕی یەشکر ولەتیرەی ئەزدشنوە و هاوپەیمانی منالەکانی دوئەل بوو.

فاتیمە، زوهرە و زەیدی بۆ کەلاب هێنایە دنیا. زەید کەم تەمەن بوو، کەلاب مرد بەلأم زوهرە گەورە ببوو. رەبیعە کوڕی حەرام کوڕی عەبد کوڕی کەبیر کوڕی عوزرە کوڕی سەعد کوڕی زەید لەهۆزی قوزاعە بوو، فاتیمە، دایکی زوهرە و زەیدی کردە هاوسەر. زەهرە پیاوێکی باڵغ و قوسەی شیرخۆرە بوو. پیاوی قوزاعی، فاتیمەی بۆ سەرزەمینی منالەکانی عوزرە لەبەرزاییەکانی شام برد. قوسەیشی لەگەڵ خۆیدا برد بەلأم زەهرە لەناو خەڵکەکەی خۆی مایەوە.

فاتیمە کچی سەعد کوڕی سەیل بۆ رەبیعە کوڕی حەرام، رەزاحی هێنایە دنیا کە لەدایکەوە برای قوسەی بوو. رەبیعە لەژنێکی دیکە، سێ منالی هەبوو: حەن و مەحمود

و جەلهەمە.

زەید، لای رەبیعە گەروە و بەقوسەی ناوی دەرکرد لەبەر ئەوەی ماڵەکەی لەخەڵکەکەی دوور بوو. زەهرە لەمەککە نەڕۆشتەدەر و لەو ماوەی قوسەی کوڕی کەلاب لەسەرزەمینی قوزاعە بوو و وەك وتوویانە بەکوڕی رەبیعە کوڕی حەرام ناودەبرا، لەنێوان ئەو و یەکێك لەگەنجەکانی قوزاعە پێشهاتێك روویدا. قوسەی گەورە ببوو. پیاوی قوزاعی قوسەی بۆ غەریب بوونی سەرکۆنە کرد و وتی: بۆ ناگەڕێیتەوە بۆ لای کەس و کارەکەی خۆت، تۆ لەئێمە نیت.

کاتێك قوسەی ئەمەی بیست، رۆشتە لای دایکی، خەمبار و دڵتەنگ بوو. سەبارەت بەوتەی پیاوی قوزاعی پرسیاری لەدایکی کرد. دایکی وتی: کوڕم، سوێند بەخوا تۆ لەو رێزدارتۆ و باوکت لەباوکی ئەو گەورەترە، تۆ کوڕی کەلاب کوڕی مورە کوڕی کەعب کوڕی لوئەی کوڕی غالب کوڕی فیهر کوڕی مالك کوڕی نەزر کوڕی کەنانەی قورەشیت و خەڵکەکەی تۆ لەمەککە و لەنزیك ماڵی خواوەند نیشتەجێن.

قوسەی بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ ناو خەڵکەکەی چونکە چیتر نەیدەتوانی بەرگەی غەریبی سەرزەمینی قوزاعە بگرێت. بەڵام دایکی پێی وت: کوڕم، پەلە مەکە، تا مانگی حەرام چاوەڕێ بکە و لەگەڵ حەج کەرانی عەرەب بڕۆ چوونکە دەترسم بەڵایەکت بەسەردا بێت.

قوسەی تا مانگی حەرام چاوەڕوانی کرد. حاجییەکان لەقوزاعە بەرێکەوتن. لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت تا گەیشتە مەککە، کاتێك لەرێ و رەسمەکانی حەج کردن تەواو بوو، لەوێ مایەوە. پیاوێکی بوێرو بەرێز بوو. حەبی کچی حەلیل کوڕی حەبشیەی خوزاعی خوازبێنی کرد و ئەوی کردە هاوسەری خۆی. وەك دەڵێن: حەلیل لەو کاتەدا بەرێوبەری کارەکانی کەعبە بوو.

بەوتەی کوڕی ئیسحاق، قوسەی لەگەڵ حەلیل مایەوە تا ئەو کاتەی عەبدوئەلدار و عەبدمەناف و عەبدولعوزەی و عەبدقوسەی چاویان بەدنیا هەڵهێنا. کاتێك منداڵەکانی فراوان و سامانەکەی زیاد و شەرەف و گەورەیی پێبڕا، حەلیل کوڕی حەبشیە مرد و قوسەی کەخۆی بۆ بەرێوەبردنی کاروبارەکانی کەعبە لەخەڵکانی خوزاعە بەشیاوتر دەزانی کەمنداڵەکانی ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل بوون، لەگەڵ قورەیشییەکان و منداڵەکانی کەنانە گفتوگۆی کرد بۆ ئەوەی خوزاعە و منداڵەکانی بەکر لەمەککە دەربکەن. کاتێك

بەوتەکانی رازی بوون وپەیمانیان بەست، نامەی بۆ براکەی خۆی (لەدایکەوە) رەزاح کوڕی رەبیعە کوڕی حەرام لەدیاری قوزاعە نووسی و داوای هاوکاری لێکرد. رەزاح، خەڵکانی قوزاعەی بۆ هاوکاری کردنی براکەی هاندا وئەوانیش رازی بوون.

بەڵام لەحەدیسەکەی هوشامدا هاتووە: قوسەی ڕۆشتە لای زەهرەی برای و زۆری نەخایاند سەروەری خەڵکەکەی پێبڕا. خەڵکانی خوزاعە لەمەککە زیاتر بوون لەمناڵەکانی نەزر. قوسەی داوای هاوکاری لەزڕبراکەی خۆی رەزاح کوڕی رەبیعە کوڕی حەرام کرد. ئەو، سێ زڕ برای هەبوو، لەگەڵ براکانی دیکە و خەڵکانی قوزاعە هاتن، مناڵەکانی نەزر پشتیوانیان لەقوسەی دەکرد، خەڵکانی خوزاعەیان لەمەککە دەرکرد و قوسەی، حەبی کچی حەبشیەی کردە هاوسەری خۆی کەیەکێك بوو لەمناڵەکانی خوزاعە و چواری کوڕی بۆ هاتە دنیا. حەلیل دوایین کەس لەخوازعە بوو سەرپەرەستی کاروبارەکانی کەعبەی دەکرد. کاتێك مرد، بەرێوەبردنی کاروبارەکانی کەعبەی بەکچەکەی سپارد.

حەبی بەباوکی وت: دەزانی من ناتوانم دەرگاکەی بکەمەوە و بیبەستم.

حەلیل وتی: ئەو کارە بەپیاوێك دەسپێرم تا بەنوێنەرایەتی تۆ ئەنجامی بدات. ئەم کارەی بەباوکی غەبشان سپارد و ئەو سەلیم کوڕی عەمرۆ کوڕی بوی کوڕی مەلەکان کوڕی ئەقسا بوو.

قوسەی بەرێوەبردنی کاروبارەکانی کەعبەی بەخومرەیەك شەراب و عوودێك کڕییەوە. کاتێك خەڵکانی خوزاعە ئەمەیان بیست، دژی قوسەی وەستانەوە. ئەو، داوای هاوکاری لەبراکەی خۆی کرد و رووبەرووی خوزاعە، وەستایەوە.

دەڵێن و خوا زاناترە: خەڵکانی خوزاعە گرفتاری نەخۆشی قورحە بوون بەشێوەیەك زۆری نەمابوو هەموویان لەناو بچن. لەبەر ئەمە مەککەیان بەجێهێشت. دەستەیەکیان ماڵەکانی خۆیان بەخشی و دەستەیەکیان فرۆشیتان.

قوسەی بەرێوبردنی کاروبارەکانی کەعبەی گرتە ئەستۆ و هۆزەکانی قورەیشی کۆکردەوە وئەوانی لەمەککە نیشتەجێ کرد. پێشتر دەستەیەکیان لەسەر لووتکەی کێوەکان و ناو دۆڵەکان ژیانیان بەسەر دەبرد. ماڵەکانی مەککەی لەناو ئەواندا دابەش و خەڵك ملکەچی فەرمانڕەوایەتی بوون.

بەڵام بەوتەی کوڕی ئیسحاق، رەزاح وەڵامی داوای زڕبراکەی دایەوە و لەگەڵ سێ براکەی خۆی و خەڵکانی قوزاعە و حەج کەرانی عەرەب، بۆ هاوکاری کردنی قوسەی

بەرێکەوتن.

دەڵێت: بەگومانی خەڵکانی خوزاعە، حەلیل کوڕی حەبشییە لەناو وەسییەتەکەی خۆی بەرێوبەردنی کاروبارەکانی کەعبەی بەقوسەی سپارد چوونکە باوکی کچەزاکانی بوو. بەقوسەی وت: بەرێوەبردنی کاروبارەکانی کەعبە و مەککە، ماف تۆیە. لەم کاتەدا بوو قوسەی داوای هاوکاری کردنی خەڵکانی قوزاعەی کرد. کاتێك خەڵکان لەمەککە و عەرەفات کۆبوونەوە و ریێ ورەسمەکانی حەجیان ئەنجامدا، لەمەنی دابەزین. قوسەی و قوڕەیشییەکانی شوێنکەوتەی ئەو و منالەکانی کەنانە و خەڵکانی قوزاعە بڕیاری دەرکردنی خەڵکانی خوزاعەیان دابوو و دەبوا، ئەنجامی بدەن.

سووفە، ئەو کەسەی بەرێوبەری ریێ و رەسمی حەج بوو، خەڵکی لەعەرەفاتەوە دەبرد و ریگەی ڕۆشتن لەمەنی پێدەدان و لەکاتی ڕەمی شەیتان، ڕەمی دەستپێدەکرد. هیچ کەس بەردی بۆ شەیتان نەدەهاویشت تا ئەو کاتەی ئەو بەردی دەهاویشت. ئەو کەسانەی بۆ ئەو کارە پەلەیان بوو، دەڕۆشتنە لای و دەیانوت: هەستە و شەیتان رەجەم بکە تا ئێمەیش ئەو کارە بکەین.

بەلأم دەیوت: دەبێت چاوەڕیێ بن تا ئەو کاتەی خۆر ئاوا دەبێت.

ئەوانەی پەلەیان بوو، بەبەرد لێیان دەدا و بۆ پەلە کردن هانیان دەدا.

بەلأم سووفە چاوەڕوان دەمایەوە تا خۆر ئاوا دەبوو، ئەوسا هەڵدەستا و ڕەجمی دەکرد و خەڵکانیش بەدوای ئەودا ئەو کارەیان دەکرد.

کاتێك حاجییەکان لەم کارە تەواو دەبوون، دەیانویست لەمەنی بڕۆن، سووفە هەر دوولای عەقەبەی دەگرت و ریگەیان لەخەڵکان دەگرت. داوای مۆڵەتیان لەسووفە دەکرد. کەس مۆڵەتی پێنەدەدرا. ئەو کاتەی سووفە دەڕۆشت، ریگاکان دەکرانەوە.

لەو ساڵەدا هاوشێوەی سالأنی پێشوو، کارەکانی خۆی دەکرد. عەرەبەکان ئەم مافەیان بۆ ئەو لەبەر چاو دەگرت چوونکە لەرۆژگاری جورهەم و خوزاعەوە ببوو بەداب و نەریتێکی باو. لەو کاتەدا قوسەی کوڕی کەلاب لەگەڵ هاوەلأنی خۆی لەقوڕەیش و کەنانە و قوزاعە ڕۆشتنە لای عەقەبە و وتیان: ئەم کارە ماف ئێمەیە.

خەڵکان رازی نەبوون و قوسەیش، حاشای لەمافەکانی ئەوان کرد. شەڕ روویدا و هەردوولا دەستیان بەکوشتاری یەك کرد. شکست بەشوێنکەوتەکانی سووفە بڕا و قوسەی دەستی بەسەر کاروبارەکاندا گرت.

دەڵێت: لەم کاتەدا خوزاعە و منداڵەکانی بەکر خۆیان لەقوسەی دوورخستەوە و نەیانزانی کاروبارەکان هاوشێوەی سووفە لەدەستی ئەوانیش دەردێنێت و لەبەرێوبردنی کارەکانی کەعبە دووریان دەخاتەوە. کاتێك خۆیان بەدوور گرت، بۆ شەڕی ئەوان خۆی ئامادە وبراکەی رەزاح کوڕی رەبیعە لەگەڵ خەڵکەکەی، هاورێیەتی و پشتیوانییان لێدەکرد. خوزاعە و منداڵەکانی بەکر رووبەروویان بوونەوە و شەڕێکی دژوار دەستپێکرد. ژمارەیەکی فراوان لەهەر دوولا کوژران وبریندار بوون و سەرئەنجام هەردوولا، بانگەوازی ئاشتیان بەرز کردەوە و ویستیان یەکێك لەعەرەبەکان وەك داوەر هەڵبژێرن. یەعمەر کوڕی عەوف کوڕی کەعب کوڕی لەیس کوڕی بەکر کوڕی عەبدمەنات کوڕی کەنانەیان وەك داوەر هەڵبژارد.

یەعمەر بەمشێوەیە داوەری کرد: قوسەی بۆ بەرێوەبردنی کاروبارەکانی کەعبە و مەککە، لەخوزاعە شیاوترە و هەموو ئەو خوێنانەی قوسەی لەوانی ڕشتووە، بەفیڕۆ دەڕوات بەڵام خەڵکانی خوزاعە دەبێت خوێنبایی ئەو کەسانە بدەن کە لەهاوەڵانی قوسەی کوشتوویانە و کاروبارەکانی کەعبە و مەککە، بەقوسەی بسپێرن.

قوسەی کاروبارەکانی گرتەدەست و خەڵکەکەی خۆی لەمەککەدا نیشتەجێ کرد. فەرمانڕەوایەتی پێبڕا. یەکەم کەس لەمنداڵەکانی کەعب کوڕی لوئەی بوو پاشایەتی بەدەست دەهێنا و خەڵکەکەی گوێرایەڵی بوون. هەروەها پەردەداری و ئاودان و خزمەت کردنی خەڵکان و کارەکانی دیکە، لەدەستی ئەودا بوو. هەموو شەرەف و گەورەییەکانی مەدینەی بەدەست هێنا.

قوسەی مەککەی کردە چواربەش و هەردەستەیەك لەقوڕەیشییەکانی لەبەشێکیدا نیشتەجێ کرد.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: قوڕەیشییەکان لەبڕینی دارەکانی حەرەم لەناو ماڵەکانیان دەترسان. قوسەی دارەکانی بەدەستی خۆی بڕییەوە و عەرەبەکان ئەویان بەکەسێکی پیرۆز لەقەڵەمدا. رێ ورەسمی مارەبڕین و راوێژ کردن و ئاڵا بەستن بۆ شەڕ لەماڵەکەی ئەودا ئەنجام دەدرا. ئاڵاکە یەکێك لەکوڕەکانی ئەو دەیبەست. هەرکەچێك دەبوا جل و بەرگی ژنان لەبەر بکات، لەماڵەکەی ئەودا لەبەری دەکرد و لەوێوە دەڕۆشتە ماڵی کەسەکانی خۆی.

فەرمانی قوسەی لەسەردەمی ژیان و مەرگیدا لەناو خەڵکانی قوڕەیش ئەنجامدەدرا و بەپێچەوانەی فەرمانەکانی ئەو نەدەجووڵانەوە چوونکە فەرمانبەری کردنی ئەویان

بەپیرۆز دەزانی.

قوسەی دارئەلندەوەی کردە مەنزڵگەی خۆی و دەرگاکەی بەرەو مزگەوت کردەوە. قورەیشییەکان لەوێ راوێژیان سەبارەت بەکارەکانی خۆیان دەکرد.

سایب کوڕی خەباب دەڵێت: لەسەردەمی خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب بیستم کەسێك بەسەرهاتەکەی قوسەی کوڕی کەلاب و کۆکردنەوەی خەڵکان و دەرکردنی خەڵکانی خوزاعە و مناڵەکانی بەکر و لەدەست گرتنی کاروبارەکانی کەعبە و مەککەی باس دەکرد. عومەر ئامادە بوو و حاشای لەراستی وتەکانی نەکرد.

دەڵێت: قوسەی بەو پێگەی و جێگەی لەناو خەڵکەکەی بەدەستی هێنا بوو، بۆ بەرێوەبردنی کاروبارەکانی مەککە، فەرمانڕەوایەکی رەها بوو بەڵام شێواز و ریێ و رەسمی حەج کردنی وەك خۆی هێشتەوە چوونکە گۆڕانکاری کردن لەو کارە نەشیاو بوو. بەمشێوەیە سووفە لەکارەکەی خۆیدا مایەوە تا ئەو کاتەی لەناو چوو وکارەکان بەپێی میرات بەبنەماڵەی سەفوان کوڕی حارس کوڕی شەجنە گەیشت. مناڵەکانی مالك کوڕی کەنانە و مورە کوڕی عەوف ئەم کارەیان لەئەستۆدا بوو تا ئەو کاتەی ئیسلام هات و خواوەند بەهۆیەوە، هەموو ئەو شتانەی لەناو برد.

قوسەی لەمەککە ماڵێکی دروست کرد کەهەمان دارئەلندەوبوو. قورەیشییەکان لەو ماڵەدا سەبارەت بەکێشەکانی خۆیان گفتوگۆیان دەکرد.

کاتێك قوسەی پیر و پەکیکەوت، عەبدئەلدار کورە گەورەکەی وەك دەڵێن لاواز بوو، عەبدمەناف لەسەردەمی باوکی شەرەف و پێگەی بۆ خۆی بەدەست هێنابوو، عەبدولعوزەی و عەبدقوسەی شوێن پەنجەیان بەکارەکانەوە دیار بوو، بەڵام قوسەی بەعەبدئەلداری وت: هەرچەندە براکانت پێش تۆ کەوتونەتەوە بەڵام سوێند بەخوا پێگەی تۆیش هاوشێوەی ئەوان بەرز دەکەمەوە، هیچ کام لەوان ناچێتە ناو کەعبە مەگەر ئەوەی تۆ دەرگاکەی بکەیتەوە، ئاڵای شەڕی قورەیشییەکان بەدەستی تۆ دەبەسترێت، کەس لەمەککە ئەرکی ئاودانی خەڵکان ناگرێتەدەست و هیچ کەس لەکاتی وەرزی حەج لەخواردنی خەڵکانی دیکە ناخوات و قورەیشییەکان لەماڵەکەی تۆدا کێشە بەکار و کێشەکانی خۆیان دێنن. دارئەلندەوەی بەعەبدئەلداردا. پەردەداری و ئاڵا ورفادەت و ئاودانی خەڵکان بوو بەیەکێك لەئەرکەکانی ئەو.

رفادەت ئەو خەرجییە بوو قورەیش لەهەر وەرزێکدا لەسامای خۆیان بەقوسەیان

دەدا و بەهاوکاری ئەو سامانە خواردنی بۆ خەڵکان ئامادە دەکرد بۆ ئەوحاجییانەی خواردن و تویشوویان پێنەبوو. قوسەی ئەمەی کردبووە ئەرکێکی پێویست لەسەر شانی خەڵکانی قورەیش. لەکاتی دەرکردنی ئەم فەرمانەدا وتبووی: ئەی خەڵکی قورەیش، ئێوە دراوسێکانی خوا و دانیشتووانی ماڵ و حەرەمی خواوەندن و حاجییان میوان و زیارەتکەرانی خوان و لەهەموو میوانەکانی دیکە زیاتر شیاوی رێزن، کەواتە لەسەردەمی حەج کردن خواردن و خواردنەوە بۆ ئەوان کۆبکەنەوە تا ئەو کاتەی کۆتایی بەحەجەکەی خۆیان دێنن.

خەڵکان ئەو کارەیان کرد و هەر ساڵە بۆ ئەم مەبەستە بەشێك لەسامانەکەی خۆیان بەقوسەی دەدا. قوسەی لەکاتی حەج کردن خواردنی بۆ خەڵکان دروست دەکرد. ئەم کارە لەسەردەمی نەزانی و جاهلییەتدا باو بوو تا ئەو کاتەی ئیسلام هات. ئەم نەریتە تا ئێستایش بەردەوامە. ئەمە ئەو خواردنەیە ساڵانە سوڵتان لەمەنی بۆ خەڵکانی دروست دەکات تا ئەو کاتەی کۆتایی بەحەج دێت.

کاتێك قوسەی مرد، کورەکانی ئەرکەکانی ئەویان گرتە ئەستۆ.

## قوسەی کوری کەلاب بوو

دایکی کەلاب، هند کچی سەریر کوری سەعلەبە کوری حارس کوری فیهر کوری مالك کوری نەزر کوری کەنانە بوو، دوو زربرای بوو کە لەیەك دایك نەبوون: تیم و یەقزە کە بەوتەی هوشام، دایکیان ئەسماء کچی عودەی کوری حارسە کوری عەمرۆ کوری عامر کوری بارق بوو.

بەلام کوری ئیسحاق دەڵێت: دایکیان هند کچی حارسە لەنەتەوەی بارق و بەوتەیەك یەقزە لەهند دایکی کەلاب بوو.

## کەلاب کوری مورە بوو

دایکی مورە وەحشییە کچی شەیبان کوری موحارب کوری فیهـ کوری مالك کوری نەزر کوری کەنانە بوو. مورە دوو برای بوو: عودەی و هەسیس و بەوتەیەك دایکی هەسیس و مورە، مەخشییە کچی شەیبان کوری موحارب کوری فیهر بوو. دایکی عودەی، رەقاش کچی رەکبە کوری نائیلە کوری کەعب کوری حەرب کوری تیم کوری مەعد کوری فەهم کوری عەمرۆ کوری قەیس کوری عەیلان بوو.

## مورە کوڕی کەعب بوو

دایکی کەعب، بەوتەی کوڕی ئیسحاق و کوڕی کەلبی، ماویە کچی کەلب کوڕی قەیس کوڕی جەسر کوڕی شیع الله کوڕی ئەسەد کوڕی وەبرە کوڕی تەغلەب کوڕی حیلوان کوڕی ئەلحاف کوڕی قوزاعە بوو. دوو برای هەبوو بەناوەکانی: عامرە و سامە.

## کەعب کوڕی لوئەی بوو

دایکی لوئەی بەوتەی کوڕی هوشام عاتیکە کچی یەخلد کوڕی نەزر کوڕی کەنانە بوو، ئەو یەکەم عاتیکەی قورەیش لەسیلسیلەی ڕەچەڵەکی پێغەمبەرە.

لوئەی لەدایك و باوکەوە دوو برای هەبوو بەناوەکانی: تیم کەبەتیم ئەلادرەم ناویان دەبرد و قەیس.

دەڵێن: لەمناڵەکانی قەیس برای لوئەی کەس نەمایەوە و دوایین کەسی ئەوان لەرۆژگاری خالید کوڕی عەبدوڵڵەی قەسری مرد. کەس میرات هەڵگری ئەو نەبوو.

## لوئەی کوڕی غالب بوو

دایکی غالب لەیلی کچی حارس کوڕی تەمیم کوڕی سەعد کوڕی هودەیل کوڕی مەدرەکە بوو. براکانی ئەو حارس و موحارب و ئەسەد و عەوف وجون و زەئب بوون.

موحارب و حارس لەقورەیش زەواهیر بوون کە لەدەرەوەی دۆڵی مەککە دەژیان.

حارس لەناو دۆڵەکەدا جێگیر بوو.

## غالب کوڕی فیهر بوو

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: غالب بوو قورەیشییەکانی لەیەك جێگەدا کۆکردەوە. دایکی غالب جەندەلە کچی عامر کوڕی حارس کوڕی مەزازی جورهەمی بوو.

بەوتەی باوکی عوبەیدە، مەعمەر کوڕی موسەنا دایکی سەلما کچی ئەدبەن تابخە کوڕی ئەلیاس کوڕی موزەر بوو و بەوتەیەك، دایکی جەمیلە کچی عەدوان کوڕی بارقی ئەزدی بوو.

فیهر لەدەورانی خۆی سالاری خەڵکانی مەککە بوو. لەشەڕێك کەحەسان کوڕی عەبد کەلاب کوڕی مسوەب زوحەرسی حەمیری لەمەککە هەڵیگیرساند، فیهر سەرکردەی خەڵکانی مەککە بوو. وەك وتوویانە: حەسان لەگەڵ حەمیر و کەسانێکی زۆر

لەهۆزەکانی یەمەن هاتبوو و دەیویست بەردەکانی کەعبە لەناو ببات بۆ ئەوەی حاجییەکان رووبکەنە یەمەن. لەنەخلە دابەزی و چوارپێی خەڵکانی تاڵان و رێگەی بەست بەڵام نەیوێرا بڕواتە ناو شاری مەککە. کاتێك قورەیش و هۆزەکانی کەنانە و خەزیمە و ئەسەد و جەزام و هۆزەکانی دیکەی موزەر ئەمەیان بینی، رووبەرووی حەسان بوونەوە. سالاری خەڵکان فیهر کوڕی مالك بوو. شەڕێکی دژواریان کرد و حەمیرییەکان شکستیان خوارد و حەسان کوڕی عەبدکەلال، شای حەمیر ئەسیر کرا. حارس کوڕی فیهر ئەوی ئەسیر کرد.

لەکوژراوەکانی ئەم شەرە قەیس کوڕی غالب بوو، حەسان بۆ ماوەی سێ ساڵ وەك ئەسیر لەمەککە مایەوە تا ئەوەی فیدیەی دا و ئازادیان کرد بەڵام لەرێگەی گەڕانەوەی بۆ یەمەن، مرد.

## فیهر کوڕی مالك بوو

دایکی مالیك عیکرەشە کچی عەدوانە و عەدوان حارس کوڕی عەمرۆ کوڕی قەیس کوڕی عەیلان بوو.

بەوتەی کوڕی ئیسحاق، دایکی مالك عاتیکە کچی عەدوان کوڕی عەمرۆ کوڕی قەیس کوڕی عەیلانە. مالك دوو برای بوو: یەخلەد کە پەیوەستی مناڵەکانی عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی مالك کوڕی کەنانە بوو و لەناو قورەیشییەکاندا نەما.

ئەوی دیکەیان سەڵت بوو بەڵام لەمناڵەکانی ئەو کەس نەمایەوە.

دەڵێن: ناوی قورەیش لەقورەیشی کوڕی بەدر کوڕی یەخلەد کوڕی حارس کوڕی یەخلەد کوڕی نەزر کوڕی کەنانە وەرگیراوە، چوونکە کاتێك کاروانی مناڵەکانی نەزر دەهات، عەرەبەکان دەیانوت: کاروانەکەی قورەیش هات. ئەم وشەیە بوو بەسەرچاوەی ناسینەوەی هەمووی هۆزەکان.

دەڵێن: قورەیش کوڕی بەدر لەسەفەرەکان رێنیشاندەر و توێشوودارى مناڵەکانی نەزر بوو. کوڕێکی بوو ناوی نەزر کە چاڵی بەدری هەڵکەند و ناوی بەدر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

کوڕی کەلبی دەڵێت: قورەیش تێکەڵەیەك لەخەڵکە جیاوازەکان بوون کەیەك دایك و باوکیان نەبوو. دەستەیەك وتوویانە: مناڵەکانی نەزر کوڕی کەنانەیان بەقورەیش ناو دەبرد لەبەر ئەوەی رۆژێك نەزر کوڕی کەنانە ڕۆشتە ناو کۆبوونەوەی خەڵکەکەی خۆی.

ئەوانەی دانیشتبوون بەیەکیان وت: سەیری نەزر بکەن دەڵێی وشترێکی قوڕەیشە، یانی چوارشانە و بەهێز. ئەم وشەیە لەسەر منداڵەکانی ئەو مایەوە.

بەوتەیەك وشەی قوڕەیش لەئاژەڵێکی دەریاییەوە سەرچاوەی وەرگرتووە کەئاژەڵە دەریاییەکانی دەخوارد و بەقرش ناوی دەبەن. منداڵەکانی نەزر کوڕی کەنانەیان هاوشێوەی ئەو ئاژەڵە بەهێزە، بەقوڕەیش ناوبرد و هەروەها وتوویانە نەزر کوڕی کەنانە لەبەر ئەوە بەقوڕەیش ناوی دەرکرد چوونکە بەسامانی خۆی هاوکاری کەسانی زۆری کرد و تەقریش بەمانای پشکنینە کەکوڕەکانی نەزر بەدوای پێویستی و نیازی حاجییەکان دەگەڕان و بەراوەردیان دەکرد

بەوتەیەکی دیکە نەزر کوڕی کەنانە، ناوی قوڕەیش بوو.

هەروەها دەڵێن: منداڵەکانی نەزر کوڕی کەنانە بەبەنی نەزر ناو دەبران. کاتێك قوسەی کوڕی کەلاب ئەوانی کۆکردەوە، نەوانیان بەقوڕەیش ناو برد چوونکە کۆبوونەوە بەمانای (تقرش)ە و عەرەبەکان وتیان منداڵەکانی نەزر (تقرشیان) کرد یانی کۆبوونەوە

هەروەها دەڵێن: بۆیە منداڵەکانی نەزر بەقوڕەیش ناو دەبەن چوونکە دوژمنان هیچ کات هێرشیان نەدەکردنە سەر.

دەڵێن: عەبدولمەلیك کوڕی مەروان لەمحەممەد کوڕی جەریری پرسی: قوڕەیشییەکان چ کاتێك ئەم ناوەیان پێبڕا؟

وتی: کاتێك لەحەرەم کۆبوونەوە، چوونکە کۆبوونەوە بەمانای تقرشە.

عەبدولمەلیك وتی: من بەمشێوە نەمبیستووە، بەڵام بیستوومە قوسەیان بەقوڕەشی ناو دەبرد و پێشتر هیچ کەسیان بەو ناو بانگ نەکردووە.

لەباوکی سەلمە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف دەگێڕنەوە: کاتێك قوسەی لەحەرەم نیشتەجێ بوو و کارە چاکەکانی ئەنجامدا، بەقوڕەشی ناویان برد و یەکەم کەس بوو بەم ناوە بانگ کرا.

لە محەممەد کوڕی عومەر دەگێڕنەوە: قوسەی یەکەم کەس بوو لەموزدەلیفە ئاگری کردەوە بۆ ئەوەی هەرکەس لەعەرەفە دەوەستێت، بیبینێت و لەهەموو رۆژگاری جاهلییەت لەشەوی وەستان لەموزدەلیفە، ئاگریان دادەگیرسان.

لە عەبدوالله کوڕی عومەر دەگێڕنەوە: ئاگر موزدەلیفە لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) و

ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان دادەگیرسا. دەڵێت: تا ئێستایش ئەو ئاگرە دادەگیرسێت.

## مالك کوڕی نەزر بوو

ناوی نەزر، قەیس و دایکی بەرە کچی موڕ کوڕی ئەدبەنی تابخە بوو. براکانی لەدایك و باوکەوە، نەزیر و مالك و مەلەکان و عامر و حارس و عەمرۆ و سەعد و عەوف و غەنەم و مەخریمە و جەرول و غەزوان و جەدال بوون. زڕبراکەیان عەبد مەنات بوو کەدایکی فوکەیهە و بەوتەیەك فوکهە بوو. ئەو زەفرا کچی هەنی کوڕی بەلی کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەلحاف کوڕی قوزاعە بوو. برای دایکی عەبدمەنات، عەلی کوڕی مەسعود کوڕی مازن کوڕی زەئب کوڕی عودەی کوڕی عەمرۆ کوڕی مازنی غەسانی و عەبدمەنات کوڕی کەنانە، هند کچی بەکر کوڕی وائلی کردە هاوسەر و دوای ئەو، عەلی کوڕی مەسعود براکەی لەدایکیەوە، هندی کردە هاوسەر و سەرپەرەستی منداڵەکانی براکەیشی گرتەئەستۆ و منداڵەکانی عەبدمەناتیان بەبەنی عەلی ناو دەبرد.

## نەزر کوڕی کەنانە بوو

دایکی کەنانە عەوانە کچی سەعد کوڕی قەیس کوڕی عەیلان بوو.

بەوتەیەك دایکی، هند کچی عەمرۆ کوڕی قەیس بوو و براکانی لەباوکەوە، ئەسەد و ئەسدە بوون.

## کەنانە کوڕی خەزیمە بوو

دایکی خەزیمە سەلما کچی ئەسلەم کوڕی ئەلحاق کوڕی قوزاعە بوو و براکەی، هوزەیل. براکەیان لەدایکەوە تەغلەب کوڕی حیلوان کوڕی عیمران کوڕی ئەلحاف کوڕی قوزاعە بوو.

بەوتەیەك دایکی خەزیمە و هوزەیل، سەلما کچی ئەسەد کوڕی رەبیعە بوو.

## خەزیمە کوڕی مەدرەکە بوو

ناوی مەدرەکە عەمرۆ بوو و دایکی خێندەف و ناوی لەیلی کچی حیلوان کوڕی عیمران کوڕی ئەلحاف کوڕی قوزاعە بوو. دایکی لەیلی زەرییە کچی رەبیعە کوڕی نزار بوو. دەڵێن: قورقی زەرییە ناوەکەی سەرچاوەکەی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

براکانی مەدرەکە: عامر کەپێیان دەوت تابیخە، عومەیر کەبەقەمعە ناویان دەبرد.

دەڵێن: عومەیر باوکی خوزاعەیە.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: دایکی کوڕەکانی ئەلیاس، خێندەف بوو، ئەو ژنێکی یەمەنی کەکوڕەکانی نەژادیان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە و پێیان دەڵێن مناڵەکانی خێندەف.

دەڵێن: دوو برا سەرقاڵی لەوەڕاندنی وشترەکان بوون و راو و خوراردنیان لێ دروست دەکرد. کەسێك دەستدرێژی کردە سەر وشترەکان و عامر بەعەمرۆی وت: تۆ بۆ پشتیوانی کردن لەوشترەکان دەڕۆیت یا سەرقاڵی ئامادە کردنی خواردن لەگۆشتی نێچیرەکە دەبیت؟

عەمرۆ وتی: خواردن لەنێچیرەکە ئامادە دەکەم.

عامر بۆ پشتیوانی کردن لەوشترەکان ڕۆشت و ئەوانی گەڕاندەوە. کاتێك ڕۆشتنە لای باوکیان و بەسەرهاتەکەیان گێڕایەوە، بەعامری وت: تۆ مەدرەکەیت کەوشترەکانت دۆزییەوە. بەعەمرۆی وت: تۆ تابخەیت کەخواردنت لەنێچیرەکە ئامادە کرد.

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: ئەلیاس بۆ نان خواردن ڕۆشتبوو و وشترەکانی لەرێوییەك ڕەمیان کرد. عەمرۆ ڕۆشت و وشترەکانی گەڕاندەوە و بەمەدرەکە ناوی دەرکرد و عامر رێوییەکی گرت و برژادنی و بەتابخە ناویان برد.

## مەدرەکە کوڕی ئەلیاس بوو

دایکی رەباب کچی حیدە کوڕی مەعد بوو.

برایەکی بوو بەناوی ئەلناس. ئەلیاسیان بەعەیلان ناو دەبرد لەبەر ئەوەی بۆ دەستبلاۆی سەرکۆنەیان دەکرد و دەیانوت: ئەی عەیلان، یانی خێزاندار، لەگرفتاری خێزانەکەت، گرفتار دەبیت. بەوتەیەك بۆیە بەعەیلان ناویان برد لەبەر ئەوەی کۆیلەی موزەر سەرپەرەستی دەکرد کەناوی عەیلان بوو.

## ئەلیاس کوڕی موزەر بوو

دایکی موزەر سودە کچی عەك بوو

براکەی ئەیادە.

دوو برای لەباوکەوە هەبوو بەناوەکانی رەبیعە و ئەنمار. دایکیان جەداله کچی وەعلان کوڕی جوشەم کوڕی جەلهەمە کوڕی عەمرۆ لەهۆزی جورهەم.

دەستەیەك وتوویانە: كاتێك نزار كوڕی مەعد لەمردن نزیك كەوتەوە، وەسییەتی بۆ كوڕەكانی نووسی و سامانەكەی لەناو ئەواندا دابەش كرد. وتی: كوڕەكانم، ئەم خێوەتە كە لەچەرمی سوورە و هەموو شتەكانی ناوی بۆ موزەر و موزەریان بەحەمراء ناوبرد. و ئەم خێوەتە ڕەشە و هەموو شتەكانی ناوی بۆ رەبیعە.

دواتر دەستی ئەنماری گرت و وتی: ئەم كیسەیە و ئەم راخەڕە و هەر شتێك لەسامانەكەی من هاوشێوەی ئەوان بێت، بۆ تۆ و ئەگەر لەدابەش كردن كێشەتان بۆ دروست بوو، بڕۆنە لای ئەفعی كوڕی ئەفعی جورهەمی – ئەفعی پاشای نەجران بوو– تا لەنێوان ئێوەدا دابەشی بكات و بەكارەكەی رازی بن.

نزار دوای ماوەیەك مرد و كاتێك كوڕەكانی لەسەر دابەش كردنی میراتی باوكیان گرفتاری كێشە بوون، سوار وشترەكانی خۆیان بوون و بۆ لای ئەفعی بەرێكەوتن. هێشتا شەو و رۆژێك لەنشینگەی ئەفعی و سەرزەمینی نەجران دوور و لەبیابانێكدا بوون كەشوێن پێی وشترێكیان بینی.

ئەیاد وتی: ئەم وشترە كەشوێن پێكانی دەبینن، یەك چاوی بووە.

ئەنمار وتی: كلكی كورت بووە.

رەبیعە وتی: گێڕ بووە.

موزەر وتی: ڕەمی كردووە.

زۆری نەخایاند. وشترسوارێك بەخێرایی لەوان نزیك كەوتەوە. كاتێك بەوان گەیشت وتی: لەم ناوەدا وشترێكی ونبووتان نەبینیووە؟

ئەیاد وتی: وشترەكەی تۆ یەك چاوی بوو؟

وتی: بەڵێ.

ئەنمار وتی: وشترەكەت كلكی كورت بوو؟

وتی: بەڵێ.

رەبیعە وتی: وشترەكەت گێڕ بوو؟

وتی: بەڵێ.

موزەر وتی: وشترەكەت ڕەمی كردبوو؟

وتی: بەڵێ.

دواتر پێی وتن: وشترەكەی من لەكوێیە؟ شوێنكەییم نیشان بدەن.

وتیان: سوێند بەخوا نەمانبینیوە و نازانین.

وتی: ئێوە وشترەکەی منتان گرتووە چوونکە بێ هەڵە ئاماژەتان بەتایبەتمەندییەکانیدا.

وتیان: ئێمە وشترەکەی تۆمان نەبینیووە.

بەدوای ئەوندا بەرێکەوت تا گەیشتنە نەجران. لەدەرباری ئەفعی وەستان و داوای مۆڵەتیان کرد، کاتێك مۆڵەتیان پێدرا، ڕۆشتنە ناو. ئەو پیاوە لەپشت دەرگاکەوە هاواری دەکرد: ئەی پاشا ئەو پیاوانە وشترەکەی منیان گرتووە و سوێند دەخۆن نەیانبینیووە.

ئەفعی پیاوەکەی بانگ کرد و وتی: چی دەڵێیت؟

وتی: ئەی پاشا ئەوانە وشترەکەی منیان بردووە و وشترەکەی من لای ئەوانە.

ئەفعی بەوانی وت: چی دەڵێن؟

وتیان: لەسەفەرەکەمان بۆ لای تۆ، شوێن پێی وشترەکەمان بینی و ئەیاد وتی، یەك چاوی هەیە.

لەئەیادی پرسی: چۆنت زانی یەك چاوی هەیە؟

وتی: بینیم گژ و گیای لەلایەك خواردبوو بەڵام لەلاکەی دیکە گژ و گیا فراوان و دەستی لێنەدرابوو. لەبەر ئەمە وتم یەك چاوی هەیە.

ئەنمار وتی: بینیم کەپشکڵی وشترەکە لەیەك شوێندا ڕژاوە و ئەگەر کلکی درێژ بوایە، پشکڵەکەی بڵاو دەکردەوە. لەبەر ئەمە زانیم کلکی کورت بووە.

ڕەبیعە وتی: بینیم شوێنپێی قاچێکی جێگیر و ئەوەی دیکەیان نارێکە و زانیم کەگێرە.

موزەر وتی: بینیم لەبەشێك لەسەر زەوی لەوەڕاوە و جیاواز لەوە گژ و گیای تازەی بەجێهێشتووە و لەشوێنێکی کەم گژ و گیادا لەوەڕیوە و زانیم ڕەمی کردووە.

ئەفعی وتی: ڕاست دەکەن، شوێنپێی وشترەکەی تۆیان بینیووە، وشترەکەی تۆی لای ئەوان نییە، برۆ بەدوایدا بگەڕێ. دواتر ئەفعی پرسی: ئێوە کێن؟

نەژاد و ڕەچەڵەکی خۆیان باس کرد. بەخێرهاتنی کردن و پرسی: کێشەتان چییە؟

ئەوان بەسەرهاتەکە و وەسییەتەکەی باوکیان بۆ گێڕایەوە.

ئەفعی وتی: بەو هۆش و زیرەکییەی هەتانە، چ پێویستییەکتان بەمن هەیە.

وتیان: باوکمان ئەم فەرمانەی پێداوین.

ئەفعی فەرمانیدا و و خانوویەکیان خستنە بەردەست و بەخزمەتکاریماڵی میوانەکانی وت بەشێوەیەکی چاك ڕێزیان لێبگرێت و تا ئەو جێگەی دەتوانێت، میوانداریان بکات. دواتر یەکێك لەکۆیلە وشیار و ئەدەب فێر بووەکانی خۆی بانگ کرد و وتی: گویێ لەوتەکانیان بگرە و ئاگادارم بکەرەوە.

کاتێك لەماڵی تایبەت بەمیوانەکان دابەزین، میواندارەکەیان هەنگوینی بۆ ئەوان برد. خواردیان ووتیان: هەنگوێنی لەمە بەتامتر و خۆشترمان نەخواردبوو.

ئەیاد وتی: ڕاستتان وت ئەگەر هەنگ، نەیڕژاندابیتە سەر ستەمکارێك. کۆیلە ئەم وتەی بەزەین سپارد.

کاتێك، کاتی خواردن گەیشت، خواردنیان هێنا، مەڕێکیان برژاندبوو، خواردیان و وتیان: برژاوێکی لەمە قەڵەوتر و خۆشترمان نەبینیوە.

ئەنمار وتی: ڕاستە، ئەگەر شیری سەگی نەدەخوارد.

شەرابیان هێناو کاتێك خواردیانەوە، وتیان: شەرابێکی پاك و بەتامە و بۆنخۆشە.

رەبیعە وتی: ڕاستە ئەگەر داری مێوەکەی لەسەر گۆڕێك نەدەڕوا.

دواتر وتیان: کەسمان بەمیواندارتر و خانە ئاوەدانتر لەم پاشایە نەبینیوە.

موزەر وتی: ڕاستە ئەگەر کوڕی باوکی خۆی دەبوو.

کۆیلە ڕۆشتە لای ئەفعی و لەوتەکانی ئەوان ئاگاداری کردەوە. ئەفعی ڕۆشتە لای دایکی خۆی و وتی: سوێندت دەدەم بەخوا پێم بڵێ باوکی من کێیە؟

وتی: ئەم پرسیارە بۆ دەپرسیت، تۆ کوڕی ئەفعی پاشای گەورەییت.

وتی: ڕاست دەکەیت؟

کاتێك پێداگری ئەوی بینی، وتی: کوڕم، باوکت ئەفعی کەڕەچەڵەکت بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، پیرێکی پەککەوتە بوو، دەترسا پاشایەتی لەناو بنەماڵەکەیدا نەمێنێتەوە، شازادەیەکی گەنج هاتە لای ئێمە، من لێی نزیك بوومە بەتۆ دووگیان بووم.

دواتر کەسێکی بۆ لای میواندارەکە نارد و پرسی: ئەو هەنگوینەی دەرخواردی ئەوانتدا، چی بوو و لەکوێوە هێنابووت؟

وتی: پێیان وتین شانەی هەنگێك لەچاڵێکدایە، کەسم نارد تا هەنگوینەکەی بێنێت. پێیان وتم: ئێسقانی ڕزاوی لەناو چاڵەکەدا بووە و هەنگ، هەنگوینی ڕژاندۆتە سەری یەکێك لەمردووەکان، هەنگوینێکیان هێنا کەهاوشێوەیم نەبینیبوو و لەبەر ئەوەی باش بوو، بۆ میوانەکانم دانا.

دواتر بانگی سفرەدارەکەی خۆی کرد و وتی: ئەو مەڕەی بۆ ئەوانت برژاند چی بوو؟

وتی: وەڵامم بۆ شوانەکەمان نارد تا باشترین مەڕم بۆ بنێرێت و ئەویش، ئەم مەڕەی بۆ ناردم. هیچی دیکەم لێ نەپرسی.

ئەفعی کەسی بۆ لای شوانەکە نارد تا بەسەرهاتی مەڕەکەی بۆ باس بکات.

وتی: ئەمە یەکەم بەرخۆلە بوو ئەمساڵ لەمەڕەکان زا. دایکی مرد و بەرخۆلەکە مایەوە. سەگێکم بوو کەئەویش زابوو، بەرخۆلەکە لەگەڵ بێچووە سەگەکان تێکەڵ و شیری سەگی دەخوارد. لەناو ڕانەکە هاوشێوەی ئەو نەدەبینرا، بۆیە ئەوم نارد.

کەسی بۆ لای شەرابدارەکەی نارد و پرسی: ئەو شەرابەی دەرخواردی ئەوانت دا، چی بوو؟

وتی: لەدەنکی ترێیئەو دارمێوەی لەسەر گۆڕی باوکت ناشتوومە و لەناو عەرەبەکان شەرابێکی هاوشێوەی ئەمە نابینرێت.

ئەفعی وتی: ئەمانە چ جۆرە خەڵکانێکن. ئەوان، شەیتانن.

ئەوانی بانگ کرد و وتی: کێشەی ئێوە چییە؟ بەسەرهاتی خۆتان باس بکەن.

ئەیاد وتی: باوکم کەنیزێکی سپی و ڕەش مووی لەگەڵ هەموو شتەکانی لەسامانەکەی خۆی بەڕەنگی ئەوان بەمن بەخشییوە.

وتی: باوکت مەڕ و ماڵاتی دوو ڕەنگی بەجێهێشتووە کە لەگەڵ شوان و خزمەتکارەکەیان بەتۆ دەبڕێت.

ئەنمار وتی: باوکم کیسەیەك و فەڕش و هەموو شتەکانی هاوشێوەی لەسامانەکەی خۆی بەمن بەخشییوە.

وتی: هەرچی زیو و کشت و زەوی بەجێماوە، بۆ تۆیە.

ڕەیعە وتی: باوکم ئەسپ و خێوەتێکی ڕەش و هەموو شتەکانی هاوشێوەی ئەمانەی بەمن بەخشیوە.

وتی: باوکت ئەسپی ڕەش و سیلاحی بەجێهێشتووە کەهەموویان و ئەو کۆیلانەی بەکاری دەبەن، تایبەتە بەتۆ. ئەویان بەرەبیعە ئەلفەرس ناو دەبرد.

موزەر وتی: باوکم خێوتێکی سووری چەرمین و هەموو شتەکانی هاوشێوەی سامانەکەی خۆی بەمن بەخشیوە.

وتی: باوکت چەندین وشتری سوور مووی بەجێهێشتووە کە لەگەڵ هەموو

سامانەکەی بەو ڕەنگە تایبەتە بەتۆ. وشتری سوور و خێوەت و زێڕەکان بەموزەر بڕا و بەموزەر ئەلحەمراء ناوی دەرکرد.

## موزەر کوڕی نزار بوو

دەڵێن: نازناوەکەی باوکی ئەیاد بوو.

بەوتەیەك نازناوەکەی باوکی ڕەبیعە بوو.

دایکی مەعاند کچی جوشەم کوڕی جەلهەمە کوڕی عەمرۆ بوو.

براکانی ئەو، قنس و قەناسە و سام و حیدان و حیدزە و جونەید و جونادە و فەحم و عوبەیدئەلرەماح و عورف و عەوف و شەك و قوزاعە بوون. مەعد نازناوەکەی قوزاعە بوو.

## نەزار کوڕی مەعد بوو

دایکی مەعد بەوتەی هوشام مەعدد کچی لەهم کوڕی جەلحەب کوڕی جەدیس و بەوتەیەك، کوڕی تەسم کوڕی یەقشان کوڕی ئیبراهیمی خەلیل بوو.

براکانی: یەکیان دیت کە بەوتەیەك هەمان عەکە و بەوتەیەك عەك، کوڕی دیسە و ئەوی دیکەیان عەدەن کە بەوتەیەك عەدەن لەو لەدایك بوو و خەڵکانی ئەویَ لەمناڵەکانی ئەو بوون و ئەبێن و ئەد و ئەبی و زوحاك و عی.

دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسان وتوویانە عەك لەبراکەی مەعد جیابوویەوە و بەرەو سەمرانی یەمەن بەرێکەوت. کاتێك دانیشتووانی حوزور، شوعەیب کوڕی زی مەهدمی حوزوریان کوشت، خواوەند بەبەڵای بەخت نەسر گرفتاری کردن و ئەرمیا و بەرخیا دەرکەوتن و مەعدیان لەگەڵ خۆیان برد و کاتێك ئاگری شەڕ دامرکایەوە، ئەویان بۆ مەککە گەڕاندەوە و براکان و عەمان و مەعد لەمناڵەکانی عەدنان، پەیوەستی هۆزەکانی یەمەن ببوون و لەویَ هاوسەریان گرتبوو و خەڵکانی یەمەن بەباشترین شێوە مامڵەیان لەگەڵ کردبوون لەبەر ئەوەی دایکی هەردووکیان لەجورهەمییەکان بوو.

## مەعد کوڕی عەدنان بوو

عەدنان لەباوکەوە دوو برای بوو: نەبتا و عەمرۆ.

ڕەچەڵەکی پێغەمبەر(د.خ) تا مەعد بەو شێوەی باسمان کرد، جیاوازی و ناکۆکی لەسەر نییە.

لەباوکی ئەلئەسوەد دەگێڕنەوە: ڕەچەڵەکی پێغەمبەر(د.خ) بەمشێوەیە:

محەممەد کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم کوڕی عەبدمەناف کوڕی قوسەی کوڕی کەلاب کوڕی مورە کوڕی کەعب کوڕی لوئەی کوڕی غالب کوڕی فیهر کوڕی مالك کوڕی نەزر کوڕی کەنانە کوڕی خەزیمە کوڕی مەدرەکە کوڕی ئەلیاس کوڕی موزەر کوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان کوڕی ئەدد.

سەبارەت بەدرێژەی ڕەچەڵەکی ئەو جیاوازی لەئارادایە.

لەدایکی سەلمە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە کەدەڵێت: لە پێغەمبەرم(د.خ) بیست، دەیفەرموو: عەدنان کوڕی ئەدد کوڕی زەند کوڕی یەری کوڕی ئەعراق ئەلسەری بوو.

دایکی سەلمە دەڵێت: زەند هەمان هەمیسع و یەری هەمان نەبتە، ئەعراق ئەلسەری، ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بەگومانی دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسان، عەدنان کوڕی ئەدد کوڕی مەقوم کوڕی ناحور کوڕی تیرەح کوڕی یەعرەب کوڕی یەشجب کوڕی نابت کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە.

دەستەیەك وتوویانە: عەدنان کوڕی ئەدد کوڕی ئەیتحب کوڕی ئەییووب کوڕی قیزەر کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە.

دەڵێت: قوسەی کوڕی کەلاب لەهۆنراوەیەك نەژادی خۆی بۆ قیزەر دەگەڕێنێتەوە، و بەوتەی ڕەچەڵەك ناسان عەدنان کوڕی میدەع کوڕی مونیع کوڕی ئەدد کوڕی کەعب کوڕی یەشجب کوڕی یەعرەب کوڕی هەمیسع کوڕی قیزەر کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە.

لە محەممەد کوڕی سائیبی کەلبی دەگێڕنەوە: مەعد کوڕی عەدنان کوڕی ئەدد کوڕی هەمیسع کوڕی سەلامان کوڕی عەوس کوڕی یوز کوڕی قەموال کوڕی ئەبی کوڕی عەوام کوڕی ناشد کوڕی حەزا کوڕی بەلداس کوڕی یەلداف کوڕی تابخ کوڕی جاحم کوڕی تاحش کوڕی ماخی کوڕی عەیفی کوڕی عەبقەر کوڕی عوبەید کوڕی دۆعا کوڕی حەمدان کوڕی سەنبەر کوڕی یەسربی کوڕی یەحزن کوڕی یەلحن کوڕی ئەرعەوی کوڕی عەیفی کوڕی دیشان کوڕی عەیسەر کوڕی ئیقناد کوڕی ئیهام کوڕی موقەسیر کوڕی ناحس کوڕی زارح کوڕی شەمی کوڕی موزی کوڕی عەوس کوڕی عەرام کوڕی قیزەر کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە.

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: یەکێك لەخەڵکانی تەدمور بەناوی باوکی یەعقووب لەموسوڵمانەکانی منداڵەکانی ئیسرائیل، کتێبەکەی ئەوانی خوێندبوویەوە و زانستی لای خۆی کۆکردەوە، دەیوت: بروخ کوڕی ناریا، دەبیری ئەرمیا، ڕەچەڵەکی مەعد کوڕی عەدنانی تۆمار کردبوو و لەکتێبەکەی خۆی ئاماژەی پێداوە. ئەم بابەتە لای زاناکانی شوێنکەوتەی کتێب بەناوبانگ و لەکتێبەکەی ئەوان ئاشکرایە و هاوشێوەی ئەو ناوانەیە باسمان کرد و ئەگەر جیاوازییەك بەرچاو دەکەوێت بەهۆی زمانەکەوەیە چوونکە ئەم ناوانەیان لەعیبرانییەوە وەرگرتووە.

لەزوبەیر کوڕی بوکار ڕەچەڵەك ناسی بەناوبانگ دەگێڕنەوە: مەعد کوڕی عەدنان کوڕی ئەدبن کوڕی هەمیسع کوڕی ئەسحەب کوڕی تەبت کوڕی قیدار کوڕی ئیسماعیل بوو.

بەوتەی دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسەکان، مەعد کوڕی عەدنان کوڕی ئەدد کوڕی ئەمین کوڕی شاحب کوڕی سەعلەبە کوڕی عەتر کوڕی نەلانح کوڕی موحەلیم کوڕی عەوام کوڕی موحتەمیل کوڕی رائیمە کوڕی عیقان کوڕی عیلەت کوڕی شەحدوود کوڕی زەریب کوڕی عەبقەر کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل کوڕی یەزن کوڕی ئەعوەج کوڕی موتعیم کوڕی تەمەح کوڕی قسور کوڕی عبوود کوڕی دەعدەع کوڕی مەحمود کوڕی زائد کوڕی نەدوان کوڕی ئەئامە کوڕی دوس کوڕی حوسن کوڕی نەزال کوڕی قومەیر کوڕی موجەشەر کوڕی مەعدمەر کوڕی سەیفی کوڕی نەبت کوڕی قیدار کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: مەعد کوڕی عەدنان کوڕی ئەد کوڕی هەمیسع کوڕی نەبت کوڕی سەلمانە و سەلمان لەسەلامان کوڕی حەمل کوڕی نەبت کوڕی قیزەر کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم لەدایك بووە.

بەوتەیەکی دیکە: مەعد کوڕی عەدنان کوڕی ئەدد کوڕی مەقوم کوڕی ناحور کوڕی موشریح کوڕی یەشجب کوڕی مەلەك کوڕی ئەیمەن کوڕی نەبیت کوڕی قیزەر کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم بوو.

بەوتەیەکی دیکە: مەعد کوڕی عەدنان کوڕی ئەد کوڕی ئەدد کوڕی هەمیسع کوڕی ئەسحەب کوڕی سەعد کوڕی نەرنح کوڕی نەزیر کوڕی جەمیل کوڕی مونجیم کوڕی لافس کوڕی سابوح کوڕی کەنانە کوڕی عەوام کوڕی نەبت کوڕی قیزەر کوڕی ئیسماعیل بوو.

دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسانی یەمەنی وتوویانە: دەستەیەك لەزاناكانی عەرەب، چل پشتی مەعد تا ئیسماعیلیان بەعەرەبی دەستیێشان كردووە، و بۆ وتارەكەی خۆیان بەڵگە لەهۆنراوە عەرەبییەكان دەهێننەوە و لەگەڵ وتەكانی شوێنكەوتەی كتێب، بەراوەردیان كردووە كە لەژمارەدا چوون یەكە و ناوە جیاوازەكانمان لەرووی نووسینی وشەكانەوە بەمشێوەیە نووسی:

مەعد كوڕی عەدنان كوڕی ئەدد كوڕی هەمیسع سەلمانی ئەمین كوڕی هەمیتع، هەمیدع شاجب كوڕی سەلامان، مونەجەر نەبیت كوڕی شوحا سەعد رەجەب كوڕی نەعمانا، قەموال، بەریح ناسب كوڕی كەسدانا، موحەلیم، زولعەین كوڕی حەرانا، عەوام كوڕی بەلداسا، موحتەمیل كوڕی بەلدانا، یەدلاف، راسیمە كوڕی تەهبا، تاهب، عیقان كوڕی جوهەمی، جاحم، عیلەت كوڕی مەحشی، تاحش، شەحدوود كوڕی میعجالی، ماخی، زەریب، خاتەم ئەلتار كوڕی عەقارا، عاق عەبقەر باوكی ئەلجەن كوڕی عاقاری، ئیبراهیم، جامیع ئەلشمول كوڕی بەیداعی، دۆعا ئیسماعیل زو ئەلمەتابخ كوڕی ئیبداعی، عوبەید یەزن، تەعان كوڕی هوماری، حەمدان، ئیسماعیل، زولئەعوەج كوڕی بەشمانی، دەشین، موتعیم كوڕی یەسرانی، بەسرەم، تەمەح كوڕی بوحرانی بەحزن قەسوور، كوڕی مەلحانی، یەلحەن، عبوود كوڕی رەعوانی، رەعوی، دەعدەع كوڕی عاقاری، عاقر كوڕی داسان، زائید، عاسار، عاسر، نیدوان كوڕی قەنادی، قەنار، ئەنامە كوڕی سامار، بەهامی كوڕی دوس ئەلعەتق كوڕی موقەسیر، موقاسری، حوسن، ناحس، نەزال كوڕی زارح قومەیر كوڕی سومی، سەما موجەشیر كوڕی مەزرا كوڕی سەنفا، سومەر، سەڤ كوڕی جەعسەم، عەرام كەهەمان نەبیت و قیزەرە.

دەڵێت: مانای قیزەر پاشایە و ئەو یەكەم پاشا لەمناڵەكانی ئیسماعیل كوڕی ئیسماعیل بەڵێن راست (صادق الوعد) كوڕی ئیبراهیمی خەلیل كوڕی تارخ، ئەزر كوڕی ناحور كوڕی ساروع كوڕی ئەرغوا كوڕی باڵغە و باڵغ لەزمانی سریانیدا بەمانای دابەشكەر دێت چوونكە ئەو زەوی لەنێوان مناڵەكانی ئادەمدا دابەش كرد، باڵغ كوڕی فالج كوڕی عابر كوڕی شاڵخ كوڕی ئەرفەخشیز كوڕی سام كوڕی نوح كوڕی لەمەك كوڕی متوەشلەخ كوڕی ئەخنوخ، ئیدریس كوڕی یەرد كوڕی مەهلائیل كوڕی قینان كوڕی ئەنوش كوڕی شیس كوڕی ئادەمە.

پێشتر ئاماژەماندا بەرووداو و بەسەرهاتەكانی ئیسماعیل كوڕی ئیبراهیم و باوكان و

دایکانی ئەو تا ئادەم، چیتر دووبارە کردنەوەیان کارێکی پەسەند نییە.

## هەنووکە دەگەڕێینەوە بۆ سەر باس کردنی ژیاننامەی پێغەمبەر( د.خ )

عەبدولموتەلیب هەشت ساڵ دوای ساڵی فیل، ماڵئاوایی لەجیهان کرد و سەبارەت بەپێغەمبەر وەسیەتی لای ئەبو تالیب کرد لەبەر ئەوەی ئەبوتالب و عەبدوللەی باوکی پێغەمبەر(د.خ) لەیەك دایك بوون. دوای عەبدولموتەلیب، ئەبو تالیب سەرپەرەستی کردنی پێغەمبەری(د.خ) لەئەستۆ گرت.

ئەبو تالیب لەگەڵ کاروانی قورەیش بۆ بازرگانی کردن رووی دەکردە شام. کاتێك بۆ ڕۆشتن خۆی ئامادە کرد، پێغەمبەر(د.خ) بەتامەزرۆییەوە داوای لێکرد بیبات، ئەبو تالیب بەزەیی پیایدا هاتەوە و وتی: سوێند بەخوا لەگەڵ خۆم دەیبەم و بۆ یەك ساتیش لێی جیا نابمەوە. ئەوی لەگەڵ خۆیدا برد تا ئەوەی کاروان گەیشتە بەسرای شام. راهیبێك بەناوی بوحەیرا لەخانەقایەك دەژیا، پیاوێکی زانا و مەسیحی بوو. بەردەوام لەخانەقاکەدا ڕاهیبێك دەژیا و هەموویان زانستی خۆیان لەکتێبێکەوە بەمیرات دەبرد.

کاتێك ئەو ساڵە کاروانەکە لەنزیك خانەقای بوحەیرا دابەزی، خواردنێکی زۆری بۆ ئەوان دروست کرد لەبەر ئەوەی لەخانەقاکەی خۆی بینی کەهەورێك سێبەری بۆ پێغەمبەر(د.خ) دروست کردووە، کاتێك ئەمەی بینی، لەخانەقاکەی هاتەدەر و هەموو کاروانییەکانی میوان کرد، کاتێك پێغەمبەری(د.خ) بینی، لێی راما و لە جەستەی وردبوویەوە چوونکە تایبەتمەندییەکانی لەکتێبەکەی خۆیدا بینیبوو، کاتێك کاروانییەکان لەخواردن تەواو بوون و بڵاوەیان لێکرد، بوحەیرا لە پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەخەو وبێداری پرسیاری کرد و پێغەمبەر(د.خ) وەڵامی دایەوە. هەموو وەڵامەکان لەگەڵ زانیارییەکانی ناو کتێبەکە یەکیان دەگرتەوە. دواتر سەیری پشتی پێغەمبەری(د.خ) کردو نیشانەی کۆتایی پێغەمبەرانی لەنێوان دوو بازووی ئەودا بینی.

دوای ئەوە بوحەیرا بەئەبو تالبی وت: ئەم کوڕە چی تۆیە؟

وتی: کوڕی منە.

بوحەیرا وتی: کوڕی تۆ نییە، باوکی ئەم کوڕە زیندوو نییە.

ئەبو تالیب وتی: برازامە.

بوحەیرا وتی: باوکی چی بەسەر هات؟

ئەبو تالیب وتی: کاتێك ئەم کوڕە لەسکی دایکیدا بوو، مرد.

بوحەیرا وتی: راستت وت، ئەو بۆ دیاری خۆت بگەڕێنەوە و لەجوولەکەکان بۆ سەر گیانی ئەو بترسە چوونکە سوێند بەخواوەند ئەگەر ببیینن و ئەوەی من زانیم، بیزانن، زیانی پێدەگەیێنن. ئەم کوڕە چارەنووسێکی گەورەی هەیە، لەزووترین کات بیگەڕێنەرەوە بۆ مەککە. ئەبوتالیب بەخێرایی ئەوی بۆ مەککە گەڕاندەوە.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك ئەبوتالیب پێغەمبەری(د.خ) بۆ بەسرای شام برد، تەمەنی حەوت ساڵ بوو.

لەباوکی موسا دەگێڕنەوە: ئەبو تالیب مەبەستی ڕۆشتن بۆ شامی کرد. پێغەمبەر(د.خ) و دەستەیەك لەگەورەکانی عەرەب لەم سەفەرەدا هاوڕێیەتیان دەکرد، کاتێك لەراهیبەکە نزیك کەوتنەوە، دابەزین و باریان خست. راهیب هاتە لای ئەوان، پێشتر کاتێك لای خانەقاکە تێدەپەڕین، راهیبەکە، گرنگی پێنەدەدان.

دەڵێت: لەوکاتەی بارەکانیان دادەگرت، راهیبەکە بەناویاندا سووڕایەوە تا هات و دەستی پێغەمبەری(د.خ) گرت، وتی: ئەمە سەروەری جیهانییانە، ئەمە نێردراوی پەروەردگاری جیهانییانە، ئەم کەسە، خواوەند وەك رەحمەتێك بۆ جیهانیان، وەك پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانەی دەکات.

گەورەکانی قوڕەیش وتیان: تۆ چی دەزانیت؟

راهیب وتی: کاتێك ئێوە لەگەردەنەکەوە دەرکەوتن، هیچ دار و بەردێك نەما سوجدە نەبات. دار و بەردەکان تەنیا بۆ پێغەمبەرەکان سوجدە دەبەن، من خاتەمی پێغەمبەرایەتی لەژێر شانەکانی ئەو دەناسمەوە کەهاوشێوەی سێوە.

دوای ئەوە راهیب گەڕایەوە و خواردنی بۆ ئامادە کردن، کاتێك خواردنەکەیان هێنا، پێغەمبەر(د.خ) بۆ لەوەڕاندنی وشترەکان دوور کەوتبوویەوە، وتی: کەسێك بنێرن تا بێت.

پێغەمبەر(د.خ) هات و هەورێك لەسەر سەری بوو.

راهیب وتی: سەیرکەن، هەورەکە سێبەری بۆ کردووە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخەڵکەکە نزیك کەوتەوە، ئەوان لەژێر سێبەری دارەکەدا بوون، کاتێك دانیشت، سێبەری دارەکە بۆ سەر سەری پێغەمبەر(د.خ) سووڕا. راهیب

وتی: سەیرکەن، دارەکە، سێبەر بۆ پێغەمبەر(د.خ) دروست دەکات.

لەو کاتەدا راهیب وەستا بوو. سوێندی دەدان تا پێغەمبەر(د.خ) بۆ ناو رۆمییەکان نەبن چوونکە ئەگەر ببینن و نیشانەی پێغەمبەری(د.خ) ئەو بناسنەوە، دەیکوژن. حەوت کەس لەرۆمییەکان هاتن. راهیب لێیان نزیك کەوتەوە و وتی: بۆ چ کارێك هاتوون؟

وتیان: لەم مانگەدا پێغەمبەر(د.خ) دەرکەوتووە و نێردراوانیان بۆ هەموو رێگاکان رەوانە کردووە، ئێمەیشیان بۆ ئەم رێگەیە ناردووە.

راهیب وتی: ئایا کەس لەدوای ئێوە دێت؟

وتیان: نا، تەنیا ئێمەیان بۆ ئەم رێگەیە ناردووە.

وتی: بەگومانی ئێوە ئەگەر خواوەند مەبەستی ئەنجامدانی کارێك بکات، دەتوانن رێگەی لێبگرن؟

وتیان: نە، رۆشتنە لای ئەو و لەگەڵیدا مانەوە.

دەڵێت: راهیب گەڕایەوە بۆ لای کاروانییەکان و وتی: سوێند بەخوا سەرپەرەستی ئەم کوڕە کێیە؟

وتیان: ئەبو تالیب.

دەڵێت: راهیب بەردەوام سوێندی ئەبو تالیبی دەدا تا بیگەڕێنێتەوە. ئەبوتالیب ئەوی گەڕاندەوە و ئەبوبەکری لەگەڵ ئەودا ناردەوە و قولیچە و زەیتوونی کردە توێشووی رێگەیان.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: لە پێغەمبەرم(د.خ) بیست کەفەرمووی: هەرگیز مەبەستی ئەنجامدانی کارەکانی سەردەمی جاهلییەتم نەکرد جگە لەدوو جار کەخواوەند رێگەی ئەو کارەی لێگرتم. دوای ئەوە چیتر مەبەستی ئەنجامدانی کاری خراپەم نەکرد تا ئەوەی خواوەند وەك پێغەمبەر(د.خ) هەڵیبژاردم، شەوێك بەهاورێکەم وت کە لەسەرەوەی مەککە شوانیمان دەکرد: ئاگات لەمەڕەکانی من بێت تا بڕۆمە مەککە و بسوڕێمەوە هاوشێوەی هەموو گەنجەکانی دیکە.

وتی: باشە بڕۆ.

فەرمووی: هاتم و مەبەستی گەڕانم بەکۆڵانەکاندا کرد، کاتێك گەیشتمە یەکەم ماڵی مەککە، دەنگی تەپڵ و دەهۆڵم بیست.

وتم: چی روویداوە؟

وتیان: فلاَن کەس کوڕی فلاَنی، فلاَن کچی کردۆتە هاوسەر.

فەرمووی: دانیشتم و سەیری ئەوانم دەکرد، خواوەند منی خەواند و لەگەرمای هەتاو بەئاگا هاتمەوە و بۆ لای هاوڕێکەم گەڕامەوە.

هاوڕێکەم پرسی: چیت کرد؟

وتم: هیچم نەکرد و بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕایەوە.

فەرمووی: جارێکی دیکە ئەو داوایەم لەهاوڕێکەم کرد و وتی: بڕۆ.

ڕۆشتم و کاتێك گەیشتمە مەککە، دەنگی تەپڵ و دەهۆڵم بیست. دانیشتم و سەیرم کرد، دووبارە خواوەند منی خەواند و لەگەرمای هەتاو بەئاگا هاتمەوە. بۆ لای هاوڕێکەم گەڕامەوە و بەسەرهاتەکەم بۆ باس کرد. دوای ئەوە مەبەستی ئەنجامدانی کاری خراپەم نەکرد تا ئەوەی خواوەند بەهەڵبژاردنی من بۆ پێغەمبەرایەتی، ڕێزی لێگرتم.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەهاوسەری گیری پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ خەدیجە

هوشام دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) خەدیجەی کردە هاوسەر، تەمەنی بیست و پێنج ساڵ و خەدیجە چل ساڵ بوو.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: خەدیجە کچی خوەیلد کوڕی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی قوسەی، ژنێکی بازرگان بوو. سامانێکی زۆری لەبەردەستدا بوو و پیاوانی بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی بەکرێ دەگرت و بەشێك لەسوودی خۆی بەوان دەدا چوونکە خەڵکانی قوڕەیش بازرگان بوون.

کاتێك خەدیجە ڕاستگۆیی و ئەمانەتداری و چاکەخوازی پێغەمبەری(د.خ) بیست، کەسی بەدوایدا نارد تا لەگەڵ کۆیلەکەی مەیسەرە، بەمەبەستی بازرگانی ڕوو بکاتە شام و بەشێکی زیاتر لەکەسانی دیکە وەربگرێت.

پێغەمبەر(د.خ) ڕازی بوو و بەسامانی خەدیجە، مەبەستی ڕۆشتن بۆ شامی کرد. مەیسەرە لەگەڵیدا بوو. کاتێك گەیشتنە شام، پێغەمبەر(د.خ) لەژێر سێبەری دارێك لەنزیك خانەقای یەکێك لەراهیبەکان دابەزی. ڕاهیبەکە هاتەدەر و لەمەیسەرەی پرسی: ئەم پیاوەی لەژێر ئەو دارەدا دانیشتووە، کێیە؟

مەیسەرە وتی: یەکێکە لەخەڵکانی قوڕەیش و دانیشتووانی حەرەم.

راهیب وتی: سوێند بەخوا ئەو کەسەی لەژێر ئەم دارەدا دانیشتووە، پێغەمبەر(د.خ).

پێغەمبەر کاڵاکانی خۆی فرۆشت و ئەوەی دەیویست، کڕی و بۆ مەککە گەڕایەوە. وەك دەڵێن مەیسەرە دەیبینی، لەگەرمای ڕۆژ، دوو فریشتە سێبەریان بۆ دروست دەکرد.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە مەککە و سامانی خەدیجەی تەسلیم کردەوە، دوو بەرابەر یا زیاتر قازانجی کردبوو. مەیسەرە خەدیجەی لەوتەکانی راهیب و بینینی فریشتەکانی بۆ باس کرد.

خەدیجە ژنێکی بیرمەند و دوورئەندێش بوو. خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد ڕێزی پێببەخشێت. کاتێك مەیسەرە بەسەرهاتەکانی بۆ گێڕایەوە، کەسی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و پەیامیدا: ئەی کوڕی مام، من بەهۆی پەیوەندی خزمایەتی و شەرەف و ئەمانەت و چاکەخوازی و راستگۆیی، ئارەزوومەندی تۆم. لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە.

لەو کاتەدا خەدیجە لەروانگەی سامان و شەرەف و گەورەیی، لەپێشتر لەهەموو ژنانی قوڕەیش بوو و خەڵکانێکی زۆر تامەزرۆ بوون ببنە هاوسەری. کاتێك پەیامەکەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نارد، مامەکانی خۆی لێ ئاگادار کردنەوە و حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب لەگەڵ ئەو ڕۆشتە لای خوەیلد کوڕی ئەسەد و خوازبێنی خەدیجەی کرد. خەدیجە بوو بەهاوسەری پێغەمبەر(د.خ).

جگە لەئیبراهیم، منداڵەکانی دیکەی پێغەمبەر(د.خ)، زێنەب، روقییە، دایکی کولسوم، فاتیمە، قاسم و تەییب و تاهیر لەخەدیجە بوون. پێغەمبەر(د.خ) نازناوی قاسمی وەرگرت و بەباوکی قاسم بانگیان دەکرد. هەموو کوڕەکانی پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژگاری جاهلیدا مردن و کچەکانی دەورانی ئیسلامیان بینی و موسوڵمان بوون و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کۆچیان کرد.

لەکوڕی شەهابی زوهری دەگێڕنەوە: خەدیجە، پێغەمبەری(د.خ) لەگەڵ یەکێکی دیکە لەقوڕەیشییەکان بۆ بازرگانی کردن لەبازاری حەبەشە و تەهامە، بەکرێ گرتبوو. خوەیلد ئەوی کردە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ). ئەو کەسەی لەنێوان ئەواندا هاتوچۆی دەکرد، کەنیزێك لەموالیدەکانی مەککە بوو.

واقدی دەڵێت: ئەمانە ناڕاستە.

دەڵێت: خەدیجە کەسی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و پێشنیاری هاوسەرگیری پێدا. ئەو، ژنێکی شەریف بوو و هەموو قورەیشییەکان ئارەزوویان دەکرد ببنە هاوسەری و ئەگەر هیوایان شك ببردایە، سامانێکی زۆریان بۆ بەدەست هێنانی خەدیجە خەرج دەکرد. خەدیجە باوکی خۆی میوان کرد و شەرابێکی زۆری دەرخواردداتا سەرخۆش بوو، مانگایەکی سەر بڕی. بۆنی زەعفەرانی لەباوکی دا و حیلەیەکی لەبەر کرد. کەسی بەدوای پێغەمبەر(د.خ) و مامەکانی ئەو نارد کەهاتن. خوەیلد، خەدیجەی کردە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ). کاتێك مەستی بەریدا: وتی: ئەم بۆن و حیلەیە چییە؟

خەدیجە وتی: منت کردە هاوسەری محەممەد کوڕی عەبدواللە.

خوەیلد وتی: ئەو کارەم نەکردووە، ئەو کارە ناکەم، گەورەکانی قورەیش خوازبێنی تۆیان کرد بەڵام ڕازی نەبووم.

واقدی دەڵێت: ئەمەیش هەڵەیە، لای ئێمە گێڕانەوەی کوڕی عەباس ڕاستە کەدەڵێت: عەمرۆ کوڕی ئەسەد مامی خەدیجە، ئەوی کردە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) چوونکە باوکی پێش شەڕی فەجار مردبوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ماڵی خەدیجە ئەوەیە ئەمڕۆ بەماڵەکەی خەدیجە بەناوبانگە. معاویە ماڵەکەی کڕی و مزگەوتێکی لێدروست کرد تا خەڵکان نوێژی تیا بخوێنن، بینایەکی تیادروست کرد کەهێشتا وەك خۆی ماوەتەوە و گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، ئەو بەردەی لەبەردەرگای ماڵەکە لای چەپ جێگیرە، بەردێکە پێغەمبەر(د.خ) لەژێریدا پەنای دەگرت تا لەو بەردانەی لەماڵی ئەبو لەهەب و ماڵی عودەی کوڕی حەمرای سەقەفی دەهاوێژران، پارێزراو بێت. بەردەکە یەك زەراع و یەك وەجەب لەیەك زەراعدایە.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بە پێغەمبەر(د.خ) تا سەردەمی هەڵبژاردنی بۆ پێغەمبەرایەتی

ئەبوجەعفەر دەڵێت: باسی هۆکارەکانی هاوسەرگیری پێغەمبەر(د.خ) و خەدیجە و جیاوازی گێڕانەوەکانمان کرد. دە ساڵ پێش هاوسەرگیری ئەوان، قورەیشییەکان کەعبەیان وێران کرد و سەرلەنوێ، دروستیان کردەوە و بەوتەی کوڕی ئیسحاق، ئەم رووداوە لەساڵی سێ و پێنجی تەمەنی پێغەمبەر(د.خ) روویدا.

وێران کردنی کەعبە لەبەر ئەوە بوو چوار دیواریەکی بێ سەقف بوو، بەرزاییەکەی لەبالاّی مرۆڤێك تێپەڕی نەدەکرد. دەیانویست بەرزی بکەنەوە و سەقفێکی بۆ دروست بکەن چوونکە چەند کەسێك لەقورەیشییەکان گەنجینەکانی ناو یەکێك لەچاڵەکانی کەعبەیان دزی.

بەسەرهاتی دوو ئاسکە زێڕینەکە لەگێڕانەوەی هوشام کوڕی محەممەد بەمشێوە بوو کەکەعبە دوای تۆفانی نوح بناغەی بۆ دارێژرا و خواوەند بەئیبراهیم و ئیسماعیل فەرمانیدا، هاوشێوەی پێشوو، دروستی بکەنەوە. لەقورئاندا ئاماژەی پێدراوە کە:

((واذ یرفع ابراهیم القواعد من البیت و اسماعیل ربنا تقبل منا انك انت السمیع العلیم:

واتاکەی: کاتێك ئیبراهیم پایەکانی ئەم ماڵەی بەرز دەکردەوە (هاورێ لەگەڵ ئیسماعیل) (دەیانوت) پەروەردگارا لێمان رازی بە چوونکە تۆ بیسەر و زانایت.))

لەرۆژگاری نوح کەس ئۆدەداری کاروبارەکانی ماڵەکە نەبوو، چوونکە ماڵەکە بۆ ئاسمان بەرز کرابوویەوە. دوای ئەوە خواوەند فەرمانی بەئیبراهیمدا ئیسماعیلی کوڕی لەنزیك ماڵەکە نیشتەجێ بکات چوونکە مەبەستی ئەوەی کردبوو کەسەکانی خۆی بەپێغەمبەر بەرێز بکات.

ئیبراهیمی خەلیل و کوڕەکەی ئیسماعیل، دوای رۆژگاری نوح، کاروبارەکانی ماڵەکەیان گرتەئەستۆ. مەککە، لەو کاتەدا بیابان و جورهەمییەکان و عەمالیق لەدەوروبەری نیشتەجێ بوون. ئیسماعیل هاوسەرێکی لەخەڵکانی جورهەم هەڵبژارد و عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی مەزاز هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە هۆنییەوە:

((زاوای ئێمە کەسێکە باوکی لەهەموو خەڵکان شەریفتر بوو.))

((منداڵەکانی ئەو لەئێمەن و ئێمە، خزمەکانی ئەوین))

لەمنداڵەکانی ئیبراهیم، ئیسماعیل سەرپەرەستی بەڕێوبردنی کارەکانی کەعبە بوو. دوای ئەو نەبت کەدایکی لەجورهەمییەکان بوو، جێگەی باوکی گرتەوە. کاتێك نەبت مرد، منداڵەکانی ئیسماعیل فراوان نەبوون. جورهەمییەکان دەستیان بەسەر کاروبارەکانی کەعبەدا گرت. عەمرۆ کوڕی حارس کوڕی مەزاز، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

(( لەدوای نابت، ئێمە سەرپەرەستیماڵەکە بووین))

((بەدەوری ماڵەکەدا دەسووڕاینەوە و چاکییەکان، ئاشکرا بوون)).

یەکەم کەس لەخەڵکانی جورهەم سەرپەرەستی کارەکانی ماڵەکەی گرتە دەست، مەزاز بوو. دوای ئەو ئەم کارە کەوتە دەستی کوڕەکانی کەیەك لەدوای یەك ئۆدەداری ئەم کارە بوون. دواتر، جورهەمییەکان لەمەککە خراپەکاریان کردە پیشە و ڕێزی ماڵەکەیان نەگرت. ئەو سامانەی بۆ کەعبە دەهێنرا، دەیانخوارد و ستەمیان لەحاجییەکان دەکرد. ستەمکاری ئەوان گەیشتە ئەو رادەکەی ئەگەر کەسێکیان مەبەستی زیناکردنی دەکرد و شوێنی دەستنەدەکەوت، لەناو کەعبەدا ئەو کارەی ئەنجامدەدا. وەك دەڵێن: ئەساف لەناو کەعبە لەگەڵ نائیلە زینای کرد و هەر دووکیان بوون بە بەرد.

لەدەورانی جاهلییەت لەمەککە ستەم و زیناکاری نەبوو. ئەگەر پاشایەك ڕێزی ئەو ماڵەی نەدەگرت، لەناو دەچوو. بەبەکە ناویان دەبرد چوونکە ستەمکارانی و یاخییانی لەناو دەبرد.

کاتێك ستەمکاری جورهەمییەکان زیادی کرد، منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عامر لەیەمەنەوەو هاتن. منداڵەکانی حارسە کوڕی عەمرۆ لەتەهامە نیشتەجێ بوون و بەخوزاعە ناویان دەکرد. ئەوان، منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی ڕەبیعە کوڕی حارسە و ئەسلەم و مالك و مەلەکان، منداڵەکانی ئەقسی کوڕی حارسە بوون.

خواوەند، خەڵکانی جورهەمی بەبەڵای خوێنی مێشك و مێروولە گرفتار کرد و هەموویان لەناوچوون. خەڵکانی خوزاعە بڕیاریاندا پاشماوەی ئەوان لەشارەکە دەربکەن. سالاریان عەمرۆ کوڕی ڕەبیعە کوڕی حارسە بوو کەدایکی فوهەیرە کچی عامر کوڕی حارس کوڕی مەزازە. شەڕێکی گەورە دەستپێکرد. کاتێك عامر کوڕی حارس

لەشکستی خۆیان دڵنیابوو، دوو ئاسکی زێڕینی کەعبە و بەردی ڕەشی وەك نیشانەی تۆبە کردن هێنایەدەر و ئەم هۆنراوە خوێندەوە:

((خواوەندا جورهەمییەکان بەندەکانی تۆن))

((خەڵکانێکی تازە هاتوون و ئەوان لەکۆنەوە لێرە نیشتەجێن))

(( لەرۆژگارانی پێش، دیاری تۆبەدەستی ئەوان ئاوەدان کراوەتەوە)).

بەڵام خواوەند بەتۆبەکەی رازی نەبوو. دوو ئاسکەکە و بەردی ڕەشی خستە ناو چاڵی زەمزەم و بەخۆڵ دایپۆشی. لەگەڵ خەڵکانی جورهەم بەرەو جوهەینە ڕۆشت. لافاوێکی خرۆشان هات و هەموو شتێکی لەناو برد.

کاروباری کەعبە کەوتە دەسی عەمرۆ کوڕی رەبیعە و بەوتەی مناڵەکانی قوسەی کەوتە دەستی عەمرۆ کوڕی حارسی غەبشانی کە یەکێك لەخەڵکانی خوزاعە بوو. بەڵام سێ شت لەدەستی خەڵکانی موزەردا بوو:

یەکیان مۆڵەتی رۆشتن لەعەرەفات بۆ مەنی لەدەستی غەوس کوڕی موڕدا بوو کەپێیان دەوت سووفە، کاتێك دەبوا مۆڵەتی ڕۆشتن بدرێت، دەیانوت: سووفە مۆڵەتمان پێبدە.

دووەم: ڕۆشتن بەرەو مەنی و لەدەستی مناڵەکانی زەید کوڕی عەدەواندا بوو. دوایین کەس لەوان کەئەم کارەی لەئەستۆدا بوو، باوکی سەیارە عومەیلە کوڕی ئەعزەل کوڕی خالید کوڕی مەعد کوڕی حارس کوڕی وابش کوڕی زەید بوو.

سێیەم: دوا خستنی مانگە حەرامەکان بوو کەپێیان دەوت نەسیئی. ئەم کارە لەئەستۆی قەلموسدا بوو. ئەو، حوزەیفە کوڕی فەقیم کوڕی عودەی لەمناڵەکانی مالك کوڕی کەنانە بوو. دوایین کەسی ئەوان باوکی سەمامە جونادە کوڕی عەوف کوڕی ئومەییە کوڕی قەلع کوڕی حوزەیفە بوو کە لەرۆژگاری ئیسلامدا دەژیا. دواتر مانگەکانی حەرام بۆ شوێنی خۆیان گەڕانەوە و خواوەند ئەوانی جێگیر و نەسیئی هەڵوەشایەوە.

کاتێك هۆزی مەعد فراوان بوون، بڵاو بوونەوە.

بەڵام قوڕەیشییەکان مەککەیان بەجێنەهێشت و کاتێك عەبدولموتەلیب چاڵی زەمزەمی هەڵکەند، دوو ئاسکە زێڕینەکەی لەناو چاڵەکەدا دۆزییەوە وەك چۆن پێشتر لەم کتێبەدا ئاماژەمان پێدا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەو کەسەی گەنجەکەی ڕفاند، دوویك موالی مناڵەکانی

مەلیح کوڕی عەمرۆ خوزاعی بوو و قورەیشییەکان دەستی ئەویان بڕییەوە. حارس کوڕی عامر کوڕی نەوفل و باوکی ئەهاب کوڕی عەزیز کوڕی قەیس کوڕی سوەیدی تەمیمی دایك برای حارس کوڕی عامر کوڕی نەوفل کوڕی عەبدمەناف و باوکی لەهەب کوڕی عەبدولموتەلیب لەدزی ڕفاندنی گەنجەکانی کەعبە تاوانبار کران. قورەیشییەکان گومانیان کرد ئەوان گەنجەکەیان دزیوە و بەدوویکیان سپاردووە. کاتێك قورەیشییەکان ئەوانیان تاوانبار کرد، دوویکیان نیشاندا و دەستیان بڕییەوە.

دەڵێن: قورەیشییەکان دڵنیا بوون گەنجی کەعبە لای حارس کوڕی عامر کوڕی نەوفل کوڕی عەبدمەنافە. ئەویان بردە لای یەکێك لەژنە کاهینەکانی عەرەب کەوتی: لەبەر ئەوەی ڕێزی کەعبەی شکاندووە، دە ساڵ ناڕواتە ناو مەککە. ئەو دەساڵ لەدەرەوەی مەککە ژیانی بەسەر برد.

دواتر، دەریا کەشتی یەکێك لەبازرگانەکانی ڕۆمی گەیاندە کەنارەکانی جەددە. کەشتییەکە تێکشکا. داروتەختەی کەشتییەکەیان کۆکردەوە وبۆ دروست کردنی سەقفی کەعبە بەکاریان برد. پیاوێکی قیبتی لەمەککە دەژیا ودارتاشی دەزانی. سەرەتاکانی کارەکە ئامادە بوو بەڵام مارێك لەچاڵی ماڵی کەعبە کەشوێنی دیارییەکان بوو، دەهاتەدەر و بەدیوارەکەدا هەڵدەگەڕا و خەڵکان لێی دەترسان چوونکە هەر کەس لێی نزیك دەکەوتەوە، دەمی دەکردەوە و دەنگی لێوەدەهات. یەکێك لەڕۆژەکان کەمارەکە لەسەر دیواری کەعبە بوو، خواوەند باڵندەیەکی نارد و مارەکەی هەڵگرت و بردی. قورەیشییەکان وتیان: هیوادارین خواوەند لەو کارەی ئەنجامی دەدەین ڕازی بێت چونکە کەرەستەی پێویست و داری ئامادەمان هەیە. ئەم ڕووداوە پێنج ساڵ پێش شەڕی فەجار و تەمنی پێغەمبەر(د.خ) سی و پێنج ساڵ بوو.

کاتێك قورەیشییەکان بڕیاریاندا کەعبە وێران بکەن و سەرلەنوێ دروستی بکەنەوە، باوکی وەهەب کوڕی عەمرۆ کوڕی عائیز کوڕی عیمران کوڕی مەخزوم هات و بەردێکی لەبینای دیواری کەعبە هەڵگرت بەڵام بەردەکە لەدەستی کەوتە خوار وگەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، وتی: ئەی خەڵکانی قورەیش ئەوەی بۆ دروست کردنی ئەم ماڵە بەکاری دەبەن، دەبێت لەڕێگەی حەڵاڵەوە بەدەست هاتبێت، مارەیی زیناکار و داهاتی زینا بۆ ئەم کارە تەرخان مەکەن.

دەستەیەك دەڵێن: ئەمە وتەی وەلید کوڕی موغەیرەیە.

دەڵێن: عەبدوالله کوڕی سەفوان کوڕی ئومەییە کوڕی خەلەف کچی جەعدە کوڕی هوبەیرە کوڕی ئەبی وەهب کوڕی عەمرۆ کوڕی عائیز کوڕی عیمران کوڕی مەخوزمی بینیبوو کە بەدەوری کەعبەدا دەسووڕایەوە، وتی: ئەمە کێیە؟

کاتێك وتیان کچی جەعدە کوڕی هوبەیرەیە، وتی: عەبدوالله کوڕی سەفوانی جەدەوی، یانی هەمان باوکی وەهب کەبەردی لەدیواری کەعبە هەڵگرت و بەردەکە لەدەستی کەوتەخوار و بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە و وتی: ئەی قورەیشییەکان ئەوەی بۆ ئەم بینایە خەرجی دەکەن، دەبێت لەرێگەی حەلاڵەوە بەدەست هاتبێت، مارەیی زیناکار و بەرهەمی سوو بۆ ئەم کارە خەرج و تەرخان مەکەن.

باوکی وەهب خاڵی پێغەمبەر(د.خ) و پیاوێکی شەریف بوو.

لە محەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: قورەیشییەکان کەعبەیان دابەش کرد و لای دەرگاکە، بەمناڵەکانی عەبدمەناف و زەهرە بڕا، نێوان بەردی ڕەش و روکنی یەمانی بەمناڵەکانی مەخزوم و تیم و دەستەیەکی دیکە لەهۆزەکانی قورەیش، پشتی کەعبە بۆ مناڵەکانی جومەح و مناڵەکانی سەهم و لای بەردەکە کەحەتیم بوو، بۆ مناڵەکانی عەبدوئەلدار کوڕی قوسەی و مناڵەکانی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی قوسەی و مناڵەکانی عودەی کوڕی کەعب.

خەڵکان لەوێران کردنی ماڵەکە دەترسان، وەلید کوڕی موغەیرە وتی: ((من دەسپێدەکەم)) پاچی هەڵگرت و وتی: ((خواوەندا مەترسە، جگە لەچاکە هیچ مەبەستێکمان نییە)) بەشێك لەنێوان دوو روکنەکەی وێران کرد، خەڵك ئەو شەوە چاوەڕوان بوون و وتیان: ((چاوەڕوان دەبین ئەگەر بەلایەکی بەسەرداهات، کەعبە وێران ناکەین و لەسەر شێوەی یەکەمی خۆی دەیهێڵینەوە و ئەگەر هیچ بەلایەکی بەسەردا نەهات، دڵنیا دەبین کەخواوەند لەکارەکەی ئێمە رازییە و کەعبە وێران دەکەین)).

وەلید کوڕی موغەیرە ئەو شەوە سەرقاڵی ئەنجامدانی کارەکانی خۆی بوو و کەسانی دیکەیش هاوکاریان کرد تا ئەوەی وێرانی گەیشتە پایەکان کەبەردە سەوزەکان هاوشێوەی ددانە پەیوەستەکان پێکەوە لکا بوون.

هەروەها لە محەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: یەکێك لەپیاوانی قورەیش لەوێران کردنی کەعبە بەشدار بوو، نوێڵێکی کردە نێوان دوو بەرد تا هەڵیکەنێت، کاتێك بەردەکە تەکانی خوارد، مەککە لەرایەوە و لەهەمان کات گەیشتنە بناغەی بیناکە.

دەڵێت: هۆزەکانی قورەیش بەردیان بۆ بناغەکەی کۆکردەوە، هەر هۆزێك بەجیا بەردی

کۆدەکردەوە و بیناغەیان بەرز کردەوە تا گەیشتنە شوێنی بەردی ڕەش و کێشەیان بۆ دروست بوو، هەر هۆزێك دەیویست خۆی بەردەکە لەشوێنی خۆیدا دابنێت تا ئەوەی بۆ ئەو کارە ریزیان بەست. پەیمانیان بەست و مەترسی شەڕ هاتە ئاراوە. منالەکانی عەبدوئەلدار کاسەیەك خوێنیان هێنا و لەگەڵ منالەکانی عودەی کوڕی کەعب، پەیمانی مەرگیان بەست و دەستیان بەخوێنەکە سوور کرد. قورەیشییەکان چوار پێنج رۆژیان بەمشێوەیە بەسەر برد، دوای ئەوە لەمزگەوت کۆبوونەوە و راوێژیان کرد و لەسەر دادپەروەری رێککەوتن.

بەوتەیەکی دەستەیەك لەمێژوونووسان، لەو کاتەدا باوکی ئومەییە کوڕی موغەیرە کەپیرترین پیاوی قورەیش بوو، وتی: ئەی قورەیشییەکان یەکەم کەس کە لەدەرگای مزگەوتەکە بێتە ژوور، بۆ ئەم کێشەیە لەنێوان ئێوەدا داوەری بکات.

یەکەم کەس کەهات، پێغەمبەر(د.خ) بوو. کاتێك ئەویان بینی، وتیان: ئەو، ئەمینە، بەداوەری کردنی ئەو رازین، ئەو، محەممەدە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەوان نزیك کەوتەوە، کێشەکەیان بۆ باس کرد، وتی: پارچەیەك بێنن. پارچەکەی دانا وبەردەکەی خستە ناو پارچەکە و وتی: هەر هۆزێك سووچێکی پارچەکە بگرێت و هەڵیگرێت. ئەو کارەیان کرد و بەردەکەیان تا شوێنەکەی خۆی بەرز کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) بەدەستی خۆی بەردەکەی خستە شوێنەکەی خۆی و بینای دیوارەکەیان بەرز کردەوە.

قورەیشییەکان پێغەمبەری(د.خ)خوایان پێش ئەوەی وەحی بۆ بێتەخوار، بەئەمین ناو دەبرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بینای کەعبە پانزە ساڵ دوای جەنگی فەجار بوو، لەساڵی فیل تا ساڵی فەجار بیست ساڵی خایاند. لەنێوان شارەزایانی مێژوو جیاوازی هەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر لەکاتی هەڵبژاردنی بۆ پێغەمبەرایەتی چەند ساڵی بوو، دەستەیەك وتوویانە: هەڵبژاردنی ئەو لەساڵی سی و پێنجی بینای کەعبەو تەمەنی لەو کاتەدا چل ساڵ بوو.

ئاماژەدان بەبێژەرانی ئەم وتەیە

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەتەمەنی چل ساڵی بۆ پێغەمبەرایەتی

راسپێردرا.

هەروەها لەئەنس و مالك چەندین گێڕانەوە بەم ناوەڕۆکە لەبەر دەستایە.

لەعورە کوڕی زوبەیر دەگێڕنەوە: پێغەمبەر لەکاتی راسپێرانی بۆ پێغەمبەرایەتی، تەمەنی چل ساڵ بوو.

لەیەحیا کوڕی جەعدە دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) بەفاتیمەی فەرموو بوو: ساڵانە یەك جار قورئان بۆ من دەخوێندرایەوە، بەڵام ئەم ساڵ دووجار، گومان دەکەم سەردەمی مەرگم نزیك بۆتەوە. یەکەم کەس لەبنەماڵەکەم کەپەیوەستی من دەبێت، تۆییت. هەر پێغەمبەرێك کەهەڵبژێردرا، پێغەمبەر(د.خ) لەدوای ئەو لەنیوەی تەمەنی دوای ئەو راسپێردرا، عیسا لەساڵی چلەم و من لەساڵی بیستەم.

لەعێکرەمە دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) چل ساڵە بوو کە لەمەککە بۆ پێغەمبەرایەتی راسپێردرا و سیانزە ساڵ لەمەککە مایەوە.

گێڕانەوەیەکی دیکە بەم ناوەڕۆکە لەکوڕی عەباس لەبەردەستایە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: پێغەمبەر(د.خ) تەمەنی چل و سێ ساڵ بوو ئەرەکی پێغەمبەرایەتی کەوتە سەرشانی.

ئاماژەدان بەبێژەرانی ئەم وتەیە

لەهوشام دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) تەمەنی چل وسێ ساڵ وەحی بۆ هاتەخوار.

هەروەها لەسەعید کوڕی موسەییب، گێڕانەوەیەك بەم ناوەڕۆکە لەبەر دەستایە.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەڕۆژ و مانگی هەڵبژاردنی پێغەمبەر(د.خ)

ئەبوجەعفەر دەڵێت: گێڕانەوەیەکی ڕاست لەبەردەستایە: سەبارەت بەڕۆژووی ڕۆژی دووشەممە لە پێغەمبەریان پرسی و فەرمووی: من، لەڕۆژی دووشەممە چاوم بەدنیا هەڵهێناوە، لەڕۆژی دووشەممە وەحی بۆ من هاتەخوار و بۆ پێغەمبەرایەتی راسپێردرام.

دەڵێت: لەمبارەوە هیچ ناکۆکییەك نابینرێت، بەڵام جیاوازی و ناکۆکی هەیە لەسەر ئەوەی دووشەممەی کام مانگە بوو. دەستەیەك وتوویانە: سەرەتای هاتنە خوارەوەی قورئان بۆ پێغەمبەر(د.خ) لەهەژدەی مانگی رەمەزان بوو. لە عەبدوالله کوڕی زەید گێڕانەوەیەك بەم ناوەرۆکە لەبەردەستایە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: هاتنە خوارەوەی قورئان لەبیست و چواری رەمەزان بوو. کوڕی جەلد گێڕانەوەیەکی بەم ناوەرۆکە ئاماژە پێداوە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: هاتنە خوارەوەی قورئان لەحەفدەی رەمەزاندا بوو. وفەرموودەکانی خواوەند وەك بەڵگە دەهێننەوە کەدەفەرمێت:

((وما انزلنا علە عبدنا یوم الفرقان یوم التقی الجمعان.

واتاکەی: (ئەگەر بەخوا) و ئەوەی ڕۆژی کۆتایی کار، ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوو دەستە، بۆ بەندەکەی خۆمان ناردمانەخوار، باوەڕتان هێناوە، و ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ کافرەکان لەبەدری ڕۆژی حەفدەی رەمەزان بوو)).

ئەبو جەعفەر دەڵێت: (( پێغەمبەر(د.خ) پێش ئەوەی جبرەئیل خۆی نیشان بدات و پەیامەکەی پێ ڕابگەیێنێت، شوێنەوار و نیشانەکانی دەبینی. یەك لەوان ئەو بەسەرهاتە بوو سەبارەت بە دوو فریشتەکە باسمان کرد کەسکی ئەویان هەڵدڕی و پیسی و ناپاکییان لێدەرهێنا و بابەتێکی دیکە ئەوەی بەهەر ڕێگەیەکدا دەڕۆشت، دار و بەردەکان دروودیان بۆ دەنارد.))

لەبەرە کچی ئەبی تەجرات دەگێڕنەوە: کاتێك خواوەند دەیویست فەرموودەکانی خۆی بە پێغەمبەر(د.خ) ڕابگەیێنێت، کاتێك بۆ کاری تایبەت دەڕۆشت (مەبەست سەرئاوە) بەرادەیەك دوور دەکەوتەوە کەهیچ ماڵێکی لەبەرچاو نەبێت و دەڕۆشتە ناو دۆڵەکان و لای هەر دار و درەختێك تێدەپەڕی، پێیان دەوت: (( السلام علیك یا رسول

الله)) سەیری چەپ وراست و پشت سەری خۆی دەکرد بەڵام کەسی نەدەبینی.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئۆمەتەکانی دیکە سەبارەت بەپێغەمبەرایەتی ئەو قسەیان کردووە و زاناکانی هەر نەتەوەیەك لەهاتنی ئەو ئاگادار بون.

عامر کوڕی رەبیعە دەڵێت: لەزەید کوڕی عەمرۆ کوڕی نوفەیلم بیست، دەیوت: چاوەڕوانی پێغەمبەرێك لەمناڵەکانی ئیسماعیل ولەنەوەکانی عەبدولموتەلیبم و دەترسم نەگەمە سەردەمەکەی ئەو بەڵام باوەڕم پێی هەیە و وتەکانی پشتراست دەکەمەوە و بەپێغەمبەرایەتی ئەو شایەتی دەدەم، ئەگەر تەمەنت درێژ بوو و چاوت پێی کەوت، سڵاوی منی پێبگەیێنە، هەنووکە تایبەتمەندییەکانی بەتۆ دەڵێم تا لای تۆ شاراوە نەبێت.

وتم: بیانڵێ.

وتی: نەکورتە نە باڵابەرز، نە تووکنە نەکەم موو، بەردەوام سوورییەك لەچاوی ئەودا دەبینرێت و خاتەمی پێغەمبەران لەنێوان دوو بازووی ئەودایە، ناوی ئەحمەدە و لەم شارەدا لەدایك دەبێت، دواتر خەڵکەکەی دەریدەکەن و دینەکەی پەسەند ناکەن تا ئەوەی بۆ یەسرب کۆچ دەکات و دەسەڵاتی فراوان دەبێت، ئاگادار بە حاشا لەوتەکانی نەکەیت چوونکە بەمەبەستی دۆزینەوەی دینەکەی ئیبراهیم هەموو ویلایەتەکان گەڕاوم و لەجوولەکە و ئاگرپەرەست و مەسیحی پرسیارم کرد وهەموویان وتیان: ئەم دینە لەدوای ئەم ئایینانەوە دێت و تایبەتمەندی ئەویان بەمشێوەیە باس کرد و وتیان: دوای ئەو، هیچ پێغەمبەرێك نامێنێت.

عامر دەڵێت: کاتێك باوەڕم هێنا، وتاری زەید کوڕی عەمرۆم بۆ پێغەمبەر(د.خ) باس کرد و سڵاوی ئەوم پێگەیاند. پێغەمبەر(د.خ) وەڵامی دایەوە و داوای بەخشینی بۆ کرد و فەرمووی: ئەوم لەبەهەشتا بینی.

عەبدوالله کوڕی کەعب موالی عوسمان دەڵێت: رۆژێك عومەر کوڕی خەتاب لەمزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) دانیشتبوو، عەرەبێك هاتە ناو مزگەوتەکە و بەدوای عومەردا گەڕا. کاتێك عومەر ئەوی بینی، وتی: ئەم پیاوە تا ئێستایش ناباوەڕە، ئەو لەسەردەمی جاهلییەت کاهین بووە.

عەرەبەکە سڵاوی لەعومەر کرد و دانیشت. عومەر پێی وت: ئایا باوەڕت هێناوە؟

وتی: بەڵێ.

عومەر وتی: ئایا لەسەرەمی جاهلییەت کاهین بوویت؟

عەرەب وتی: سبحان الله، وتەیەك دەهێنیتە سەرزمان كە لەكاتی خەلافەتەوە بەهیچ كام لەژێر دەستەكانی خۆت نەوتووە.

عومەر وتی: ئێمە لەجاهلییەت خراپتر لەوە بووین، بتمان دەپەرەستی تا ئەو كاتەی خواوەند بەئیسلام، رێزداری كردین.

عەرەب وتی: بەڵێ ئەی سەرەوەری باوەڕداران لەسەردەمی جاهلییەت كاهین بووم.

عومەر وتی: پێمان بڵێ، سەرنج راكێشترین هەواڵێك كەشەیتان بۆی هێنای چی بوو؟

عەرەب وتی: شەیتان یەك مانگ یا یەك ساڵ پێش ئیسلام هات و وتی: مەگەر نابینیت كاروباری جنۆكەكان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

عومەر وتی: خەڵكانیش ئەوەیان باس كرد، سوێند بەخوا لەگەڵ دەستەیەك لەقورەیشییەكان لای بتێك لەبتەكانی سەردەمی جاهلییەت دانیشتبووین یەكێك لەعەرەبەكان بەرخێكی بۆ قوربانی كردبوو، چاوەڕێ بووین گۆشتەكەی بەسەر ئێمەدا دابەش بكات، لەدڵەوە دەنگێكم بیست كەهیچ كات دەنگێكی كاریگەرتر لەو دەنگم نەبیستبوو و ئەمە یەك مانگ پێش دەركەوتنی ئیسلام بوو، دەیوت: ئەی قوربانی، كارێكە سەركەوتنی لەگەڵدایە. كەسێك هاوار دەكات و دەڵێت: (( لا اله الا الله))

جوبەیر كوڕی موتعیم دەڵێت: لەبوانە لای بتێك دانیشتبووم. ئەمە یەك مانگ پێش هەڵبژاردنی پێغەمبەر(د.خ) بوو. وشترێكمان كوشتبوو یەكێك هاواری كرد: شتێكی سەیر ببیستن كەگوێ هەڵخستن بۆ وەحی بەسەر چوو و بەردی ئاسمانیمان تێدەگرن و ئەمە بەهۆی ئەوپێغەمبەرەوەیە لەمەككە لەدایك دەبێت و ناوی ئەحمەدە و بۆ یەسرب كۆچ دەكات. دەڵێت: ئێمە دەستمان هەڵگرت و پێغەمبەر(د.خ) دەركەوت.

لەكوڕی عەباس دەگێڕنەوە: یەكێك لەمنالەكانی عامر ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ((خاتەمی پێغەمبەرایەتی كە لەنێوان دوو بازووی تۆدایە، نیشانمانی بدە، تا ئەگەر پێویستت بەچارەسەر كردن هەبێت، چارەسەرت بكەم چوونكە بەناوبانگترین پزیشكم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دەتەوێت ئایەتێك (مۆجیزە) نیشانی تۆ بدەم؟

پیاوی عامری وتی: بەڵێ، بانگی ئەم دارخورمایە بكە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سەیری دارخورماكەكەی كرد و بانگی كرد. دارخورماكە هات و لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ) وەستا. دواتر فەرمووی: بگەڕێرەوە و گەڕایەوە.

پیاوی عامری وتی: ئەی منداڵەکانی عامر، سوێند بەخوا جادووگەرێکی هاوشێوەی ئەمەم نەبینیوە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: بەڵگەکان بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(د.خ) لەژمارە نایەت و بەخواستی خوا، لەکتێبێکی جیاوازدا باسیان دەکەین.

هەنووکە دەگەڕێینەوە بۆ سەر باس کردنی بەسەرهاتی پێغەمبەر(د.خ) لەو کاتەوەی جبرەئیل وەحی بۆ هێنایە خوار.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: پێشتر، باسی ئەو گێڕانەوانەمان کرد سەبارەت بەیەکەم دەرکەوتنی جبرەئیل و ئێستا وەسفی چۆنییەتی دەرکەوتنی جبرەئیل و وەحی خواوەند، باس دەکەین.

لەعایشە دەگێڕنەوە: یەکەم وەحی بۆ پێغەمبەر(د.خ) هاتە خوار، خەونێکی راست بوو هاوشێوەی بەرەبەیان. دواتر تامەزرۆی تەنیای بوو و دەڕۆشتە ئەشکەوتی حەرا و چەندین شەوی لەوێ بەپاڕانەوە بەسەر دەبرد. دواتر بۆ لای کەسەکانی خۆی دەگەڕایەوە و بۆچەندین شەوی دیاریکراو توێشووی هەڵدەگرت تا ئەوەی راستییەکان خۆیان نیشاندا و وتی: ئەی محەممەد تۆ پێغەمبەری خواییت.

پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمێت: تا نیوە هەستامە سەرپێ، دواتر هەستام، جەستەم دەلەرزی، ڕۆشتمە لای خەدیجە و وتم: دامپۆشن، دامپۆشن. تا ئەو کاتەی ترس لەجەستەمدا نەما. دواتر هات ووتی: ئەی محەممەد تۆ پێغەمبەری خواییت.

پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمێت: دەمویست خۆم لەسەرەوەی کێوەکە فڕێبدەمە خوار. بەڵام ئەو خۆی نیشانی من دەدا و دەیوت: ئەی محەممەد تۆ پێغەمبەری خواییت و من جبرەئیلم. دوای ئەوە پێی وتم: بخوێنە.

وتم: چی بخوێنم؟

دەفەرمێت: منی گرت و سێ جار رایوەشاندم. دواتر وتی: بخوێنە بەناوی ئافرێنەرەکەت کەئافرێنراوەکانی ئافراند. گەڕامەوە بۆ لای خەدیجە و وتم: لەخۆم دەترسم. بەسەرهاتەکەی خۆم بۆ باس کرد.

خەدیجە وتی: دڵخۆش بە چوونکە خواوەند هیچ کات لاوازت ناکات لەبەر ئەوەی لەگەڵ خزمان چاکە دەکەیت و قسەی راست دەهێنیتە سەرزمان و ئەمانەت دار و میواندار و پشتیوانی راستییەکانیت. دواتر خەدیجە منی بۆ لای وەرقە کوڕی نەوفل کوڕی ئەسەد برد و وتی: بزانە برازاکەت دەڵێت چی؟

وەرەقە پرسیاری کرد و کاتێك بەسەرهاتەکەی خۆم بۆ باس کرد، وتی: (سوێند بەخوا ئەمە نامووسێکە کە بۆ موسا کوڕی عیمران هاتەخوار، خۆزگە لەم کارەدا پشکێکم پێدەبڕا، خۆزگە ئەو کاتەی خەڵکەکەت لەم شارە دوورت دەخەنەوە، زیندوو بم.

وتم: مەگەر خەڵکەکەم دوورم دەخەنەوە و لەشارەکە دەرمدەکەن؟

وتی: بەڵێ، هەرکەس هاوشێوەی تۆ دینێك بێنێت، دوژمنایەتی دەکەن، ئەگەر ئەو رۆژە زیندوو بم، هاوکاریت دەکەم.

دەفەرمێت: یەکەم ئایەتەکانی قورئان کە لەدوای ((اقراء باسم ربك)) بۆ من هاتەخوار:

((ن، والقلم و مایسطرون)) و (( یا ایها المدثر)) و ((الضحی)) بوو.

لە عەبدوالله کوڕی شەداد دەگێڕنەوە: جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی محەممەد، بخوێنە.

فەرمووی: چی بخوێنم؟

دەڵێت: ئەوی راتەکاند و دووبار وتی: ئەی محەممەد، بخوێنە.

فەرمووی: چی بخوێنم.

جبەرئیل وتی: ((اقراء باسم ربك الذی خلق تا کۆتایی سورەی عەلەق. دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە بۆ لای خەدیجە و وتی: ئەی خەدیجە، پێم وابێت زیانم بەرکەوتووە (نەخۆش کەوتووم.

خەدیجە وتی: هەرگیز خواوەند ئەو کارە لەگەڵ تۆدا ناکات، چوونکە هەرگیز گوناحێکت نەکردووە.

دەڵێت: خەدیجە ڕۆشتە لای وەرقە کوڕی نەوفل و بەسەرهاتەکەی بۆ باس کرد. وەرقە وتی: ئەگەر راست بکەیت، هاوسەرەکەت پێغەمبەرە و لەخەڵکەکەی ڕەنجی زۆری پێدەبڕێت و ئەگەر زیندوو بم، هاوکاری دەکەم.

دوای ئەوە جبرەئیل نەهات و خەدیجە پێی وت: ئەگەری هەیە خواوەند وازی لێهێنابێتیت. خواوەند ئەم ئایانەی ناردەخوار:

((والضحی، و اللیل اذا سجی، ما ودعك ربك و ما قلی.

واتاکەی: قەسەم بەرۆژ و شەو، ئەوساتەی تاریك دەبێت کەپەروەردگار نەبەجێی هێشتووی نەبۆتە دوژمنت.))

لە عەبدوللە کوڕی زوبەیر دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) ساڵانە یەك مانگ لەئەشکەوتی حەرا بۆ پاڕانەوە و خواپەرەستی دادەنیشت. ئەمە لەریێ ورەسمەکانی قورەیش و لەسەردەمی جاهلییەتەوە بەجێمابوو. لەو مانگەی لەئەشکەوتەکە دەمایەوە، هەرکەس لەهەژارەکان سەردانی بکردایە. خواردنی پێدەبەخشی وکاتێك مانگەکە کۆتایی دەهات. دەرۆشتە کەعبە، حەوت یا هەرچەند جار خواوەند دەیویست، بەدەوری ماڵەکەدا دەسووڕایەوە و دواتر دەگەڕایەوە بۆ ماڵ.

کاتێك ئەو ساتانە نزیك کەوتەوە خواوەند دەیویست بۆ پێغەمبەرایەتی رایسپێرێت، مانگی رەمەزان بوو. پێغەمبەر(د.خ) بەرەو حەرا بەرێکەوت و کاتێك شەو وەحی هاتەخوار، جبرەئیل دەرکەوت.

پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمێت: هات و وەرەقەیەکی لەدیبا لەدەستا بوو کەتیایدا نووسرا بوو. وتی: بخوێنە.

وتم: چی بخوێنم؟

جبرەئیل بەشێوەیەك رایتەکاندم گومانم کردە مەرگە. دواتر وتی: بخوێنە.

وتم: چی بخوێنم؟ بەڵام چیتر منی ڕانەتەکاند.

وتی: ((اقرا ء باسم ربك الذی خلق. تا کۆتایی سوورەی علق)).

دەفەرمێت: خوێندمەوە. جبرەئیل ڕۆشت و من لەخەو هەستام وەك بڵێی نووسراوێك لەزەینمدا بوو. هەڵبەستوان و شێتەکانم بەدوژمن دەزانی و نەمدەویست سەیریان بکەم و بەخۆمم دەوت هەرگیز قورەیشییەکان ناڵێن شاعیر یا شێت بووە، دەڕۆمە سەرکێوەکە تا خۆم فڕێبدەمە خوار تا بمرم و ئاسوودە بم. بەم مەبەستە هاتمەدەر و لەنێوان کێوەکە، دەنگێکم لەئاسمانەوە بیست کەدەیوت: ئەی محەممەد تۆ پێغەمبەری خواییت و من جبرەئیلم.

دەفەرمێت: سەرم بەرز کردەوە و جبرەئیلم لەروخساری پیاوێکدا بینی کەقاچەکانی لەئاسۆی ئاسماندا بوو و دەیوت: ئەی محەممەد، تۆ پێغەمبەری خواییت و من جبرەئیلم.

دەفەرمێت: وەستابووم و سەیری جبرەئیلم دەکرد. لەمەبەستەکەی خۆم پاشەگەز بوومەوە و هەنگاوێك بۆ دواوە و پێشەوە نەڕۆشتم. سەیری ئاسۆکانی ئاسمانم دەکرد. سەیری هەر شوێنێکم دەکرد جبرەئیلم دەبینی. وەستابووم بێ ئەوەی لەشوێنەکەی خۆم بجووڵێم تا ئەوەی خەدیجە کەسی بۆ گەڕان بەدوای مندا نارد، گەشتنە مەککە و

بۆلای خەدیجە گەڕانەوە، من وەستابووم، جبرەئیل ڕۆشت و من بۆ لای کەسەکانی خۆم گەڕامەوە. ڕۆشتمە لای خەدیجە، دانیشتم کەوتی: ئەی باوکی قاسم، لەکوێ بوویت چەند کەسێکم بەدوای تۆدا نارد بەڵام نەیانبینی و گەڕانەوە.

وتم: یا شاعیر بووم یا شێت.

وتی: ئەی باوکی قاسم، بەخوات دەسپێرم، خوا هیچ بەڵایەك بەسەر تۆدا ناهێنێت چوونکە ڕاستکردار و ئەمانەتداری و لەگەڵ خزمان چاکەکاری. ئەی کوڕە مام، ئەگەری هەیە شتێکت بینیبێت؟

وتم: بەڵێ. بەسەرهاتەکەی خۆم بۆ گێڕایەوە.

خەدیجە وتی: ئەی کوڕە مام، دڵخۆشبە و خۆڕاگری بکەرە پیشە، سوێند بەو خوایەی گیانی خەدیجە لەدەستی ئەودایە، هیوادارم پێغەمبەری ئەم خەڵکە بیت.

دواتر هەستا و جلی لەبەر کرد و ڕۆشتە لای وەرەقە کوڕی نەوفل کوڕی ئەسەد کوڕە مامەکەی خۆی کەمەسیحی و کتێبی خوێندبوو و وتاری زۆری لەشوێنکەوتەکانی تەورات و ئینجیل بیستبوو. بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

وەرەقە وتی: قدوس! قدوس! سوێند بەو خوایەی گیانی وەرەقە لەدەستی ئەودایە ئەگەر وتەکانت ڕاست بێت، ناموسی ئەکبەر (گەورە) هاتووە (مەبەستی لەناموس، جبرەئیل بوو) ئەو ناموسەی ڕۆشتە لای مووسا، ئەو، پێغەمبەری ئەم ئوممەتەیە، پێی بڵێ خۆڕاگری بکاتە پیشە.

خەدیجە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و لەوتەکانی نەوفل ئاگاداری کردەوە. بەمشێوەیە خەمی پێغەمبەر(د.خ) کەمی کرد.

کاتێك کۆتایی بەمانەوەی لەحەرا هێنا، بەرەو کەعبە بەڕێکەوت. بەدەوریدا سووڕایەوە و وەرەقە، ئەوی بینی و وتی: ئەی کوڕی برا، لەوەی بینیوتە و بیستووتە، ئاگادارم بکەرەوە.

پێغەمبەر(د.خ) بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ باس کرد.

وەرەقە وتی: سوێند بەو خوایەی گیانی من لەدەستی ئەودایە، تۆ پێغەمبەری ئەم ئوممەتە و ناموسی گەورە کە ڕۆشتە لای موسا، هاتۆتە لای تۆ، حاشا لەوتەکانت دەکەن و ئازارت دەدەن و لەم شارە دوورت دەخەنەوە و دژایەتی و شەڕت لەگەڵ دەکەن، ئەگەر زیندوو بم بەخواستی خواوەند هاوکاریت دەکەم.

پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە بۆماڵەکەی خۆی و بەهۆی وتەکانی وەرەقە زیاتر دڵخۆش بوو و چیتر خەمی و ناڕاحەتی نەما.

دەڵێن: لەو وتانەی خەدیجە بۆ بەهێز کردن و پشتگەرم کردنی پێغەمبەر(د.خ) هێنایە سەرزمان، ئەوە بوو کەوتی: ئەی کوڕە مام، ئایا کاتێك جبەرئیل دێتە لای تۆ، دەتوانی ئاگادارم بکەیتەوە.

فەرمووی: بەڵێ.

کاتێك جبرەئیل هات، پێغەمبەر(د.خ) بەخەدیجەی وت: جبرەئیل هات. خەدیجە وتی: هەستە و لەسەر ڕانی چەپی من دانیشە.

پێغەمبەر(د.خ) هەستا و لەسەر ڕانی خەدیجە دانیشت.

خەدیجە وتی: دەیبینیت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

خەدیجە وتی: هەستە و لەسەر ڕانی راستی من دانیشە.

پێغەمبەر(د.خ) لەسەر ڕانی راستی دانیشت.

خەدیجە وتی: دەیبینیت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

خەدیجە وتی: وەرە و لەناو باوەشم دانیشە.

پێغەمبەر(د.خ) ئەو کارەی کرد.

خەدیجە وتی: ئایا ئێستایش دەیبینیت؟

فەرمووی: بەڵێ.

ئەوسا خەدیجە سەرپۆشەکەی فڕێدا و پێغەمبەر(د.خ) لەباوەشی ئەودا دانیشتبوو، وتی: دەیبینیت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نە.

خەدیجە وتی: ئەی کوڕە مام، دڵخۆشبە و خۆڕاگر، چوونکە سوێند بەخوا ئەمە فریشتەیە و شەیتان نییە.

ئەم حەدیسەیان لەفاتیمە کچی حسەین گێڕاوەتەوە بەم زیاد کردنە: خەدیجە پێغەمبەری(د.خ) لەژێر کراسەکەی خۆیدا جێگە کردەوە و جبرەئیل خۆی داشارد و بە پێغەمبەری(د.خ) وت: ئەمە فریشتەیە و شەیتان نییە.

کوڕی ئەبی کەسیر دەڵێت: لەباوکی سەلمەم پرسی: یەکەم ئایەی قورئان کەهاتە

خوار، کامە بوو؟

وتی: ((یا ایها المدثر))

وتم: دەڵێن: ((اقراء باسم ربك الذی خلق بوو))

پێی وتم: تەنیا وتەکانی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕمەوە، فەرمووی: لەحەرا بووم، کاتێك کۆتایی بەمانەوەم هات، هاتمە خوار و ڕۆشتمە ناو یەکێك لەدۆڵەکان، دەنگێکم بیست، سەیری پێش و پاش و چەپ وراستی خۆم کرد، هیچم نەبینی، کاتێك سەرم بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، جبرەئیلم بینی لەنێوان ئاسمان و زەوی لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، ترسام.

درێژەی گێڕانەوەکە لەحەدیسەکەی عوسمان کوڕی عەمرۆدایە کەپێغەمبەر فەرمووی: گەڕامەوە بۆ لای خەدیجە و وتم: دامپۆشن. دایانپۆشیم و ئاویان بەروخسارمدا کرد. ئەم ئایە هاتە خوار کە:

((یا ایها المدثر، قم فانذر.

واتاکەی: ئەی ئەوەی جل و بەرگت لەخۆت ئاڵاندووە، هەستە و بترسێنە.))

لەهوشام کوڕی محەممەد دەگێڕنەوە: جبرەئیل یەکەم جار لەشەوی شەممە و شەوی یەکشەممە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پەیامی خواوەندی لەرۆژی دووشەممە گەیاند و فێری دەستنوێژ و نوێژی کرد و (اقراء باسم ربك الذی خلق))ی پێخوێند. پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی دووشەممە کەوەحی هاتەخوار، تەمەنی چل ساڵ بوو.

ئەبوزەری غەفاری دەڵێت: لەپێغەمبەرم پرسی: یەکەم جار چۆن دڵنیا بوویت بوویتە پێغەمبەر؟

فەرمووی: ئەی ئەبوزەر، لەدۆڵی مەککەدا بووم دوو فریشتە هاتنە لای من، یەکیان لەسەر زەوی و ئەوی دیکەیان لەسەر زەوی و ئاسمان، یەکیان بەوەی دیکەی وت: ئەمە خۆیەتی.

ئەویتر وتی: خۆیەتی.

وتی: کێشی لەگەڵ یەکێکی دی بەراوەرد بکە. منیان لەگەڵ کەسێکی دیکەدا کێش کرد وزیاتر بووم.

وتی: لەگەڵ دە کەس بیکێشە. منیان لەگەڵ دەکەس کێشا و لەهەموویان زیاتر بووم.

وتی: لەگەڵ سەد کەس بیکێشە. منیان لەگەڵ سەد کەس کێشا وزیاتر بووم.

وتی: لەگەڵ هەزار کەس بیکێشە. منیان لەگەڵ هەزار کەس کێشا و زیاتر بووم.

یەکیان بەوەی دیکەی وت: سکی هەڵدڕە، سکی منی هەڵدڕی.

ئەوسا وتی: دڵی دەربێنە. یا وتی: دڵی بقڵیشێنە. دڵی منی قەڵیشت و دڵۆپە خوێنەکانی لێ دەرهێنا و ڕشتی.

ئەوی دیکەیان وتی: سك و دڵی بشۆ. دواتر ئارامی بانگ کرد کەهاوشێوەی پشیلەیەکی سپی بوو، خستیە سەر دڵی من و وتی: سکی بدوورەوە. سکی منیان دوورییەوە و مۆری پێغەمبەرایەتیان لەنێوان دوو شانی مندا و ڕۆشتن. دەڵێی هێشتا دەیانبینم.

لەزوهری دەگێڕنەوە: ماوەیەك وەحی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نەدەهاتە خوار. خەمبار بوو و دەڕۆشتە سەر بەرزایی کێوەکان تا خۆی فرێبداتە خوار و کاتێك دەگەیشتە سەر لووتکەی کێوەکان، جبرەئیل خۆی نیشاندەدا و دەیوت: تۆ پێغەمبەری خواییت. دڵی ئارام دەبوویەوە.

پێغەمبەر(د.خ) بەمشێوەی فەرموو بوو: ڕۆژێك لەرێگەدا بووم، فریشتەیەك لەسەر رێگەی ئەشکەوتی حەرا هاتە لام. بینیم لەسەر کورسیەیەك لەنێوان ئاسمان و زەوی دانیشتووە، ترسام و بۆ لای خەدیجە گەڕامەوە و وتم: دامپۆشن. منیان داپۆشی و ئەم ئایە هات خوار:

((یا ایها المدثر، قم فانذر و ربك فکبر و ثیابك فطهر.

واتاکەی: ئەی ئەوەی جل و بەرگت لەخۆتەوە ئاڵاندووە، هەستە و بترسێنە، تەکبیری پەروەردگار بێنەرە سەرزمان و جلەکانی خۆت بەپاك و خاوێنی رابگرە.))

زوهری دەڵێت: یەکەم ئایەکان بۆ پێغەمبەر(د.خ) هاتنە خوار : ((اقراء باسم ربك الذی خلق بوو، تا ما لم یعلم)).

ئەبو جەعفەر دەڵێت: کاتێك خواوەند ئیرادەی کرد پێغەمبەر(د.خ) خەڵکەکەی لەئازاب بترسێنێت ورێگەی کوفر و بتپەرەستییان لێبگرێت و باسی پێغەمبەرایەتی خۆی بۆ خەڵکان بکات، پێغەمبەر(د.خ) بەشێوەیەکی نهێنی لەگەڵ ئەو کەسانەی جێگەی باوەڕی بوون، دەپەیڤی و وەك دەڵێن یەکەم کەس کەباوەڕی پێی هێنا، خەدیجە بوو.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: یەکەم شت خواوەند بەدوای بانگەوازی تەوحید (خواپەرەستی) و بێزار لەبتەکان، فەرزی کرد، نوێژ بوو.

لە محەممەد کوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: کاتێك نوێژ لەسەر پێغەمبەر(د.خ) فەرز کرا، جبرەئیل هات. ئەو، لەسەرەوەی مەککە پاژنەی خۆی لەزەویدا وکانییەك هەڵقولآ، جبرەئیل دەستنوێژی گرت و پێغەمبەر(د.خ) سەیری دەکرد چوونکە جبرەئیل دەیویست شێوازی خۆپاك کردنەوە و دەستنوێژ گرتنی فێر بکات. دوای ئەوە، پێغەمبەر(د.خ) هاوشێوەی جبرەئیل دەستنوێژی گرت. جبرەئیل بۆ نوێژ وەستا و پێغەمبەر(د.خ) هاوشێوەی ئەو نوێژی خوێند. جبرەئیل ڕۆشت و پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە بۆ لای خەدیجە و دەستنوێژی گرت تا چۆنییەتی ئەو کارە فێری خەدیجە بکات، خەدیجەی هاوشێوەی پێغەمبەر(د.خ) دەستنوێژی گرت. دواتر پێغەمبەر(د.خ) نوێژی کرد و خەدیجەیش هاوشێوەی ئەو، نوێژی خوێند.

لەئەنس کوڕی مالك دەگێڕنەوە: کاتێك، کاتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(د.خ)، گەیشت، لای کەعبە خەوتبوو، نەریت بوو قوڕەیشییەکان لەوێ دەخەوتن. جبرەیل و میکائیل هاتن و وتیان: فەرمان سەبارەت بەکێیە؟

وتیان: سەبارەت بەسالاری خەڵکەکەیە. ڕۆشتن و لەلای قیبلەوە هاتن. سێ فریشتە بوون و پێغەمبەریان(د.خ) دۆزییەوە. خەوتبوو، ئەویان خستە سەرپشت و سکیان هەڵدڕی. دواتر ئاوی زەمزەمیان هێنا و سکی ئەویان لەپیسی و نەزانی پاك کردەوە. دواتر تەشتێکی زێڕیان هێنا، لێوانلێو بوو لەئیمان و زانست و سکی ئەویان لەئیمان و زانست لیپاولیپ کرد. ئەوسا، بۆ ئاسمانی یەکەم بەرزیان کردەوە و جبرەئیل وتی: دەرگا بکەنەوە. دەرگاوانەکانی ئاسمان وتیان: کێیت؟

وەڵامی دایەوە، جبرەئیلم.

وتیان: کێت لەگەڵدایە؟

وتی: محەممەد.

وتیان: بۆ پێغەمبەرایەتی ڕاسپێردراوە؟

وتی: بەڵێ.

وتیان: بەخێربێن ((دوعایان بۆ پێغەمبەر(د.خ) کرد))

کاتێك ڕۆشتە ناو، پیاوێکی چوارشانەی قۆزی بینی، لەجبرەئیلی پرسی: ئەمە

کێیە؟

جبرەئیل وەڵامی دایەوە: ئەمە باوکی تۆ ئادەمە.

دوای ئەوە بۆ ئاسمانی دووەمیان برد و جبرەئیل وتی: دەرگاکان بکەنەوە. هەمان پرسیاریان لێ دووبارە کردەوە و لەهەموو ئاسمانەکان پرسیار و وەڵام هاوشێوەی ئاسمانی یەکەم بوو. کاتێك ڕۆشتە ناو، دووپیاوی بینی و پێغەمبەر(د.خ) پرسی: ئەی جبرەئیل ئەمانە کێن؟

وتی: یەحیا و عیسا، کوڕە خاڵەکانی تۆن.

دوای ئەوە بۆ ئاسمانی سێیەمیان برد و کاتێك ڕۆشتە ناو پیاوێکی بینی، پرسی: ئەی جبرەئیل ئەمە کێیە؟

وتی: یوسفی براتە، کە لەهەموو کەسەکان قۆزتر و جوانتر بوو، بەهەمان شێوە کەمانگی شەوی چواردە لەهەمو ئەستێرەکان جوانترە.

دوای ئەوە گەیشتنە ئاسمانی چوارەم، لەوێ پیاوێك دانیشتبوو، پێغەمبەر(د.خ) پرسی: ئەی جبرەئیل ئەمە کێیە؟

وەڵامی دایەوە: ئەمە ئیدریسە و ئایەی ((و رفعناه مکانا علیا))ی خوێندەوە.

دوای ئەوە ڕۆشتنە ئاسمانی پێنجەم. پیاوێکی بینی و پێغەمبەر(د.خ) پرسی: ئەی جبرەئیل ئەمە کێیە؟

وەڵامی دایەوە: هاروونە.

دوای ئەوە گەیشتنە ئاسمانی شەشەم، پیاوێکی بینی وپرسی:

ئەی جبرەئیل، ئەمە کێیە؟

وەڵامی دایەوە کەمووسایە.

جبرەئیل ئەوی بردە ئاسمانی حەوتەم و پیاوێکی بینی و پێغەمبەر(د.خ) پرسی:

ئەی جبرەئیل، ئەمە کێیە؟

وتی: ئەوە ئیبراهیمی باوکتە.

دوای ئەوە ئەوی بردە بەهەشت و لەوێ ڕووبارێك بوو کەئاوکەی لەشیر سپیتر و لەهەنگوین شیرینتر بوو. لەهەر دوولای خێوەتەکان لەمرواری هەڵدرابوون. پرسی: ئەی جبرەئیل ئەمە چییە؟

وەڵامی دایەوە: ئەمە کەوسەرە کەخواوەند بەتۆی بەخشیوە و ئەمە نشینگەی تۆیە.

دەڵێت: جبرەئیل بەدەستی خۆی لەخۆڵەکەی هەڵگرت، موشك بوو، دوای ئەوە بەرەو

سدرة المنتهى ڕۆشت و لەخواوەند نزیك كەوتەوە كە بەئەندازەی یەك تیر یا نزیكتر بوو. لەنزیك پەروەردگار جۆرەكانی دوڕ و یاقوت و مرواری، دەبینرا.

خواوەند وەحی بەبەندەكەی خۆی كرد و زانست و تێگەیشتنی پێبەخشی و پەنجا نوێژی لەسەر فەرز كرد.

پێغەمبەر(د.خ) لەگەڕانەوە لای موسا تێپەڕی و پرسی: خواوەند چی لەسەر ئۆمەتەكەت فەرز كرد.

وەڵامی دایەوە: پەنجا نوێژ.

موسا وتی: بۆ لای خواوەند بگەڕێرەوە و داوای كەم كردنەوەی لێبكە چوونكە ئۆمەتەكەی تۆ لەهەموو ئۆمەتەكان لاوازترە و تەمەنی كورتترە. زیانەكانی و ڕەنجەكانی منداڵەكانی ئیسرائیلی بۆ باس كرد.

پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و دە نوێژ لەپەنجا نوێژەكە كەم كرایەوە.

دووبارە لای موسا تێپەڕی وپێی وت: دووبارە داوا لەخوا بكە، كەمی بكاتەوە. ئەو كارەی كرد تا ئەو جێگەی پێنج نوێژ مایەوە.

موسا وتی: بگەڕێرەوە و داوای كەم بوونەوەی لیٚ بكە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چیتر ناگەڕێمەوە. بەدڵیدا هات نەگەڕێتەوە چوونكە خواوەند فەرموو بووی: فەرموودەی من ناگەڕێتەوە و قەزای من گۆڕانی بەسەردا نایەت. بەڵام نوێژی ئۆمەتەكەی من، دەجار كەم كرایەوە.

ئەنس دەڵێت: هەرگیز بۆنێك تەنانەت بۆنی جەستەی بووكم بەخۆشتر لەبۆنی جەستەی پێغەمبەر(د.خ) نەبینیوە چوونكە پێستی خۆم لەپێستی ئەو خشاند و بۆنم كرد.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: زاناكانی ڕابردوو ناكۆكن لەسەر ئەوەی دوای خەدیجە چ كەسێك باوەڕی بە پێغەمبەر(د.خ) هێنا و وتەكانی ئەوی پشتڕاست كردەوە.

دەستەیەك وتوویانە: یەكەم پیاو باوەڕی بە پێغەمبەر(د.خ) هێنا، عەلی كوڕی ئەبی تالیب بوو.

ئاماژەدان بەبێژەرانی ئەم وتەیە

لەكوڕی عەباس دەگێڕنەوە: یەكەم كەس لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) نوێژی خوێند، عەلی

کوڕی ئەبی تالیب بوو.

هەروەها لەجابر دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی دووشەممە بۆ پێغەمبەرایەتی راسپێردرا و عەلی رۆژی سێشەممە نوێژی خوێند.

باوکی حەمزە دەڵێت: لەزەید کوڕی ئەرقەمم بیست، وتی: یەکەم کەس اوەڕی بە پێغەمبەر(د.خ) هێنا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو. ئەم حەدیسەم لەگەڵ نەخەعی باس کرد بەڵام حاشای لێکرد و وتی: یەکەم کەس کەباوەڕی بەئیسلام هێنا، ئەبوبەکر بوو.

لەباوکی حەمزەی موالی ئەنسار دەگێڕنەوە: یەکەم کەس باوەڕی بە پێغەمبەر(د.خ) هێنا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو.

عوباد کوڕی عەبدوالله دەڵێت: بیستم عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەیوت: من بەندەی خوا و برای پێغەمبەری(د.خ) خوا و راستگۆی گەورەم، هەرکەس دوای من قسە بکات، درۆزنە چوونکە حەوت ساڵ پێش هەموو خەڵکان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) نوێژم خوێند.

عەفیفی کێندی دەڵێت: لەرۆژگاری جاهلی ڕۆشتمە مەککە، لای عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب دابەزیم و کاتێك هەتاو هەڵهات، سەیری کەعبەم کرد، گەنجێك هات و سەیری ئاسمانی کرد، دواتر بۆ لای کەعبە ڕۆشت و رووبەرووی وەستا و زۆری نەخایاند کوڕێکی گەنج هات و لای راستی ئەو وەستا. دواتر ژنێك هات و لەپشت سەری ئەو وەستا و کاتێك رکوعی کرد، کوڕ و ژنەکەیش رکوعیان کرد. دواتر پیاوەکە سەری بەرز کردەوە و کوڕە و ژنەکەیش سەریان بەرز کردەوە. پیاوەکە سوجدەی برد و ئەو دوانەیش سوجدەیان برد.

وتم: ئەی عەباس، ئەمە کارێکی گەورەیە.

عەباس وتی: بەڵێ راستە، دەزانی ئەمە کێیە؟

وتم: نازانم.

وتی: ئەمە محەممەد کوڕی عەبدوالله کوڕی عەبدولموتەلیبی برازای منە. دەزانی ئەوەی لەگەڵ ئەودایە کێیە؟

وتم: نازانم.

وتی: ئەوە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوڕی عەبدولموتەلیبی برازای منە. دەزانی ئەو ژنەی لەپشت سەری ئەوان وەستاوە، کێیە؟

وتم: نازانم.

وتی: ئەوە خەدیجە کچی خوەیلد هاوسەری برازاکەی منە. برازاکەم پێی وتم

ئاسمان بەوانی وتووە ئەو کارە بکەن کەدەیبینی، سوێند بەخوا لەسەراسەری زەوی جگە لەم سیٚ کەسە، کەس باوەڕی بەم ئایینە نییە.

ئیسماعیل کوڕی ئەیاس کوڕی عەفیف لەگێڕانەوەی وتەی باوەگەورێی خۆی دەڵێت: پیاوێکی بازرگان بووم و لەرۆژگاری حەج دەرۆشتمە مەککە و لای عەباس دادەبەزیم. کاتێك لای ئەو دانیشتبووم، پیاوێك هات و بۆ نوێژ وەستا و رووی کردە کەعبە. دواتر ژنێك هات و لەگەڵ ئەو نوێژی خوێند. دواتر کوڕێك هات و لەگەڵ ئەوان نوێژی کرد.

وتم: ئەی عەباس، ئەم دینە چییە کەمن نایزانم.

عەباس وتی: ئەمە محەممەد کوڕی عەبدوڵڵایە کەدەڵێت خواوەند ئەوەی بۆ بڵاو کردنەوەی ئەم دینە هەڵبژاردووە و دەڵێت رۆژێك دەست بەسەر گەنجەکانی خوسرەو و قەیسەردا دەگرێت. ئەم ژنە، هاوسەرەکەی خەدیجە کچی خوەیلدە و ئەم کوڕە، ئامۆزاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە کەباوەڕی پێی هێناوە.

دەڵێت: خۆزگە ئەو رۆژە باوەڕم دەهێنا و دەبوومە سێیەم موسوڵمان.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئەم گێڕانەوەیە بەناوەرۆکی دیکە باسی کراوە کەعەفیف دەڵێت: عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب هاورێی من بوو و بۆ کڕینی بۆن دەهاتە یەمەن و لەکاتی حەج، دەیفرۆشت. رۆژێك لەگەڵ عەباس لەمەنی بووم، پیاوێك هات و دەستنوێژی گرت و بۆ نوێژ وەستا. دوای ئەو ژنێك هات و بەهەمان شێوە دەستنوێژی گرت و لای ئەو وەستا، دواتر گەنجێك هات و دەستنوێژی گرت و لای ئەوان وەستا.

بەعەباسم وت: ئەمە کێیە؟

وتی: برازاکەی من محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی عەبدولموتەلیبە و دەڵێت خواوەند ئەوی وەك پێغەمبەر(د.خ) هەڵبژاردووە و ئەمە برازاکەم عەلی کوڕی ئەبی تالیبە کەباوەڕی بەدینەکەی ئەو هێناوە و ئەم ژنە، هاوسەرەکەی خەدیجە کچی خوەیلدە و شوێنکەوتەی دینەکەی ئەوە.

عەفیف دوای ئەوەی باوەڕی هێنا، دەیوت: خۆزگە چوارەم موسوڵمان دەبووم.

لەباوکی حازمی مەدەنی و لەکەلبی دەگێڕنەوە: عەلی یەکەم کەس بوو باوەڕی بەئیسلام هێنا.

کەلبی دەڵێت: عەلی کاتێك باوەڕی هێنا، تەمەنی حەوت ساڵ بوو.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: یەکەم نێرینە باوەڕی بەئیسلام هێناو وتەکانی پێغەمبەری(د.خ)پشتراست کردەوە، عەلی کوڕی ئەبی تالیب و لەو کاتەدا دەساڵان بوو. یەکێك لەو نیعمەتەکانی خواوەند پێی بەخشی ئەوە بوو پێش ئیسلام، هاوڕێیەتی و هاوەڵایەتی پێغەمبەری(د.خ) دەکرد.

لەکوڕی حەجاج دەگێڕنەوە: لەبەخشینەکانی خواوەند سەبارەت بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەو چاکییانەی بەوی بەخشی ئەوە بوو: قوڕەیشییەکان گرفتاری قاتوقڕی بوون، نانخۆرەکانی ئەبوتالیب زۆر بوون. پێغەمبەر(د.خ) بەعەباسی مامی وت کەلەهەموویان دەوڵەمەندتر بوو: ئەی عەباس، ئەبوتالیبی برات نانخۆری زۆری هەیە و وەك دەبینی خەڵکان گرفتاری قاتوقڕی بوون، با کەمێك لەقورسایی سەرشانی ئەو سووك بکەین. من یەکێك لەکوڕەکانی ئەو هەڵدەگرم و تۆیش یەکیان.

عەباس رازی بوو. ڕۆشتنە لای ئەبو تالیب و وتیان: دەمانەوێت هاوکاریت بکەین تا ئەم بەڵایە نامێنێت.

ئەبو تالیب وتی: عەقیل لای من بەجێبێڵن، چیتان پێخۆشە بیکەن. پێغەمبەر(د.خ) عەلی هەڵگرت و بردی بۆماڵەکەی خۆی و عەباس جەعفەری برد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لای پێغەمبەر(د.خ) مایەوە تا ئەو کاتەی بۆ پێغەمبەرایەتی راسپێردرا. عەلی باوەڕی پێهێنا و جەعفەر لای عەباس بوو تا ئەو کاتەی باوەڕی بەئیسلام هێنا و لەو بێ نیاز بوو.

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی نوێژ دەڕۆشتە دۆڵەکانی مەککە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەدوور لەچاوی باوك و مامەکانی لەگەڵیدا دەڕۆشت و نوێژیان دەخوێند و کاتێك شەو دادەهات، دەگەڕانەوە. ماوەیەکیان بەمشێوەیە بەسەر برد. ڕۆژێك نوێژیان دەکرد، ئەبوتالیب ئەوانی بینی و بە پێغەمبەری(د.خ) وت: ئەی کوڕی براکەم، ئەم دینەی تۆ چییە؟

پێغەمبەر(د.خ) وەڵامی دایەوە: ئەمە دینی خوا و فریشتەکان و پێغەمبەران و دینی باوکی ئێمە ئیبراهیمە و خواوەند منی بۆ بڵاو کردنەوەی راسپاردووە و شیاوە تۆیش بەم بانگەوازە رازی بیت و لەم کارەدا هاوکاریم بکەیت.

ئەبو تالیب وتی: برازاکەم ناتوانم پشت بکەمە دینی خۆم و باو باپیرانم، بەڵام تا ئەو کاتەی زیندووم کەس ناتوانێت ئازاری تۆ بدات.

گێڕانەوەیەکی دیکە لەکوڕی ئیسحاق لەئارادایە بەم ناوەڕۆکە: ئەبوتالیب بەعەلی وت: کوڕی خۆم، ئەم ئایینە چییە باوەڕت پێی هێناوە.

وەڵامی دایەوە: باوکە گیان، باوەڕم بەخوا و پێغەمبەرەکان هێنا و شوێن دینەکەی محەممەد کەوتووم و لەگەڵ ئەودا نوێژ دەخوێنم.

ئەبو تالیب وتی: ئەو بۆ چاکەکاری هانت دەدات، شوێنکەوتەی بە.

لەموجاهید دەگێڕنەوە: عەلی دە ساڵە بوو باوەڕی بەئیسلام هێنا. واقدی دەڵێت:

(( هاوەڵانی ئێمە کۆکن لەسەر ئەوەی عەلی یەك ساڵ دوای ئەوەی بوو بەزڕکوڕی پێغەمبەر(د.خ))، باوەڕی بەئیسلام هێنا و دوانزە ساڵ لەمەککە بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: یەکەم کەس باوەڕی هێنا، ئەبوبەکر بوو.

عەمرۆ کوڕی عەبەسە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەعەکاز بوو. ڕۆشتمە لای و پرسیم، ئەی پێغەمبەر(د.خ)، چ کەسێك باوەڕی پێ هێناوی؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوو پیاو باوەڕیان بەدینەکەی من هێناوە یەکیان ئازادە و ئەوی دیکەیان غولام. ئەبوبەکر و بیلال.

دەڵێت: لەو کاتەدا باوەڕم هێنا و چوارەم باوەڕدار بووم.

جوبەیر کوڕی نوفەیر دەڵێت: ئەبوزەر و کوڕی عەبەسە هەردووکیان دەیانوت ئێمە چوارەم موسوڵمانین و پێش ئێمە جگە لە پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر و بیلال کەسی دیکە باوەڕی نەهێنابوو، کەس نەیدەزانی چ کەسێکی دیکە باوەڕی هێناوە.

لەموغەیرە کوڕی ئیبراهیم دەگێڕنەوە: یەکەم کەس باوەڕی هێنا، ئەبوبەکر بوو.

دەستەیەك وتوویانە: پێش ئەبوبەکر دەستەیەکی دیکە باوەڕیان بەئیسلام هێنابوو.

محەممەد کوڕی سەعد دەڵێت: بەباوکم وت: ئایا ئەبوبەکر پێش هەمووان باوەڕی هێنا؟

وتی: نە، زیاتر لەپەنجا کەس باوەڕیان هێنا بوو بەڵام باوەڕی ئەو لەهەمووان باشتر بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: یەکەم کەس باوەڕی بەئیسلام هێنا، زەید کوڕی حارسە کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

لەزوهریان پرسی: یەکەم موسوڵمان کێ بوو؟

وتی: لەژنان خەدیجە و لەپیاوان زەید کوڕی حارسە.

بەڵام لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق ئاماژەی پێدراوە: زەید کوڕی حارسە کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) یەکەم نێرینە بوو دوای عەلی کوڕی ئەبی تالیب باوەڕی بەئیسلام هێنا. دوای ئەوان ئەبوبەکر کوڕی ئەبی قوحافە موسوڵمان بوو و باوەڕی خۆی ئاشکرا کرد و خەڵکەکەی خۆی بۆ ئەو کارە هاندەدا.

دەڵێت: ئەبوبەکر کەسێکی کۆمەڵایەتی بوو، ڕەچەڵەك و نەژادی قورەیشییەکانی بەباشی دەزانی و چاك و خراپی دەناسییەوە. پیاوێکی بازرگان و چاکەکار بوو. خەڵکان بەهۆی زانست و بازرگانی و چاکەکاری لەدەوری کۆدەبوونەوە. ئەبوبەکر، بانگەوازی ئیسلامی بەو کەسانە دەوت کەباوەڕی پێیان بوو. عوسمان کوڕی عەفان و زوبەیر کوڕی عەوام و عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و تەڵحە کوڕی عوبەیدالله لەسەر دەستی ئەو باوەڕیان بەئیسلام هێنا و کاتێك رازی بوون، ئەوانی بردە لای پێغەمبەر(د.خ) کەهەموویان باوەڕیان هێنا و لەپشت سەری پێغەمبەر(د.خ) نوێژیان خوێند. ئەم هەشت کەسە زووتر لەهەموان باوەڕیان هێنا و نوێژیان کرد و وتەکانی پێغەمبەریان پشتڕاست کردەوە. دوای ئەوان چەندین کەس لەژنان و پیاوانی مەککە باوەڕیان بەئایینەکە هێنا و ئیسلام و موسوڵمانی لەناو مەککەدا بلاو بوویەوە.

واقدی دەڵێت: هاوەڵانی ئێمە کۆکن یەکەم موسوڵمان خەدیجە بوو باوەڕی بە پێغەمبەر(د.خ) هێنا و وتەکانی پشتڕاست کردەوە. بەڵام سەبارەت بەئەبوبەکر و عەلی و زەید جیاوازی هەیە لەوەی کامیان زووتر لەوانی دیکە باوەڕی هێنا.

هەروەها واقدی دەڵێت: خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس پێنجەم موسوڵمان بوو. ئەبوزەریش بەچوارەم یا پێنجەم موسوڵمان دەزانن.

عەمرۆ کوڕی عەبەسەی سولەمی بەچوارەم یا پێنجەم موسوڵمان دەزانن.

دەڵێت: سەبارەت بەم کەسانە جیاوازی هەیە کەکامیان زووتر باوەڕی بەئیسلام هێنا. گێڕانەوەکان سەبارەت بەوان فراوان و جیاوازن.

محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی نەوفل دەڵێت: باوەڕهێنانی زوبەیر بەدوای ئەبوبەکر بوو. ئەو چوارەم یا پێنجەم موسوڵمان بوو.

بەڵام لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق ئاماژەی پێدراوە: خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس و ژنەکەی هەمینە کچی خەلەف کوڕی ئەسعەد کوڕی عامر کوڕی بیازەی خوزاعی، دوای چەند کەسێکی دیکە، باوەڕیان هێنا.

سێ ساڵ دوای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(د.خ)، خواوەند فەرمانی پێدا بانگەوازەکەی خۆی ئاشکرا بکات و فەرمووی:

(( فاصدع بما تؤمروا عرض عن المشركين.

واتاکەی: ئەوەی فەرمانت پێدراوە، ئاشکرای بکە و لەکافران خۆت بەدوور بگرە.))

پێشتر، بانگەوازەکەی پێغەمبەر(د.خ) بەشێوەیەکی نهێنی بوو.

هەروەها خواوەند دەفەرمێت:

((و انذر عشيرتك الاقربين، و اخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنين، فان عصوك فقل انی بری مما تعملون.

واتاکەی: کەسانی نزیك بترسێنە، بۆ ئەو باوەڕدارانەی شوێنت کەوتوون، بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکە، ئەگەر نافەرمانی تۆیان کرد، بڵێ، لەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن، بێزارم.

دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی نوێژ دەڕۆشتنە ناو دۆڵەکان و بەدوور لەچاوی خەڵکان نوێژیان دەخوێند. ڕۆژێك سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و دەستەیەك لەموسوڵمانەکان لەیەکێك لەدۆڵەکان نوێژیان دەخوێند. دەستەیەك لەبتپەرستەکان ئەوانیان بینی و ڕەخنەیان لێگرتن. شەڕ و ئاژاوەی لێکەوتەوە. سەعد کوڕی ئەبی وەقاس بەئێسقانی وشتر لەیەکێك لەبتپەرستەکانیدا و سەری شکاند. ئەمە یەکەم خوێن بوو لەئیسلامدا ڕژا.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) ڕۆژێك بەسەفادا سەرکەوت و هاواری کرد. قورەیشییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و وتیان: چیت بەسەر هاتووە؟

فەرمووی: ئەگەر ئاگادارتان بکەمەوە بەرەبەیان یا شەوانە دوژمن هێرشتان دەکاتەسەر، ئایا باوەڕ بەوتەکانی من دەکەن؟

وتیان: بەڵێ.

فەرمووی: من لەئازابێکی مەترسیدار ئاگادارتان دەکەمەوە.

ئەبولەهەب وتی: بۆ ئەمە ئێمەت کۆکردۆتەوە؟ خواوەند سوورەی ئەبولەهەبی ناردە خوار و فەرمووی:

((تبت يدا ابی لهب و تب، ما اغنی عنه ماله و ما كسب، سيصلی نارا ذات لهب، و امراته حماله الحطب، فی جيدها من مسد.

واتاکەی: دەستەکانی ئەبی لەهەب زیانی پێبگات و زیانی پێگەیشتووە. سامان و ئەوەی بەدەستی هێنا، هیچ هاوکارییەکیان نەکرد، بەزوویی گرفتاری ئاگرێکی بڵێسەدار دەبێت لەگەڵ ژنەکەی کەچیلکە بەکۆڵ دەکێشێت و تەنافێکی چنراوی لەملدایە))

هەروەها لەکوڕی عەباس گێڕانەوەیەکی دیکە لەبەر دەستایە: کاتێك ئایەی و انذر عشیرتك الاقربین هاتەخوار، پێغەمبەر(د.خ) بەسەفادا سەرکەوت و هاواری کرد و خەڵکان وتیان: ئەمە کێیە هاوار دەکات؟

وتیان: محەممەدە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیب، ئەی منداڵەکانی عەبدمەناف، کاتێك خەڵکان کۆبوونەوە، فەرمووی: ئەگەر بڵێم لەداوێنی کێوەکەدا سوپایەك خۆی مەڵاس داوە، ئایا باوەڕ بەوتەکانی من دەکەن؟

وتیان: تا هەنووکە درۆمان لەتۆ نەبیستووە.

فەرمووی: ئێوە لەئازابێکی مەترسیدار ئاگادار دەکەمەوە کە لەبەردەمتانایە.

ئەبو لەهەب وتی: بۆ ئەم مەبەستە ئێمەت کۆکردۆتەوە؟ سوری تبت یدا ابی لهب هاتەخوار.

لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب دەگێڕنەوە: کاتێك ئایەی و انذر عشیرتك الاقربین هاتە خوار، پێغەمبەر(د.خ) بانگی کردن و فەرمووی: خواوەند فەرمانی پێداوم کەسانی نزیکی خۆم ئاگادار بکەمەوە و دڵگرانم چوونکە دەزانم کاتێك وتەکانم دەسپێبکەم، خراپەم لەگەڵ دەکەن. بێدەنگ بووم تا جبرەئیل هات و وتی: ئەی محەممەد، ئەگەر ئەوەی فەرمانت پێدراوە ئەنجامی نەدەیت، خواوەند سزات دەدات. خواردنێك دروست بکە و ڕانێکی مەڕی بخەسەر و دەفرێك لیوالیو بکە لەشیر ومنداڵەکانی عەبدولموتەلیب کۆبکەرەوە تا لەگەڵ ئەوان بدوێم و پەیامەکەم بگەیێنم.

دەڵێت: فەرمانەکانیم ئەنجامدا و خەڵکانم بانگ کرد. چل کەس بوون، یەکێك کەمتر یا زیاتر. مامەکانی ئەبوتالیب و حەمزە و عەباس و ئەبولەهەب لەناویاندا بوون. کاتێك کۆبوونەوە، پێی وتم خواردنەکە بێنم. کاتێك خواردنەکەم هێنا، پێغەمبەر(د.خ) لەتە گۆشتێکی هەڵگرت و بەدیان لەت و کوتی کرد و لای دەفرەکە داینا و فەرمووی: بەناوی خواوەند دەسپێبکەن.

دەڵێن: خزمان نانیان خوارد. هیچ شتێك کەم نەبوو. سوێند بەو کەسەی گیانی من

لەدەستی ئەودایە، ئەو خوراردنەی بۆ هەموویانم هێنابوو، بەتەنیا یەك كەسیان دەیخوارد. دواتر پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواردنەوەیان دەرخواردبدە.

دەفرە شیرەكەم هێنا و خواردیانەوە تا هەموویان تێر بوون، سوێند بەو خوایەی گیانی من لەدەستی ئەودایە، تەنیا بەشی یەك كەسیانی دەكرد. كاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی ئەوەی كرد وتەكانی دەستپێبكات، ئەبولەهەب پێشدەستی كرد و وتی: هاورێیان ئێوەی جادوو كرد.

خەڵكان بلاوەیان لێكرد و پێغەمبەر(د.خ) نەیتوانی لەگەڵیان بدوێت.

دەڵێت: رۆژێكی دیكە پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرمووم: ئەم پیاوە وەك بینیت لەقسە كردن پێش من كەوتەوە و خەڵكان بلاوەیان لێكرد. دووبارە خواردنێك ئامادە بكە و بانگێشتیان بكەرەوە.

ئەو كارەم كرد و خەڵكانم بانگێشت كرد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدام خواردنەكە بێنم و كارەكەی رۆژی پێشووی خۆی دووبارە كردەوە. خواردنیان خوارد و هیچ شتێك كەم نەبوو. شیریان خوارد تا هەموویانم تێر بوون.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) وتەكانی دەسپێكرد و فەرمووی: ئەی منالەكانی عەبدولموتەلیب، سوێند بەخوا هیچ كام لەعەرەبەكان شتێكی باشتریان نەهێناوە لەوەی من بۆ خەڵكەكەی خۆم هێناومە، من خێری ئەم دنیا و ئەو دنیام بۆ هێناون و خواوەند فەرمانی پێداوم بانگەوازەكەی خۆم بەئێوە رابگەیێنم. خەڵكانی من لەم كارەدا هاوكاری بكەن تا ببنە جێگری من و جێنشینی من.

دەڵێت: بێدەنگ بوون و من لەهەموویان كەم تەمەنتر بووم، وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) من پشتیوانی تۆ دەبم.

پێغەمبەر(د.خ) ملی منی گرت و وتی: ئەمە برا و جێگر و جێنشینی منە. شوێنكەوتەی ئەو بن.

دەڵێت: خەڵكان بەدەم پێكەنینەوە هەستا و بەئەبوتالیبیان وت: پێی وتی فەرمانبرداری وتەكانی كورەكەت بیت.

رەبیعە كوڕی ناجد دەڵێت: كەسێك بەعەلی كوڕی ئەبی تالیبی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، میراتی كوڕی مامەكەت بەتۆ گەیشت و بە مامت نەگەیشت؟

عەلی وتی: (كۆببنەوە) سێ جار وتی تا ئەوەی خەڵكان كۆبوونەوە و گوێیان گرت.

وتی: پێغەمبەر(د.خ) منداڵەکانی عەبدولموتەلیب و هەموو کەسەکانی خۆی بانگ کرد کەهەر کامیان بەتەنیا بزنێکی دەخوارد و دەفرێك شیری دەخواردەوە. خواردنێکی کەمی دروست کردبوو کەهەموویان خواردیان و تێر بوون بەلاّم خواردنەکە وەك خۆی مابوویەوە، دەفرێك شیری هێنا، لێیان خوارد و تێر بوون بەلاّم شیرەکە وەك خۆی مابوویەوە وەك بڵێی کەس دەستی لێنەداوە.

دوای ئەوە قسەی کرد و فەرمووی: ئەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیب، من بۆ لای ئێوە بەتایبەت و بۆ لای خەڵکان بەگشتی راسپێردراوم و بانگەوازەکەی منتان بیستووە، کێتان بەیعەت لەگەڵ من دەکات تا برا و جێگری من لەم کارەدا بێت؟

دەڵێت: کەس هەڵنەستا و من کە لەهەموویان منداڵتر بووم، هەستام، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دانیشە.

دووبارە قسەکەی دووبارە کردەوە و سێ جار وتەکانی هێنایە سەرزمان. هەر سێ جارەکە هەستام و فەرمووی: دانیشە.:

جاری سێیەم دەستی خۆی خستە ناو دەستی من. لەبەر ئەمەیە من جێگر و میرات هەڵگری ئەوم.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بانگەوازەکەی خۆی ئاشکرا کرد و پێشنیاری باوەڕهێنان و ئیسلامی بەخەڵکان کرد، خەڵکەکەی نەخۆیان لێ دوورخستەوە و نەحاشایان لێکرد تا ئەو کاتەی رەخنە و ئیهانەی خواکانی ئەوانی کرد. لەم کاتەدا دژی ئەو وەستانەوە و پەیمانیان بەست. ئەبوتالیب پشتیوانی لێکرد و پێغەمبەر(د.خ) سەرقاڵی بانگەوازەکەی خۆی بوو و هیچ بەربەستێك لەسەر رێگەی نەدەبینرا.

کاتێك قورەیشییەکان بینیان پێغەمبەر(د.خ) دەستبەرداری بانگەوازەکەی خۆی نابێت و ئەبو تالیب پشتیوانی لێدەکات، دەستەیەك لەگەورەکانی قورەیش و لەناویان عوتەبە کوڕی رەبیعە و شەیبە کوڕی رەبیعە و ئەبوئەلبەختەری کوڕی هوشام و ئەسوەد کوڕی موتەلیب و وەلید کوڕی موغەیرە و ئەبوجەهل کوڕی هوشام و عاس کوڕی وائیل و نەبییە و مونەبە کوڕەکانی حەجاج ڕۆشتنە لای ئەبوتالیب و وتیان: ئەی ئەبو تالیب، برازاکەت جوێن بەخواکانی ئێمە دەدات و بۆ دینەکەمان سەرکۆنەمان دەکات. ئێمە بەبێ ئاوز لەقەڵەم دەدات و باوکانمان بەگومڕا دەناسێنێت، یا لەئێمەی دوور بخەرەوە یارێگە بدە دژی بوەستینەوە چوونکە تۆیش هاوشێوەی ئەو، دژی ئێمەیت.

ئەبوتالیب بەنەرمی قسەی لەگەڵ کرد و ڕۆشتن. پێغەمبەر(د.خ) سەرقاڵی بانگەوازەکەی خۆی بوو. دەسەڵاتی فراوان و خەڵکان داخ لەدڵ بوون. قوڕەیشییەکان سەبارەت بە پێغەمبەر(د.خ) قسەی زۆریان هێنایە سەرزمان و یەکتریان دژی ئەو هاندەدا.

جارێکی دیکە دەستەیەك لەگەورەکانی قوڕەیش ڕۆشتنە لای ئەبو تالیب و وتیان: ئەی ئەبو تالیب، تۆ لەروانگەی تەمەن و پێگەوە گەورەتر لەئێمەیت، داوامان لێکردیت ڕێگە لەبرازاکەت بگریت بەڵام ئەو کارەت نەکرد. سوێند بەخوا رازی نابین جوێن بەباوکانی ئێمە بدات و بەکەم ئاوزمان بزانێت و رەخنە لەخواکانمان بگرێت، یا لەم کارانەی دووری دەخەیتەوە یا دژی تۆ و ئەو دەوەستینەوە بۆ ئەوەی یا ئێمە لەناو بچین یا ئێوە.

کاتێك قوڕەیشییەکان ڕۆشتن، ئەبو تالیب لەدوژمنایەتی کردنی خەڵکەکەی ترسا چوونکە نەیدەویست پێغەمبەر(د.خ) تەسلیمی ئەوان بکات یا دەست لەهاوکاری کردنی هەڵبگرێت.

لەسەدی دەگێڕنەوە: دەستەیەك لەقوڕەیشییەکان کۆبوونەوە، ئەبوجەهل کوڕی هوشام و عاس کوڕی وائیل و ئەسوەد کوڕی عەبدولموتەلیب و ئەسوەد کوڕی عەبد یەغوس و کەسانێکی دیکە لەخەڵکەکەی لەناویاندا دەبینران. بەیەکیان وت: دەڕۆینە لای ئەبوتالیب وسەبارەت بە محەممەد قسەی لەگەڵ دەکەین تا داوەری بکات و ڕێگەی ئیهانە کردنی خواکانی ئێمەی لێبگرێت. ئێمەیش ئیهانەی خواکەی ئەو ناکەین چوونکە دەترسین ئەم پیرە بمرێت و ئێمە بەرابەر بە محەممەد کارێك ئەنجام بدەین و دواتر عەرەبەکان بۆ کارەکەمان سەرکۆنەمان بکەن و بڵێن، نەیانتوانی هیچی لەگەڵدا بکەن تا ئەو کاتەی مامەکەی مرد و دوای ئەوە، دژی وەستانەوە.

دەڵێت: کەسێکیان بۆ لای ئەبو تالیب بەناوی موتەلیب، وتی: سەران وپیرانی خەڵك دەیانەوێت تۆ ببینن.

ئەبوتالیب وتی: بیانهێنە. کاتێك هاتن، وتیان: ئەی ئەبو تالیب تۆ گەورە و سالاری ئێمەیت و داوەری و دادپەروەری بکە. ڕێگە لەبرازاکەت بگرە بۆ ئەوەی چیتر ئیهانەی خواکانی ئێمە نەکات و ئێمەیش چیتر خواکەی ئەو، ئیهانە ناکەین.

دەڵێت: ئەبوتالیب کەسی بەدوای پێغەمبەردا(د.خ) نارد وهات. پێی وت: کوڕی

برام، سەرکردەکان و گەورەکانی خەڵکەکەت داوای دادپەروەری لەتۆ دەکەن بۆ ئەوەی ئیهانەی خواکانیان نەکەیت و ئەوانیش ئیهانەی خواکەی تۆ نەکەن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پێشنیاری دینێکیان پێدەکەم لەدینەکەی خۆیان باشترە بۆیان.

ئەبو تالیب وتی: پێشنیاری چییان پێدەکەیت؟

فەرمووی: دەمەوێت یەك وشە بێننە سەرزمان بۆ ئەوەی عەرەبەکان هەموویان ملکەچیان بن و بەسەر عەجەمەکاندا زاڵ بن.

دەڵێت: ئەبوجەهل وتی: چ وشەیەکە تا دەجار بیهێنینە سەر زمان.

فەرمووی: بڵێن لا الە الا اللە.

دەڵێت: رازی نەبوون و وتیان داوای شتێکی دیکە بکە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر خۆر بێنن و بیخەنە سەر دەستی راستم، جگە لەوە هیچی دیکەم ناوێت.

دەڵێت: قورەیشییەکان تووڕە بوون و هەستان و وتیان: سوێند بەخوا ئیهانە و جوێنبارانی خواکەت دەکەین کە بەم شێوە فەرمانی پێداویت. خواوەند لەقورئاندا دەفەرمێت:

(( و انطلق الملاء منهم ان امشوا و اصبروا علی آلهتکم ان هذا الشیئی یراد. ما سمعنا بهذا فی الملة الاخرة ان هذا الا اختلاق.

واتاکەی: گەورەکانیان ڕۆشتن و وتیان، بڕۆن و لەگەڵ خواکانتان بسازێن چوونکە ئەمە شتێکی گونجاو و پەسەندە. شتی لەم شێوەم لەنەتەوەکانی دیکە نەبیستووە و ئەم تەنیا ریاکارییە.))

ئەبو تالیب بە پێغەمبەر(د.خ) وت: کوڕی برام، قسەیەکی ناڕەوات نەهێنایە سەرزمان. پێغەمبەر(د.خ) پێشنیاری ئیسلامی پێکرد و وتی: یەك وشە بێنەرە سەرزمان تا لەرۆژی هەستانەوە شایەتی تۆ بم، بڵێ: لا الە الا اللە.

وتی: ئەگەر عەرەبەکان سەرکۆنەیان نەدەکردم و نەیاندەوت لەمەرگ ترسا، ئەو وشەم دەهێنایە سەرزمان، بەڵام شوێنکەوتەی دینی باب و باپیرانم.

کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك ئەبوتالیب نەخۆش کەوت، دەستەیەك لەقورەیشییەکان ڕۆشتنە لای، ئەبوجەهل یەکێك بوو لەوان. وتیان: برازاکەت، جوێن بەخواکانی ئێمە و

فلاّنە کار و فیسارە کار ئەنجام دەدات و ئەمە و ئەوە دەڵێت. ڕێگەی ئەو کارانەی لێبگرە.

ئەبوتالیب پێغەمبەری(د.خ) بانگ کرد و کاتێك هات لەنێوان ئەبو تالیب و کەسانیتر جێگەی یەك کەس بۆ دانیشتن دەبوویەوە. ئەبوجەهل کاتێك ئەمەی بینی ترسا ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) لای ئەبوتالیب دانیشێت بەزەیی پیاییدا بێتەوە، لەبەر ئەمە هەستا و لەو جێگەیە دانیشت. پێغەمبەر(د.خ) لەنزیك مامی نەیتوانی دانیشت و لای دەرگاکە دانیشت. ئەبوتالیب پێی وت: کوڕی برام، خزمەکانت سکالاّیان هەیە و دەڵێن جوێن بەخواکانیان دەدەیت. قوڕەیشییەکان قسەیان کرد و پێغەمبەر(د.خ) وەلاّمی دانەوە و وتی: دەمەوێت یەك وشە بێنە سەرزمان بۆ ئەوەی عەرەبەکان ملکەچتان ببن و عەجەمەکان باجتان پێبدەن.

ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر خزمەکانی دانا و وتیان: دە وشە دەڵێین، ئەو وشەیە چییە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڵێن لا اله الا الله.

خزمەکانی تووڕە هەستان و وتیان: دەیەوێت هەموو خواکان بکاتە یەك.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك قوڕەیشییەکان بەو شێوەیە لەگەڵ ئەبوتالیب قسەیان کرد و ڕۆشتن، کەسی بەدوای پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە کرد و کاتێك هات، پێی وت: کوڕی برام، خزمەکانت هاتبوون و ئەمە و ئەوەیان دەوت. من و خۆت بپارێزە و زیاتر لەتوانایی من کێشەم بۆ دروست مەکە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی بیست، گومانی کرد بۆچوونی مامی گۆڕاوە و چیتر پشتیوانی لێناکات، فەرمووی: مامە گیان ئەگەر خۆر بخەنە دەستی ڕاست و مانگ بخەنە دەستی چەپم، لەو کارە چاو ناپۆشم تا ئەو کاتەی خواوەند سەرکەوتنم پێدەبەخشێت یا لەم ڕێگەدا دەکوژرێم.

پێغەمبەر(د.خ) گریا و مەبەستی ئەوەی کرد بڕوات. ئەبوو تالیب بانگی کرد، کاتێك هات وتی: کوڕی برام، بڕۆ چیت پێخۆشە بیڵێ چوونکە سوێند بەخوا هەرگیز تەسلیمت ناکەم.

دەڵێت: کاتێك قوڕەیشییەکان زانیان ئەبوتالیب دەست لەهاوکاری کردنی پێغەمبەر(د.خ) هەڵناگرێت و مەبەستی جیابوونەوە و دژایەتی هەیە، عەمارە کوڕی

وەلید کوڕی موغەیرەیان بردە لای و وتیان: ئەی ئەبوتالیب، ئەوە عەمارە کوڕی وەلید، قۆزترین و شاعیرترین گەنجی قوڕەیش، هەڵیگرە بۆخۆت تا ببێتە بەردەست و هاوکاری تۆ و خزمەتی تۆ بکات و بەکوڕی تۆ ناو ببرێت بەڵام لەجیاتی ئەو برازاکەت تەسلیم بەئێمە بکە کەپشتی کردۆتە دینی تۆ و باوکانی تۆ و دوو بەرەکی لەناو ئێمەدا ناوەتەوە تا بیکوژین و بەمشێوەیە پیاوێك لەبەرابەر پیاوێك.

ئەبوتالیب وتی: بەراستی خراپەکارن، کوڕی خۆتان بەمن دەدەن تا خواردنی پێبدەم و کوڕی خۆم بەئێوە بسپێرم تا بیکوژن، سوێند بەخوا هیچ کات ئەمە روونادات.

موتعیم کوڕی عودەی کوڕی نەوفل کوڕی عەبدمەناف وتی: سوێند بەخوا ئەی ئەبو تالیب، خەڵکەکەت دادپەروەریان لەگەڵ تۆ کرد و هەوڵیاندا کارێك نەکەن تۆ پەسەندی نەکەیت، بەڵام ناتەوێت رازی بیت.

ئەبوتالیب لەوەڵامدا وتی: سوێند بەخوا دادپەروەری ناکەن بەڵام تۆ ئەوان دژی من هان دەدەیت، چیت پێخۆشە بیکە.

دەڵێت: لەم کاتەدا بوو کێشەکە گەورەتر و خەڵکان دژایەتی یەکیان ئاشکرا کرد و دەنگیان لەیەك بەرز کردەوە.

بەمشێوەیە هەرکام لەهۆزەکانی قوڕەیش دژی موسوڵمانەکانی خۆیان وەستانەوە و دەستیان بەئەشکەنجە کردنی ئەوان کرد بۆ ئەوەی لەدینەکەیان پاشگەز ببنەوە، بەڵام خواوەند لەپەنای ئەبوتالیب زیانەکانی لە پێغەمبەر(د.خ) دوورخستەوە.

ئەبوتالیب کاتێك کردەوەی قوڕەیشییەکانی بینی، لەگەڵ منداڵەکانی هاشم و منداڵەکانی عەبدولموتەلیب قسەی کرد و داوای لێکردن پشتیوانی لە پێغەمبەر(د.خ) بکەن. ئەوانیش بۆ پشتیوانی کردن لە پێغەمبەر(د.خ) هاوپەیمان بوون جگە لەئەبولەهەب کەدژایەتی دەکردن. ئەبوتالیب لەپشتیوانی خەڵکەکەی شادمان و وەسفی پێغەمبەری(د.خ) کرد بۆ ئەوەی هێز و دەسەڵاتەکەی فراوان ببێت.

عوروە کوڕی زوبەیر لەنامەیەك بۆ عەبدولمەلیك کوڕی مەروان نووسیبووی: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) پێشنیاری رێگەی راستی بەخەڵکەکەی کرد و سەرەتا دژی نەوەستانەوە، هیوادار بوو گوێ لەوتەکانی بگرن بەڵام کاتێك خراپەی بتەکانی هێنایە سەرزمان، دەستەیەك لەدەسەڵاتدارانی قوڕەیش کە لەتائیفەوە هاتن، حاشایان لەراستی قسەکانی کرد و خەڵکەکەی خۆیان بۆ دژایەتی کردنی ئەو، هاندا. زۆرینەی خەڵك خۆیان لەوان بەدوور گرت مەگەر ژمارەیەکی کەم کەخوا ئەوانی پاراست.

دوای ئەوە سەرکردەکانی قورەیش بڕیاریاندا کەسان و منداڵەکانی خۆیان لەموسوڵمان بوون پاشەگەز بکەنەوە. بەمشێوەیە بارودۆخی شوێنکەوتەکانی پێغەمبەر(د.خ) دژوار بوو، دەستەیەکیان لەدینەکەی خۆیان گەڕانەوە و دەستەیەکی دیکە نا. کاتێك موسوڵمانان کەوتنە تەنگانەوە، پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا بۆ سەرزەمینی حەبەشە بڕۆن چوونکە پاشاکەی خۆپەرەست بوو کە بەنەجاشی ناویان دەبرد. کەس لەسنوری فەرمانڕەوایەتی ئەو ستەمی لێنەدەکرا و سەرزەمینی حەبەشە شوێنی بازرگانی کردنی قورەیشییەکان بوو. کاتێك موسوڵمانان لەمەککە رووبەرووی ئازار بوونەوە، زۆربەیان بۆ حەبەشە کۆچیان کرد. پێغەمبەر(د.خ) مایەوە و قورەیشییەکان بەهەمان شێوە لەسەر خراپەکاری لەگەڵ موسوڵمانان بەردەوام بوون تا ئەو کاتەی ئیسلام لەناو مەککەدا بڵاو بوویەوە و ژمارەیەك لەگەورەکانی قورەیش باوەڕیان بەئیسلام هێنا.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: سەبارەت بەژمارەی ئەو کەسانەی یەکەم جار بۆ حەبەشە کۆچیان کرد، بۆچوونەکان جیاوازن. دەستەیەك وتوویانە یانزە پیاو و چوار ژن بوون.

لەحارس کوڕی فوزەیل دەگێڕنەوە: کۆچکەرانی حەبەشە بەشێوەیەکی نهێنی ڕۆشتنەدەر و یانزە پیاو و چوار ژن بوون. سوارە و پیادە گەیشتنە شۆعەیبییە و خواوەند، سەرکەوتنی بەموسوڵمانەکان بەخشی. کاتێك گەیشتنە ئەو ناوچەیە، دوو کەشتی بازرگانی ئامادە بوو و ئەوانی بەنیوەی دینارێك بۆ حەبەشە برد. سەفەری ئەوان لەڕەجەبی ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(د.خ) بوو. قورەیشییەکان شوێنیان کەوتن بەڵام کاتێك گەیشتنە دەریا، موسوڵمانەکان ڕۆشتبوون و نەیانتوانی بیانگرن. کاتێك گەیشتنە حەبەشە، ئاسوودە بوون چوونکە کەس دژایەتی دینەکەی ئەوانی نەدەکرد.

لە محەممەد کوڕی سەعدی واقدی دەگێڕنەوە کەژنان و پیاوانی کۆچکەر بۆ حەبەشە ئەم کەسانە بوون:

عوسمان کوڕی عەففان هاوڕێ لەگەڵ ژنەکەی ڕوقییە کچی پێغەمبەر(د.خ) .

باوکی حوزەیفە کوڕی عوتبە کوڕی ڕەبیعە لەگەڵ ژنەکەی سەهلە کچی سوهەیل کوڕی عومەر.

زوبەیر کوڕی عەوام کوڕی خوەیلد کوڕی ئەسەد.

مەسعەب کوڕی عومەیر کوڕی هاشم کوڕی عەبدمەناف کوڕی عەبدئەلدار.

عەبدولرەحمان کوڕی عەوف کوڕی عەبدعەوف کوڕی حارس کوڕی زەهرە.

باوکی سەلمە کوڕی عەبد ئەلئەسەد کوڕی هیلال کوڕی عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی مەخزوم لەگەڵ ژنەکەی دایکی سەلمە کچی ئەبی ئومەییە کوڕی موغەیرە کوڕی عەبدوالله کوڕی عومەر کوڕی مەخزوم.

عوسمان کوڕی مەزعونی جومەحی.

عامر کوڕی رەبیعەی عەنزی لەگەڵ ژنەکەی لەیلی کچی باوکی خەسمە.

ئەبی سەبرە کوڕی ئەبی روهم کوڕی عەبدولعوزەی عامری.

حاتب کوڕی عەمرۆ کوڕی عەبدشەمس.

سوهەیل کوڕی بەیزا لەمناڵەکانی حارس کوڕی فیهر.

عەبدوالله کوڕی مەسعود هاوپەیمانی مناڵەکانی زەهرە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: دەستەیەکی دیکە وتوویانە ئەو موسوڵمانانەی بۆ حەبەشە کۆچیان کرد جگە لەو مناڵە بچووکانەی پێیان بوو، یا لەوێ لەدایك بوون، ئەگەر عەمار کوڕی یاسریش بەیەکێك لەوان بزانین، هەشتا و دوو کەس بوون، بەڵام لەکۆچ کردنی عەمار، گومانمان هەیە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بینی موسوڵمانان گیرۆدەی ئازار و ڕەنجن و ئەو، بەئیرادەی خواوەند و پشتیوانی ئەبوتالیب پارێزراوە، بەڵام ناتوانێت زیان و بەلا لەموسوڵمانان دوور بخاتەوە، فەرمانی پێدان: بەرەو حەبەشە بڕۆن چوونکە لەوێ پاشایەکی لێیە ستەم لەکەس ناکات، تا ئەو کاتەی خواوەند ڕێگە چارەیەك بۆ ئێوە دەدۆزێتەوە. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوتن و ئەمە یەکەم کۆچی موسوڵمانان بوو لەئیسلامدا.

دەڵێت: یەکەم کەسان بۆ حەبەشە کۆچیان کرد ئەم کەسانە بوون:

لەمناڵەکانی ئومەییە کوڕی عەبدشەمس کوڕی عەبدمەناف: عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ هاوسەرەکەی روقییە کچی پێغەمبەر(د.خ).

لەمناڵەکانی عەبدشەمس: باوکی حوزەیفە کوڕی عوتبە کوڕی رەبیعە لەگەڵ ژنەکەی سەهلە کچی سوهەیل کوڕی عەمرۆ.

لەمناڵەکانی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزەی کوڕی قوسەی: زوبەیر کوڕی عەوام.

درێژەی گێرانەوەی کوڕی ئیسحاق هەمان درێژەی گێرانەوەی واقدییە، جگە لەوەی

دوای ئاماژەدان بەناوی ئەبو سەبرە کوڕی ئەبی روهم دەڵێت: بەوتەیەك باوکی حاتب کوڕی عەمرۆ، دەڵێن یەکەم کەس بوو بۆ حەبەشە کۆچی کرد.

هەروەها لەگێڕانەوەکەی کوڕی ئیسحاق، یەکەم کۆچکەرانی حەبەشە، دەکەس بوون.

دەڵێت: دوای ئەوە جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتەدەر و موسوڵمانان یەك لەدوای یەك دەڕۆشتن و لەسەرزەمینی حەبەشە کۆدەبوونەوە، دەستەیەکیان هاوسەرەکانی خۆیانیان بردبوو و دەستەیەکی دیکە بەتەنیا ڕۆشتبوون کەژمارەی هەموویان دەگەیشتە هەشتا و دوو کەس.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بۆ حەبەشە کۆچیان کرد، ئەو، لەمەککە بەئاشکرا و نهێنی بانگەوازەکەی خۆی بەخەڵکان رادەگەیاند و لەپەنای ئەبوتالیب و منداڵەکانی هاشم، لەزیانەکان پارێزراو بوو. قورەیشییەکان کەنەیاندەتوانی زیانی پێبگەیێنن ئەویان بەجادووگەری و شێتی تاوانبار کرد و وتیان شاعیرە. رێگەیان نەدەدا هەموو کەسێك محەممەد ببینێت لەترسی ئەوەی نەکا باوەڕ بەوتەکانی بێنێت و موسوڵمان بێت.

لە عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی عاسیان پرسی دوژمنایەتی قورەیش لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) چۆن بوو؟

وتی: خۆم ئامادە بووم و سەرکردەکانی قورەیش لەحیجر دانیشتبوون. باسی پێغەمبەریان(د.خ) کرد و وتیان: هیچ کات لەگەڵ ئەم پیاوەدا رێگەی سازگاری ناگرینەبەر کە بەبێ ئاوز لەقەڵەممان دەدات و سەرکۆنەی باوکانمان و گاڵتە بەدینەکەمان دەکات و دەیەوێت دوو بەرەکی لەناو ئێمەدا بنێتەوە و خراپەی خواکانمان بڵێت. تا ئێستایش خۆڕاگر بووین.

دەڵێت: لەو کاتەدا ئەم قسانەیان دەکرد، پێغەمبەر(د.خ) دەرکەوت و هات و دەستی لەبەردی ڕەش سوو، دواتر بەدەوری کەعبەدا سووڕایەوە و لەبەردەم خەڵکانەوە تێپەڕی. یەك لەوان قسەیەکی گاڵتەئامێزی هێنایە سەرزمان کەشوێنەوارەکەی بەروخساری پێغەمبەرەوە(د.خ) دەرکەوت. ڕۆشت و جارێکی دیکە لەبەردەم ئەوانەوە تێپەڕی. دووبارە گاڵتەیان پێکرد گەوەستا و فەرمووی: ئەی قورەیشییەکان، دەبیستن، سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، سەرئەنجام دەکوژرێن.

دەڵێت: وتەکەی کاریگەری لەسەر ئەواندانا و بێدەنگ بوون. ئەو کەسانەی زیاتر

لەهەمووان دژایەتییان دەکرد، بەنەرمی وتیان: ئەی باوکی قاسم، بەخۆشی برۆ، تۆ هیچ کات سووك نەبوویت.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و ڕۆژێکی دیکە لەهەمان شوێن کۆببونەوە. منیش لەوێ بووم. بەیەکیان وت: سەبارەت بەو قسەتان دەکرد و کاتێك وتەیەکی ناخۆشی هێنایە سەرزمان، بێدەنگ بوون.

لەم قسانەدا بوون کە پێغەمبەر(د.خ) دەرکەوت و هەموویان هەستان. دەوریان گرت و وتیان: تۆ بوویت فلانە قسە و فیسارە قسەت دەهێنایە سەرزمان و گاڵتەت بەئێمە و خواکانی ئێمە دەکرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

یەکیان خوارەوەی عاباکەی گرت و رایکێشا. ئەبوبەکری راستگۆ بەرگری لێکرد و بەدەم گریانەوە وتی: ئایا کەسێك دەکوژن کەدەڵێت خواوەندی تاقانە، پەروەردگاری منە؟ قورەیشییەکان دەستبەرداری بوون. ئەمە توندترین هەڵس و کەوتی ئەوان بەرابەر بە پێغەمبەر(د.خ) بوو کەبەچاوی خۆم بینیم.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: رۆژێك ئەبوجەهل کوڕی هوشام لای پێغەمبەر(د.خ) تێپەڕی. ئەو، لەنزیك سەفا دانیشتبوو، ئەبوجەهل ئازار و جوێنی پێدەدا. رەخنەی لەدینەکەی دەگرت. پێغەمبەر(د.خ) بێدەنگ بوو و هیچی نەوت. کەنیزەکەی عەبدوالله کوڕی جودعانی تیمی کە لەماڵەکەی ئەو لەسەرەوەی سەفا بوو، ئەمەی بیست.

دەڵێت: ئەبوجەهل ڕۆشت و لەنزیك کەعبە لای قوڕەیشییەکانی دیکە دانیشت. زۆری نەخایاند حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب کەوان لەسەر شان لەڕاو گەڕایەوە. ئەو کاتێك لەڕاو دەگەڕایەوە یەکسەر نەدەڕۆشتە ماڵ بەڵکو بەدەوری کەعبەدا دەسوڕایەوە و دوای سووڕانەوە لای قوڕەیشییەکان دەوەستا و قسەی لەگەڵ ئەوان دەکرد. حەمزە لەهەموو قوڕەیشییەکان بوێرتر بوو. ئەو ڕۆژە کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە بۆ ماڵ، حەمزە لای کەنیزەکەی کوڕی جودعان تێپەڕی کەپێی وت: ئەی باوکی عومارە، خۆزگە لێرە دەبووی و دەتبینی محەممەدی برازات، کەمێك پێش ئێستا، چۆن لەلایەن ئەبوجەهلەوە ئازار درا. محەممەد لێرەدانیشتبوو و ئەبوجەهل جوێنی پێدەدا و بەشێوەیەکی نەشیاو قسەی لەگەڵ کرد بەڵام ئەو ڕۆشت و هیچی نەوت.

دەڵێت: حەمزە لەتاو تورەیی سوور بوویەوە و بەخێرایی ڕۆشت. لای کەس نەوەستا و بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەبوجەهل خۆی ئامادە کرد. کاتێك ڕۆشتە مزگەوت و ئەوی

بینی، بەرەو لای ڕۆشت و بەکەوانەکەی لەسەریدا و سەری شکاند و وتی: تو جوێن بە محەممەد دەدەیت و نازانیت من باوەڕم بەدینەکەی ئەو هێناوە، هەرچی ئەو دەیلێت، منیش دەیلێم؟ ئەگەر دەتوانی هەستە و رووبەرووی من ببەرەوە.

دەڵێت: کەسانێك لەپیاوانی منالەکانی مەخزوم بەرگریان لەئەبوجەهل کرد، بەلام ئەبوجەهل وتی: کارتان بەحەمزە نەبێت چوونکە من بەشێوەیەکی نەشیاو هەڵس و کەوتم لەگەڵ براکەی کرد.

حەمزە باوەڕی هێنا و قورەیشییەکان زانیان هێزی پێغەمبەر(د.خ) زیادی کردووە چوونکە حەمزە بەرگری لێدەکات. لەبەر ئەمە چیتر نەیانتوانی ئازاری پێغەمبەر(د.خ) بدەن.

لەیەحیا کوڕی عوروە کوڕی زوبەیر دەگێڕنەوە: یەکەم کەس لەناو شاری مەککە قورئانی بەئاشکرا خوێند، عەبدوالله کوڕی مەسعود بوو. دەڵێت: ڕۆژێك هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) کۆببونەوە و وتیان تا ئێستا قورەیشییەکان بەدەنگی بەرز قورئانیان نەبیستووە، چ کەسێك دەتوانێت قورئان بەگوێی ئەوان بگەیێنێت.

عەبدوالله کوڕی مەسعود وتی: من ئەو کارە دەکەم.

وتیان: دەترسین زیانت پێبگەیێنن، دەمانەوێت پیاوێك ئەم کارە بکات کەخەڵکەکەی بەرگری لێبکەن.

کوڕی مەسعود وتی: رێگە بدەن ئەو کارە بکەم چوونکە خواوەند پشتیوانیم لێدەکات.

دەڵێت: کوڕی مەسعود نیمەڕۆ، ڕۆشتە جێگەی ئیبراهیم، قورەیشییەکان لەشوێنەکانی خۆیان دانیشتبوون، بەدەنگی بەرز وتی: ((بسم الله الرحمن الرحیم)) خوێندنەوەی سوورەی ڕەحمانی دەسپێکرد و بەردەوام بوو. قورەیشییەکان گوێیان گرت و وتیان: کوڕی دایکی عەبد، چی دەڵێت؟

دەستەیەکیان وتیان: بەشێك لەقورئانەکەی محەممەد دەخوێنێتەوە. هەستان و شەقەزلله بارانیان کرد بەلام ئەو لەسەر خوێندنەوە بەردەوام بوو. سەرئەنجام بۆ لای هاورێکانی گەڕایەوە، روخساری خوێناوی بوو، پێیان وت: لەم بەلایە دەترساین.

کوڕی مەسعود وتی: دوژمنانی خواوەند هەرگیز هاوشێوەی ئەمڕۆ ریسوا و لاواز نەبوون، ئەگەر دەخوازن بەیانیش ئەو کارە دەکەم.

وتیان: بەسە، ئەوەی پەسەندیان نەدەکرد، بەرگوێیان کەوت.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: کاتێك کۆچکەرانی حەبەشە، لەسنووری فەرمانڕەوایەتی نەجاشی ئاسوودە بوون، قورەیشییەکان بڕیاریاندا، دژی ئەوان فێڵێك بکەن. بۆ ئەم مەبەستە عەمرۆ کوڕی عاس و عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی رەبیعە کوڕی موغەیرەی مەخزومیان بەچەندین دیاری گرانبایی ڕەوانە و دیارییەکانی پێشکەشی نەجاشی و بەتریقەکانیان کرد و خوازیاری تەسلیم کردنەوەی موسوڵمانانی حەبەشە بوون، بەڵام نەیانتوانی هیچ کارێك بکەن و سەرشۆڕ و تێکشکاو، بۆ مەککە گەڕانەوە.

دوای ئەوە عومەر کوڕی خەتاب باوەڕی هێنا. ئەو پیاوێکی بوێر و چاونەترس بوو، پێش ئەو، حەمزە باوەڕی هێنا. بەباوەڕهێنانی ئەوان هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەهێز بوون و ئیسلام لەناو هۆزەکانی قورەیش ئاشکرا بوو. نەجاشیش موسوڵمانانی حەبەشەی لەژێر چەتری پشتیوانی خۆیدا کۆکردەوە.

قورەیشییەکان کۆبوونەوە و بڕیاریاندا پەیمان نامەیەك بنووسن بۆ ئەوەی کچ بەمناڵەکانی هاشم و مناڵەکانی موتەلیب نەدەن و ژنیش لەوان نەخوازن، مامڵەیان لەگەڵ نەکەن. لەمبارەوە پەیمانێکیان نووسی و لەناو کەعبەدا هەڵیانواسی تا پەیمانەکەیان بەهێز بێت.

بەدوای پەیمانی قورەیشییەکان، مناڵەکانی هاشم و مناڵەکانی موتەلیب لەدەوری ئەبوتالیب کۆبوونەوە. جگە لەئەبولەهەب کەپەیوەستی قورەیشییەکان بوو و دژی موسوڵمانان، پەیماننامەکەی مۆر کرد. دوو ساڵ بەمشێوەیە بوو و موسوڵمان ڕەنج و ئازاری زۆریان پێبڕا، خورادەمەنییان پێنەدەگەیشت مەگەر بەنهێنی و لەلایەن ئەو قورەیشییانەی چاکەیان لەگەڵ دەکردن.

دەڵێن: ئەبوجەهل، حەکیم کوڕی حەزام کوڕی خوەیلدی بینی لەگەڵ کۆیلەکەی گەنمی بۆ خەدیجەی پووری دەبرد کە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) لەدۆڵی ئەبوتالیبدا بوو، لەبەردەمیدا وەستا و وتی: بۆ مناڵەکانی هاشم خواردن دەبەیت؟ سوێند بەخوا ڕێگە نادەم بڕۆیت و لەناو مەککە ریسوات دەکەم.

ئەبوئەلبەختەری کوڕی هوشام هات و وتی: کارت پێی چییە؟

ئەبوجەهل وتی: خواردن بۆ مناڵەکانی هاشم دەبات.

ئەبوئەلبەختەری وتی: ئەم خواردنە هی پوورەکەیەتی، بۆ ڕێگەی نادەیت بیبات، وازی لێ بێنە.

بەڵام ئەبوجەهل رازی نەبوو، یەکتریان جوێنباران کرد، ئەبوئەلبەختەری ئێسقانی

وشترێکی هەڵگرت و سەری ئەبوجەهلی شکاند. حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب لێیانەوە نزیك بوو و ئەوانی دەبینی، حەزیان نەدەکرد هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەم کارە بزانن و دواتر سەرکۆنەیان بکەن.

لەتەواوی ئەم ماوەدا پێغەمبەر(د.خ)، بەئاشکرا و نهێنی، شەو ورۆژ، سەرقاڵی بانگەوازەکەی خۆی بوو، بەردەوام وەحی بۆ دەهات کەرێگە گرتن و هاندان و هەڕەشە کردن لەنەیاران و تەواو کردنی بەڵگەکان بوو.

کوڕی عەباس دەڵێت: سەرکردەکانی قورەیش کۆبوونەوە و بەڵێنیان بە پێغەمبەر(د.خ) دا سامانی پێببەخشن بەشێوەیەك ببێتە دەوڵەمەندترین پیاوی مەککە و هەرکەسی بوێت، بیکەنە هاوسەری، وتیان: ئەی محەممەد هەموو ئەو شتانە بۆ تۆ بێت بەو مەرجەی جوێن بەخواکانی ئێمە نەدەیت و بەخراپە باسیان نەکەیت، ئەگەر بەمە رازی نابیت، شتێکی دیکەت پێشکەش دەکەین کە لەبەرژەوەندی تۆدابێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو شتە چییە.

وتیان: بۆ ماوەی یەك ساڵ تۆ خواکانی ئێمە، یانی لات و عوزا بپەرەستە، ئێمەیش بۆیەك ساڵ خواکەی تۆ دەپەرەستین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: با بزانم لەلایەن خواوەندەوە چیم پێدەگات.

و لەلەوحی پارێزراوە وەحی هاتەخوار: (( قل یا ایها الکافرون، لا اعبد ما تعبدون، و لا انتم عابدون ما اعبدولا انا عابد ما عبدتم و لا انتم عابدون ما اعبد. لکم دینکم ولي الدين.

واتاکەی: بڵێ ئەی کافران، من ئەوەی دەیپەرەستن، ناپەرەستم، ئێوەیش ئەو شتە ناپەرەستن کەمن دەیپەرەستم، منیش ئەوەی ئێوە دەیپەرەستن، ناپەرەستم و ئێوەیش ئەو شتە ناپەرەستن کەمن دەیپەرەستم، دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم.))

هەروەها خواوەند ئەم ئایەی ناردەخوار:

((قل افغیر الله تأمرونی اعبد ایها الجاهلون، و لقد اوحی الیك و الی الذین من قبلك لئن اشرکت لیحطبن عملك و لتکونن من الخاسرین بل الله فاعبدوکن من الشکارین.

واتاکەی: بڵێ: ئەی نەزانەکان، مەگەر دەتانەوێت ناچارم بکەن جگە لەخوا بپەرەستم. بەتۆ و ئەو کەسانەی پێش تۆ وەحی کرا کەئەگەر شرك بکەیت، کردەوەکانت بەفیڕۆ دەڕوات و دەبیتە یەکێك لەزیانکاران، خواوەند بپەرستە و شوکورگوزار بە.))

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: وەلید کوڕی موغەیرە و عاس کوڕی وایل و

ئەسوەد کوڕی موتەلیب و ئومەییە کوڕی خەلەف ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتیان: ئەی محەممەد، ئێمە خواکەی تۆ دەپەرەستین و تۆیش خواکەی ئێمە بپەرەستە و لەکارەکانی خۆمان دەتکەینە شەریك، ئەگەر دینەکەی تۆ لەوەی ئێمە باشتر بێت، ئێمەیش بەشداریمان تیا کردووە و پشکێکمان بەرکەوتووە و ئەگەر دینەکەی ئێمە باشتر بێت، تۆیش بەشداریت کردووە و پشکێکت بەردەکەوێت. سوورەی قل یا ایها الکافرون، هاتەخوار.

پێغەمبەر(د.خ) خوازیاری باشتربوونی خەڵکەکەی بوو و دەیویست خۆی لەوان نزیك بکاتەوە.

محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بینی خەڵکەکەی خۆی لێ دوور دەخەنەوە و ئەم کارەی بەلاوە ناپەسەند بوو، ئارەزووی کرد خواوەند هۆکارێك فەراهەم بکات تا لەخەڵکەکەی نزیك بکەوێتەوە چوونکە خەڵکەکەی خۆش دەویست و دەیویست نیشانەکانی تووندوتیژی لەناو بچێت. کاتێك ئەم ئەندێشەیە بەزەینیدا تێپەڕی، خواوەند ئەم ئایانەی ڕەوانە فەرموو:

((والنجم اذاهوی، ماضل صاحبکم و ما غوی، و ما ینطق عن الهوی.

واتاکەی: سوێند بەو ئەستێرەی کاتێك ئاوا دەبێت هاورێکەتان نەگومڕا بووە و نەبەرەو خراپەکاری دەڕوات و نە لەرووی هەوا وهەوەسەوە دەدوێت.))

کاتێك گەیشتە ئەم ئایە کە: ((افرأیتم اللات و العزی، و مناة الثالثة الاخری.

واتاکەی: من لەلات وعوزا و سێیەم مەنات ئاگادار بکەنەوە.))

شەیتان ئەم وتەی هێنایە سەرزمانی کە: (( لا تلك الغرانیق العلی و ان شفاعتهن ترتضی.

واتاکەی: ئەم بتانە گەورەن چوونکە شیفاعەتی ئەوان جێگەی رەزامەندییە.))

کاتێك قورەیشییەکان ئەمەیان بیست، دڵخۆش بوون و بەوەسف کردنی خواکانی خۆیان شادمانییان پێبڕا. گوێیان لەوتەکانی گرت و باوەڕدارانیش باوەڕیان بەوەحی بوو و بەهەڵە تاوانباریان نەدەکرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخوێندنەوەی ئایات، سووجدەی برد، موسوڵمانانیش سوجدەیان برد و ناباوەڕانی قورەیش و کەسانی دیکەی ناو مزگەوتەکە بەهۆی ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) وەسفی خواکانی ئەوانی کردبوو، سوجدەیان برد. باوەڕدار و ناباوەڕ لەو شوێنەدا سووجدەی برد، جگە لەوەلید کوڕی

موغەیرە کەپیرەپیاوێکی پەککەوتە بوو و مشتێك خۆڵی هەڵگرت و لەناوچاوی سوو و بەمشێوەیە سووجدەی برد.

دەڵێت: کاتێك قورەیشییەکان لەمزگەوتەکە ڕۆشتنەدەر، شادمان بوون و وتیان: محەممەد وەسفی خواکانی ئێمەی کرد و بەبتە گەورەکان ناوی بردن کەشیفاعەتی ئەوان جێگەی رەزامەندییە.

داستانی سوجدەی موسوڵمانان بەموسوڵمانانی نیشتەجێی حەبەشە گەیشت و وتیان قورەیشییەکان باوەڕیان هێنا. دەستەیەکیان گەڕانەوە و دەستەیەکیان مانەوە. جبرەئیل هات و وتی: ئەی محەممەد چیت کرد، شتێکت بۆ خەڵکان باس کرد کەمن لەلایەن خواوەندەوە، بۆم نەهێنابووی. وتەیەکەیت هێنایە سەرزمان کەوتەی خواوەند نەبوو.

پێغەمبەر(د.خ) خەمبار بوو و لەخواوەند ترسا. خواوەند رەحیم بوو، ئایەیێکی رەوانە و دژوارییەکەی ئەوی سووك کرد و ئاگاداری کردەوە پێغەمبەرانی پێش ئەوەیش ئەم ئارەزووەیان کردووە و شەیتان ئارەزووی ئەوانی هێناوەتە سەرزمانیان. ئایەکە بەمشێوە بوو:

((وما ارسلنا من قبلك من رسول و لا نبی اذا تمنی القی الشیطان فی امنیته فینسخ الله ما یلقی الشیطان ثم یحکم الله آیاته و الله علیم حکیم.

واتاکەی: پێش تۆ نێردراوێك یا پێغەمبەرێکمان نەنارد، مەگەر ئەو کاتەی وەحی خوێندەوە، شەیتان کاریگەری لەسەر وتەکانیدانا، خواوەند ئەو شتەی دەسکردەی شەیتانە، پووچەڵی دەکاتەوە و ئایەتەکانی خۆی بەهێز و جێگیر دەکات چوونکە خواوەند دانا و فرەزانە.

خەم و خەفەتی پێغەمبەر(د.خ) نەما و ئەوەی شەیتان هێنایە سەرزمانی، پووچەڵ کرایەوە و ئەم ئایەی هاتەخوار:

((الکم الذکر و له الانثی، تلك اذا قسمة ضیزی، ان هی الاسماء سمیتموها انتم و آباوکم ما انزل الله بها من سلطان ان یتبعون الا الظن و ما تهوی الانفس و لقد جائهم من ربهم الهدی. ام للانسان ما تمنی. فلله الاخرة و الاولی. و کم من ملك فی السموات لا تغنی شفاعتهم شیئا الامن بعد ان یأذن الله لمن یشاء و یرضی.

واتاکەی: ئایا کوڕ تایبەتە بەئێوە و کچ تایبەتە بەئێوە؟ ئەمە خۆی بەشێکی

زاڵمانەیە. بتەکان تەنیا ناون کەئێوە و باوکانی ئێوە ناوتان لێناون و خواوەند هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئەوان نەناردوە. جگە لەگومان ئەوەی هەوەسی دڵەکانە، شوێنی ناکەون لەکاتێکدا لەلایەن پەروەردگارەوە رێگەیان نیشاندراوە. مەگەر مرۆڤ ئارەزووی هەرچی بکات دەتوانێت بەدەستی بێنێت. چوونکە ئەم جیهان و ئەو جیهان، تایبەتە بەخواوەند. زۆرن ئەو فریشتانەی ئاسمان کەشیفاعەتیان کاریگەر نابێت مەگەر لەدوای ئەوەی خواوەند بەهەر کەسێك بخوازێت و پەسەندی بکات، مۆڵەت بدات.))

کاتێك قورەیشییەکان ئەمەیان بیست، وتیان: محەممەد لەوەسف کردنی خواکانی ئێوە پەشمیان بۆتەوە و گۆڕانکاری لەوتەکانیدا کرد و وتەیەکی دیکەی هێنایە سەرزمان. ئەم دوو وشەیە کەشەیتان هێنایە سەرزمانی ئەو، کەوتە سەر زاری ناباوەڕان و دوژمنایەتی ئەوان لەگەڵ موسوڵمانان زیادی کرد. دەستەیەك لەموسوڵمانانی حەبەشە گەڕانەوە و کاتێك لەمەککە نزیك کەوتنەوە، ئاگادار بوونەوە کەهەواڵی باوەڕهێنانی خەڵکانی مەککە ناڕاستە. لەپەنای کەسانی دیکەدا ڕۆشتنە ناو مەککە. ژمارەیان سی وسێ کەس و لەمەککە مانەوە تا ئەو کاتەی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە کۆچیان کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دوای ڕووداوی غەرانیق، چەند کەسێك لەقورەیشییەکان دژی ئەو پەیمانەی لەکەعبە هەڵیانواسیبوو، وەستانەوە. ئەو کەسەی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم پەیمانە زیاتر لەهەمووان هەوڵیدەدا، هوشام کوڕی عەمرۆ کوڕی حارسی عامری کە لەدایکەوە برازای نەزلە کوڕی هاشم کوڕی عەبدمەناف بوو. ئەو، ڕۆشتە لای زوهەیر کوڕی ئەبی ئومەییە مەخزومی کەدایکی عاتیکە کچی عەبدولموتەلیب بوو، وتی: ئەی زوهەیر تۆ خواردن دەخۆیت و جل و بەرگ دەپۆشی و هاوسەرەکەت لەماڵە، بەڵام خزمەکانت باروودۆخێکی لەو شێوەیان هەیە کەبێ ئاگا نیت، کەس مامڵەیان لەگەڵ ناکات، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوان خزمەکانی باوکی حەکەم کوڕی هوشام دەبوون و پێشنیارت پێدەدا دژی ئەوان پەیمان ببەستێت، هەرگیز ڕازی نەدەبوو.

زوهەیر وتی: چیبکەم، من یەکە کەسم، ئەگەر کەسێکی دیکەم لەگەڵدا بێت، بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە، ئامادەم.

هوشام وتی: کەسێکی دیکەیش هەیە.

زوهەیر پرسی: کێیە؟

هوشام وتی: من.

زوهەیر وتی: بەدوای سێیەم کەسدا بگەڕێ.

هوشام ڕۆشتە لای موتعیم کوڕی عودەی کوڕی نەوفل کوڕی عەبدمەناف و وتی: ئەی موتعیم، ئایا بەوە رازی دەبیت دوو تیرە لەعەبدمەناف لەناو بچن و تۆ بینەری ئەم ڕووداوە بیت و هاوپەیمانی قورەیشییەکان؟

موتعیم وتی: چیبکەم، من یەک کەسم.

هوشام وتی: کەسێکی دیکەیش هەیە.

وتی: کێیە؟

وتی: منم.

موتعیم وتی: بەدوای سێیەم کەسدا بگەڕێ.

هوشام وتی: گەڕاوم.

موتعیم وتی: کێیە؟

هوشام وتی: زوهەیر کوڕی ئومەییە.

موتعیم وتی: بەدوای چوارەم کەسدا بگەڕێ.

هوشام ڕۆشتە لای باوکی بەختەری کوڕی هوشام و هاوشێوەی قسەکانی پێشووی هێنایە سەرزمان.

باوکی بەختەری وتی: ئایا کەس بۆ ئەم کارە هاوکاریمان دەکات؟

هوشام وتی: بەڵێ.

باوکی بەختەری وتی: کێ؟

هوشام وتی: زوهەیر کوڕی ئەبی ئومەییە و موتعیم کوڕی عودەی، منیش لەگەڵ ئێوەدام.

باوکی بەختەری وتی: بەدوای پێنجەم کەسدا بگەڕێ.

هوشام ڕۆشتە لای زەمعە کوڕی ئەسوەد کوڕی موتەلیب، باسی خزمایەتی و مافەکانی منداڵەکانی هاشمی کرد.

زەمعە وتی: ئایا کەس بۆ ئەم کارە هاوکاریمان دەکات.

هوشام وتی: بەڵێ و ناوی کەسەکانی برد.

دواتر لەنزیک حەجوون لەسەرەوەی مەککە، شوێنێکیان بۆ کۆبوونەوە دیاری کرد و

لەوێ کۆبوونەوە و پەیمانیان بەست دژی پەیمانەکە بوەستنەوە و هەڵیبوەشێننەوە.

زوهەیر وتی: من دەسپێدەکەم و پێش هەمووان باسی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە دەکەم.

ڕۆژی دواتر ڕۆشتنە شوێنی کۆبوونەوەی خۆیان لەکەعبە. زوهەیر کوڕی ئەبی ئومەییە، حیلەیەکی لەبەردابوو، حەوت جار بەدەوری کەعبەدا سووڕایەوە، دواتر لەکەسانی دیکە نزیك کەوتەوە و وتی: ئەی خەڵکانی مەککە، ئێمە خواردن دەخۆین و دەخۆینەوە و جل و بەرگ لەبەر دەکەین، بەڵام منداڵەکانی هاشم بەرەو لەناوچوون دەڕۆن چوونکە کەس مامڵەیان لەگەڵ ناکات. سوێند بەخوا دانانیشم تا ئەو پەیمانە هەڵبوەشێتەوە.

ئەبوجەهل لەسوچێکی مزگەوتەکەدا دانیشتبوو، وتی: هەڵیت و پڵیت مەڵێ، پەیمانەکە هەڵناوەشێتەوە.

زەمعە کوڕی ئەسوەد وتی: تۆ هەڵیت و پڵیت دەڵێیت، کاتێك پەیمانەکە نووسرا، ئێمە رازی نەبووین.

باوکی بەختەری وتی: زەمعە راست دەکات، ئێمە بەناوەرۆکی پەیمانەکە رازی نین و پەسەندی ناکەین.

موتعیم کوڕی عودەی وتی: راست دەکەن و هەر کەس جگە لەمە بڵێت، درۆزنە، لەپەیمان و ناوەرۆکەکەی بێزارین.

هوشام کوڕی عومەر قسەی هاوشێوەی هێنایە سەرزمان.

ئەبوجەهل وتی: بۆ ئەم کارە کۆبوونەتەوە.

ئەبوتالیب لەسووچێکی مزگەوتەکەدا دانیشتبوو.

موتعیم کوڕی عودەی هەستا تا پەیمانەکە بدڕێنێت و بینی مۆریانە هەمووی خواردووە جگە لەوشەی لا اله الا الله کە قوڕەیشییەکان لەسەرەتای نووسراوەکانی خۆیاندا دەیانووسی.

دەڵێت: بیستم نووسەری پەیمانەکەی دژی پێغەمبەر(د.خ) ومناڵەکانی هاشم و مناڵەکانی موتەلیب، مەنسور کوڕی عێکرەمە کوڕی هاشم کوڕی عەبدمەناف کوڕی عەبدئەلدار کوڕی قوسەی، دەستی ئیفلیج بوو.

موسوڵمانەکانی دیکە لەحەبەشە مابوونەوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری بۆ لای نەجاشی نارد و ئەوانیان سواری دوو کەشتی کرد و بۆ

لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕانەوە. کاتێك گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) کەئەو، دوای سەفەری حوّدەیبییە لەخەیبەر بوو. هەموو ئەو کەسانەی بەکەشتی گەڕانەوە، شانزە کەس بوون.

پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە و لەناو قوڕەیشییەکان بوو و بەئاشکرا و نهێنی خەڵکانی لەبانگەوازەکەی خۆی ئاگادار دەکردەوە. بۆ گاڵتە و ئازارەکانی ئەوان خۆڕاگر بوو. ئازارەکانی ئەوان بۆ سەر پێغەمبەر(د.خ) زیادی کرد تا ئەو ڕادەی کاتێك بۆ نوێژ دەوەستا، ڕیخۆڵەی بزنیان تێدەگرت. دواتر پێغەمبەر(د.خ) لەسووچێکدا و بەنهێنی نوێژی دەخوێند.

- عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: کاتێك ڕیخۆڵەیان دەخستە ماڵی پێغەمبەر(د.خ)، بەدارێك دەیهێنایەدەر و لەبەر دەرگا دەوەستا و دەیفەرموو: ئەی مناڵەکانی عەبدمەناف، ئەم چ پشتیوانییەکە لەمنی دەکەن. دواتر لەناو کۆڵانەکەدا فڕیدەدا.

ئەبوتالیب و خەدیجە لەیەك ساڵدا مردن. بەوتەی کوڕی ئیسحاق ئەم ڕووداوە سێ ساڵ پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە بوو. بەمردنی ئەوان کاروباری پێغەمبەر(د.خ) دژوار بوو چوونکە دوای مەرگی ئەبوتالیب، ئازاریان دەدا کەپێش مردنەکەی بوێری ئەو کارەیان نەبوو. ئازار و گاڵتە پێکردنی ئەوان گەیشتە ڕادەیەك تەنانەت یەکیان خۆڵی کرد بەسەری پێغەمبەردا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك سەفییە خۆڵی کردە بەسەر پێغەمبەردا(د.خ) ، پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە بۆ ماڵ و خۆڵ بەروخسارییەوە بوو. یەکێك لەکچەکانی خۆڵەکەی پاك کردەوە و دەستی بەگریان کرد و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کچم مەگری چوونکە خواوەند پشتیوانیم لێدەکات.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: قوڕەیشییەکان نەیانتوانی ئازارم بدەن تا ئەوەی ئەبوتالیب مرد.

کاتێك ئەبوتالیب مرد، پێغەمبەر(د.خ) بەرەو تاییف ڕۆشت تا داوای هاوکاری لەسەقەفییەکان بکات. وەك وتوویانە لەم سەفەرەیدا تەنیا بوو.

محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە تاییف، ڕۆشتە لای چەند کەسێك لەسەقەفییەکان کەسەرکردەی خەڵکان بوون. سێ برا بوون: عەبدیا لەیل و مەسعود و حەبیب کەهەر سیانیان کوڕی عەمرۆ کوڕی عومەیر بوون. یەکێکان هاوسەرەکەی لەهۆزی مناڵەکانی جومەحی قوڕەیش بوو. پێغەمبەر(د.خ)

گفتوگۆی لەگەڵ کردن بۆ ئەوەی سەرخستنی ئیسلام و دژی قورەیش و ناباوەڕان هاوکاریان لێوەربگرێت.

یەکیان کەجل و بەرگی کەعبەی لەبەردا بوو، وتی: چۆن بزانین خواوەند تۆی ڕەوانە کردووە؟

ئەویتریان وتی: خواوەند جگە لەتۆ کەسی دیکەی شك نەدەبرد وەك پێغەمبەر هەڵیبژێرێت.

سێیەمی وت: سوێند بەخوا قسە لەگەڵ تۆ ناکەم، چونکە ئەگەر بەو شێوە بێت کەدەڵێیت (من پێغەمبەری خوام) گرنگتر لەوەییت وەڵامت بدەمەوە و ئەگەر درۆت بۆ خواوەند هەڵبەستبێت، ڕوا نییە وەڵامت بدەمەوە.

پێغەمبەر(د.خ) هەستا و وتی: ئەم گفتوگۆیە لای کەس باس مەکەن. چوونکە دەترسا قورەیشییەکان ئاگادار ببنەوە و ئازار و ڕەنجەکانی سەرشانی زیاتر بکەن. بەڵام رازی نەبوون و کۆیلە و کەسانی ژێر دەستەی خەڵکەکەیان دژی ئەو هاندا جوێنباران و بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد تا ئەوەی دەستەیەك کۆبوونەوە. پێغەمبەر(د.خ) پەنای بۆ باخێك برد کە خاوەنەکانی عوتبە کوڕی ڕەبیعە و شەیبە کوڕی ڕەبیعە بوون. هەردووکیان لەناو باخەکەدا بوون. کۆیلەکانی سەقیف چیتر شوێنی نەکەوتن. ئەو لەژێر سێبەری دارێك دانیشت، کوڕەکانی ڕەبیعە سەیریان دەکرد. ئەوان هەڵس و کەوتی کۆیلەکانی سەقیفیان بینیبوو.

پێغەمبەر(د.خ)، وەك دەڵێن، ئەو ژنە جومەحییەی بینی و پێی وت: بینیت خزمەکانت چ بەڵایەکیان بەسەردا هێنایین؟

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئارامی گرت و لەخوا پاڕایەوە و لەلاوازی خۆی سکاڵا و داوای هاوکاری کرد. کوڕەکانی ڕەبیعە لەکردەوەی ئەو خەڵکە بێزار بوون و کۆیلە مەسیحییەکەی خۆیان (ناوی عەداس) بانگ کرد و وتیان: چەند بۆڵە ترێ هەڵبگرە و بیبە بۆ ئەو پیاوە تا بیخوات.

عەداس ئەو کارەی کرد و بۆڵە ترێکانی لای پێغەمبەر(د.خ) دانا. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) دەستی بۆ برد فەرمووی: بسم الله. دواتر خواردی.

عەداس سەیری ڕوخساری کرد و وتی: سوێند بەخوا خەڵکی ئەم شارە بەمشێوەیە قسە ناکەن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تۆ لەکام شارە و دینی تۆ چییە؟

وتی: من مەسیحیم و خەڵکی نەینەوام.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەدیاری یونس کوڕی مەتا، پیاوی خواپەرەست؟

عەداسی وتی: چۆن دەزانی کەموسا کوڕی مەتا کێیە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو، برای منە، ئەو پێغەمبەر(د.خ) بوو، منیش پێغەمبەرم.

عەداس دەستی بەماچ کردنی سەر و دەست وپێی پێغەمبەر(د.خ) کرد. یەکێك لەکوڕەکانی رەبیعە بەوەی دیکەی وت: کۆیلەکەتی لەرێ بەدەر کرد. کاتێك عەداس بۆ لای ئەوان گەڕایەوە، پێیان وت: بۆ دەست و پێی ئەو پیاوەت ماچ کرد؟

عەداس وتی: سوێند بەخوا لەسەر زەوی باشتر لەم پیاوە نییە، وتەیەکی باس کرد کەتەنیا پێغەمبەران لێی ئاگادارن.

وتیان: ئەی عەداس لەدینەکەی خۆت پاشگەزت نەکاتەوە چوونکە دینەکەی خۆت باشترە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەسەقەفییەکان هیوابڕاو بوو، لەتاییفەوە گەڕایەوە بۆ مەککە و کاتێك گەیشتە نەخلە، لەتاریکی شەو، بۆ نوێژ خۆی ئامادە کرد. دەستەیەك لەجنۆکەکان لای ئەو تێپەڕین کەخواوەند لەقورئاندا ئاماژەی پێداون.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: وەك بیستوومە ئەوان حەوت جنۆکە لەجنۆکەکانی نەسیبینی یەمەن بوون. گوێیان لەپێغەمبەر گرت و کاتێك لەنوێژەکەی تەواو بوو، گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان و پێشنیاری باوەڕهێنانیان پێکردن. خۆیان باوەڕیان هێنابوو و بەوتەکانی پێغەمبەر(د.خ) رازی ببوون. خواوەند سەبارەت بەبەسەرهاتی ئەوان بەمشێوەیە دەفەرمێت:

((واذا صرفنا الیك نفرا من الجنیستمعون القرآن فلما حضروه قالوا انصتوا فلما قضی و لوا ابی قومهم منذرین قالوا یا قومنا انا سمعنا کتابا انزل من بعد موسا مصدقا لما بین یدیه یهدی الی الحق و الی طریق مستقیم. یا قومنا اجیبوا داعی الله و آمنوا به یغفرلکم من ذنوبکم و یجرکم من عذاب الیم.

واتاکەی: و کاتێك چەند کەسێك لەپەرییەکانمان بۆ لای تۆ هێنا تا قورئان ببیستن. کاتێك گەیشتنە بەردەم پێغەمبەر(د.خ)، بەیەکیان وت: گوێ بگرن. کاتێك قورئان خوێندرایەوە، بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەڕانەوە و وتیان: ئەی نەتەوەی پەری! ئێمە

گوێمان لەکتێبێك گرت کەدوای موسا هاتۆتە خوار و پشتراستکەرەوەی کتێبەکانی دیکەیە و بۆ ڕێگەی ڕاستی ڕێنوێنی دەکات.

ئەی خەڵکی ئێمە، وەڵامی بانگەوازەکەی خواوەند بدەنەوە و باوەڕ بێنن تا لەگوناحەکانتان خۆش بێت و لەئازابی مەترسیدار ڕزگارتان بکات.))

هەروەها فەرموو:

((قل اوحی الی انه استمع نفر من الجن، قالوا انه سمعنا قرآنا عجبا.

واتاکەی: بڵێ وەحی بۆ من هاتووە کەدەستەیەك لەپەرییەکان گوێیان لەقورئان خوێندنەوەی من گرت و وتیان: ئێمە قورئانێکی سەرسورهێنەرمان بیست.))

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ناوی ئەو جنۆکانەی گوێیان لەپێغەمبەر گرت، حس و مس و شاسر و ناسر و ئینا ئەلئەرد و ئینین و ئەلاحەقم بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەتاییف گەڕایەوە، یەکێك لەخەڵکانی مەککەی بینی، پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرموو: ئایا لەلایەن منەوە هەواڵێك دەبەیت؟

وتی: بەڵێ.

فەرمووی: بڕۆ لای ئەخنەس کوڕی شەریق و پێی بڵێ محەممەد دەڵێت: ئایا پەنای من دەدات تا پەیامی خواوەند بەگوێی خەڵکان بگەیێنم؟

دەڵێت: ئەو کەسە ڕۆشتە لای ئەخنەس و پەیامی پێغەمبەری(د.خ) پێڕاگەیاند.

ئەخنەس وتی: من هاوپەیمانی قورەیشییەکانم، ناتوانم دژی ئەوان پەنای کەس بدەم.

کاتێك ئەو کەسە وتاری ئەخنەسی بە پێغەمبەر(د.خ) گەیاند: پێی فەرموو: دەتوانی بگەڕێیتەوە؟

وتی: بەڵێ.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڕۆ لای سوهەیل کوڕی عەمرۆ و پێی بڵێ محەممەد دەڵێت: ئایا پەنام دەدەیت بۆ ئەوەی خەڵکان لەپەیامی خواوەند ئاگادار بکەمەوە.

کاتێك ئەو کەسە پەیامی پێغەمبەری(د.خ) بەسوهەیل گەیاند، وتی: منداڵەکانی عامر کوڕی لوئەی دژی منداڵەکانی کەعب، ناتوانن پەنای کەس بدەن.

دەڵێت: نێردراو بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و لەوتەکانی سوهەیل ئاگاداری کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دەتوانی بگەڕێیتەوە؟

وتی: بەڵێ.

فەرمووی: بڕۆ بۆ لای موتعیم کوڕی عودەی و بڵێ، محەممەد دەڵێت: ئایا پەنام دەدات تا پەیامەکەی خوا بەخەڵکان رابگەیێنم.

کاتێك نێردراو موتعیمی لەپەیامەکەی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار کردەوە، وەڵامی دایەوە: بەڵێ، با بێت.

نێردراو گەڕایەوە و پێغەمبەری(د.خ) لەوتەکانی موتعیم ئاگادار کردەوە.

بەرەبەیان موتعیم کوڕی عودەی و برازاکانی کەرەستە و جل و بەرگی شەڕیان پۆشی و ڕۆشتنە ناو مزگەوتی حەرام. کاتێك ئەبوجەهل ئەوی بینی، وتی: پەنادەر یا شوێنکەوتەی پەنادەر؟

موتعیم وتی: پەنادەرم.

ئەبوجەهل وتی: هەرکەس تۆ پەنای بدەیت، ئێمەیش پەنای دەدەین.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ناو مەککە و لەشارەکەدا مایەوە. ڕۆژێك ڕۆشتە ناو مزگەوتی حەرام، ناباوەڕان لەنزیك کەعبە بوون و کاتێك ئەبوجەهل پێغەمبەری(د.خ) بینی، وتی: ئەی منداڵەکانی عەبدمەناف ئەمە پێغەمبەری ئێوەیە.

عوتەبە کوڕی رەبیعە وتی: بۆ نابێت ئێمەیش پێغەمبەر یا پاشایەکمان هەبێت.

پێغەمبەریان لەوتەکەی عوتەبە ئاگادار کردەوە، یا خۆی بیستی، ڕۆشتە لای ئەوان و وتی: ئەی عوتەبە، ئەم وتەیەت بۆ پشتیوانی کردن لەپێغەمبەر و خواوەند نەهێنایە سەرزمان بەڵکو لە لەخۆبایی بوونی تۆوە سەرچاوەی گرتووە، تۆی ئەی ئەبوجەهل، ماوەیەکی زۆر ناخایەنێت، زۆر دەگریت و کەمتر پێدەکەنیت و ئێوەی ئەی قوڕیشییەکان ماوەیەکی دی بەدڵخواز یا نابەدڵخواز، دەبنە شوێنکەوتەی دینی خواوەند .

پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی حەج لەگەڵ هۆزەکانی عەرەب گفتوگۆی دەکرد و دەیوت کە پێغەمبەری خوایە وئەوانی بۆ باوەڕهێنان و هاوکاری کردنی خۆی هاندەدا.

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: بیستم رەبیعە کوڕی عوباد لەگەڵ باوکم دەپەیڤی و دەیوت: گەنج بووم و لەگەڵ باوکم لەمەنی بووین. پێغەمبەر(د.خ) لەشوێنی هۆزە عەرەبەکان دەوەستا و دەیوت: ئەی منداڵەکانی فلان، من پێغەمبەری خوام و بۆ لای ئێوە ڕەوانە کراوم، خواوەند فەرمانتان پێدەدات بیپەرەستن و شەریکی بۆ دادەنێن و

لەپەرەستینی بتەکان خۆتان دووربخەنەوە. باوەڕ بەمن بێنن و وتەکانم پشتراست بکەمەوە و پشتیوانیم لێبکەن تا پەیامەکەی خۆم بگەیێنم.

دەڵێت: پشت سەری ئەوپیاوێکی چرچ ولۆچ و سپی رووخسار وجل و بەرگی عەدەنی لەبەردا بوو، کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەوتارەکەی خۆی تەواو دەبوو، دەیوت: ئەی منداڵەکانی فلأن، ئەم کەسە داوتان لێدەکات چیتر لات و عوزا نەپەرەستن و شوێنکەوتەی نەزانییەکانی ئەو ببن، ئاگادار بن، باوەڕی پێنەهێنن و گوێ لەوتەکانی مەگرن.

دەڵێت: بەباوکم وت: ئەم پیاوە کێیە بەدوای پێغەمبەر(د.خ) دەڕوات و پێچەوانەی ئەو قسە دەکات؟

باوکم وتی: مامەکەی ئەو عەبدولعوزەی، ئەبولەهەب کوڕی عەبدولموتەلیب.

محەممەد کوڕی موسلیم دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە شوێنی مانەوەی هۆزەکانی کێندە، سەرکردەکەیان مەلیح بوو. پێشنیاری خواپەرەستی پێکردن بەلأم بەوتەکانی رازی نەبوون.

عەبدوالله کوڕی حوسەین دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ماڵەکانی منداڵەکانی عەبدوالله لەهۆزی کەلب. پێشنیاری خواپەرەستی پێکردن و فەرمووی: ئەی منداڵەکانی عەبدوالله، خواوەند چاکەکاری بەباوکی ئێوە بەخشییووە. بەلأم رازی نەبوون.

عەبدوالله کوڕی کەعب کوڕی مالك دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە شوێنی مانەوەی منداڵەکانی حوزەیفە و پێشنیاری خواپەرەستی پێکردن بەلأم بەشێوەیەکی ناشیرین وەلأمیان دایەوە. هیچ کام لەهۆزەکانی عەرەب بەو شێوەیە وەلأمی پێغەمبەریان(د.خ) نەدابوویەوە.

محەممەد کوڕی موسلیم دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە شوێنی مانەوەی منداڵەکانی عامر کوڕی سەعسەعە و پێشنیاری خواپەرەستی پێکردن. یەکێك لەوان کەناوی بوحەیرە بوو، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەم گەنجەم لەعەرەبەکان وەردەگرت بەهۆی ئەوەوە هەموو عەرەبەکانم دەخوارد.

بوحەیرە بەپێغەمبەری وت: ئەگەر شوێن تۆ بکەوین و باوەڕ بەخواکەت بێنین و خواوەند تۆ بەسەر نەیارەکانت زاڵ بکات، ئایا دوای تۆ ئێمە کاروبارەکان دەگرینە دەست؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەم کارە لەدەستی خوادایە و بەکێی بوێت، دەیبەخشێت.

بوحەیرە وتی: ئێمە سینەی خۆمان بکەینە قەڵغان لەبەرابەر عەرەبەکان و کاتێك

سەرکەوتنت بەدەست هێنا، کەسانی دیکە جێگەی تۆ بگرنەوە، پێویستمان بەم کارە نییە. بەبانگەوازەکەی رازی نەبوون.

کاتێك خەڵکان لەحەج گەڕانەوە، منداڵەکانی عامر ڕۆشتنە لای یەکێك لەسەرکردەکانی خۆیان کەپیرەپیاوێکی پەککەوتە بوو، توانای حەج کردنی نەبوو و ساڵانە کاتێك لەحەج دەگەڕانەوە، ڕووداوەکانی کاتی حەجیان بۆ دەگێڕایەوە. کاتێك ئەو ساڵە ڕۆشتنە لای، سەبارەت بەڕووداوەکانی کاتی حەج کردن پرسیاری کرد، وتیان: گەنجێك لەقورەیش لەتایەفەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیب هاتە لامان و دەیوت پێغەمبەرە و دەیویست پشتیوانی لێبکەین و بیهێنین بۆ سەرزەمینەکەی خۆمان.

دەڵێت: پیرەکە دەستی خستە سەر سەر و وتی: ئەی منداڵەکانی عامر، ئایا دەکرێت قەرەبووی ئەم هەڵەی ئێوە بکەینەوە، بەدوایدا گەڕا. سوێند بەو خوایەی گیانی منی لەدەستدایە، هەر کەسێك لەمنداڵەکانی ئیسماعیل ئەم وتەیە بهێنێتە سەرزمان، ڕاست دەکات، بۆ وەلأمتان نەدایەوە؟

پێغەمبەر(د.خ) بەمشێوەیە لەکاتی حەج کردن دەڕۆشتە لای هۆزە عەرەبەکان و پێشنیاری ئیسلام و خواپەرەستی پێدەکردن. هەر کاتێك دەیبیست یەکێك لەعەرەبە ناودار و شەریفەکان هاتۆتە شاری مەککە، دەڕۆشتە لای و پێشنیاری خواپەرەستی پێدەکرد.

قتادەی زەفەری دەڵێت: سوەید کوڕی سامت لەمنداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف بەمەبەستی حەجی عەمرە سەردانی مەککەی کرد. خەڵکی سوەید نازناوی کامل یان پێدابوو چوونکە پیاوێکی بوێر و شاعیرێکی گەورە و ڕێزدار بوو.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، پێشنیاری ئیسلام و خواپەرەستی پێکرد. سوەید پێی وت: ئەگەری هەیە ئەوەی تۆ باسی دەکەیت هاوشێوەی ئەوە بێت کەمن باسی دەکەم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تۆ چیت هەیە؟

سوەید وتی: حیکمەتی لوقمان.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڵێ تا بزانم.

سوەید بەشێك لەحیکمەتی لوقمانی باس کرد و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وتەیەکی زۆر جوانە، بەلأم وتەکانی من زۆر باشترە، قورئانێکە وخواوەند بۆ ڕوون کردنەوەی

ڕێگەی خەڵکان ڕەوانەی کرووە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەشێك لەقورئانی بۆ خوێندەوە و پێشنیاری باوەڕهێنانی پێکرد بەڵام حاشای کرد و وتی: وتەیەکی زۆر جوانە. دواتر بۆ مەدینە گەڕایەوە و خەڵکانی خەزرەج، کوشتیان. خەڵکەکەی وتیان: ئەو لەسەر ئیسلام کوژرا. کوشتنی ئەو پێش شەڕی بەعاس بوو.

لەمەحمود کوڕی لوبەید دەگێڕنەوە: باوکی ئەلحەیسەر ئەنس کوڕی رافیع لەگەڵ دەستەیەك لەگەنجەکانی منداڵەکانی ئەشهەل هاتە مەککە. ئەیاس کوڕی مەعاز یەکێك بوو لەوان و دەیانویست لەگەڵ قورەیشییەکان دژی خەزرەجییەکان پەیمان ببەستن. پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە و هات و لەگەڵ ئەوان دانیشت و فەرمووی: دەتانەوێت شتێکی باشترتان دەسکەوێت لەوەی بەمەبەستی بەدەستهێنانی هاتوون؟

وتیان: چییە؟

فەرمووی: من پێغەمبەری خوام، منی بۆ لای بەندەکانی ڕەوانە کردووە تا بۆ پەرەستینی خوا و دوور کەوتنەوە لەبتەکان ناچاریان بکەم و کتێبێکی بۆ من ناردووە. سەبارەت بەئیسلام قسەی بۆ کردن و چەندین ئایەی قورئانی خوێندەوە.

ئەیاس کوڕی مەعاز کەنەوجەوان بوو، وتی: ئەی خەڵکینە، ئەمە لەمەبەستەکەی خۆتان زۆر باشترە.

دەڵێت: باوکی ئەلیەحسەر مشتێ خۆڵی هەڵگرت و کردی بەسەروچاوی ئەیاسدا و وتی: چاو لەم وتانە بپۆشە چوونکە بۆ مەبەستێکی دیکە هاتووین.

دەڵێت: ئەیاس بێدەنگ بوو، بۆ مەدینە گەڕانەوە و شەڕی بەعاس لەنێوان ئەوس وخەزرەج ڕوویدا و زۆری نەخایاند ئەیاس مرد.

مەحمود کوڕی لوبەید دەڵێت: ئەو کەسانەی لەکاتی بەخاك سپاردنی ئەو ئامادە بوون، دەیانوت بەردەوام سپاسی خواوەندی دەکرد تا ئەو کاتەی مرد. گومانیان نەبوو کاتێك مرد، باوەڕدار بوو. لەهەمان دانیشتن کە پێغەمبەری(د.خ) بینی و گوێی لەوتەکانی گرت، کاریگەری ئیسلامی لەسەر دروست بوو.

دەڵێت: کاتێك خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد سەرکەوتن بەدینەکەی ببەخشێت و ڕێز لە پێغەمبەر(د.خ) بگرێت و بەڵێنەکەی خۆی بێنێتەدی، پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی حەج سەرقاڵی بانگەوازەکەی لەناو هۆزە عەرەبەکاندا بوو و لای عەقەبە دەستەیەك لەخەڵکانی خەزرەجی بینی کەخواوەند چاکەی ئەوانی دەویست.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بینی، پرسی: ئێوە کێن؟

وتیان: لەخەڵکانی خەزرەجین.

فەرمووی: لەنزیك جولەکەکانن؟

وتیان: بەڵێ.

فەرمووی: دانیشن تا قسەتان بۆ بکەم.

ئەوان رازی بوون و دانیشتن. پێغەمبەر(د.خ) پێشنیاری ئیسلامی پێکردن و چەندین ئایەی قورئانی خوێندەوە.

دەڵێت: خواوەند بەو شێوەی ویستبوو کەجوولەکەکانی دیاری ئەوان شوێنکەوتەی زانست و کتێب بوون و خەزرەجییەکان بتپەرەست و کافر. چەندین شەڕیان لەگەڵ جولەکەکان ئەنجامدابوو و هەر کاتێك رووداوێك روویدەدا، دەیانوت: پێغەمبەرێکمان هەیە و کاتی دەرکەوتنی نزیکە و رۆژگاری نزیك بۆتەوە، ئێمەی شوێنی دەکەوین و بەهاوکاری ئەو، ئێوە، هاوشێوەی نەتەوەی عاد و سەموود کوشتار دکەین و لەناوتان دەبەین.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) قسەی بۆ کردن و پێشنیاری خواپەرەستی پێکردن، بەیەکیان وت: سوێند بەخوا ئەمە هەمان پێغەمبەرە، با پێش ئێوە باوەڕی پێنەهێنن.

بەمشێوەیە دەستەیەك لەخەزرەجییەکان بەبانگەوازەکەی پێغەمبەر(د.خ) رازی بوون و وتەکانیان پشتڕاست کردەوە و وتیان: لەنێوان خەڵکەکەی ئێمە دوژمنی و ڕق لەئارادایە و هیوادارین خواوەند بەهۆی تۆوە دوژمنایەتی لەناو ئێمەدا نەهێڵێت، ئێستا دەگەڕێینەوە لایان بۆ ئەوەی پێشنیاری باوەڕهێنانیان پێبکەین، ئەگەر ئەوانیش باوەڕ بەم دینە بێنن، کەس لەتۆ ئازیزتر نابێت.

خەرزەجییەکان بۆ سەرزەمینەکەی خۆیان گەڕانەوە. باوەڕیان هێنابوو و وتەکانی پێغەمبەریان پشتڕاست کردبوویەوە. وەك دەڵێن: ئەوان شەش کەس و بریتی بوون لە: ئەسعەد کوڕی زەرارە، عەوف کوڕی حارس، حارسە کوڕی مالك، قوتبە کوڕی عاهر، عوقەبە کوڕی عامر و جابر کوڕی عەبدوللە کوڕی رەباب.

دەڵێت: کاتێك گەیشتنە مەدینە سەبارەت بە پێغەمبەر(د.خ) و ئیسلام لەگەڵ خەڵکەکەیان دووان. لەناو هەموو ماڵەکانی ئەنسار، باس و خواسەکان سەبارەت بە

پێغەمبەر(د.خ) بوو.

ساڵی دواتر لەکاتی حەج کردن، دوانزە کەس لەئەنسار هاتنە مەککە و پێغەمبەریان لەنزیك عەقەبە بینی. ئەمە عەقەبەی یەکەم بوو و بەیعەتیان لەگەڵ کرد. ئەم بەیعەتەیان بەبەیعەتی ژنان ناوبرد چوونکە هێشتا شەڕ پێویست نەکرابوو.

دەستەی دووەم ئەم کەسانە بوون: ئەسعەد کوڕی زەرارە، عەوف کوڕی حارس، مەعاز کوڕی حارس، رافیع کوڕی مالك، زەکوان کوڕی عەبدقەیس، عوبادە کوڕی سامت، باوکی عەبدولرەحمان یەزید کوڕی سەعلەبە، عەباس کوڕی عوبادە، عوقەبە کوڕی عامر، قوتبە کوڕی عامر، باوکی هەیسەم کوڕی تیهان و عوەید کوڕی ساعیدە.

عوبادە کوڕی سامت دەڵێت: لەعەقەبەی یەکەم ئامادە بووم و دوانزە کەس بووین. لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتی ژنانمان بەست و ئەمە پێش ئەوە بوو شەڕ پێویست بکرێت. بەیعەتمان کرد شەریك بۆ خوا دانەنێین و لەدزی و زینا خۆمان دوور بخەینەوە و منداڵەکانی خۆمان نەکوژین و تۆمەتی ناڕەوا بۆ کەس هەڵنەبەستین و لەکاری پێغەمبەر(د.خ) نافەرمانی نەکەینە پیشە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەری رێزتان لەبەیعەتەکەتان گرت، بەهەشت دەبێتە جێگەتان، ئەگەر بەشێکیتان پشتگوێ خست و لەم دنیایە سزاکەیتان چێشت، کەفارەی تاوانەکەتان داوە و ئەگەر کارە ناڕەواکەی خۆتان ئاشکرا نەکرد، لەرۆژی هەستانەوە خواوەند لێپێچینەوەتان لەگەڵ دەکات، ئەگەر بخوازێت، دەتانبەخشێت و ئەگەر بخوازێت، سزاتان دەدات.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئەنسارییەکان بۆ سەرزەمینی خۆیان دەگەڕانەوە، پێغەمبەر(د.خ) مەسعەب کوڕی عومەیر کوڕی هاشم کوڕی عەبدمەنافی لەگەڵ ئەوان نارد تا قورئانیان بۆ بخوێنێت و ئیسلام و فیقەیان فێر بکات. مەسعەب لەمەدینە بەقاری ناوی دەرکرد و شوێنی مانەوەی، لەماڵی ئەسعەد کوڕی زەرارە بوو.

دەڵێت: رۆژێك ئەسعەد کوڕی زەرارە لەگەڵ مەسعەب کوڕی عومەیر بەرەو گەڕەکی منداڵەکانی عەبدئەشهەل و بەنی زەفەر، بەرێکەوتن. سەعد کوڕی مەعاز سەرکردەی خەڵکەکە، کوڕە پووری ئەسعەد کوڕی زەرارە بوو. لەیەکێك لەباخەکانی منداڵەکانی زەفەر لەسەر چاڵاوێك دانیشتن و لەگەڵ چەند کەسێك لەهۆزی ئەسلەم کۆبوونەوە. لەم کاتەدا سەعد کوڕی مەعاز بەئەسید کوڕی حوزەیری وت: ئەم دوو پیاوەی بۆ گەڕەکی ئێمە هاتوون، مەبەستی ئەوەیان هەیە لاوازەکانی ئێمە لەرێگە بەدەر بەرن. رێگەی ئەم کارەیان لێبگرە و پێی بڵێ نەیێتە گەڕەکی ئێمە. ئەگەر ئەسید کوڕی زەرارە کوڕە پوورم

نەدەبوو، خۆم ئەو کارەم دەکرد.

ئەسعەد کوڕی حوزەیر ڕمە کورتەکەی خۆی هەڵگرت و بۆ لای ئەوان بەرێکەوت. کاتێك ئەسعەد کوڕی زەرارە ئەوی بینی، بەمەسعەبی وت: ئەمە سەرکردەی خەڵکانە، بەراشکاوی قسەی لەگەڵ بکە.

مەسعەب وتی: ئەگەر دانیشێت، لەگەڵی دەدوێم.

دەڵێت: ئەسید وەستا و دەستی بەجوێندان کرد، وتی: بۆ هاتوون، دەتانەوێت لاوازەکانی ئێمە فریوبدەن، ئەگەر دەتانەوێت بەزیندووی بمێننەوە، لێرە بڕۆن.

مەسعەب پێی وت: دانیشە و گووێ بگرە، ئەگەر ویستت رازی ببە و ئەگەر نەتویست، رازی مەبە.

ئەسید وتی: وتەیەکی دادپەروەرانەیە، ڕمە کورتەکەی خۆی لەزەیو چەقاند و دانیشت.

مەسعەب سەبارەت بەئیسلام قسەی بۆ کرد و قورئانی بۆ خوێندەوە.

مەسعەب و ئەسعەد وتبوویان: سوێند بەخوا پێش ئەوەی قسە بکات، لەروو کراوەی روخساری دەمانزانی باوەڕ بەئیسلام دێنێت.

ماوەیەك دواتر وتی: زۆر باش ودڵپەسەندە، کاتێك بتانەوێت باوەڕ بەم دینە بێنن، چی دەکەن؟

وتیان: دەبێت غوسڵ بکەیت و جلەکانت پاك و خاوێنە بکەیتەوە، دواتر شایەتوومان بێنیتە سەر زمان و دوو رەکعەت نوێژ بخوێنیت.

دەڵێت: ئەسید هەستا و غوسڵی کرد و جلەکانی پاك کردەوە و شایەتوومانی هێنا و دوو رەکعەت نوێژی خوێند. بەمەسعەب و ئەسعەدی وت: لێرە پیاوێك هەیە ئەگەر باوەڕ بەئێوە بێنێت، هیچ کەس لەخەڵکەکەی نافەرمانی ناکات، ئەو سەعد کوڕی مەعازە. کەمێکی دیکە دەینێرم بۆ لای ئێوە.

ئەسید ڕمەکەی خۆی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ لای سەعد و خەڵکان کە لەشوێنەکەی خۆیان دانیشتبوون. کاتێك سەعد کوڕی مەعاز ئەوی لەدوورەوە بینی، وتی: سوێند بەخوا ئەسید کوڕی حوزەیر بەروخسارێکی جیاواز گەڕایەوە.

کاتێك ئەسید لای ئەوان وەستا، سەعد مەعاز پێی وت: چیت کرد؟.

ئەسید وتی: هیچی خراپم نەبینی، ڕێگەم لێگرتن و وتیان: تۆ هەرچی بڵێی

ئەنجامی دەدەین. بەڵام بیستم کەمناڵەکانی حارسە بەرێکەوتون تا ئەسعەد کوڕی زەرارە بکوژن و کاتێك زانییان ئەو کوڕە پووری تۆیە، مەبەستی ئەوەیان کرد ڕێزی تۆ بشکێنن.

دەڵێت: سەعد تووڕە هەستا و لەوەی بیستبووی، ترسا. ڕمەکەی لەدەستی ئەسید وەرگرت و وتی: سوێند بەخوا هیچ کارێکت نەکرد. بۆ لای مەسعەب و ئەسعەد کوڕی زەرارە ڕۆشت. کاتێك ئەوانی بەئارام و ئاسوودە بینی، زانی ئەسید ویستوویەتی گوێ لەوتەکانی ئەوان بگرێت. لەنزیکەوە وەستا و دەستی بەجوێندان کرد و بەئەسعەد کوڕی زەرارەی وت: ئەی باوکی ئەمامە، ئەگەر لەبەر خزمایەتی نەدەبوو، نەتدەتوانی لەماڵەکەی ئێمە کارێك ئەنجام بدەیت کەلای ئێمە ناپەسەندە.

ئەسعەد کوڕی زەرارە بەمەسعەبی وت: سوێند بەخوا ئەمە ئەو سەرکردەیە وخەڵکان شوێنکەوتەی ئەون، ئەگەر باوەڕ بەتۆ بێنێت، کەس دژایەتی تۆ ناکات.

مەسعەب بەسەعد کوڕی مەعازی وت: دانیشە و گووێ بگرە، ئەگەر پەسەندت کرد، ڕازی ببە و ئەگەر پەسەندت نەکرد، بەپێچەوانەی خواستی تۆ ناجووڵێینەوە.

سەعد وتی: دادپەروەرییە. ڕمەکەی لەزەوی چەقاند و دانیشت. مەسعەب باسی ئیسلامی بۆ کرد و چەند ئایەیێکی قورئانی خوێندەوە. وتبوویان: پێش ئەوەی دەست بەقسە بکات، ئیسلامەمان لەروخساری ئەودا بینی.

سەعد وتی: کاتێك کەسێك بیەوێت، باوەڕ بێنێت، دەبێت چی بکات؟

وتیان: غوسل دەکەیت و جل و بەرگی خاوێن دەپۆشیت و شایەتوومان دێنیت و دوو ڕەکعەت نوێژ دەخوێنیت.

دەڵێت: سەعد هەستا، غوسڵی کرد و جلەکانی خاوێن کردەوە و شایەتوومانی هێنایە سەرزمان، دوو ڕەکعەت نوێژی خوێند و بۆ لای خەڵکان گەڕایەوە. ئەسید کوڕی حوزەیری لەگەڵدا بوو.

کاتێك خەڵکان ئەویان لەدوورەوە بینی، وتیان: سوێند بەخوا بەروخسارێکی جیاوازەوە گەڕایەوە.

کاتێك سەعد لەنزیك خەڵكان وەستا، وتی: ئەی مناڵەکانی عەبدئەشهەل، چۆن من دەناسن؟

وتیان: سالار و سەروەری ئێمەیت.

وتیان: ژنان و پیاوانی ئێوە قسە لەگەڵ من ناکەن تا ئەو کاتەی باوەڕ بەخوا و

پێغەمبەر(د.خ) دێنن.

دەڵێت: سوێند بەخوا، هەمان شەو، لەگەڕەکی منداڵەکانی عەبدئەشهەل، هەموو ژن و پیاوەکان موسوڵمان بوون.

مەسعەب بۆ ماڵی ئەسعەد کوڕی زەرارە گەڕایەوە و پێشنیاری ئیسلامی بەخەڵکان دەکرد. ماڵێك لەناو ئەنساردا نەمایەوە کەژن و پیاوی موسوڵمانی تیا نەبێت جگە لەتیرەی ئەوس الله کەشاعیرەکەیان باوکی قەیس، ئەسڵەتی سەیفی رێگەی ئەو کارەی لێدەگرتن و ناباوەڕ مانەوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە کۆچی کرد و شەڕی بەدر و ئۆحۆد و خەندەك، کۆتایی پێهات.

دەڵێت: دوای ئەوە، مەسعەب کوڕی عومەیر بۆ مەککە گەڕایەوە. موسوڵمانانی ئەنسار لەگەڵ حاجییە ناباوەڕەکانی خەڵکەکەی خۆیان هاتنە مەدینە و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) لەنزیك عەقەبە، کاتێکیان بۆ یەکتر بینین دیاری کرد. خواوەند مەبەستی ئەوەی کردبوو هاوکاری پێغەمبەر(د.خ) بکات و ئیسلام لای موسوڵمانان ئازیز و ناباوەڕی ریسوا بکات.

لەکەعب کوڕی مالك کە یەکێك بوو لەئامادە بووانی عەقەبە و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) لەو شوێنە بەیعەتی کردبوو، دەگێڕنەوە: ئێمە لەکاتی حەج کردن ڕۆشتینە مەدینە، نوێژمان دەکرد وشارەزای دینەکە ببوین، سالار و سەرکردەی ئێمە، بەراء کوڕی مەعرور، هاورێیەتی ئێمەی دەکرد. کاتێك لەمەدینە هاتەدەر، بەراء وتی: سوێند بەخوا، بۆچوونێکم هەیە، ئایا رازی دەبن.

ئێمە وتمان: بۆچوونەکەت چییە؟

وتی: بۆچوونم ئەوەیە ئەم بینایە پشت گوێ نەخەین و رووەو کەعبە نوێژ بخوێنین.

وتمان: سوێند بەخوا ئێمە بیستوومانە پێغەمبەر(د.خ) روو دەکات شام و نوێژ دەخوێنێت، ئێمە نافەرمانی فەرمانەکانی ناکەین.

بەراء وتی: من روو دەکەمە کەعبە و نوێژ دەخوێنم.

وتمان: ئێمە نایکەین.

دەڵێت: کاتێك کاتی نوێژ گەیشت، ئێمە روومان کردە شام و نوێژمان خوێند و بەراء رووی کردە کەعبە و نوێژی خوێند. گەیشتینە مەککە و رەخنەمان لەم کارەی بەراء گرت

بەڵام دەستبەرداری کارەکەی نەبوو.

کاتێك گەیشتینە مەککە، پێی وتم: با بڕۆینە لای پێغەمبەر(د.خ) و سەبارەت بەکارەکەی خۆم پرسیاری لێبکەم چوونکە لەدژایەتی کردنی ئێوە دڵم پیس بووە.

دەڵێت: ڕۆشتین و بەدوای پێغەمبەردا(د.خ) گەڕایین چوونکە ئەومان نەدەناسی وپێشتر ئەومان نەبینیبوو. یەکێك لەکەسانی مەککەمان بینی و پرسیاری پێغەمبەرمان(د.خ) لێکرد.

وتی: ئایا دەیناسن؟

وتمان: نە.

وتی: عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی دەناسن؟

وتمان: بەڵێ.

دەڵێت: عەباسمان دەناسی لەبەر ئەوەی بازرگان بوو و دەهاتە لای ئێمە. ئەو کەسە ووتی: کاتێك ڕۆشتنە ناو مزگەوتی حەرام، پێغەمبەر(د.خ) ئەو کەسەیە لەگەڵ عەباس دانیشتووە.

دەڵێت: ڕۆشتینە ناو مزگەوت، عەباس و پێغەمبەری دانیشتبوون. سڵاومان کرد و دانیشتین.

پێغەمبەر(د.خ) رووی کردە عەباس و وتی: ئەم دوو پیاوە دەناسی؟

عەباس وتی: بەڵێ، ئەمە بەراء کوڕی مەعرور سەرکردەی خەڵکەکەی خۆیەتی و ئەمە کەعب کوڕی مالکە.

دەڵێت: سوێند بەخوا فەرموودەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەبیر ناکەم کەفەرمووی: هەمان شاعیرەکە؟

عەباس وتی: بەڵێ.

بەراء کوڕی مەعرور وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بۆ ئەم سەفەرە هاتم و خواوەند ڕێگەی ئیسلامی نیشاندام. بەڵام بەباشم زانی پشت نەکەمە کەعبە و روو لەکەعبە نوێژ بخوێنم، هاوڕێکانم دژایەتی ئەو کارەیان کردم تا ئەو ئەندازەی دڵم لێیان پیس بوو، بۆچوونی تۆ چییە.

پێغەمبەر(د.خ) وتی: باشترە لەگەڵ خەڵکەکەت بمێنیتەوە، بەراء چیتر روو لەشام نوێژی دەخوێند.

دەڵێت: کەسەکانی دەڵێن رووی دەکردە کەعبە و نوێژی دەخوێند تا کاتێك مرد.

بەڵام ئەمە ڕاست نییە و ئێمە باشتر دەزانین.

دەڵێت: دوای ئەوە ڕۆشتینە حەج و لەنیوەی ڕۆژەکانی تشرین لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) لەعەقەبە کاتی یەکتربینینمان دیاری کرد. کاتێك لەحەج تەواو بووین و شەوی دیاریکراو گەیشت، باوکی جابر عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی حەرام لەگەڵمان بوو، لەمەبەستەکەی خۆمان ئاگادارمان کردەوە. ئێمە، کارەکانی خۆمان لەناباوەڕانی مەککە دەشاردەوە، بەڵام بەومان وت: ئەی باوکی جابر، تۆ یەکێکیت لەسەرانی خەڵکەکەی ئێمە و دەترسین ئەگەر لەسەر ئەم دینەی خۆت بمێنیتەوە، بڕۆیتە جەهەننەم. دواتر پێشنیاری ئیسلامەمان پێکرد و وتمان بڕیارمانداوە لەعەقەبە چاومان بە پێغەمبەر(د.خ) بکەوێت، باوکی جابر باوەڕی هێنا و لەگەڵ ئێمە هاتە عەقەبە و بوو بەیەکێك لەئێمە.

دەڵێت: ئەو شەوە، لەشوێنەکەی خۆمانماینەوە تا ئەو کاتەی یەك لەسەر سێی شەو بەسەرچوو، بەرەو شوێنی دیدارەکە بەڕێکەوتین. بەنهێنی ڕۆشتین و لەدۆڵی نزیك عەقەبە کۆبووینەوە. حەفتا کەس بووین و دوو ژنیش هاوڕێیەتی ئێمەیان دەکرد. چاوەڕوانی پێغەمبەر(د.خ) بووین، هات. عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی هاوڕێیەتی دەکرد. عەباس هێشتا باوەڕی نەهێنابوو، بەڵام دەیویست لەکاری برازاکەی بەشدار بێت و پەیمانی بۆ وەربگرێت.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) دانیشت، یەکەم کەس قسەی دەسپێکرد، عەباس بوو، وتی: ئەی خەزرەجییەکان (هەموو ئەنسارییەکان چ ئەوس و چ خەزرەج، بەخەزرەجی ناو دەبرد)، پێگەی محەممەد لای ئێمە دەزانن، لەبەڵاکانی خەڵکەکەی خۆمان پاراستمان و ئێستا لەناو شارەکەی خۆی ڕێز و پێگەی هەیە بەڵام دەخوازێت پەیوەستی ئێوە ببێت، ئەگەر دەزانن دەتوانن وەفادار بن و دژی نەیارەکانی پشتیوانی بکەن، خۆتان دەزانن و بەڵێنەکەتان و ئەگەر دەزانن کاتێك ڕوو دەکاتە مەدینە، تەسلیمی نەیارەکانی دەکەن و هاوکاری ناکەن، هەر ئێستاکە بەجێی بێڵن چوونکە لەناو شارەکەی خۆی بەئاسوودەی ژیان بەسەر دەبات.

دەڵێت: بەعەباسمان وت: وتەکانی تۆمان بیست، هەنووکە ئەی پێغەمبەر(د.خ) تۆ بدوێ و داواکارییەکانت باس بکە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ئاخاوتنی دەسپێکرد و قورئانی خوێندەوە و بۆ پشتگەرم

بوون لەئیسلام هانیدان، فەرمووی: بەیعەتی من لەسەر ئێوە بێت کەهاوشێوەی هاوسەر و منداڵەکانتان پارێزگاریم لێبکەن.

بەراء کوڕی مەعرور وتی: سوێند بەو خوایەی بەراستی تۆی ناردووە، هاوشێوەی کەسەکانی خۆمان دەتپارێزین، ئەی پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتمان لەگەڵ بکە چوونکە پیاوی شەڕ و سیلاحین و ئەمەمان لەباوکانی خۆمانەوە بۆ ماوەتەوە.

باوکی هەیسەم تیهان هاوپەیمانی منداڵەکانی عەبدئەشهەل، وتەکانی بەراء ی بڕی و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەنێوان ئێمە و کەسەکان، مەبەستی جوولەکەکان بوو، پەیمانێك هەیە و دەیشکێنین ئەگەر ئەو کارە بکەین و سەرکەوتن بەدەست بێنیت، ئەگەری هەیە بۆ ناو خەڵکەکەی خۆت بگەڕێیتەوە و ئێمە پشتگوێ بخەیت؟

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بزەیەك کەوتە سەر لێوی و وتی: خوێنی من خوێنی ئێوەیە و وێرانی من وێرانی ئێوەیە، من لەئێوەم و ئێوە لەمنن، لەگەڵ هەرکەس بجەنگن، دەجەنگم و پەیمانی ئاشتیتان لەگەڵ هەر کەس هەبێت، ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ دەگرمەبەر.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوانزە سەرکردە هەڵبژێرن تا کاروباری خەڵکەکەتان سامان بدات. دوانزە کەسەکە هەڵبژێردران، نۆیان لەخەزرەج و سیان لەئەوس.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دواتر پێغەمبەر(د.خ) بەسەرکردەکانی فەرموو: سەرپەرەستی کارەکانی خەڵکی خۆتانن و هاوشێوەی حەوارییەکانی عیسا کوڕی مریەم، سەرپەرەستی ئەوانن، منیش سەرپەرەستی خەڵکەکەی خۆمم.

ئەوان وتیان: ڕازین.

عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادە وتی: کاتێك خەڵك بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) یەکیانگرت، عەباس کوڕی عوبادەی ئەنساری وتی: ئەی خەڵکی خەزرەج، دەزانن بەیعەتی ئێوە لەگەڵ ئەم پیاوە لەسەر چییە؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: بەیعەت دەکەن کە لەگەڵ ڕەش و سوور بجەنگن، ئەگەر دەزانن کاتێك گەورەکانتان دەکوژرێن و سامانەکانتان تاڵان دەکرێت، بەجێی دەهێڵن، بزانن کە ئەم کارە لاوازی و ڕیسوایی هەردوو دنیایی بەدواوە دێت و ئەگەر دەزانن لەئەگەری لەدەستدانی سامان و ماڵی خۆتان، ڕێز لەبەیعەتەکەتان دەگرن، لەگەڵ خۆتان بیبەن

چوونکە خێری ئەم دنیا و ئەو دنیایی بەدواوە دێت.

خەڵکان وتیان: ئەگەر سامانمان بەفیڕۆ بڕوات و سەرکردەکانیشمان بکوژرێن، ئەو لەگەڵ خۆمان دەبەین.

ئەوسا وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەگەر ڕێزمان لەبەیعەتەکەی خۆمان گرت، چیمان پێدەبڕێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەهەشت.

وتیان: دەستت بێنەپێش. پێغەمبەر(د.خ) دەستی بردە پێش و بەیعەتیان لەگەڵ کرد.

عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادە وتی: عەباس ئەو قسانەی کرد بۆ ئەوەی پەیمانەکەی پێغەمبەر(د.خ) بەهێزتر بکات.

بەڵام بەوتەی عەبدوالله کوڕی ئەبی بەکر وتەکانی عەباس بۆ ئەو مەبەستە بوو تا ئەو شەوە بەیعەتەکە دوا بکەوێت بۆ ئەوەی عەبدوالله کوڕی ئەبی کوڕی سەلوولیش ئامادە بێت و هێزی خەڵك زیاد بکات. خواوەند دەزانێت مەبەستی چی بوو؟!

منداڵەکانی نەجار دەڵێن: ئەسعەد کوڕی زەرارە یەکەم کەس بوو بەیعەتی کرد بەڵام منداڵەکانی عەبدئەشهەل دەڵێن: یەکەم کەس باوکی هەیسەم کوڕی تیهان بوو.

کەعب کوڕی مالك دەڵێت: یەکەم کەس لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتی بەست، بەراء کوڕی مەعرور بوو. دوای ئەوە کەسانیتر بەیعەتیان کرد و کاتێك هەموومان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتمان کرد، شەیتان لەسەرەوەی عەقەبە، بەبەرزترین دەنگ کە تا ئەوکاتە بیستبووم، هاواری کرد: ئەی خەڵکینە! پێغەمبەر(د.خ) و صابییەکان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێوە، پەیمانیان بەست.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوژمنی خوا چی دەڵێت، ئەمە شەیتانی عەقەبەیە. دوژمنی خوا بزانە کۆتایی بەژیانی تۆیش دێنین.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) بەئەنساری فەرموو: بۆ شوێنەکانی خۆتان بگەڕێنەوە. عەباس کوڕی عوبادە وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بەراستی ڕەوانە کردووە، ئەگەر بخوازیت بەیانی بەشمشێر دەکەوینە کوشتاری خەڵکانی مەنی.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: فەرمانی لەو شێوەم پێنەدراوە، بۆ شوێنەکانی خۆتان بگەڕێنەوە.

دەڵێت: بۆ شوێنەکانی خۆمان گەڕاینەوە و خەوتین. کاتێك بەیانی بوویەوە، قورەیشییەکان هاتنە لامان و وتیان: ئەی خەزرەجییەکان، بیستوومانە لای هاورێکەی ئێمە بوون و دەتانەوێت لەگەڵ خۆتانی ببەن و بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێمە، بەیعەتتان لەگەڵ بەستووە، سوێند بەخوا ناخوازین لەنێوان ئێمە و ئێوە شەڕ رووبدات.

دەڵێت: ناباوەڕانی خەڵکەکەی ئێمە، سوێندیان بۆ خواردن کە شتی وا رووینەداوە و ئاگادار نین.

ئەوان باوەڕیان کرد. ئێمە سەیری یەکمان دەکرد. خەڵکان هەستان، حارس کوڕی هوشام کوڕی موغەیرەی مەخزومی لەناو ئەواندا بوو، جووتێك پێپۆشی تازەی لەپێدابوو، منیش بۆ ئەوەی شتێکم وتبێت، وتم: ئەی باوکی جابر، تۆ کەیەکێك لەسەروەرانی خەڵکەکەی ئێمەیت، ناتوانیت پێپۆشێکی هاوشێوەی پێپۆشی ئەم گەنجە قورەیشییە لەپێ بکەیت.

کاتێك حارس ئەم وتەی بیست، پێپۆشەکانی دەرهێنا و بۆ منی هاویشت، وتی: لەپێیان بکە. باوکی جابر وتی: سوێند بەخوا ئەم گەنجەت تووڕە کرد، پێپۆشەکانی بۆ بگەڕێنەرەوە.

وتم: سوێند بەخوا نایگەڕێنمەوە، چوونکە ئەمە شانسە و ئەگەر بەخت هاورێیەتیم بکات، دەبمە خاوەنی جلەکانیشی.

بەمشێوە بوو حەدیسی کەعب کوڕی مالیك سەبارەت بەعەقەبە کەخۆی تیایدا بەشدار بوو.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: ئەنسارییەکان لەمانگی زیحەججە، لەمەککە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتیان کرد و پێغەمبەر(د.خ) دوای بەیعەت، پاشماوەی ئەو مانگە و موحەرەم و سەفەری لەمەککە بەسەر برد و لەمانگی رەبیع الاول بۆ مەدینە کۆچی کرد و رۆژی دووشەممەی دوانزە ئەو مانگە، گەیشتە ناو شاری مەدینە.

هوشام کوڕی عوروە دەڵێت: کاتێك کۆچکەرانی حەبەشە گەڕانەوە، ژمارەی موسوڵمانەکان زیادی کرد و دەستەیەکی زۆر لەئەنساری مەدینە باوەڕیان هێنا. ئیسلام لەو شارەدا بڵاوبوویەوە و خەڵکانی مەدینە پێش خەڵکانی مەککە کەوتن.

کاتێك قورەیشییەکان ئەمەیان بینی، ئازارەکانی سەر موسوڵمانانیان زیاتر کرد. دەیانەویست لەدینەکەیان پەشیمانیان بکەنەوە، دژوارییەکانی موسوڵمانان زیادی کرد.

ئەمە دوایین فیتنە و ئاژاوە بوو کەموسوڵمانان پێی گرفتار دەبوون. ئاژاوەی یەکەم ئەوە بوو پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدان بۆ حەبەشە بڕۆن. ئاژاوەی دووەم کاتێك سەرپهەڵەدا کە لەحەبەشە گەڕانەوە.

بەمشێوەیە حەفتا کەس لەسەرانی موسوڵمانی مەدینە، لەکاتی حەج ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. پەیمانیاندا و وتیان: تۆ لەئێمەیت و ئێمە لەتۆین و هەرکەس لەهاوەڵانی تۆ کەبێتە لای ئێمە، لەئێمەیە و هاوشێوەی خۆمان پارێزگاریتان لێدەکەین.

قورەیشییەکان بەرابەر بەموسوڵمانەکان توندوتیژیان کردە پیشە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی تا هاوەڵانی بەرەو مەدینە کۆچ بکەن. ئەمە دووەم جار بوو پێغەمبەر(د.خ) هاوەڵانی خۆی ڕەوانە دەکرد و خۆیشی دوای ئەوان کۆچی کرد. لەم کاتەدا بوو خواوەند ئەم ئایەی بۆ ناردەخوار:

((و قاتلوهم حتى لا تكون فتنة (و يكون الدين كله الله).

واتاکەی: شەڕیان لەگەڵ بکەن بۆ ئەوەی ئاژاوە و فیتنە نەمێنێتەوە و هەموو دین تایبەت بەخوا بێت.))

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: قورەیشییەکان ڕۆشتنە لای عەبدوللە کوڕی ئەبی سەلوول و قسەیان لەگەڵ کرد. عەبدوللە کوڕی ئەبی وتی: ئەم کارێکی گەورەیە و خەڵکەکەی من بێ ئاگاداری من ئەو کارە ناکەن. ئەوان ڕۆشتن و خەڵکان لەمەنی بلاوەیان لێکرد. هەواڵەکە بلاوبوویەوە و زانیان پێشهاتێك روویداوە. بەدوای ئەنسارییەکاندا گەڕان. سەعد کوڕی عوبادە ومونزەر کوڕی عەمرۆیان دۆزییەوە کەهەردووکیان لەسەر کردەکان بوون. مونزەر هەڵات بەڵام سەعدیان گرت. دەستی ئەویان بەملییەوە بەستەوە و بردیانە ناو شاری مەککە و ئازاریاندا. قژیان ڕادەکێشا چوونکە قژی زۆر درێژ بوو.

سەعد دەڵێت: لەدەستی قورەیشییەکاندا بووم. چەند کەسێکیان بەرەورووم دەهات. لەناویاندا پیاوێکی سپی روخساری دەبینرا. بەخۆم وت ئەگەر شتێك هەبێت لای ئەم پیاوەیە. کاتێك لەمن نزیك کەوتەوە، شەقەزللەیەکی زۆر بەهێزی لەروخسارمدا و بەخۆمم وت: دوای ئەمە هیچ شتێك لای قورەیشییەکان دەست ناکەوێت. لەهەمان کات کە لەدەستی ئەواندا بووم و منیان بەسەر زەویدا ڕادەکێشا، یەکیان لێم نزیك کەوتەوە و

وتی: لەنێوان تۆ و قورەیشییەکان، هیچ و پەنا و پەیمانێك نییە.

وتم: بۆ نا، من پشتیوانیم لەبازرگانی کردنی جوبەیر کوڕی موتعیم و حارس کوڕی ئومەییە دەکرد و ڕێگەم نەدەدا کەس دەستدرێژیان بکاتە سەر.

وتی: ناوی ئەم دوو کەس بەدەنگی بەرز بێنەسەر زمان و کارەکانی خۆت لەگەڵ ئەوان باس بکە.

دەڵێت: ئەو کارەم کرد و ئەو پیاوە بەدوای جوبەیر و حارسدا ڕۆشت. لەمزگەوتی حەرام لەنزیك کەعبە ئەوانی بینی و وتی: لەئەبتەع لەیەکێك لەخەزرەجییەکان دەدەن و دەڵێت لەنێوان خۆی و ئێوەدا پەیمانێك هەیە.

وتبوویان: ئەو کەسە کێیە؟

وتبووی: سەعد کوڕی عوبادە.

وتبوویان: ڕاست دەکات چوونکە پارێزگاری لەبازرگانی ئێمە کرد و ڕێگەی نەدەدا لەشارەکەی خۆی کەس دەستدرێژی بکاتە سەر کاڵاکانی ئێمە.

دەڵێت: ئەو دووانە هاتن و سەعدیان لەدەست قورەیشییەکان ڕزگار کرد و ڕۆشت.

ئەو کەسە لەقورەیشییەکان کە لەگەڵ سەعد دوا، سەهیل کوڕی عەمرۆ بوو.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: کاتێك ئەنسار بۆ مەدینە گەڕانەوە، باوەڕهێنانی خۆیان ئاشکرا کرد، هێشتا چەند کەسێك لەپیرەکانی خەڵك، ناباوەڕ بوون کەعەمرۆ کوڕی جەموح لەناویاندا دەبینرا.

((مەعاز کوڕی عەمرۆ کوڕی جەموح لەعەقەبە ئامادە بوو و لەگەڵ گەنجەکانی ئەنسار، بەیعەتی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەست.))

دەستەیەك لەئەوس و خەزرەج، لەعەقەبەی دووەم لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتیان بەست و ئەمە بەیعەتی جەنگ بوو چوونکە خواوەند بانگی شەڕی هەڵدا و بارودۆخ جیاواز لەعەقەبەی یەکەم بوو. لەعەقەبەی یەکەم بەپێی ئەو حەدیسەی لەعوبادە کوڕی سامت گێڕامانەوە، بەیعەتی ژنان بوو، بەڵام عەقەبەی دووەم، وەك لەگێڕانەوەکەدا ئاماژەم پێدا، بۆ شەڕ کردن لەگەڵ سوور و ڕەش بوو.

عوبادە کوڕی سامت یەکێك لەسەرکردەکان بوو، دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتی جەنگمان بەست. عوبادە لەو دوانزە کەسە بوو لەعەقەبەی یەکەم لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەیعەتی بەست.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: کاتێك خواوەند بانگی جەنگی بەگوێی پێغەمبەر(د.خ)

ڕاگەیاند، پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا لەمەککە کۆچ بکەن و ڕێگەی مەدینە بگرنەبەر و پەیوەستی برا ئەنسارییەکانی خۆیان بن. فەرمووی: خواوەند برا و سەرزەمینێکی بۆ ئێوە دیاری کرد کە لەوێ پارێزراو دەبن. ئەوان بەرێکەوتن و پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە مایەوە. چاوەڕوانی دەکرد تا خواوەند مۆڵەتی ئەو کارەی پێبدات بۆ ئەوەی لەمەککەوە بۆ مەدینە کۆچ بکات.

دەڵێت: یەکەم کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بۆمەدینە کۆچی کرد، باوکی سەلمە کوڕی عەبدئەلئەسەدی مەخزومی بوو. یەك ساڵ پێش بەیعەتی عەقەبە بۆ مەدینە ڕۆشت، ئەو یەکێك بوو لەکۆچکەرانی حەبەشە و کاتێك بۆ مەککە گەڕایەوە، قوڕەیشییەکان ئازاریان دەدا و کاتێك زانی ئەنسار باوەڕیان هێناوە، بۆ مەدینە کۆچی کرد.

کۆچکەرێکی دیکە بەدوای باوکی سەلمە، عامر کوڕی ڕەبیعە هاوپەیمانی عودەی کوڕی کەعب بوو کە لەگەڵ هاوسەرەکەی لەیلی کچی ئەبی حەسمە، بۆ مەدینە ڕۆشت.

دوای ئەو، عەبدوالله کوڕی جەحش و باوکی ئەحمەد کوڕی جەحش کۆچیان کرد. باوکی ئەحمەد کوێر بوو بەڵام بێ ڕێنیشاندەر لەسەرو و خواری مەککە هاتوچۆی دەکرد. دوای ئەوان، هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە بەرێکەوتن. پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە بوو و چاوەڕوانی مۆڵەتی خوای دەکرد. هەر کەس لەموسوڵمانان لەمەککە مابوویەوە یا کەوتبووە زیندان یا گرفتاری فیتنەی ناباوەڕان ببوو، جگە لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەبوبەکر کوڕی ئەبی قوحافە.

بەمشێوەیە بوو، ئەبوبەکر بەردەوام داوای لەپێغەمبەر(د.خ) دەکرد مۆڵەتی کۆچ کردنی پێبدات، پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: پەلە مەکە ئەگەری هەیە خواوەند کەسێك بکاتە هاوسەفەری تۆ. ئەبوبەکر هیوادار بوو هاوسەفەرەکەی پێغەمبەر(د.خ) بێت.

کاتێك قوڕەیشییەکان بینیان پێغەمبەر(د.خ) لەشارەکانی دیکە پشتیوان و هاوەڵی هەیە و لەڕۆشتنی باوەڕداران، ئاگادار بوونەوە و لەژێر دەستی ئەواندا نەماون، چاودێری ڕۆشتنەدەرەوەی پێغەمبەر(د.خ) بوون چوونکە دەیانزانی ئەویش پەیوەستی کۆچکەران دەبێت تا خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات لەبەر ئەمە لەدار ئەلنەدوە،ماڵی قوسەی کوڕی کەلاب کەقوڕەیشییەکان هەموو کارەکانی خۆیان لەوێ ئەنجامدەدا، کۆبوونەوە و ڕاوێژیان کرد تا بزانن دەبێت بەرابەر بە پێغەمبەر(د.خ) چی بکەن چوونکە

لەسەرئەنجامی کارەکانی ئەو دەترسان.

کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك قوڕەیشییەکان بڕیاریاندا لەماڵەکەی قوسەی کۆببنەوە و سەبارەت بەکارەکانی پێغەمبەر(د.خ) راوێژ بکەن، لەرۆژی دیاریکراو، شەیتان لەروخساری پیاوێکی بەرێز و بەجل و بەرگێکی ناشیرین خۆی نیشانی ئەوندا. لەبەردەم ماڵەکەدا وەستا و کاتێك قوڕەیشییەکان ئەویان بینی، وتیان: ئەی پیرە پیاو کێیت؟

ئیبلیس وتی: پیرێك لەدانیشتووانی نەجد و کاتێك لەکارەکەی ئێوە ئاگادار بوومەوە، هاتم تا گوێ لەوتەکانی ئێوە بگرم و ئەگەری هەیە بتوانم هاوکاریتان بکەم.

وتیان: زۆرباشە، پەیوەستمان ببە. ئیبلیس لەگەڵ ئەوان رۆشتەژوور.

دەڵێت: لەم کۆبوونەوەدا سەرکردەکانی قوڕەیش لەهەموو هۆزەکان ئامادە بوون:

لەمناڵەکانی عەبدشەمس: شەیبە و عوتەبە کوڕەکانی رەبیعە و ئەبوسوفیان کوڕی حەرب.

لەمناڵەکانی نەوفل کوڕی عەبدمەناف: توعەیمە کوڕی عودەی و جوبەیر کوڕی موتعیم و حارس کوڕی عامر کوڕی نەوفل.

لەمناڵەکانی عەبدئەلدار کوڕی قوسەی: نەزر کوڕی حارس کوڕی کەلدە.

لەمناڵەکانی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزەی: باوکی بەختەری کوڕی هوشام و زەمعە کوڕی ئەسوەد و ئەسوەد کوڕی موتەلیب و حەکیم کوڕی حوزام.

لەمناڵەکانی مەخزوم: ئەبوجەهل کوڕی هوشام.

لەمناڵەکانی سەهم: نەبیە و مونەبە کوڕەکانی حەجاج.

لەمناڵەکانی جومەح: ئومەییە کوڕی خەلەف.

لەگەڵ کەسانی دیکە لەقوڕەیش و ئەوانەی لەقوڕەیشییەکان نەبوون.

کاتێك کۆبوونەوە، وتیان: دەسەڵاتی ئەم پیاوە بەرادەیەك زیادی کردووە کەئاگادارن لێی و دەترسین لەگەڵ هاوەڵانی هێرش بکاتە سەر ئێمە. چارەیەك بۆ ئەم کێشەیە بدۆزنەوە.

دەڵێت: راوێژیان کرد، یەکیان وتی: بەبەندێکی ئاسنین بیبەستنەوە و دەرگای لەسەر دابخەن و چاوەڕێ بن تا هاوشێوەی شاعیرەکانی دیکە، وەك زوهەیر و نابیغە و کەسانیتر، دەمرێت.

پیری نەجدی وتی: سوێند بەخوا ئەمە بۆچوونێکی راست نییە، ئەگەر زیندانی

بکەن، هاوەڵانی ئاگادار دەبنەوە و هێرشتان دەکەنەسەر تا لەدەست ئێوە رزگاری بکەن و چاوەڕوان دەبن تا ژمارەیان زیاد بکات و هێرشی سەراسەری بکەنە سەر ئێوە.

دووبارە راوێژیان کرد. یەکیان وتی: لەشارەکەی خۆمان دەیکەینەدەر و کاتێك رۆشت، چیتر ترسمان نییە بۆ کوێ دەڕوات و لەکوێ دەمێنێتەوە چوونکە لەدەست ئەو ئاسوودە دەبین و دووبەرەکی لەناو ئێمەدا نامێنێتەوە.

پیری نەجدی وتی: ئەمەیش بۆچوونێکی پەسند نییە، مەگەر کاریگەری وتەکانی ئەو بەسەر خەڵکانەوە نابینن، ئەگەر ئەم کارە بکەن، ئەگەری هەیە بڕواتە لای یەکێك لەهۆزە عەرەبەکان و بەسەریاندا زاڵ ببێت و دواتر لەگەڵ ئەوان هێرش بکاتە سەر ئێوە و کاروبارەکانتان لەدەست دەربێنێت. بۆچوونێکی دیکە پەسەند بکەن.

ئەبوجەهل کوڕی هوشام وتی: بۆچوونێکم هەیە کە کەستان باسی نەکرد.

وتیان: ئەی باوکی حەکەم، بۆچوونەکەی تۆ چییە؟

وتیان: بۆچوونی من ئەوەیە لەهەر هۆزێك گەنجێکی بوێر و رێزدار هەڵبژێرین و هەر کامیان شمشێرێکی بدەینە دەست تا هێرش بکەنە سەر محەممەد و هاوشێوەی یەك پیاو لەیەك کاتدا بیکوژن و خوێنی بڕێژن و ئێمە ئاسوودە بکەن. ئەگەر ئەو کارە بکەن، خوێنی ئەو دەکەوێتە ئەستۆی هەموو هۆزەکان و منداڵەکانی عەبد مەناف ناتوانن رووبەرووی هەموو هۆزەکان ببنەوە و بەخوێنبایی رازی دەبن، ئێمەیش خوێنباییەکەی دەدەین.

پیری نەجدی وتی: ئەمە بۆچوونی راستە و خێر تەنیا لەم کارەدایە.

لەسەر ئەوە رێککەوتن و بڵاوەیان لێکرد. جبرەئیل رۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەمشەو لەجێگەکەی خۆت مەخەوە.

دەڵێت: کاتێك شەو داهات، لەبەردەمماڵەکەی ئەودا کۆبوونەوە و چاوەڕوان بوون تا پێغەمبەر(د.خ) بخەوێت و هێرشی بکەنەسەر.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بەمەی زانی، بەعەلی کوڕی ئەبی تالیبی وت: لەجێگەکەی من بخەوە و جل و بەرگە سەوزەکەی من بپۆشە تا زیانت پێنەگات. پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی خەوتن ئەو جلە سەوزەی لەبەر دەکرد.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: دەستەیەکی دیکە بەم داستانەیان زیاد کردەوە کە پێغەمبەر(د.خ) بەعەلی فەرموو: ئەگەر کوڕی قوحافە هاتە لای تۆ، پێی بڵێ، من بەرەو

کێوی سور بەرێکەوتم با بێتە لای من، تۆ خواردنم بۆ بنێرە و ڕێنیشاندەرێکم بۆ بگرە تا من بۆ مەدینە ببات و چوارپێیەکم بۆ بکرە.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و خواوەند چاوی کەسەکانی بۆ بینیی ئەو کوێر کرد. پێغەمبەر(د.خ) لای ئەوان تێپەڕی.

محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی دەڵێت: ئەوان کۆببوونەوە، ئەبوجەهل کوڕی هوشامیش لەناویاندا بوو، کاتێك لەبەردەمماڵی پێغەمبەر(د.خ) بوون، بەوانی وت: محەممەد گومان دەکات ئەگەر باوەڕ بەدینەکەی بێنن، دەبنە پاشای عەرەب و عەجەم و دوای مەرگ، زیندوو دەبنەوە و باخێکی هاوشێوەی ئەردەنتان پێدەبڕێت، ئەگەر باوەڕ بەدینەکەی نەهێنن، دەکوژرێن و لەئاگری جەهەننەمدا دەسووتێن.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەماڵەکەی هاتەدەر، مشتێك خۆڵی هەڵگرت و فەرمووی: بەڵێ من وا دەڵێم و تۆیش یەکێکی لەوان. خواوەند، چاوانی ئەوانی بێ ئاگا و کوێر کرد، پێغەمبەریان (د.خ) نەبینی، پێغەمبەر(د.خ) خۆڵی بەسەرا کردن و ئەم ئایانەی دەخوێندەوە:

((یس و القرآن الحکیم، انك لمن المرسلین، علی صراط مستقیم، تنزیل العزیز الرحیم، لتنذر قوما ما انذر آبائهم فهم غافلون، لقد حق القول علی اکثرهم فهم لایؤمنون، انا جعلنا اعناقهم اغلا لافهی الی الاذقان فهم مقمحون. و جعلنا من بین ایدیهم سدا و من خلفهم سدا فاغشیناهم فهم لا یبصرون.

واتاکەی: یا، سین، سوێند بەم قورئانەی حیکمەت فێرکەرە، تۆ لەپێغەمبەرانی و شوێنکەوتەی ڕێگەی ڕاست. قورئان لەلایەن خواوەندی بەهێزی ڕەحیمەوە ڕەوانە کراوە تا دەستەیەك کەباوکانیان ئاگادار نەکرانەوە و خۆیشیان بێ ئاگان، ئاگادار بکەیتەوە، فەرمانی خواوەند سەبارەت بەزۆرینەی ئەوان هاتۆتەدی و ئەوان باوەڕ ناهێنن مەگەر ئەوەی بەند و زنجیر لەملیان بکەین کە تا چەناکەیان دێت و سەریان لەجووڵە دەکەوێت، لەبەردەم ئەوان لەمپەرێکمان دانا و پەردەمان خستە سەریان تا نەبینن.))

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخوێندنەوەی ئەم ئایانە تەواو بوو، هەموویان خۆڵیان بەسەرەوە بوو، پێغەمبەر(د.خ) بۆ شوێنی مەبەست کەوتەرێ. کەسێك هاتە لایان و وتی: لێرە چاوەڕێی چین؟

وتیان: چاوەڕوانی محەممەد دەکەین.

وتی: سوێند بەخوا محەممەد لەماڵەکەی هاتەدەر و خۆڵی کرد بەسەر و ڕوخساری

هەمووتاندا و ڕۆشت، مەگەر خۆڵ بەسەر و روخساری یەکەوە نابینن؟

دەڵێت: دەستیان خستەسەر سەری خۆیان و خۆڵیان بینی و سەیری دەرگای ماڵەکەیان کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیبان لەناو جێگەکەدا بینی کەجل و بەرگی پێغەمبەری لەبەردابوو، وتیان: سوێند بەخوا ئەمە محەممەدە خەوتووە و جلەکانی خۆی لەبەردایە. مانەوە تابەیانی داهات و عەلی لەجێگەکەی هەستا و وتیان: ئەو کەسەی پێی وتین محەممەد ڕۆشتووە، ڕاستی وت.سەبارەت بەم ڕووداوە و مەبەستەکەی قورەیشییەکان ئەم ئایە هاتە خوار کە:

((واذیمکر بك الذین کفرو الیثبتوك او یقتلوك او یخرجوك و یمکرون و یمکر الله و الله خیر الماکرین.

واتاکەی: و کاتێك کافران سەبارەت بەتۆ بیریان لەفریو دەکردەوە کە زیندانیت بکەن یا بتکوژن یا لەشارەکە دوورت بخەنەوە، ئەوان فێڵێیان دەکرد و خواوەند فێڵەکانی ئەوانی پووچەڵ کردەوە چوونکە خواوەند لەهەموو فێڵکەران شارەزاترە.))

و ئەم ئایە کە:

((ام یقولون شاعر نتربص به ریب المنون، قل تربصوا فانی معکم من المتربصین.

واتاکەی: و یا بڵێن شاعیرێکە کەچاوەڕوانی مەرگی ئەو دەکەین، بڵێ چاوەڕوان بن چوونکە منیش وەك ئێوە چاوەڕێم.))

دەڵێن: ئەبوبەکر ڕۆشتە لای عەلی و هەواڵی پێغەمبەری پرسی. عەلی وتی: پێغەمبەر(د.خ) بەرەو ئەشکەوتی سوور بەرێکەوت و فەرمووی ئەگەر دەیەوێت بمبینێت، با بێتە ئەو شوێنە. ئەبوبەکر بەپەلە ڕۆشت و لەرێگەدا پێغەمبەری بینی، پێغەمبەر(د.خ) دەنگی ئەبوبەکری لەتاریکی شەودا بیست و گومانی کرد یەکێکە لەکافرەکان، لەبەر ئەمە بەخێرایی ڕۆشت و پێپۆشەکەی دڕا و پەنجەی بەر بەردێك کەوت و بریندار بوو، خوێنێکی زۆری لێ ڕۆشت، ئەبوبەکر ترسا پێغەمبەری ترساندبێت، لەبەر ئەمە دەنگی بەرز کردەوە و قسەی کرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی ناسییەوە وەستا تا هات و پێکەوە ڕۆشتن. خوێن لەقاچی پێغەمبەر(د.خ) دەچۆڕا، تا بەرەبەیان گەیشتنە ئەشکەوتێك و ڕۆشتنە ناو ئەشکەوتەکە.

ئەوانەی چاودێری ماڵەکەی پێغەمبەریان دەکرد، بەرەبەیان ڕۆشتنە ناو ماڵەکەی. عەلی لەجێگەکەی هەستا و کاتێك ئەویان بینی، ناسیانەوە و وتیان: هاورێکەت

لەکوێیە؟

عەلی وتی: چوزانم، مەگەر من پاسەوانی ئەوم، پێتان وت بڕوات، ئەویش ڕۆشت.

ئەو کەسانە لەعەلی کوڕی ئەبی تالیباندا و بۆ مزگەوتیان برد. کاژێرێك رایانگرت و دواتر ئازادیان کرد. خواوەند پێغەمبەری لەزیان و بەڵاکانی ئەوان پاراست.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: خواوەند مۆڵەتی کۆچ کردنی بەپێغەمبەردا.

هوشام کوڕی عوروە دەڵێت: کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەرەو مەدینە ڕۆشتن و ئەو، یانی پێغەمبەر(د.خ)، هێشتا نەڕۆشتبوو و ئایەی (قتال)نەهاتبوویە خوار، ئەبوبەکر داوای مۆڵەتی کۆچ کردنی لێکرد، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چاوەڕێ بکە ئەگەری هەیە مۆڵەتی کۆچ کردن بەمنیش بدرێت. ئەبوبەکر دوو وشتری کڕیبوو، خۆی ئامادە کرد تا لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەرەو مەدینە کۆچ بکات، کاتێك پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی چاوەڕێ بێت و ئاگاداری کردەوە کەچاوەڕوانە لەخواوەندەوە مۆڵەتی کۆچ کردنی پێبگات، دوو وشترەکەی راگرت و ئالفی باشی دەرخوارددان تا قەڵەو بوون، چاوەڕوانی هاوسەفەری پێغەمبەری دەکرد، کاتێك کۆچی پێغەمبەر(د.خ) دواکەوت، ئەبوبەکر پێی وت: هیواداری مۆڵەتی کۆچ کردنت پێ بدرێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ. ئەبوبەکر بەهەمان شێوە چاوەروان مایەوە.

عایشە دەڵێت: لەکاتی نیمەڕۆ لەگەڵ ئەسمای خوشکم لەماڵەوە دانیشتبووین. پێغەمبەر(د.خ) هات. هەموو رۆژێك سەرەتای رۆژ یا کۆتاییەکانی دەهاتە ماڵی ئێمە و کاتێك ئەبوبەکر بینی، پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی نیمەڕۆدا هاتووە، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ، بەدڵنیاییەوە پێشهاتێك روویداوە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) هاتە ژوور، بەئەبوبەکری وت: ئێرە چۆڵ بکە.

ئەبوبەکر وتی: سیخوڕ لەناوماندا نییە، ئەم دووانە کچەکانی منن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مۆڵەتی کۆچ کردنم پێدراوە.

ئەبوبەکر وتی: هاوسەفەری تۆم؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ، هاوسەفەری منیت.

ئەبوبەکر وتی: یەکێك لەو دوو وشترە هەڵبگرە. ئەو دوو وشترە بوو بۆ سەفەرەکەیان ئامادەی کردبوو، یەکیانی دا بە پێغەمبەر(د.خ) و وتی: بۆ ئەوەی سواری بیت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دەبێت بەهاکەی بدەم.

دەڵێت: عامر کوڕی فوهەیرە لەکەنیززادەکانی ئەزد، کۆیلەی توفەیل کوڕی عەبدوالله

و لەدایکەوە برای عایشە بوو. کاتێك عامر کوڕی فوهەیرە باوەڕی هێنا و گرفتاری ئەشکەنجە بوویەوە، ئەبوبەکر ئەوی کڕییەوە و ئازادی کرد. بڕوادارێکی بەبڕوا بوو. کاتێك ئەبوبەکر و پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت، ئەبوبەکر مەڕومالآتی هەبوو و عامر کوڕی فوهەیرەی لەگەڵ مەڕومالآتەکەی بۆ ئەشکەوتی سوور بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) دەنارد. ئەشکەوتی سوور ئەوەیە خواوەند لەقورئاندا ئاماژەی پێدەدات. وشترەکانیان بەیەکێك لەخەڵکانی بەنی عەبد کوڕی عودەی ڕەوانە کرد کەهاوپەیمانی قوڕەیش و ناباوەڕ بوو، بەلآم ئەویان بەکرێ گرت چوونکە ڕێگەی زۆر بەباشی دەزانی.

لەو شەوانەی ئەبوبەکر و پێغەمبەر(د.خ) لەناو ئەشکەوتەکەدا بوون، عەبدوالله کوڕی ئەبوبەکر، شەوانە دەڕۆشتە لایان و لەدەنگ و باسەکانی مەککە ئاگاداری دەکردنەوە. بەرەبەیانان لەمەککە بوو. عامر هەموو شەوێك دەڕۆشتە لایان تا شیری مەڕەکان بدۆشن و بەرەبەیان بۆ لای شوانەکانی دیکە دەگەڕایەوە تا کەس بەکارەکەی نەزانێت.

کاتێك دەنگ وهەراکە دامرکایەوە و ئاگادار بوونەوە چیتر کەس بەدوایانەوە نییە، پیاوی عەدەوی بەدوو وشترەوە هات و بەرێکەوتن. عامر کوڕی فوهەیریان بۆ خزمەت کردن لەگەڵ خۆیان برد. ئەبوبەکر ئەوی سوار وشترەکەی خۆی دەکرد، جگە لەعامر کوڕی فوهەیر و پیاوی عەدەوی شارەزای ڕێگەکە، کەسی تریان لەگەڵدا نەبوو.

پیاوی عەدەوی ئەوانی لەخوارەوەی مەککەوە برد تا گەیشتنە خوارەوەی عەسفان بەرابەر بەکەنار. بەرێکەوتن تا لەقەدید تێپەڕین و کەوتنە سەر ڕێگەکە و لەخەرار و سەنییەت ئەلموڕە تێپەڕین. دواتر لەرێگەی مودەلیجە لەنێوان ڕێگەی عومق و ڕێگەی روحا، تێپەڕین تا گەیشتنە ڕێگەی عەرج و لەلای راستی ڕەکوبو لەئاوێك بەناوی غابر گوزەریان کرد تا گەیشتنەی وادی ڕەئم و لەوێوە ڕێگەی مەدینەیان گرتەبەر. پێش نیمەڕۆ لەدەرەوەی مەدینە، لای منالەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف دابەزین و وەك دەڵێن، پێغەمبەر(د.خ) دوو ڕۆژ لەوێ مایەوە بەلآم منالەکانی عەمرۆ گومان دەکەن پێغەمبەر(د.خ) کاتێکی زیاتر لای ئەوان ماوەتەوە. دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) وشترەکەی خۆی بەرەو پێش برد تا لەناو منالەکانی نەجار دابەزی.

لەگێڕانەوەکەی عایشەدا بەمشێوە هاتووە: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەمالی ئەبوبەکردابوو و پێی وت هاوڕێ و هاوسەفەری ئەوە، ئەبوبەکر لەخۆشحالیدا دەستی بەگریان کرد و عەبدوالله کوڕی ئەبی ئەرقەدی دوئەلییان بەکرێ گرت تا ڕێنیشاندەری

ڕێگەکەیان بێت. وشترەکانی خۆیان بەو سپارد تا بیانلەوەڕێنێت تا کاتی سەفەرەکەیان دەگات.

دەڵێت: جگە لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەبوبەکری ڕاستگۆ و بنەماڵەکەی کەس لەکۆچی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار نەبوو. پێغەمبەر(د.خ) عەلی کوڕی ئەبی تالیبی لەسەفەرەکەی خۆی ئاگادار کردبوویەوە و پێی فەرموو بوو لەمەدینە بمێنێتەوە و ئەمانەتەکانی خەڵك بۆ خاوەنەکانیان بگێڕێتەوە لەبەر ئەوەی هەموو خەڵکانی مەدینە شتە گرانباییەکانی خۆیان بە پێغەمبەر(د.خ) دەسپارد چوونکە باوەڕیان بەڕاستگۆیی و ئەمانەتداری ئەو دەکرد.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی ڕۆشتنی کرد، ڕۆشتە لای ئەبوبەکر. لەدەرگایەکی بچوك لەپشتی ماڵەکەی ئەبوبەکر ڕۆشتنەدەر و ڕێگەی ئەشکەوتی سوریان گرتەبەر. سور ناوی کێوێکە لەخوارەوەی مەککە، ڕۆشتنە ناو ئەشکەوتەکە. عەبدوالله کوڕی ئەبوبەکر ڕۆژانە لەباس و خواسەکانی مەککە ئاگاداری دەکردنەوە و عامر کوڕی فوهەیرە مەڕەکانی دەبردە لایان تا شیرەکەی بدۆشن و ئەسمای کچی ئەبوبەکر، شەوانە خواردنی بۆ دەبردن.

پێغەمبەر(د.خ) سێ ڕۆژ لەئەشکەوتەکەدا مایەوە، ئەبوبەکری لەگەڵدا بوو. قوڕەیشییەکان سەد وشتریان وەك خەڵات دانا بۆ ئەو کەسەی محەممەدیان تەسلیم دەکات. عەبدوالله کوڕی ئەبوبەکر چاودێری کاروباری قوڕەیشییەکانی دەکرد و کاتێك شەوانە دەڕۆشتە ئەشکەوتەکە و دەگەڕایەوە، عامر کوڕی فوهەیرە، مەڕەکانی بەشوێنپێیەکانی ئەودا دەبرد بۆ ئەوەی شوێن پێکانی دیار نەبێت.

دوای سێ ڕۆژ، کاتێك خەڵکان لەگەڕان دەستیان هەڵگرت، پیاوی بەکرێگیراو، وشترەکان و ئەسما کچی ئەبوبەکر سفرەیەکی هێنا و بەر ئەوەی هیچی پێنەبوو تا بیپێچێتەوە، پشتێنەکەی خۆی دەرهێنا و کردی بەدوو لەت و بەلەتێکی سفرەکەی پێچایەوە، لەبەر ئەمە پێی دەڵێن ذات الناطقین یانی خاوەنی دوو پشتێن.

کاتێك ئەبوبەکر وشترەکانی هێنایە لای پێغەمبەر(د.خ)، وشترەکەی بردە پێش و وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆبن، سەرکەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سوار وشترێك نابم هی خۆم نەبێت.

ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، وشترەکە هی تۆیە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەچەندە کڕیوتە؟

ئەبوبەکر بەهای وشترەکەی وت:

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەهەمان بەها کڕیمەوە.

ئەبوبەکر وتی: بۆ تۆ بێت.

ئەسما کچی ئەبوبەکر دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەبوبەکر ڕۆشت، دەستەیەك لەقورەیشییەکان هاتنە بەردەرگای ماڵی ئێمە. ئەبوجەهل کوڕی هوشامیان لەگەڵدا بوو. ڕۆشتمەدەر و پێیان وتم: باوکت لەکوێیە؟

وتم: سوێند بەخوا نازانم باوکم لەکوێیە.

دەڵێت: ئەبوجەهل پیاوێکی دەم پیس و جوێنفرۆش بوو، دەستی بەرز کردەوە و شەقەزللەیەکی لێدام، گوارەکانم کەوت. سێ شەو تێپەڕی و ئێمە نەماندەزانی پێغەمبەر(د.خ) بۆ کوێ ڕۆشتووە تا ئەوەی یەکێك لەجنۆکەکان هات و لەخوارەوەی مەککە چەندین هۆنراوەی خوێندەوە. خەڵکان بەدوای دەنگەکەدا ڕۆشتن بەڵام خۆیان نەبینی، ناوەرۆکی هۆنراوەکەی بەمشێوەیە بوو:

((خواوەند بەدوو هاورێ کە

لەخێوەتی دایکی مەعبەد دابەزین

پاداشتی چاکە بدات

ڕێگەیان نیشاندرا و لەوێ دابەزین

ئەو هاورێیەی محەممەد ڕزگاری بوو

خەڵکانی منداڵەکانی کەعب، لەمانەوەی پێغەمبەر(د.خ) شادمان بن

چوونکە پێگەی ئەو پەنادەری باوەڕدارانە)).

کاتێك هۆنراوەی ئەو جنۆکەیەمان ببیست، زانیمان پێغەمبەر(د.خ) بەرەو مەدینە بەرێکەوتووە. چوار کەس بوون و ئەم سەفەرەیان کردووە: پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر و عامر کوڕی فوهەیرە و عەبدوالله کوڕی ئەرقەد کەشارەزای ڕێگەکە بوو.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەمحەممەد کوڕی عەباس دەگێڕنەوە: شەوانە قورەیشییەکان بیستیان یەکێك لەسەرەوەی ئەبوقەیس هۆنراویەك بەم ناورەۆکە دەخوێنێتەوە:

((ئەگەر دوو سەعد تەندروست بن

محەممەد لەنەیارەکانی لەمەککە ترسی نییە))

بەرەبەیان ئەبوسوفیان وتی: ئەم دوو سەعدە کێن؟ سەعدی بەکر یا سەعدی تەمیم یا

سەعدی هوزەیم؟

شەو دووبارە هەمان دەنگیان بیستەوە کەهۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە دەخوێندەوە:

((ئەی سەعدی ئەوس، تۆ هاریکاری بە

و تۆئەی سەعدی بوێری خەزرەجییەکان

بەبانگەوازی ڕێنیشاندەر رازی بین

و لەخواوەند داوای بەهەشت بکەن

چوونکە پاداشتی خواوەند بۆ خوازیاری رزگاری

باخی بەهەشتی سێبەردارە.))

بەرەبەیان ئەبوسوفیان وتی: سوێند بەخوا ئەم دوو سەعدە یەکیان سەعد کوڕی مەعاز و ئەوی دیکەیان سەعد کوڕی عوبادەیە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ڕێنیشاندەر، پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکری لەرۆژی دووشەممە دوانزەی رەبیع الاول، لەکاتی ئێواریێ، لای منالەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف، دابەزاند.

عەبدولرەحمان کوڕی عوەیم کوڕی ساعیدە دەڵێت: کەسانی خەڵکەکەی من کەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بوون، وتیان: کاتێك بیستمان پێغەمبەر(د.خ) لەمەککەوە بەرێکەوتووە، چاوەرێمان دەکرد، هەموو رۆژێك لەبەیانییەوە دەڕۆشتینە حەرە و چاوەڕوانی گەیشتنی پێغەمبەر(د.خ) بووین. دەماینەوە تا ئەو کاتەی چەتری هەتاو بەسەر هەموو شوێنێکدا دەکێشرا و چیتر سێبەر نەدەما. ئەوسا بۆ ماڵەکانی خۆمان دەگەڕاینەوە چوونکە رۆژەکانی زۆر گەرم بوو. ئەو رۆژەی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت، وەك هەموو رۆژەکانی دیکە ڕۆشتینە سەر رێگەکە و کاتێك هەتاو هەموو شوێنێکی گرتەوە، گەڕاینەوە بۆ ماڵەکانی خۆمان. یەکەم کەس پێغەمبەری(د.خ) بینی، یەکێك لەجوولەکەکان بوو کەچاوەڕوانی ئێمەی دەبینی، هاواری کرد: ئەی منالەکانی قیلە، بەختەکەی ئێوە هات، ئێمە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوتین. لەژێر سێبەری دارێك لەگەڵ ئەبوبەکر دانیشتبوو. زۆرینەی ئێمە پێشتر پێغەمبەرمان(د.خ) نەبینیبوو، ئەومان نەدەناسی و کاتێك سێبەرەکە گەڕا، ئەبوبەکر هەستا و بەعاباکەی خۆی سێبەری بۆ پێغەمبەر(د.خ) دروست کرد. بەمشێوەیە ئەومان ناسییەوە.

وەك دەڵێن پێغەمبەر(د.خ) لەماڵی کولسوم کوڕی هەدەم و بەوتەیەك لەماڵی سەعد کوڕی خەیسەمە دابەزی. ئەوانەی دەڵێن، نشینگەی ئەو ماڵی کولسوم کوڕی هەدەم بوو، دەڵێن: کاتێك لەماڵی کولسوم دەهاتەدەر، لەماڵی سەعد کوڕی خەیسەمە بۆ

بینینی خەڵکان دادەنیشت چوونکە پێغەمبەر(د.خ) تەنیا بوو و ژنەکانی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو. کۆچکەرە تەنیاکان (ئەوانەی ژنیان لەگەڵدا نەبوو)) لەماڵی سەعد کوڕی خەیسەمەدا بوون، لەبەر ئەمە گومانی ئەوەیان کردووە پێغەمبەر لەماڵی سەعد کوڕی خەیسەمە مابێتەوە چوونکە پێیان دەوت ((ماڵی سەڵتەکان)). خوا دەزانێت کامیان ڕاست دەکات. ئێمە ئاماژەمان بەهەر دووکیاندا.

ئەبوبەکری ڕاستگۆ، لەسەنح لای خەبیب کوڕی ئەساف خەزرەجی دابەزی و بەوتەیەك لای خارجە کوڕی زەید، مایەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب، سێ شەو لەمەککە مایەوە و ئەمانەتەکانی بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە. کاتێك کارەکانی مەککەی کۆتایی پێهێنا، پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) بوو و لەگەڵ ئەو لەماڵی کولسوم کوڕی هەدەم مایەوە.

عەلی دەیوت: لەقوبا لای بێوەژنێکی موسوڵمان مابوومەوە. لەتاریکی شەو کەسێك دەهات و لەدەرگای دەدا، ژنەکە دەڕۆشت و شتێکی لەپیاوەکە وەردەگرت.

دەڵێت: گومانم لا دروست بوو، بەژنەکەم وت: ئەم پیاوە کێیە هەموو شەوێك دێتە ماڵەکەی تۆ و شتێکی لێوەردەگریت. تۆ کەژنێکی موسوڵمان و بێوەژنیت؟

ژن وتی: سەهل کوڕی حەنیفە کوڕی واهیبە. دەزانێت کەسم نییە، لەشەودا بتەکانی خۆیان دەشکێنێت و دەیهێنێت بۆ من و دەڵێت لەجیاتی چیلکە و چەوێڵ ئاگریان پێبکەرەوە و بیانسووتێنە.

کاتێك سەهل کوڕی حەنیف لەعێراق کوژرا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەم داستانەی سەبارەت بەو دەگێڕایەوە.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆژی دووشەممە و سێ شەممە و چوارشەممە و پێنجشەممەی لەقوبا، لای منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف بەسەر برد و لەڕۆژی هەینی، ئەوێی بەجێهێشت بەڵام بەگومانی منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف، مانەوەی پێغەمبەر(د.خ) زیاتر لەوە بوو و خوا زاناترە.

دەستەیەك وتوویانە: مانەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەقوبا زیاتر لەسیانزە ڕۆژی خایاند.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: زاناکانی کۆن سەبارەت بەماوەی مانەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەدوای هەڵبژاردنی بۆ پێغەمبەرایەتی لەمەککە، بۆچوونەکانیان جیاوازە، دەستەیەك وتوویانە بۆ ماوەی دە ساڵ مایەوە.

لەئەنس کوڕی مالك دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەتەمەنی چل ساڵی بۆ پێغەمبەرایەتی راسپێردرا و دە ساڵ لەمەککە مایەوە.

لەعایشە و کوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) دە ساڵ لەمەککە مایەوە و لەم دەساڵەدا وەحی بۆ دەهاتە خوار.

لەسەعید کوڕی موسەییب دەگێڕنەوە: قورئان لەتەمەنی چل وسێ ساڵی بۆ پێغەمبەر(د.خ) هاتەخوار و دوای ئەوە دە ساڵ لەمەککە مایەوە.

لەعێکرمە و کوڕی عەباسیش، گێڕانەوەیەك بەم ناوەرۆکە لەبەردەستایە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە پێغەمبەر(د.خ) دوای هەڵبژاردنی، ماوەی سیانزە ساڵ لەمەککە مایەوە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) سیانزە ساڵ لەمەککە مایەوە و وەحی بۆ دەهاتە خوار. هەروەها لەو دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەتەمەنی چل ساڵیدا هەڵبژێردرا و دوای هەڵبژاردنی، بۆ ماوەی سیانزە ساڵ لەمەککە مایەوە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: باوکی قەیس کوڕی سورفەی ئەنساری هۆنراویەکی هەیە وتیایدا باسی گەورەیی ئەنسار و مانەوەی پێغەمبەر(د.خ) لای ئەوان دەکات و هەروەها مانەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە بەسیانزە ساڵ دەزانیت. دەڵێت:

(( لای قورەیش دە ساڵ و چەند ساڵ مایەوە.

ئاگاداری دەکردنەوە و بەدوای هاورێیاندا دەگەڕا

لەکاتی حەج بانگەوازەکەی خۆی بەگوێی خەڵکان دەگەیاند

بەڵام هیچ پەنایەکی نەدۆزییەوەو کەس بەبانگەوازەکەی رازی نەبوو

کاتێك هاتە لای ئێمە و خواوەند سەرکەوتنی بەدینەکەی بەخشی

لەمەدینە بەشادمانی ژیانی بردەسەر

هاورێیانی دەستکەوت و ئاسوودە بوو

هاوکاری خواوەندی پێدەگەیشت

و بۆ ئێمەی دەگێڕایەوە کەنوح چی بەخەڵکەکەی وت

موسا چ کاتێك دەنگی خواوەندی بیست

وای لێهات چیتر لەکەس نەدەترسا

ئێمە سامانی خۆمان لەرێگەی ئەودا بەخشی

و لەکاتی شەڕ گیانی خۆمان

زانیمان جگە لەخوای تاقانە هیچ خوایەکی دیکە بوونی نییە
و خواوەند باشترین ڕێنیشاندەرە))

وەك دەبینن باوکی قەیس لەم هۆنراوەیە دەڵێت پێغەمبەر(د.خ) دوای هەڵبژاردنی بۆ پێغەمبەرایەتی، دە ساڵ و چەند ساڵێك لەناو خەڵکەکەی خۆیدا مایەوە.

دەستەیەك وتوویانە: مانەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە دوای پێغەمبەرایەتی، پانزە ساڵ بوو و ئەم هۆنراوەیە وەك بەڵگەی ڕاستی وتەکانی خۆیان دەهێننەوە.

عێکرەمە دەڵێت: کوڕی عەباس ئەم قسەی کرد و ئەم هۆنراوەی وەك بەڵگە هێنایەوە بەڵام لەدەقی هۆنراوەکە لەجیاتی (بضع عشرة) کەدە و چەند ساڵە (خمس عشرة)ی خوێندەوە کەپانزە ساڵی تەواوە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەشوعبی دەگێڕنەوە: پێش ئەوەی وەحی بە پێغەمبەر(د.خ) بگات، بۆ ماوەی سێ ساڵ ئیسرافیل دەهاتە لای. دەقی حەدیسەکە کە لەلایەن واقدییەوە لەشوعبی دەگێڕێتەوە بەمشێوەیە: بۆ ماوەی سێ ساڵ ئیسرافیل کەسێکی نزیکی پێغەمبەر(د.خ) بوو، دەنگی ئەوی دەبیست بەڵام نەیدەبینی و دوای ئەوەی جبرەئیل هات.

واقدی دەڵێت: ئەم حەدیسەم بۆ ساڵح کوڕی دینار گێڕایەوە، وتی: برازاکەی من عەبدوالله کوڕی ئەبوبەکر کوڕی حەزم و عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادە لەمزگەوت حەدیسیان دەوت، پیاوێکی عێراقی ئەم حەدیسەی باس کرد، هەردووکیان حاشایان لێکرد و وتیان: جگە لەمەمان نەبیستووە و نازانین چوونکە لەسەرەتا وەحی تائەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، جبرەئیل وەحی بۆ دەهێنا.

لەداوود کوڕی ئەبی عامر دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) تەمەنی چل ساڵ بوو کە هەڵبژێردرا و ماوەی سێ ساڵ ئیسرافیل دەهاتەلای و وشە و زانستەکانی فێردەکرد بەڵام قورئان لەسەرزاری ئەو نەهاتەخوار و دوای سێ ساڵ، جبرەئیل دەهاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و سیانزە ساڵ لەمەککە و دە ساڵ لەمەدینە وەحی بۆ دەهات.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئەگەری هەیە ئەوانەی وتوویانە ماوەی مانەوەی ئەو لەمەککە دوای هاتنە خواری وەحی دە ساڵ بوو، ماوەکەیان لەکاتی هاتنی جبرەئیل بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) هەژمار کردبێت وئەوانەی دەڵێن سیانزە ساڵ بوو، لەسەرەتای پێغەمبەرایەتی کەئیسرافیل دەهاتە لای پێغەمبەریان، هەژمار کردبێت و ئەو سێ

ساڵەی هێشتا بۆ بلاّو کردنی بانگەوازەکەی رانەسپێردرابوو، لەبەر چاو گرتبێت.

لەقتادە جگە لەم دوو گێڕانەوەیە، دەگێڕنەوە: ماوەی هەشت لەمەککە ودە ساڵ لەمەدینە، قورئان بۆ پێغەمبەر(د.خ) دەهاتە خوار.

بەلاّم لەحەسەن دەگێڕنەوە: ماوەی هاتنە خوارەوەی قورئان دە ساڵ لەمەککە و دە ساڵ لەمەدینە بوو.

## وتار سەبارەت بەو کاتەی کردیان بەدەسپێکی مێژوو

ئەبو جەعفەر دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) هاتە مەدینە، فەرمووی مێژوو تۆمار بکەن.

لەکوڕی شیهاب دەگێڕنەوە: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) هاتە مەدینە، لەمانگی رەبیع الاول، فەرمانیدا مێژوو بنووسنەوە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: وەك وتوویانە، یەك مانگ و دوو مانگیان لەهاتنی ئەو دەکردە دەسپێکی مێژوو تا ئەوەی ساڵ بەسەر چوو.

بەوتەیەك یەکەم کەس لەئیسلامدا بناغەی مێژووی دارشت، عومەر کوڕی خەتابە.

لەشوعبی دەگێڕنەوە: ئەبو موسای ئەشعەری نامەی بۆ عومەر نووسی: نامەکانی تۆ بەئێمە دەگات بەلاّم بەرواری پێوە نییە.

دەڵێت: عومەر چەند کەسێکی بۆ راوێژ کردن کۆکردەوەو دەستەیەکیان وتیان: سەرەتای هەڵبژاردنی پێغەمبەر(د.خ) وەك دەسپێکی مێژوو دیاریبکە. دەستەیەکی دیکە وتیان: لەکۆچی پێغەمبەر(د.خ) دەستپێبکە. عومەر وتی: مێژوو لەکۆچی پێغەمبەرەوە دەسپێدەکەین چوونکە کۆچی ئەو، جیاوازی نێوان ڕاستی و چەوتی بوو.

لەمەیمون کوڕی میهران دەگێڕنەوە: حەواڵەیەکیان بردە لای عومەر کەدەبێت لەمانگی شعبان بدرێت، عومەر وتی: ئەمە کام شەعبانەیە؟ شەعبانی داهاتوو یائەو شەعبانەی ئێستا تیایداین؟

دەڵێت: عومەر بەهاوەڵانی پێغەمبەری وت: شتێك بۆ ئەم خەڵکە دیاری بکەن تا بتوانن بیناسنەوە. دەستەیەکیان وتیان: مێژووی لەسەر شێوە و ساڵی ڕۆمیەکان بنووسنەوە. وترا: ئەوان لەرۆژگاری زولەقەرنەیینەوە مێژوو دەنووسنەوە و ئەمە

مێژوویەکی دووردودرێژە. دەستەیەکی دیکە وتیان: سەرەتای مێژووی فارسەکان بکەنە دەسپێکی مێژووی خۆتان. وترا: کاتێك لەناو فارسەکان پاشایەك دەگۆڕێت، ماوەی پاشایەتی پاشای پێشوو پشتگوێ دەخەن، بڕیاریاندا بزانن پێغەمبەر(د.خ) چەند ساڵ لەمەدینە ماوەتەوە کە بەدە ساڵیان خەملاند و سەرەتای کۆچی پێغەمبەریان(د.خ) کردە دەسپێکی مێژوو.

لە محەممەد کوڕی سیرین دەگێڕنەوە: کەسێك لای عومەری کوڕی خەتاب هەستایە سەر پێی و ووتی: مێژوو، تۆمار بکەن.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: تۆمار کردنی مێژوو چییە؟

وتی: شتێکە عەجەمەکان دەیکەن و دەینووسن و دەڵێن لەفلان مانگ و فلان ساڵ.

عومەر وتی: شتێکی پەسەندە. بڕیاریاندا مێژوو بنووسنەوە و وتیان: لەچ ساڵێکەوە دەسپێبکەین؟

وتیان: لەهەڵبژاردنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ پێغەمبەرایەتی، وتیان: لەکاتی مردنی ئەو، دوای ئەوە بڕیاریاندا لەسەرەتایی کۆچەوە دەسپێبکەن، وتیان: لەکام مانگەوە دەسپێبکەین؟ وتیان: لەرمەزانەوە دەسپێدەکەین. دوای ئەوە وتیان: موحەڕەم دەکەینە سەرەتای مێژوو چوونکە مانگی حەرامە و لەحەج دەگەڕێنەوە. لەسەر موحەڕەم ڕێککەوتن.

لە عەبدوالله کوڕی عەباس دەگێڕنەوە: نووسینەوەی مێژوو لەهەمان ساڵ کە پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە کۆچی کرد، دەستپێکرد و هەمان ساڵ عەبدوالله کوڕی زوبەیر چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

هەروەها لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە: لەلێکدانەوەی (والفجر و ليال عشر) وتبووی: فەجەر موحەرەمە و سەرەتای ساڵە.

لەعوبەید کوڕی عومەر دەگێڕنەوە: موحەڕەم مانگی خواوەندە و سەرەتای ساڵ کە لەو مانگەدا خانەی کەعبەی داپۆشی، مێژوو لەوێوە دەسپێدەکەن و لەو مانگەدا سکل لێدەدەن و ڕۆژی لەموحەڕەمدایە چوونکە نەتەوەیەك لەو ڕۆژەدا تۆبەیان کرد و خواوەند بەتۆبەکەیان رازی بوو.

لەعەمرۆ کوڕی دینار دەگێڕنەوە: یەکەم کەس بەرواری لەسەر نامەکان دەنووسی، یەعلی کوڕی ئومەییە بوو کە لەیەمەن دەژیا و پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی رەبیع الاول

گەیشتە مەدینە و خەڵك وەك سەرەتای مێژوو لەقەڵەمیاندا و کردیان بەدەسپێکی مێژوو.

لەشەعبی دەگێڕنەوە: منداڵەکانی ئیسماعیل ئاگرەکەی ئیبراهیمی خەلیلیان وەك دەسپێکی مێژوو دەزانی تا ئەو کاتەی کەعبە دروست کرا و دەسپێکردنی دروست کردنیان کرد بەسەرەتای مێژوو تا ئەو کاتەی بڵاو بوونەوە و هەر هۆزێك هاتنەدەرەوەی لەتەهامەی کردە دەسپێکی مێژوو. دواتر ئەو دەستە لەمنداڵەکانی ئیسماعیل کە لەتەهامە مابوونەوە، ڕۆشتنەدەری هۆزی سەعد و نەهد و جوهەینە و منداڵەکانی زەیدیان کردە سەرەتای مێژوو تا ئەو کاتەی کەعب کوڕی لوئەی مرد و تا ساڵی فیل لەمەرگی کەعبەوە مێژوویان دەنووسییەوە. دوای ئەوە ساڵی فیلیان کردە دەسپێکی مێژوو تا ئەو کاتەی عومەر کوڕی خەتاب کۆچی پێغەمبەری(د.خ) کردە دەسپێکی مێژوو. ئەم کارە لەساڵی حەفدەیەم یا هەژدەیەمی کۆچی پێغەمبەر(د.خ) ئەنجامدرا.

لەسەعید کوڕی موسەییب دەگێڕنەوە: عومەر کوڕی خەتاب کەسانێکی کۆکردەوە و پێی وتن: لەچ ڕۆژێکەوە دەسپێبکەین؟

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: لەو ڕۆژەی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی کرد و سەرزەمینی کوفری بەجێهێشت. عومەر ئەو کارەی کرد.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: ئەو گێڕانەوەی لەشەعبی سەبارەت بەمێژووی منداڵەکانی ئیسماعیل ئاماژەی پێداوە، لەڕاستییەوە دوور نییە کەدەسپێکی مێژوو لەڕووداوێك کە لای هەمووان ناسراو بێت، نەیانبووە و بەزۆری قاتوقڕی یا زیانێك کە لەبەشێکی سەرزەمینەکەی خۆیان ڕوویداوە، وەك سەرەتای مێژووی خۆیان هەژماریان کردووە و لەناو عەرەبەکان، قورەیشییەکان کە دوایین دەسپێکی مێژوویان پێش کۆچی پێغەمبەر(د.خ)، ساڵی فیل بوو کەساڵی لەدایك بوونی پێغەمبەریشە و لەشەڕی فەجار تا بینای کەعبە پانزە ساڵی خایاند و لەبینای کەعبەوە تا هەڵبژاردنی پێغەمبەر(د.خ) ، پێنج ساڵ.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) چل ساڵە بوو بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا، وەك شەعبی دەڵێت: ئیسرافیل ماوەی سێ ساڵ دەهاتە لای پێغەمبەر(د.خ) ئەمە پێش ئەوە بوو بۆ پێغەمبەرایەتی ڕاسپێردرێت، پێشتر ئاماژەمان بەگێڕانەوە و حەدیسەکاندا، سێ ساڵ دواتر جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێی ڕاگەیاند تا بانگەوازی پێغەمبەرایەتی خۆی ئاشکرا بکات، پێغەمبەر(د.خ) دەساڵ لەمەککە بانگەوازی

خواپەرەستی کرد، دوای ئەوە لەمانگی رەبیع الاولی ساڵی چواردەیەمی پێغەمبەرایەتی خۆی بەرەو مەدینە کۆچی کرد و هاتنەدەرەوەی ئەو لەمەککە لەرۆژی دووشەممەدا بوو و هەروەها لەرۆژی دووشەممەی دوانزەی رەبیع الاول گەیشتە شاری مەدینە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی دووشەممە چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەرۆژی دووشەممە بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا و لەرۆژی دووشەممە لەمەککە کۆچی کرد و لەرۆژی دووشەممە بەردی رەشی لەجێگەی خۆیدا دانا. هەروەها لەرۆژی دووشەممە گەیشتە شاری مەدینە و لەرۆژی دووشەممە چاوی لەجیهان بەست.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: هەرچەندە سەرەتای مێژووی موسوڵمانان لەکۆچی پێغەمبەرەوە بوو، بەڵام موحەڕەمیان کردە سەرەتای مێژوو کە دوومانگ و دوانزە رۆژ پێش گەیشتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە بوو. کاتی گەیشتنی پێغەمبەریان نەکردە سەرەتای مێژوو، بەڵکو لەسەرەتای ساڵەوە دەستیان پێکرد.

## گێڕانەوەی رووداوەکانی ساڵی یەکەمی کۆچی

ئەبو جەعفەر دەڵێت: پێشتر، ئاماژەماندا بەگەیشتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە و دابەزینی ئەو و ئەوەی چ کاتێك یەکەم مەنزڵی بەجێهێشت، هەنووکە رووداوەکانی دیکەی ساڵی یەکەمی کۆچی باس دەکەین:

یەکێك لەرووداوەکان ئەوە بوو لەکاتی رۆشتنەدەر لەقوبا بۆ مەدینە، نوێژی هەینی خوێند چوونکە ئەو رۆژە هەینی بوو و لەشوێنی منداڵەکانی سالم کوڕی عەوف لەدۆڵێك کە تایبەت بەوانە، کاتی نوێژی هەینی نزیك کەوتەوە. بیستوومە کە ئێستا لەو شوێنەدا مزگەوتێك دروست کراوە، ئەمە یەکەمین نوێژی هەینی پێغەمبەر(د.خ) بوو لەئیسلامدا خوێندی و (خوتەبە) وتارێکی خوێندەوە و دەڵێن ئەمە یەکەمین خوتبەی پێغەمبەر(د.خ) بوو لەمەدینە پێشکەشی کرد.

## وتاری پێغەمبەر(د.خ) لەیەکەم هەینی

سەعید کوڕی عەبدولرەحمانی جومەحی یەکەم وتاری پێغەمبەر(د.خ) کە لەرۆژی هەینی دوای نوێژی هەینی لەناو منالەکانی سالیم کوڕی عەوف خوێندی، بەمشێوە دەیگێڕێتەوە:

((سپاسی خواوەند دەکەم، داوای هاوکاری لێدەکەم و خوازیارم لەگوناحەکانمان خۆشبێت و ڕێگەی ڕاستیمان نیشانبدات، باوەڕم بەخوایەتی ئەو هەیە و حاشای لێناکەم و لەگەڵ هەر کەسێك باوەڕی بەخوا نەبێت، دژایەتی و شەڕ دەکەم و شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد نێردراو و بەندەی ئەوە کە ئەوی لەدەورانی نەزانی و جاهلییەتی خەڵکان و تێپەڕبوونی زەمان و نزیك بوونەوەی ڕۆژی هەستانەوە، هاوڕێ لەگەڵ نوور و ئامۆژگارییەکان ڕەوانە کرد، هەرکەس پەیڕەوی خواوەند و پێغەمبەرەکەی بکات، ڕزگاری بووە و هەرکەس نافەرمانی بکات، گومڕا و کەوتۆتە ناو تاریکی و نەزانی. پێشنیار دەکەم لەخواوەند بترسن، باشترین پێشنیار کەموسوڵمانێك بەموسوڵمانێکی دیکەی بکات ئەوەیە بۆ توێشوو کۆکردنەوە ئەو جیهان، هانی بدات و ناچاری بکات، لەخواوەند بترسێت. لەکارە ناڕەواکان خۆتان بەدوور بگرن چوونکە هیچ ئامۆژگاریی و مۆجیارییەك لەمە باشتر نییە و ترس لەخواوەند هۆکارێکە بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانی ئەو جیهانە و هەرکەس پەیوەندییە نهێنی و ئاشکراکانی لەگەڵ خواوەند ئاشکرا و باشتر بکات و لەم کارەی تەنیا بەدوای ڕەزامەندیی خواوەندەوە بێت، دەبێتە هۆکارێك بۆ ناوی چاکەی لەم دنیا و توێشووێك بۆ ئەو دنیایی. کاتێك کەمرۆڤ پێویستی بەئەنجامی کردەوەکانی خۆی هەیە و هەر کردەوەیەك جگە لەمە بێت خاوەنەکەی ئارەزوو دەکات خۆزگە ئەوکارانەی ئەنجام نەدەدا. خواوەند ئاگادارتان دەکاتەوە و بەرابەر بەبەندەکانی خۆی مێهرەبانە و وتار و بەڵێنەکانی ڕاستە و بەڵێنەکانی دێتەدی بێ هیچ گوومانێك، خواوەند دەفەرمێت: وتارەکانی من گۆڕانیان بەسەردا نایەت و ستەم لەبەندەکانی خۆم ناکەم، لەکارەکانی ئەم دنیا و ئەو دنیا بەنهێنی و ئاشکرا لەخواوەند بترسن چوونکە هەر کەس لەخواوەند بترسێت، ڕزگاری بووە. ترس لەخواوەند لەغەزەب وتوڕەیی ئەو دەمانپارێزێت، ڕوخسارەکان سپی دەکات و دەبێتە هۆی ڕەزامەندی پەروەردگار و پێگەی کەسەکان

بەرز دەکاتەوە.

بەبەشی خۆتان رازی بن و کەمتەرخەمی لەکارەکانی خواوەند مەکەن چوونکە خواوەند کتێبەکەی خۆی فێری ئێوە کردووە تا راستگۆ لەدرۆزن جیا ببێتەوە. ئێوەیش چاکە بکەن بەهەمان شێوە کەخواوەند چاکەی لەگەڵ کردوون و لەگەڵ دوژمنانی ئەو دوژمنایەتی بکەن و لەرێگەی خواوەند لەکاتی پێویست، جیهاد بکەن چوونکە خواوەند ئێوەی هەڵبژاردووە و بەموسوڵمان ناوی بردوون تا ئەو کەسەی لەناو دەچێت بەبەڵگەوە لەناو بچێت و هەرکەس ژیانی بەردەوام، بێت بەبەڵگەوە بەردەوام بێت. هەموو هێزەکان تایبەتە بەخوا، بەردەوام بیری خواوەند بکەن و هەوڵ و کردەکانتان بۆ ئەو دنیا بێت، هەرکەس پەیوەندی خۆی لەگەڵ خواوەند بەهێز و سامان بدات، پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵك باشتر دەکات چوونکە خواوەند فەرمانڕەوای خەڵکانە و خەڵکان فەرمانڕەوای خواوەند، نین، خواوەند خاوەنە و خەڵکان خاوەنی خواوەند نین، خواوەند گەورەیە و هەموو هێزەکان تایبەتە بەخواوەندی گەورە.))

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سوار وشترەکەی خۆی بوو و هەوسارەکەی بەردا، لای هەر گەڕەکێك لەگەڕەکەکانی ئەنسار کەتێدەپەڕی، خەڵکەکەی داوایان دەکرد لای ئەوان دابەزێت و دەیانوت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لێرە پیاو و چەك و پشتیوان بوونی هەیە.

پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: رێگەی بدەن با بڕوات چوونکە لێپرسراوە. وشتر ڕۆیشت تا گەیشتە شوێنی مزگەوتەکە. لەشوێنی ئێستای مزگەوتەکە، وشترەکە خەوت. شوێنەکە، ئاخوڕی وشتر و تایبەت بوو بەدوو منداڵی هەتیوو لەمناڵەکانی نەجار، کە لەژێر سەرپەرەستی مەعاز کوڕی عەفرا بوون. یەکیان ناوی سەهل و ئەوی دیکەیان ناوی سوهەیل و کوڕی عەمرۆ کوڕی عوباد بوون.

کاتێك وشترەکە خەوت، پێغەمبەر(د.خ) دانەبەزی. وشترەکە پاش کەمێك هەستا و کەمێکی دیکە دوور کەوتەوە. پێغەمبەر(د.خ) جڵەوەکەی بەرەڵا کردبوو. وشترەکە ئاوڕی بۆ دواوە دایەوە و بۆ شوێنی یەکەمی خۆی گەڕایەوە و لەوێ خەوت و سەری خستە سەرزەوی. پێغەمبەر(د.خ) دابەزی و باوکی ئەییووبی کەرەستەکانی ئەوی بردە ماڵەکەی خۆی. ئەنسارییەکان پێغەمبەریان بۆ ماڵەکەی خۆیان بانگێشت دەکرد و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پیاو لەگەڵ کەل و پەلەکانی خۆی دەمێنێتەوە و لای باوکی

ئەییووب، خالید کوڕی زەید کوڕی کەلیب، دابەزی کە یەکێك بوو لەپیاوەکانی هۆزی منداڵەکانی غەنەم کوڕی نەجار.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) پرسی: وشترخانەکە هی کێیە؟

مەعاز کوڕی عەفرا وتی: هی دوو هەتیووە کە لای منن، دڵنیایە رازیان دەکەم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی لەو شوێنەدا مزگەوتێك دروست بکەن. لای باوکی ئەییووب مایەوە تا مزگەوت و ماڵەکانی، ئامادە کرا.

دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) شوێنی مزگەوتەکەی کڕی و بینای کرد بەڵام گێڕانەوەی راست لای من ئەوەیە کە لەحەدیسەکەی ئەنس کوڕی مالیکدا هاتووە و دەڵێت: شوێنی مزگەوتەکەی پێغەمبەر(د.خ) تایبەت بوو بەمناڵەکانی نەجار و دارخورما و کشتی تیا بوو و هەروەها چەندین گۆڕ لەرۆژگاری جاهلییەت لەوێ نێژرا بوون. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەهاکەی وەربگرن.

وتیان: لەجیاتی بەها، تەنیا پاداشتی خواییمان دەوێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی دارخورماکان ببڕنەوە و کشتەکە لەناو ببەن و گۆڕەکان هەڵبدەنەوە. پێغەمبەر(د.خ) پێش ئەوە لەناو تەویلەی مەڕومالاَت یا لەهەر شوێنێکی دیکە لەکاتی نوێژ، نوێژی دەخوێند.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) و موهاجیر و ئەنسار پێکەوە مزگەوتەکەیان درووست کرد.

لەم ساڵەدا مزگەوتی قوبا دروست کرا.

یەکەم کەس لەموسوڵمانان دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە کۆچی دوایی کرد، خاوەن ماڵەکەی پێغەمبەر(د.خ)، کولسوم کوڕی هەدەم بوو کەماوەیەك دوای گەیشتنی پێغەمبەر(د.خ)، مرد. دوای ئەو باوکی ئەمامە، ئەسعەد کوڕی زەرارە، لەهەمان ساڵدا مرد و مردنی ئەو، پێش کۆتایی هاتنی مزگەوتەکە بوو. ئەو بەنەخۆشی قورگ و سینگ مرد.

لەیەحیا کوڕی عەبدواللە کوڕی عەبدولرەحمان دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: باوکی ئەمامە، مردووێکی باش نەبوو. جوولەکە و ناباوەڕوانی عەرەب دەڵێن ئەگەر محەممەد پێغەمبەری خوا دەبوو، هاورێکەی نەدەمرد بەڵام لەبەرابەر خواوەند بۆ خۆم و هاورێکەم ناتوانم هیچ کارێك بکەم.

لەئەنس دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) ئەسعەد کوڕی زەرارەی بەهۆی

نەخۆشییەکەیەوە، داغ کرد.

لەعاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادەی ئەنساری دەگێڕنەوە: کاتێك باوکی ئەمامە، ئەسعەد کوڕی زەرارە مرد، خەڵکانی منالەکانی نەجار کە باوکی ئەمامە سەرکردەیان بوو، ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) پێگەی ئەم پیاوە لای ئێمە دەزانیت، کەسێك لەجیاتی ئەو دەستنیشان بکە کە تا کارەکانی ئەو لەئەستۆ بگرێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئێوە خاڵۆکانی منن، من لەئێوەم و دەبمە سەرکردەی ئێوە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) نەیدەویست بەم کارەی یەك لەوان بکاتە سەرکردەی ئەوانی دیکە. یەکێك لەو لەپێشییانەی منالەکانی نەجار بۆ خۆیانی دەگێڕنەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەر سەرکردەیان بوو.

لەم ساڵەدا باوکی ئۆحەیحە لەتایف مرد کە لەوێ ملك و ماڵی بوو. وەلید کوڕی موغەیرە و عاس کوڕی وایلی سەهمی لەمەککە مردن.

هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) لەعایشە نزیك کەوتەوە و ئەمە لەمانگی زیقەعدە، هەشت مانگ دوای هاتنی بۆ مەدینە بوو. بەوتەیەك لەمانگی شەوال حەوت مانگ دوای هاتنی ئەو بۆ مەدینە، لەعایشە نزیك کەوتەوە. هاوسەرگیری لەگەڵ عایشە سێ ساڵ دوای کۆچ و دوای مردنی خەدیجە لەمەککە ئەنجام درا و عایشە لەو کاتەدا شەش ساڵ و بەوتەیەك حەوت ساڵ تەمەنی بوو.

دەڵێن: عەبدوالله کوڕی سەفوان و کەسێکی دیکە لەقوڕەیش ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و عایشە بەپیاوی قوڕەیشی وت: فلانی حەدیسەکەی حەفسەت بیستووە؟

وتی: بەڵێ. عەبدوالله کوڕی سەفوان پرسی: حەدیسەکە چییە؟

عایشە وتی: سەبارەت بەنۆ لەپێشی منە کە لەهیچ کام لەژنانی جیهان جگە لەمریەم دایکی عیسا، نەبینراوە. سوێند بەخوا بۆ شانازی کردن بەسەر هاوسەرەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئەمە باس ناکەم.

عەبدوالله کوڕی سەفوان وتی: ئەو نۆ لەپێشییە، چین؟

عایشە وتی: فریشتەیەك هاتە ڕوخساری من، حەوت ساڵم بوو کە بوومە هاوسەری

پێغەمبەر(د.خ)، نۆ ساڵم بوو ڕۆشتمە ماڵەکەی ئەو، کچ بووم کەبوومە هاوسەری ئەو، هیچ کام لەهاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ) کچ نەبوون کاتێك بوونە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ)، کاتێك وەحی بۆ دەهات، لەگەڵ ئەودا لەژێر یەك بەتانیدا بووین، منی لەهەموان زیاتر خۆش دەویست، لەپێشهاتێك کە زۆری نەمابوو لەناوچوونی خەڵکانی لێبکەوێتەوە، ئایەی قورئان سەبارەت بەمن هاتەخوار، جبرەئیلم بینی و هیچ کام لەژنانی پێغەمبەر(د.خ) جگە لەمن نەیبینی، لەماڵەکەی مندا مرد و کەس جگە لەفریشتەکان و من، کفنیان نەکرد.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: وەك دەڵێن پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی شەوال عایشەی کردە هاوسەری خۆی، هەروەها لەمانگی شەوال، لەگەڵیدا خەوت.

عەبدوالله کوڕی عوروە لەعایشە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی شەوال منی کردە هاوسەری خۆی و هەروەها لەمانگی شەوال لەمن نزیك کەوتەوە. عایشە بەباشی دەزانی لەمانگی شەوال لەژنەکان نزیك بکەونەوە.

گێڕانەوەیەکی دیکە لە عەبدوالله کوڕی عوروە لەوتارەکانی عایشە لەبەردەستایە بەم زیادییە، دەڵێت: هیچ کام لەهاوسەرەکانی بەئەندازەی من ئازیز نەبوو.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: بەوتەیەك پێغەمبەر(د.خ) لەڕۆژی چوارشەممە لەمانگی شەوال لەماڵی ئەبوبەکر لەسەنح، لەعایشە نزیك کەوتەوە.

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) زەید کوڕی حارسە و باوکی رافیعی بۆ هێنانی کچەکانی خۆی و هاوسەرەکەی سوودە کوڕی زەمعە بۆ مەککە نارد کەئەوانیان لەمەککەوە هێنایە مەدینە.

دەڵێن: کاتێك عەبدوالله کوڕی ئەریقەت بۆ مەککە گەڕایەوە و شوێنەکەی ئەبوبەکری بە عەبدوالله‌ی کوڕی وت، عەبدوالله دایکی ڕۆمانی، هاوسەری باوکی کەدایکی عایشە بوو، بۆ مەدینە برد و تەڵحە کوڕی عوبەیدالله هاورێیەتی دەکردن.

لەم ساڵەدا وەك دەڵێن، نوێژی ئامادە دوو ڕەکعەتی پێ زیاد کردا و ئەمە یەك مانگ دوای گەیشتنی پێغەمبەر(د.خ) بۆمەدینە و دوانزەیەمی ڕەبیع الاخر بوو. پێش ئەوە نوێژی ئامادە و نوێژی سەفەر دوو ڕەکعەت بوو.

واقدی دەڵێت: حیجازییەکان لەمبارەوە ناکۆکییان نییە.

بەوتەیەك لەدایك بوونی عەبدوالله کوڕی زوبەیر لەم ساڵەدا بوو.

بەڵام بەوتەی واقدی، لەدایك بوونی ئەو لەساڵی دووەمی کۆچی پێغەمبەر(د.خ) بۆ

مەدینە و لەمانگی شەوالدا بوو.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: عەبدوڵڵا کوڕی زوبەیر یەکەم کەس لەمناڵەکانی موهاجیر کە لەمەدینە چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەکاتی لەدایك بوونی ئەو موسوڵمانان تەکبیریان وت لەبەر ئەوەی لەناو موسوڵمانان بڵاو ببوویەوە کەجوولەکەکان دەیانوت موسوڵمانانیان جادوو کردووە بۆ ئەوەی منداڵیان نەبێت. تەکبیری ئەوان لەخۆشحاڵیدابوو چوونکە خواوەند وتەی جولەکەکانی بەدرۆ خستبوویەوە.

دەڵێن: ئەسما کچی ئەبوبەکر کاتێك گەیشتە مەدینە، بە عەبدوڵڵا دووگیان بوو.

دەڵێن: نەعمان کوڕی بەشیر لەم ساڵەدا چاوی بەدنیا هەڵهێنا و یەکەم کەس بوو لەمناڵەکانی ئەنسار لەدوای کۆچی پێغەمبەر(د.خ) لەدایك بوو بەڵام واقدی بەم وتەیە رازی نابێت و دەڵێت لەدایك بوونی نەعمان چواردەمانگ دوای کۆچی پێغەمبەر(د.خ) و تەمەنی هەشت ساڵ کەمێك زیاتر یا کەمتر بوو کە پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد.

دەڵێت: لەدایك بوونی نەعمان سێ یا چوار مانگ پێش شەڕی بەدر بوو.

لەباوکی ئەسوەد دەگێڕنەوە: لای عەبدوڵڵا کوڕی زوبەیر باسی نەعمان کوڕی بەشیر کرا و وتی: شەش مانگ لەمن گەورەترە.

باوکی ئەسوەد دەڵێت: عەبدوڵڵا کوڕی زوبەیر بیست مانگ دوای کۆچی پێغەمبەر(د.خ) چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەدایك بوونی نەعمان چواردە مانگ دوای کۆچی پێغەمبەر(د.خ) و لەمانگی رەبیع الاول دا بوو.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: وتوویانە: لەدایك بوونی موختار کوڕی ئەبی عوبەیدەی سەقەفی و زیاد کوڕی سومەییە، لەم ساڵەدا بوو.

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا لەمانگی رەمەزان و حەوت مانگ دوای کۆچ، پێغەمبەر(د.خ) ئاڵایەکی سپی بۆ حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب بەست و ئەوی لەگەڵ سی کەس لەموهاجیرەکان ڕەوانە کرد تا ڕێگەی کاروانی قورەیشییەکان ببەستن. حەمزە رووبەرووی ئەبوجەهل بوویەوە کەسێسەد پیاو هاوڕێیەتیان دەکرد. مەجدی کوڕی عەمرۆ جوهەنی بوو بەنێوەنجیگەر و بێ شەڕ لەیەك جیا بوونەوە. ئاڵادارەکەی حەمزە، باوکی مورسەد بوو.

هەروەها بەوتەی ئەو لەم ساڵەدا، هەشت مانگ دوای کۆچی پێغەمبەر(د.خ)، لەمانگی شەوال، پێغەمبەر(د.خ) ئاڵایەکی سپی بۆ عوبەیدە کوڕی حار کوڕی موتەلیب

کوڕی عەبدمەناف بەست و فەرمانی پێدا بەرەو دۆڵی رابغ بڕوات. ئاڵادارەکەی موسەتیح کوڕی ئەساسە بوو، عوبەیدە لەگەڵ شەست کەس لەکۆچکەران لەناوچەی جوحەفە گەیشتە سەنییەئەلوڕە. لەئەنسار کەسی لەگەڵدا نەبوو. لەسەر ئاوی ئەحیا، ڕووبەڕووی ناباوەڕان بوویەوە. تەنیا بەتیرهاویشتن شەڕیان لەگەڵ یەك کرد و شەڕی شمشێر ڕووینەدا.

واقدی دەڵێت: بۆچوونەکان جیاوازن لەوەی کەسەرکردەی ناباوەڕان کێ بوو. دەستەیەك وتوویانە ئەبوسوفیان کوڕی حەرب بوو. دەستەیەکی دیکە وتوویانە: موکەریز کوڕی حەفس، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کەئەبو سوفیان سەرکردە و دووسەد کەس لەناباوەڕان هاوڕێیەتیان دەکرد.

دەڵێت: لەزیقەعدەی ئەم ساڵەدا، پێغەمبەر(د.خ) ئاڵایەکی سپی بۆ سەعد کوڕی وەقاس بەست و ئەوی بۆ ناوچەی خەرار ڕەوانە فەرموو. ئاڵادارەکەی میقداد کوڕی عەمرۆ بوو.

سەعد دەڵێت: من لەگەڵ بیست کەس (یا وتبووی بیست و یەك کەس) کەهەموویان پیادە بوون، بەرێکەوتین. بەرۆژ خۆمان حەشاردا و شەوانە ڕێگەمان دەبڕی، تا ئەوەی بەرەبەیانی ڕۆژی پێنجەم گەیشتینە خەرار. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدابووم، لەخەرار دوورتر نەڕۆم، کاروانەکە یەك ڕۆژ پێشتر لەوێ تێپەڕیبوو. شەست پیاو لەناو کاروانەکەدا بوون.

لەم سەفەرەدا هەموو هاوەڵانی سەعد لەموهاجیرەکان بوون.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: وتاری کوڕی ئیسحاق سەبارەت بەم شەڕانە کە لەواقدی گێڕامانەوە، جیاوازە چوونکە ئەو، ڕوودانی ئەم شەڕانە لەساڵی دووەمی کۆچیدا دەزانێت.

بەوتەی ئەو پێغەمبەر(د.خ)، دوانزەی مانگی شەوال گەیشتە مەدینە و پاشماوەی مانگی ڕەبیع الاوەل و ڕەبیع الاخری و هەردوو جومادی و ڕەجەب و شەعبانی و ڕەمەزان و شەوال و زیقەعدە و زیحەججەی لەمەدینە بەسەر برد. لەو ساڵەدا ناباوەڕان ڕێ و ڕەسمی حەج کردنیان بەڕێوەدەبرد. موحەڕەمی لەمەدینە بەسەر برد و لەمانگی سەفەر کەدوانزە مانگ لەکۆچی ئەو تێپەڕی کرد، بەمەبەستی (غەزا) ڕۆشتەدەر. تا وەدان پێشڕەوی کرد و مەبەستی قوڕەیشییەکان و منداڵەکانی زەمورە کوڕی بەکر بوو. ئەم غەزوەیە بەئەبوا ناو دەبەن. لەم سەفەرەدا منداڵەکانی زەمورە پەیمانی ئاشتیان

لەگەڵ بەست. ئەو کەسەی پەیمانی ئاشتییەکەی مۆر کرد، سەرکردەکەیان مەخشی کوڕی عەمرۆ بوو.

دەڵێت: دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە گەڕایەوە و هیچ شەڕێك ڕوویندا. پاشماوەی مانگی سەفەر و بەشێك لەرەبیع الاولی لەمەدینە بەسەر برد. لەم کاتەدا عوبەیدە کوڕی حارس کوڕی موتەلیبی لەگەڵ هەشتا کەس لەموهاجیرەکان ڕەوانە کرد. کەس لەئەنسارییەکان لەناویاندا نەدەبینران. عوبەیدە تا ئەحیا ڕۆشتە پێش کەئاوێکە لەحیجاز لەخوارەوەی سەنییەت ئەلمورە. لەوێ ڕووبەڕووی دەستەیەکی فراوان لەقوڕەیشییەکان بوویەوە بەڵام شەڕ ڕوویندا. تەنیا سەعد کوڕی ئەبی وەقاس تیرێکی هاویشت و ئەمە یەکەم تیر بوو لەئیسلامدا هاوێژرا. دوای ئەوە هەر دوولا لەیەك جوێ بوونەوە و لەدەستەی ناباوەڕان میقداد کوڕی عومەری بێهرانی و عوتبە کوڕی غەزوان بۆ ناو ئوردوی موسوڵمانەکان هەڵاتن. ئەم دوانە هەردووکیان موسوڵمان بوون و بەکەفارەوە هاتبوون تا خۆیان بەموسوڵمانەکان بگەیێن. سالاری ناباوەڕان، عیکرەمە کوڕی ئەبوجەهل بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئاڵای عوبەیدە یەکەم ئاڵا بوو پێغەمبەر(د.خ) بۆ یەکێك لەموسوڵمانانی بەست.

دەڵێت: بەوتەیەك دەستەیەك لەشارەزایان، پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی گەڕانەوە لەئەبوا و پێش گەیشتن بەمەدینە، عوبەیدەی ڕەوانە کرد.

دەڵێت: لەو کاتەی نیشتەجێی مەدینە بوو، حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیبی لەگەڵ سی کەس لەموهاجیرەکان بۆ کەنار دەریا لەناوچەی عەیس نارد کەسەرزەمینی جوهەینەیە. هیچ کەس لەئەنسار لەناویاندا نەدەبینرا. حەمزە لەکەناری دەریا ڕووبەڕووی ئەبوجەهل کوڕی هوشام بوویەوە کەسێسەد کەس لەخەڵکانی مەککە هاوڕێیەتیان دەکرد. مەجدی کوڕی عەمرۆ جوهەنی کە لەگەڵ هەردوولادا پەیمانی ئاشتی بەستبوو، بوو بەناوبژیوان. هەردوو دەستە لەیەك جیابوونەوە و هیچ شەڕێك ڕوویندا.

دەستەیەك وتوویانە: ئاڵای حەمزە یەکەم ئاڵا بوو پێغەمبەر(د.خ) بۆ یەکێك لەموسوڵمانانی بەست بەڵام چوونکە دەستەکەی ئەو لەگەڵ دەستەکەی عوبەیدە کوڕی حارس، پێکەوە ڕۆشتنەدەر، ئەم هەڵەیە ڕوویداوە.

دەڵێت: لەشارەزایانم بیستووە ئالأی کوڕی عوبەیدە یەکەم ئالأبوو لەئیسلامدا بەسترا.

دەڵێت: دوای ئەوە لەمانگی رەبیع الاول پێغەمبەر(د.خ) بەمەبەستی غەزاو رووبەرووبوونەوە لەگەڵ قورەیشییەکان رۆشتەدەر و تابوات لەناوچەی رەزەوی پێشرەوی کرد. پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و هیچ رووداوێك روویندا.

جارێکی دیکە بەمەبەستی غەزا و رووبەروو بوونەوە لەگەڵ قورەیشییەکان رۆشتەدەر و لەرێگەی دۆڵی منالەکانی دینارەوە بەرێکەوت تا گەیشتە دۆلی کوڕی ئەزهەر و لەژێر سێبەری دارێك دانیشت. لەوێ نوێژی خوێند. نوێژگەکەی ئەو ماوەتەوە. خورادنێکیان ئامادە ولێی خوارد و هاوەڵانیشی خواردیان. شوێنی کوچکاورەکە ماوەتەوە و لەچاڵاوەکەی ئەوێ بەناوی مەشیرب، ئاویان بۆ هێنا. پێغەمبەر(د.خ) لەوێ رۆشت تا لەناوچەی یەنبەع گەیشتە عەشیرە و پاشماوەی جومادی الاول و چەندی رۆژێکی جومادی الاخری لەوێ بەسەر برد و لەگەڵ منالەکانی مودەلیج و منالەکانی زەمموورە پەیمانی ئاشتی بەست و بۆ مەدینە گەڕایەوە بێ ئەوەی پێشهاتێك روویدات.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەغەزوەی زوئەلعەشیرە گەڕایەوە، کەمتر لەدەرۆژ لەمەدینە مایەوە کە کەرز کوڕی جابری فیهری سەرەوەی مەدینە تالأن کرد.، پێغەمبەر(د.خ) شوێنی کەوت و لەدۆڵی سەفوان تا نزیك بەدر رۆشت بەلأم بەکەرز نەگەیشتەوە. ئەم غەزوەیان بەبەدری یەکەم ناو بردووە.

دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە گەڕایەوە و پاشماوەی جومادی الاخر و رەجەب و شەعبانی لەو شارە بەسەر برد و لەم ناوەدا سەعد کوڕی ئەبی وەقاسی لەگەڵ هەشتا کەس بۆ غەزا رەوانە فەرموو.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا، یانی ساڵی یەکەمی کۆچی، باوکی قەیس ئەسلەت رۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ) پیشنیاری ئیسلامی پێکرد، وتی: دینەکەی تۆ پەسەندە، با تێفکرم و دواتر دەگەرێمەوە.

دوای ئەو ەی عەبدوالله کوڕی ئەبی ئەوی بینی و وتی: شەڕ کردن لەگەڵ خەزرەجییەکانت پەسەند نەکرد.

باوکی قەیس وتی: تا یەك ساڵی دیکە باوەڕ ناهێنم بەلأم لەمانگی زیقەعدەدا مرد.

## ساڵی دووەمی کۆچی

بەهاودەنگی هەموو شارەزایان پێغەمبەر(د.خ) لەرەبیع الاولی ئەم ساڵەدا بۆ غەزوەی ئەبوا و بەوتەیەك غەزوەی وەدان ڕۆشت. لەنێوان ئەم دووناوچەیە شەش میل دوورییە، کاتێك بۆ غەزا دەڕۆشتەدەر، سەعد کوڕی عوبادە کوڕی دەلەیمی لەمەدینە وەك جێگری خۆی دەستنیشان دەکرد. ئالآدارەکەی حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب بوو و وەك دەڵێن، ڕەنگی ئالآکەی سپی.

واقدی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) پانزە ڕۆژ لەوەدان مایەوە و دواتر بۆ مەدینە گەڕایەوە.

دەڵێت: دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ دووسەد کەس لەهاوەلآنی خۆی بەمەبەستی غەزا مەدینەی بەجێهێشت و لەمانگی رەبیع الاول گەیشتە بوات. دەیویست رێگە لەکاروانی قوڕەیشییەکان بگرێت، سالاری کاروانەکە ئومەییە کوڕی خەلەف بوو کەسەد پیاو لەخەڵکانی مەدینە هاورێیەتیان دەکرد. دوو هەزار و پێنسەد وشتر لەناو کاروانەکەدا دەبینرا. پێغەمبەر(د.خ) لەم غەزایە بێ هیچ ڕووداوێك بۆ مەدینە گەڕایەوە. لەم سەفەرەدا ئالآدارەکەی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و سەعد کوڕی مەعازی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد.

دەڵێت: هەروەها لەربیع الاول شوێن کەرز کوڕی جابری فیهری کەوت کەمەڕومالآتەکەی مەدینەی تالآن کردبوو. تا بەدر پێشڕەوی کرد بەلآم نەیتوانی کەرز بگرێت. ئالآدارەکەی لەم سەفەرەدا عەلی کوڕی ئەبی تالیب و زەید کوڕی حارسەی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ کۆچکەران، بۆ تالآن کردنی کاروانی قوڕەیشییەکان کە بەرەو شام دەڕۆیشتن، ڕۆشتەدەر. ئەم غەزوەیان بەزات ئەلعەشیر ناوبرد. پێغەمبەر(د.خ) تا یەنبەع پێشڕەوی کرد. لەم سەفەرەدا باوکی سەلمە کوڕی عەبدئەسەدی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا و ئالآدارەکەی حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب بوو.

عەماری یاسر دەڵێت: من و عەلی لەغەزوەی زولەعەشیرە هاورێیەتی پێغەمبەرمان دەکرد. لەماڵێك دابەزین و کەسانێك لەمناڵەکانی مودەلیجمان بینی لەناو دارخورماکانی خۆیان کاریان دەکرد. من و عەلی ڕۆشتین بۆ ئەوەی بزانین بەچ شێوەیەك کار دەکەن.

ڕۆشتین و بۆ ماوەی کاژێرێك تەماشامان دەکرد بەڵام خەومان لێکەوت و پێغەمبەر(د.خ)بەئاگای هێنایینەوە. ئێمە تۆزاوی ببووین. پێغەمبەر(د.خ) عەلی بەقاچی خۆی تەکاند و فەرمووی: ئەی باوکی توراب لەخەو هەستە، دەتەوێت لەبەدبەختترینی خەڵکان ئاگادارت بکەمەوە کەهاوشێوەی موو سوورەکەی سەموودە کەوشترەکەی کوشت، ئەو کەسەی زەرەبە لەمشوێنەی تۆ دەدات و دەستی لەناوچاویدا (و ئەمە لەخوێندا سوور دەکات) و دەستی بۆ ڕیشی ئەو برد.

لەم بارەوە ئاماژەیان بەگێڕانەوەی جیاواز داوە کە لەگێڕانەوەی محەممەد کوڕی عوبەید کوڕی موحاربی باسی لێوەکراوە: بەسەهل کوڕی سەعدیان وت: یەکێك لەئەمیرەکانی مەدینە دەخوازێت کەسێك بۆ لای تۆ بنێرێت تا جوێن بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب بدەیت.

سەهل وتی: چی بڵێم؟

وتیان: بڵێ ناوەکەی باوکی تورابە.

وتی: سوێند بەخوا پێغەمبەر(د.خ) ئەم ناوەی پێبەخشی.

وتیان: چۆن بوو؟

وتی: عەلی لەماڵەکەی هاتەدەر و لەسێبەری مزگەوتا خەوی لێکەوت. پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای فاتیمە و فەرمووی: کوڕە مامەکەی تۆ لەکوێیە؟

فاتیمە وتی: لەمزگەوتا خەوتووە.

پێغەمبەر(د.خ) ڕشۆشت وئەوی بینی کە بەپشتا کەوتووە و خۆڵاوی بووە. خۆڵی پشتی پاك کردەوەو دەیفەرموو: باوکی توراب هەستە، سوێند بەخوا هیچ ناوێکی بەئەندازەی ئەم ناوەی خۆش نەدەویست.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا چەند ڕۆژێك بۆ کۆتایی سەفەر، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، فاتیمە کچی پێغەمبەری(د.خ) وەك هاوسەر هەڵبژارد.

هەروەها ئەبو جەعفەری تەبەری دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەشوێنکەوتنی کەرز کوڕی جابری فیهری بۆ مەدینە گەڕایەوە (لەمانگی جومادی الاخر)، لەمانگی ڕەجەب، عەبدوالله کوڕی جەحەشی لەگەڵ دەستەیەك لەموهاجیرەکان ڕەوانە کرد. کەس لەئەنسارییەکان لەناویاندا نەدەبینرا.

لەگێڕانەوەی زوهری و یەزید کوڕی ڕومان لەعوروە کوڕی زوبەیر بەمشێوە باسی کراوە بەڵام بەوتەی واقدی پێغەمبەر(د.خ)، عەبدوالله کوڕی جەحشی لەگەڵ دوانزە

کەس لەموهاجیرەکان ڕەوانە فەرموو. هەروەها لەگێڕانەوەکەی ئەوان ئاماژەی پێدراوە کە پێغەمبەر(د.خ) نامەیەکی بۆ عەبدوالله کوڕی جەحەش نووسی و پێی فەرموو سەیری نەکات تا ئەو کاتەی دوو ڕۆژ بەرێگادا دەڕوات. دوای ئەوە نامەکە بخوێنێتەوە و ناوەرۆکەکەی جێبەجێ بکات و هیچ کام لەهاوەڵانی خۆی بەدڵخواز بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکان ناچار نەکات.

کاتێك عەبدوالله دوو ڕۆژ ڕێگەی بڕی، نامەکەی خوێندەوە کەنووسرا بوو

(( کاتێك نامەکەت بینی تا وادی نەخلە لەنێوان مەککە و تاییف بڕۆ و ئاگات لەقوڕەیشییەکان بێت و هەواڵەکانی ئەوان کۆبکەرەوە)). کاتێك عەبدوالله نامەکەی خوێندەوە، وتی: جێبەجێی دەکەم. بەهاوەڵانی خۆت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێداوم بەرەو نەخلە بڕۆم و ئاگام لەقوڕەیشییەکان بێت و هەواڵەکانی ئەوان کۆبکەمەوە، فەرمانی پێداوم بەزۆر و نابەدڵخواز هیچ کامتان لەگەڵ خۆمدا نەبەم، هەرکەس خوازیاری شەهید بوونە، دەتوانێت بێت و هەرکەس ناخوازێت، دەتوانێت بگەڕێتەوە، بەڵام من فەرمانەکانی پێغەمبەر(د.خ) جێبەجێ دەکەم.

عەبدوالله بەرێکەوت و هەموو هاوەڵانی هاورێیەتیان کرد. کەس نەگەڕایەوە و ڕێگەی حیجازیان گرتەبەر تا ئەوەی لەسەرەوەی فەرع گەیشتە کانێك. سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و عوتبە کوڕی غەزوان، وشترەکەیان ون کرد کەبە نۆرە سواری دەبوون. بەدوای وشترەکەیاندا گەڕان. عەبدوالله کوڕی جەحەش و کەسانی دیکە ڕۆشتن تا گەیشتنە نەخلە. کاروانێك لەقوڕەیش لەوێ تێپەڕی کەکشمیش و چەرم و کاڵای بازرگانی هەڵگرتبوو. عەمرۆ کوڕی حەزرەمی و عوسمان کوڕی عەبدوالله کوڕی موغەیرە و براکەی نەوفل کوڕی عەبدوالله کوڕی موغەیرە، هەردووك مەخزومی،وحەکەم کوڕی کەیسان لەناو کاروانەکەدا دەبینران. کاتێك قوڕەیشییەکان موسوڵمانەکانیان بینی، ترسان. موسوڵمانەکان لەنزیك ئەوان دابەزیبوون بەڵام عوکاشە کوڕی مەحسەنیان بینی کەسەری تاشیبوو. بەمشێوەیە ئاسوودە بوون و گومانیان کرد هاوەڵانی عەبدوالله بەمەبەستی ئەنجامدانی حەجی عەمرە هاتوون.

موسوڵمانان راوێژیان کرد. دوایین ڕۆژی ڕەجەب بوو، وتیان: ئەگەر ئەمشەو هێرش نەکەنە سەرکاروانەکە دەڕواتە ناو حەرەم و چیتر دەستتان پێی ناگات، ئەگەر بیانکوژن لەمانگی حەرامدا خوێنتان ڕشتووە. دوودڵ بوون و لەکارەکەی خۆیان دەترسان، دوای

ئەوە بوێری خۆیان بەدەستهێنایەوە و بڕیاریاندا کوشتاریان بکەن و سامانەکانیان تالآن بکەن. واقید کوڕی عەبدوالله تەمیمی تیرێکی هاویشت و عەمرۆ کوڕی حەزرەمی کوشت. عوسمان کوڕی عەبدوالله وحەکەم کوڕی کەیسان ئەسیرکران. نەوفل کوڕی عەبدوالله هەلآت و نەیانتوانی بیگرن. عەبدوالله کوڕی جەحەش و هاوەڵانی، کاروانەکە و دوو ئەسیرەکەیان بۆ مەدینە برد.

دەستەیەك لەنەوەکانی عەبدوالله کوڕی جەحەش دەڵێن: عەبدوالله بەهاوەڵانی خۆی وت یەك پێنجی تالآنییەکانی ئێوە تایبەتە بەپێغەمبەر(د.خ). ئەمە پێش ئەوە بوو یەك پێنج فەرز بکرێت. یەك پێنجی تالآنییەکانی بۆ پێغەمبەر(د.خ) جیا کردەوە و پاشماوەکەی لەناو هاوەڵانی خۆیدا دابەش کرد. کاتێك گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، فەرمووی: مەگەر ئەمووت لەمانگی حەرامدا شەڕ مەکەن. کاروان و دوو ئەسیرەکەی بینی بەلآم هیچی لێ هەڵنەگرت.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی فەرموو، هاوەڵانی عەبدوالله سەریانسوڕما و گومانیان کرد لەناودەچن. موسوڵمانەکان سەرکۆنەیان کردن و وتیان: کارێکتان کرد پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی ئەنجامدانی نەدابوو، لەمانگی حەرامدا شەڕتان کرد لەکاتێکدا فەرمانی شەڕکردنتان پێنەدرابوو.

قوڕەیشییەکان وتیان: محەممەد و هاوەڵانی ڕێزی مانگی حەرامیان نەگرت و لەمانگی حەرامدا خوێنیان ڕۆشت. سامانی ئێمەیان تالآن و کەسانێکیان لێ ئەسیر کردین. موسوڵمانانی مەککە لەوەڵامدا وتیان: ئەوەی ئەنجامیاندا لەمانگی شەعباندا بوو.

جوولەکەکان بەشێوەیەکی خراپ ئەم کارەیان لێکدایەوە، وتیان: واقید کوڕی عەبدوالله، عەمرۆ کوڕی حەزرەمی کوشتووە، عەمرۆ شەڕەکەی خۆش کرد و حەزرەمی ئامادەی شەڕەکە بوو، واقید ئاگری شەڕی داگیرساند (چونکە واقید بەمانای داگیرسێنەری ئاگرە) و ئەمە لەزیانی ئەواندایە و سوودی لێ نابینن. کاتێك خەڵکانێکی زۆر لەمبارەوە قسەیان کرد، خواوەند ئەم ئایەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە کرد:

((یسئلونك عن الشهر الحرام قتال فیه قل قتال فیه کبیر و صد عن سبیل الله و کفر به و المسجد الحرام و اخراج اهله منه اکبر عندالله و الفتنة اکبر من القتل و لا یزالون یقاتلونکم حتی یردو کم عن دینکم ان استطاعوا و من یرتدد منکم عن دینه فیمت و هو کافر فاولئك حبطت اعمالهم فی الدنیا و الاخرة و اولئك اصحاب النار هم فیها خالدون.

واتاکەی: پرسیاری مانگی حەرام و شەڕ کردن لەو مانگەت لێ دەپرسن، بڵێ، شەڕ کردن لەو مانگە گرینگ و ڕێگرتن لەرێگەی خوا و حاشا کردن لەوە. مزگەوتی حەرام و دەرکردنی خەڵکەکەی لای خوا گرینگترە و فیتنە و ئاژاوە لەکوشتار خراپترە، ناباوەڕان بەردەوام شەڕ لەگەڵ ئێوە دەکەن تا ئەگەر بتوانن لەدینەکەتان هەڵتانگێڕنەوە. هەرکەس لەدینەکەی پەشمیان ببێتەوە و بمرێت، کافرە. ئەم کەسانە لەم دنیا و ئەو دنیا کردەوەکانیان بەفیڕۆ دەچێت و دەچنە ریزی جەهەنەمییەکان و بۆ هەمیشە لەوێ دەمێننەوە.))

کاتێك ئایەی قورئانی لەمبارەوە هاتەخوار و خواوەند جیاوازی لەناو موسوڵمانەکاندا نەهێشت، پێغەمبەر(د.خ) کاروان و دوو ئەسیرەکەی وەرگرت. قوڕەیشییەکان بۆ عوسمان کوڕی عەبدوالله و حەکەم کوڕی کەیسان فدیەیان نارد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی فدیە وەرناگرم تا دوو هاورێکەی ئێمە یانی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و عوتەبە کوڕی غەزوان بگەرێنەوە چوونکە دەترسین لەوەی بیانکوژن و ئەگەر ئەم کارە بکەن، دوو کەسەکەی ئێوە دەکوژین. کاتێك سەعد و عوتەبە گەڕانەوە، پێغەمبەر(د.خ) بەهای ئازادی ئەسیرەکانی وەرگرت. حەکەم کوڕی کەیسان باوەڕی هێنا و لای پێغەمبەر(د.خ) مایەوە تا ئەوەی لەرووداوی بئر مەعوونە کوژرا.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: وەك وتوویانە پێغەمبەر(د.خ) دەیویست، باوکی عوبەیدەی جەڕاح بۆ ئەم سەفەرە بنێرێت، بەلاّم بۆچوونی گۆڕی و عەبدوالله کوڕی جەحەش نارد.

جوندەب کوڕی عەبدوالله دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەکی ڕەوانە دەفەرموو و باوکی عوبەیدەی وەك سەرکردەی ئەوان دەستنیشان دەکرد و کاتێك دەیویست بەرێکەوێت، لەتاو دووری پێغەمبەر(د.خ) قوڕقوڕ گریا، پێغەمبەر(د.خ) عەبدوالله کوڕی جەحەش لەجیاتی ئەو ڕەوانە کرد.

## گێڕانەوەی پاشماوەی ڕووداوەکانی ساڵی دووەمی کۆچی

لەرووداوەکانی ئەم ساڵە گۆڕینی قیبلەی موسوڵمانان لەشامەوە بۆ مەککە و لەمانگی شەعبانی ئەم ساڵەدا روویدا. زاناکانی مێژوو سەبارەت بەکاتی گۆڕینی قیبلە بۆچوونەکانیان جیاوازە و زیاتر باوەڕیان وایە لەنیوەی شەعبان، هەژدە مانگ دوای

کۆچ، قیبلە گۆڕا.

لەکوڕی مەسعود دەگێڕنەوە: خەڵکان روویان دەکردە بیت المقدس و نوێژیان دەخوێند. کاتێك هەژدە مانگ بەسەر کۆچی پێغەمبەر(د.خ) تێپەڕی کرد، لەکاتی نوێژ سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و چاوەڕوانی فەرمانی خواوەندی دەکرد. رووی دەکردە بیت المقدس و نوێژی دەخوێند بەڵام ئارەزووی دەکرد روو بکاتە کەعبە. خواوەند ئەم ئایەی رەوانە فەرمووە ((قد نری تقلب وجهك فی السماء فلنولینك قبلة ترضیها فول وجهك شطر المسجد الحرام و حیث ما كنتم فولوا وجوهكم شطره و الذین اوتوالكتاب لیعلمون انه الحق من ربهم و ما الله بغافل عما تعملون.

واتاکەی: سووڕانی رووی تۆ بۆ ئاسمان دەبینم و تۆ بۆ ئەو قیبلەی ئارەزووی دەکەیت، دەسووڕێنین. چیتر رووبکەرە المسجد الحرام، لەهەر شوێنێك بوون، رووبکەنە ئەوێ و نوێژ بخوێنن. ئەوانەی کتێبی ئاسمانیان هەیە دەزانن ئەمە راستییە و حەقە و لەلایەن پەروەردگارییانەوەیە. خواوەند لەوەی ئەنجامی دەدەن بێ ئاگا نییە.))

لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕنەوە: قیبلە لەمانگی شەعبان، هەژدە مانگ دوای کۆچی پێغەمبەر(د.خ) گۆڕا.

واقدی دەڵێت: گۆڕانی قیبلە لەرۆژی سێ شەممەی نیوەی شەعبان روویدا.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: دەستەیەکی دیکە وتوویانە گۆڕانی قیبلە شانزە مانگ دوای کۆچ بوو.

قتادە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە بوو، موسوڵمانان روویان دەکرد بیت المقدس و نوێژیان دەخوێند و کاتێك کۆچی کرد، تا شانزە مانگ روویان دەکردە بیت المقدس، دوای ئەوە قیبلە گۆڕا و روویان دەکردە کەعبە.

کوڕی زەید دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماوەی شانزە مانگ رووی دەکرد بیت المقدس و نوێژی دەخوێند. بیستی جولەکەکان دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی نەیاندەزانی قیبلەکەیان رووی لەکوێیە تا ئەوەی ئێمە نیشانماندان. پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی پەسەند نەکرد و سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و ئایەی گۆڕینی قیبلە هاتەخوار.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا رۆژووی مانگی رەمەزان فەرز کرا. بەوتەیەك ئەم مانگە شەعبان بوو. پێغەمبەر(د.خ) هاتە مەدینە و بینی جولەکەکان لەرۆژی عاشوورا رۆژو دەگرن. هۆکارەکەی لەوان پرسی، وتیان: ئەمە رۆژێکە تیایدا خواوەند بنەماڵەی فیرعەونی لەناو برد و موسا و هاورێکانی نەجاتدا. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مافی ئێمە

بۆ مووسا زیاتر لەوانە. ئەو رۆژە بەرۆژوو بوو، فەرمووی تا خەڵکانیش بەرۆژوبن. بەڵام کاتێك رۆژووی مانگی رەمەزان فەرز کرا، چیتر نەیوت لەرۆژی عاشوورا بەرۆژوبن بەڵام رێگریشی نەکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا زەکاتی رەمەزان (فطر) فەرز کرا. پێغەمبەر(د.خ) یەك یا دوو رۆژ پێش جەژنی رەمەزان، وتارێکی خوێندەوە و فەرمووی زەکاتی جەژنی رەمەزان بدەن.

هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) رۆشتە نوێژگە و نوێژی جەژنی لەگەڵ خەڵکان خوێند. ئەمە یەکەم نوێژی جەژن بوو، پێغەمبەر(د.خ) خوێندی.

هەروەها لەم ساڵەدا ئەو داردەستەی نەجاشی بۆ پێغەمبەری(د.خ) ناردبوو، بردیان بۆنوێژگە. زوبەیر کوڕی عەوام هەڵیگرتبوو. لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ) داینا و لەهەموو رۆژەکانی جەژن دەیانبرد. وەك بیستوومە دەڵێن ئێستا لای بانگدەرانی مەدینەیە.

هەروەها لەم ساڵەدا شەڕی بەدری گەورە لەنێوان موسوڵمانان و قورەیشییەکان روویدا. ئەم شەڕە لەمانگی رەمەزان بوو بەڵام سەبارەت بەرۆژەکەی بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە شەڕی بەدر لەرۆژی نۆزدەی رەمەزان روویدا.

لەکوڕی مەسعود دەگێڕنەوە: بۆشەوی قەدر لەشەوی نۆزدەی رەمەزاندا بگەڕێن چوونکە شەوی بەدر بوو.

عەبدوالله دەڵێت: شەوی قەدر لەشەوی نۆزدەی رەمەزاندا بەدوایدا بگەڕێن چوونکە بەرەبەیانەکەی شەڕی بەدر روویدا.

خارجە کوڕی زەید دەڵێت: باوکم بۆ زیندوو هێشتنەوەی شەوی نۆزدە و بیست و سێی رەمەزان وردبین بوو، نەدەخەوت و لەئەنجامدا رەنگی زەرد دەبوو، کاتێك لەهۆکارەکەیان دەپرسی، دەیوت: بەرەبەیانی ئەم شەوە خواوەند، راستی لەچەوتی جیا کردەوە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە شەڕی بەدر لەهەینی، حەفدەی رەمەزان روویدا.

عەبدوالله کوڕی مەسعود دەیوت: شەوی قەدر لەشەوی حەفدەی رەمەزاندا بەدوایدا بگەڕێن چوونکە رۆژی رووبەروو بوونەوەی دوو دەستە بوو کەئایەی قورئان هاتە خوار و خواوەند فەرمووی: یوم التقی الجمعان. دواتر دەیوت: یا لەشەوی نۆزدەیەم یا بیست و یەکەم بەدوایدا بگەڕێن.

لەزوبەیر کوڕی عودەی دەگێڕنەوە: شەڕی بەدر بەرەبەیان نۆزدەی ڕەمەزان ڕوویدا.

واقدی دەڵێت: ئەمەم لەگەڵ محەممەد کوڕی سالّح باس کرد و وتی: سەیرە، گومانم نەدەکرد کەس گومانی هەبێت کەشەڕی بەدر بەرەبەیانی هەینی، حەفدەی ڕەمەزان ڕوویدا بێت. عاسم کوڕی عەمرۆ و قتادە کوڕی یەزید کوڕی ڕۆمانیش، بۆچوونیان هاوشێوەی ئەمەیە.

دواتر محەممەد کوڕی سالّح پێی وتم: ئەی برازا، لەمبارەوە پێویست بەناو بردنی کەس ناکات چوونکە بابەتەکە ڕوون و ئاشکرایە و ژنانی ناو ماڵەکانیش ئەمە دەزانن.

واقدی دەڵێت: ئەمەم بۆ عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی باس کرد و وتی: بیستوومە: زەید کوڕی سابت شەوی حەفدەی ڕەمەزان نەدەخەوت و بەرەبەیان نیشانەکانی بێداری بەروخسارییەوە دیار بوو، دەیوت: بەرەبەیانی ئەم ڕۆژە، خواوەند ڕاستی لەچەوتی جیا کردبوویەوە وئیسلامی ئازیزو قورئانی ناردەخوار و سەرکردەی کافرەکانی ڕیسوا و زەلیل کرد. شەڕی بەدر لەڕۆژی هەینی ڕوویدا.

لەحەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەگێڕنەوە: شەوی فەرقان و ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوە، هەینی، حەفدەی ڕەمەزان بوو.

هۆکاری شەڕی بەدر و شەڕەکانی دیکەی نێوان پێغەمبەر(د.خ) و ناباوەڕانی قوڕەیش وەك عوروە کوڕی زوبەیر ئاماژەی پێدەدات، کوشتنی عەمرۆ کوڕی حەزرەمی بوو کەبەدەستی واقد کوڕی عەبدوڵڵەی تەمیمی کوژرا.

## ئاماژەدان بەشەڕی گەورەی بەدر

هوشام کوڕی عوروە دەڵێت: باوکم نامەی بۆ عەبدولمەلیك کوڕی مەروان نووسی: سەبارەت بەکاروباری ئەبوسوفیان و ڕۆشتنەکەی پرسیارت کرد کەچۆن ڕوویدا، ئوبوسوفیان کوڕی حەرب لەگەڵ کاروانێکی حەفتا کەسی لەهەموو هۆزەکانی قوڕەیش لەشامەوە دەهات. بۆ بازرگانی کردنی ڕۆشتبوونە شام و لەگەڵ سامان و کالاکانی خۆیان گەڕانەوە. پێغەمبەریان ئاگادار کردەوە و پێشتر شەڕ لەنێوان ئەوان ڕوویدابوو و خوێن ڕژا بوو. کوڕی حەزرەمی و کەسانی دیکە لەنەخلە کوژران و دوان لەقوڕەیشییەکان، یەکیان لەمناڵەکانی موغەیرە و یەکیان کوڕی کەیسان، هاوپەیمانی ئەوان، ئەسیر کرابوون. ئەم کارانە لەسەر دەستی عەبدوڵڵە کوڕی جەحش و واقد

هاوپەیمانی منداڵەکانی عودەی و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ئەنجامدرا. ئەم رووداوە یەکەم رووبەڕوو بوونەوەی نێوان پێغەمبەر(د.خ) و قوڕەیشییەکان و پێش ڕۆشتنی ئەبوسوفیان بۆ شام روویدا، شەڕی لەنێوان ئەواندا داگیرساند.

دوای ئەوە ئەبوسوفیان لەگەڵ کاروانی قوڕەیشییەکان لەشامەوە هات. رێگەکەیان لەکەنارەکانی دەریاوە بوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی بیست، باسی کاڵا و سامان و ژمارەی کەمی پیاوەکانی قوڕەیشی بۆ هاوەڵانی باس کرد. بەرێکەوتن و بەدوای ئەبوسوفیان و کاروانەکەی ئەودا دەگەڕان و بەتاڵانی وبەشی خۆیانیان دەزانی. گومانیان نەدەکرد کاتێك بەوان دەگەن، شەڕێکی ئەوتۆ رووبدات، خواوەند لەمبارەوە فەرمووی: حەزتان دەکرد دەستەی لاوازتر لەئێوە بێت.

کاتێك ئەبوسوفیان بیستی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) رێگەکەیان گرتووە، کەسی بۆ لای قوڕەیشییەکان نارد کە محەممەد و هاوەڵانی رێگەی کاروانەکەی ئێوەیان گرتووە، سامان و کاڵاکانی خۆتان بپارێزن.

کاتێك قوڕەیشییەکان ئاگادار بوونەوە، خەڵکانی مەککە کەوتنە جموجۆڵ لەبەر ئەوەی هەموو تیرەکانی منداڵەکانی لۆئەی لەکاروانەکەی ئەبوسوفیان بەشدار بوون و ئەم بزوتنەوەیە لەمنداڵەکانی کەعب کوڕی لوئەی بوو. لەمنداڵەکانی عامر جگە لەتیرەی منداڵەکانی مالك کوڕی حەسل کەس نەدەبینرا. پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی لەبەرێکەوتنی قوڕەیشییەکان ئاگادار نەبوون تا گەیشتنە شوێنی بەدر کەرێگەی کاروانی قوڕەیشییەکان لەکەناری دەریاوە بۆ شام دەڕۆشت. ئەبوسوفیان لەبەدر تێپەڕی چوونکە دەترسا لەبەدر رێگەی پێبگرن. پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت تا لەنزیك بەدر دابەزی. زوبەیر کوڕی عەوام و دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی بۆ سەر چاڵاوەکەی بەدر نارد. گومانیان نەدەکرد قوڕەیشییەکان بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەوان بێن.

چەند کەسێك لەئاوگرەکانی قوڕەیش گەیشتنە سەر چاڵی بەدر کە کۆیلەیەکی ڕەش لەمنداڵەکانی حەجاج لەناویاندا دەبینرا. نێردراوانی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ زوبەیر کوڕی عەوامدا بوون، کۆیلە ڕەشەکەیان گرت. کەسانی دیکە هەڵاتن. کۆیلەکەیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەو، نوێژی دەخوێند.

لەکۆیلەکە سەبارەت بەئەبوسوفیان و هاوەڵانی ئەو پرسیاریان کرد. دڵنیا بوون ئەو یەکێکە لەهاوەڵانی ئەبوسوفیان، بەڵام کۆیلە ڕەشەکە باسی سەرکردەکانی قوڕەیشی

دەكرد كە بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان بەرێكەوتون. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ئەم وتەیان پەسەند نەدەكرد و بەردەوام سەبارەت بەكاروانەكەی ئەبوسوفیان دەیانپرسی. پێغەمبەر(د.خ) لەنوێژ خوێندن بەردەوام بوو و ركوع و سجودی دەكرد. دەیبینی چی لەكۆیلەكە دەكەن. كاتێك كۆیلەكە دەیوت قورەیشییەكان هاتوون لێیان دەدا و دەیانوت: ئەبوسوفیان و هاوەڵانی ئەو دەشاریتەوە بەڵام كۆیلەكە ئاگای لەوان نەبوو. بەڵام كاتێك لێیان دەدا و سەبارەت بەئەبوسوفیان و هاوەڵانی پرسیاریان دەكرد، دەیوت: بەڵێ ئەمە ئەبوسوفیانە. كاروانەكەی قورەیش ئەو ناوچەی بەجێهێشتبوو، وەك چۆن خواوەند دەفەرمێت:

((اذانتم بالعدوة الدنیا و هم بالعدوة القصوی و الركب اسفل منكم، ولوتواعدتم لا ختلفتم فی المیعاد، ولكن لیقضی الله امرا كان مفعولا.

واتاكەی: كاتێك ئێوە لەكەنارەكانەوە نزیك بوون و ئەوان لەكەنارەوە دوور، كاروانەكە دوور لەئێوە بوو، ئەگەر بەڵێنیتان بوو لەگەیشتن بەشوێنی رووبەروو بوونەوە جیاوازیتان لا دروست دەبوو (لەكاتی خۆیدا نەدەگەیشتن) بەڵام (بەوشێوە بوو) تا خواوەند كۆتایی بەو كارە بێنێت كەدەبێت ئەنجام بدرێت)).

كاتێك كۆیلە رەشەكە دەیوت قورەیشییەكان هاتوون، لێیان دەدا چوونكە دەیوت: ئەمە ئەبوسوفیانە. دەستیان لێهەڵدەگرت و كاتێك پێغەمبەر(د.خ) كردەی ئەوانی بینی، دەستی لەنوێژەكەی هەڵگرت و فەرمووی: سوێند بەو كەسەی گیانی من لەدەستی ئەودایە، كاتێك وتەی راست دەهێنێتە سەرزمان، لێیدەدەن و كاتێك درۆ دەكات، دەستی لێهەڵدەگرن.

وتیان: دەڵێت قورەیشییەكان هاتوون.

فەرمووی: راست دەكات، قورەیشییەكان بۆ پارێزگاری كردن لەكاروانەكەی خۆیان هاتوون.

دواتر كۆیلەكەی بانگ كرد و پرسیاری لێكرد. كۆیلەكە باسی قورەیشییەكانی كرد و وتی: ئاگام لەئەبو سوفیان نییە.

پێغەمبەر(د.خ) پرسی: ژمارەیان چەند كەسە.

كۆیلە وتی: نازانم، زۆرن.

دەڵێت، پێغەمبەر(د.خ) پرسی: پێرێ شەو كێ خواردنی بۆ ئامادە كردن؟ كۆیلە ناوی كەسێكی برد.

پێغەمبەر(د.خ) پرسی: چەند وشتری کوشت؟

کۆیلە وتی: نۆ وشتر.

دواتر پرسی: دوێ شەو کێ خواردنی پێدان؟ کۆیلە کەسێکی ناو برد.

پێغەمبەر(د.خ) پرسی: چەند وشتری سەربڕی؟

کۆیلە وتی: دەوشتر.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ژمارەیان لەنێوان نۆسەد کەس بۆ هەزار کەسدایە. ژمارەی قورەیشییەکان نۆسەد و پەنجا کەس بوو.

پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت و لەسەر چاڵاوی بەدر دابەزی. حەوزەکانیان لێوانلێو کرد لەئاو. هاوەڵانی خۆی لەوێ ریز کرد تا قورەیشییەکان هاتن. لەهەمان کات پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە بەدر و فەرمووی: ئێرە شوێنی کوشتاری ئەوانە.

کاتێك قورەیشییەکان هاتن، بینیان پێغەمبەر(د.خ) پێش ئەوان دابەزیوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەندا، قورەیشییەکان لەگەڵ کەسەکان و غرووری خۆیان بۆ شەڕی تۆ و حاشا کردن لە پێغەمبەرەکەت هاتوون، خواوەندا بەڵێنەکەی خۆت بێنەرەدی.

کاتێك قورەیشییەکان نزیك کەوتنەوە، پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە پێش و خۆڵی کردە بەسەر و چاویاندا و خواوەند، لەناوی بردن.

پێش ڕووبەڕوو بوونەوەی قورەیشییەکان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)، ئەبوسوفیان کەسی نارد و فەرمانی گەڕانەوەی پێدان چوونکە کاروانەکەی گەیشتبوو جوحفە.

بەڵام قورەیشییەکان وتیان: سوێند بەخوا ناگەڕێینەوە تا ئەو کاتەی لەبەدر دابەزین ڕبۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەوێ بمێنینەوە و خەڵکانی حیجاز بمانبینن، بۆ ئەوەی هەرکەس ـەعەرەبەکان بمانبینێت بوێری شەڕ کردن لەگەڵ ئێمەی نەبێت. خواوەند لەمبارەوە ـەفەرمێت:

((الذین خرجوا من دیارهم بطرا و رئاء الناس و یصدون عن سبیل الله و الله بما یعملون ـحیط.

واتاکەی: ئەو کەسانەی بۆ خۆنواندن و ریاکاری لەدیارەکەی خۆیان هاتنەدەر و ـەرێگەی خواوەند دەگەڕێنەوە، خواوەند بەسەر ئەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن، زاڵە.))

کاتێك ڕووبەڕووی پێغەمبەر(د.خ) بوونەوە، خواوەند سەرکەوتنی بە پێغەمبەر(د.خ)

بەخشی و سەرکردەکانی کوفری ریسوا و دڵی موسوڵمانانی ئاسوودە کرد.

لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب دەگێڕنەوە: کاتێك ڕۆشتینە مەدینە، لەمیوەکانی مەدینەمان دەخوارد، بەلاّم بۆ ئێمە ناسازگار بوو و نەخۆش کەوتین. پێغەمبەر(د.خ) هەواڵی بەدری پێگەیشت و کاتێك ئاگادار بوویەوە ناباوەڕان هاتوون، بەرەو بەدر بەرێکەوت. بەدر چاڵاوێکە و لەوێ دوو پیاومان گرت، یەکیان قوڕەیشی و ئەوی دیکەیان کۆیلەی عوقبە کوڕی ئەبی موعیت. قوڕەیشی هەلاّت بەلاّم کۆیلەکەمان گرت و پرسیمان: ژمارەی خەڵکەکەت چەندە؟

وتی: زۆرن و زۆریش بەهێزن.

کاتێك ئەمەی وت، موسوڵمانان لێیان دەدا. ئەومان بردە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) ویستی لەژمارەی قوڕەیشییەکان ئاگادار ببێتەوە، بەلاّم کۆیلەکە نەیوت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ڕۆژانە چەند وشتر سەردەبڕن؟

وتی: دە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ژمارەیان هەزار کەسە.

شەوانە باران دەستی پێکرد و پەنامان بۆ ژێردارەکان و قەڵغانەکان برد. پێغەمبەر(د.خ) بەردەوام دەپاڕایەوە و دەیفەرموو: خواوەندا، ئەگەر ئەم دەستەیە لەناو بچێت چیتر لەسەر زەوی کەس تۆ ناپەرەستێت.

بەرەبەیان بۆ نوێژ ریزمان بەست. خەڵك لەژێر دارەکان و پەنای قەڵغانەکانەوە هاتن. پێغەمبەر(د.خ) نوێژی لەگەڵ خوێندین و بۆ شەڕ کردن هانیداین، فەرمووی: قوڕەیشییەکان لەکەناری ئەم کێوەن. کاتێك قوڕەیشییەکان نزیك کەوتنەوە و ئێمە ریزمان بەست، یەك لەوانم بینی سوار لەسەر وشترێکی موو سوور بەناویاندا دەسووڕایەوە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەمنی وت: لەحەمزە بپرسە ئەو کەسەی سوار وشترە موو سوورەکەیە، کێیە و بزانە چی دەڵێت؟ بۆیە ئەمەی وت چوونکە حەمزە لەهەموویان زیاتر لەقوڕەیشییەکانەوە نزیك بوو.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر لەناو ئەو خەڵکەکە یەك کەسیان لایەنگری خێر بێت، ئەو کەسەیە کەسوار وشترە موو سوورەکەیە.

حەمزە هات و وتی: ئەو، عوتەبە کوڕی ڕەبیعەیە کەدژی شەڕە و دەڵێت: ئەوان کەسانێکن لەگیانی خۆیان خۆش بوون و ناتوانن بەئاسانی بەسەریاندا سەرکەون، ئەی

خەڵکینە خۆتان گوناحبار مەکەن و بڵێن عوتەبە کوڕی ڕەبیعە ترساوە، دەزانن لەئێوە ترسەنۆکتر نیم.

دەڵێت ئەبوجەهل ئەمەی بیست و وتی: بۆ ئەم وتە دەهێنیتە سەرزمان، سوێند بەخوا ئەگەر جگە لەتۆ کەسێکی دیکە بەمشێوە دەئاخاوت، سزام دەدا، بەراستی لێوانلێو بوویت لەترس.

عوتەبە وتی: تۆ ڕەخنە لەمن دەگریت کەشوێنکەی خۆتت زەرد کردووە، ئەمرۆ دەزانی کێمان ترسەنۆکترە.

دەڵێت: عوتەبە کوڕی ڕەبیعە و براکەی شەیبە کوڕی ڕەبیعە و کوڕەکەی وەلید، هاتنە ناو گۆڕەپانی شەڕ و داوای شەڕکەریان کرد. شەش کەس لەئەنسارییەکان ڕووبەڕوویان بوونەوە، عوتەبە وتی: ئێمە لەگەڵ ئەماندا شەڕ ناکەین، دەبێت ئامۆزاکانی ئێمە، مناڵەکانی عەبدولموتەلیب ڕووبەڕوومان ببنەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: عەلی و حەمزە و عوبەیدە کوڕی حارس هەستن. خواوەند عوتەبە و شەیبە کوڕەکانی ڕەبیعە و وەلید کوڕی عوتەبەی کوشت. عوبەیدە کوڕی حارس بریندار بوو. حەفتا کەس لەوانمان کوشت و حەفتا کەسیان ئەسیر کران.

دەڵێت: یەکێك لەئەنسار عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبی ئەسیر کرد. عەباسیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ). عەباس وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەم پیاوە منی دیل نەکرد بەڵکو پیاوێکی بوێر و جوان ڕوخسار کەسوار ئەسپێکی ئەبڵەق بوو. ئەو لەناو شەڕکەرانی تۆدا نابینم.

ئەنساری وتی: من ئەسیرم کرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەند فریشتەیەکی بۆ هاوکاری تۆ ناردووە.

عەلی دەڵێت: لەمناڵەکانی عەبدولموتەلیب، عەباس و عەقیل و نەوفل کوڕی حارس، ئەسیر کران.

هەروەها دەڵێت: لەڕۆژی بەدر کەخۆمان بۆ شەڕ ئامادە و لەپەنای پێغەمبەردا بووین، لەهەمووومان بوێرتر بوو، هیچ کەس بەئەندازەی ئەو، لەدوژمنەوە نزیك نەبوو.

هەروەها دەڵێت: لەڕۆژی بەدر سوارەیەك جگە لەمیقداد کوڕی ئەسوەد لەناو ئێمەدا نەدەبینرا. هەموومان خەوتبووین جگە لە پێغەمبەر(د.خ) کەلای دارێك وەستابوو و تابەیانی نوێژی دەخوێند و دەپاڕایەوە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاروانی ئەبوسوفیان کە لەشامەوە هاتبوو، سی یا چل پیاوی قورەیشی هاوڕێیەتیان دەکرد. مەخریمە کوڕی نەوفل و عەمرۆ کوڕی عاس لەناویاندا دەبینران.

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە کاروانەکەی ئەبوسوفیان لەشامەوە دەگەڕێتەوە، بەموسوڵمانانی وت: ئەمە کاروانی قورەیشییەکانەو سامانی ئەوانی هەڵگرتووە، بڕۆن ئەگەری هەیە خواوەند بیکاتە بەشی ئێوە. دەستەیەکیان بەرێکەوتن و دەستەیەکیان سستییان لەخۆیان نیشاندا چوونکە گومانیان نەبوو لەوەی شەڕ روودەدات.

دەڵێت: ئەبوسوفیان چاودێری باس و خواسەکانی دەکرد و لەکاروانەکەی دەترسا. یەکێك لەکاروانییەکان ئاگاداری کردەوە: محەممەد هاوەڵانی خۆی بۆ هێرش کردنە سەر کاروانەکەی تۆ ڕەوانە کردووە. ئەبوسوفیان زەمزەم کوڕی عەمرۆی غەفاری بەکرێ گرت و ڕەوانەی مەککەی کرد و وتی قورەیشییەکان بۆ پاراستنی کالاّ و سامانەکانیان بەرێبخات و ئاگاداریان بکاتەوە محەممەد مەبەستی هێرش کردنە سەر کاروانەکەی هەیە. زەمزەم بەرێکەوت.

دەڵێت: سێ ڕۆژ پێش گەیشتنی زەمزەم بۆ مەککە، عاتیکە کچی عەبدولموتەلیب خەوێکی بینی، ترسا و کەسێکی بەدوای براکەی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبدا نارد و پێی وت:

براکەم، خەوێکم بینیووە وبەتەواوی ترساو و دەترسم شەڕ و زیان بەخەڵکەکەی تۆ بگات. ئەوەی باسی دەکەم لای کەس مەیدرکێنە.

عەباس وتی: چیت بینیووە.

عاتیکە وتی: لەخەودا بینیم سوارەیەك لەسەر وشتر هات و لەدۆڵی مەککە وەستا و هاواری کرد: ئەی خەڵکی بەردەلاّن، سێ ڕۆژی دیکە بۆ کوشتارگەکەی خۆتان بڕۆن. خەڵك لەدەروی کۆبوونەوە، ئەوسا ڕۆشتە ناو مزگەوتەکە و خەڵك بەدوایدا. لەم کاتەدا سوار لەسەر وشترەکەی خۆی لەسەرەوەی کەعبە دەرکەوت و هاواری کرد: ئەی خەڵکی بەردەلاّن، سێ ڕۆژی دیکە بۆ کوشتارگەکەی خۆتان بڕۆن. دواتر سوار لەسەر وشترەکەی لای ئەبو قەیس دەرکەوت و هاواری کرد و وتەکانی خۆی دووبارە کردەوە. دواتر بەردێکی هەڵگرت و تلی کردەوە. بەردەکە هات تا گەیشتە خوارەوەی کێوەکە و لەت و پەت بوو. چەند لەتێکی بەکەعبە گەیشت.

عەباس وتی: سوێندت دەدەم بەخوا ئەم خەوە بۆ کەس نەگێڕیتەوە و لای کەس باسی نەکەیت.

عەباس ڕۆشت و وەلید کوڕی عوتەبە کوڕی ڕەبیعەی هاوڕێی بینی و خەوەکەی عاتیکەی بۆ گێڕایەوە و پێی وت لای کەس باسی نەکات. وەلید خەوەکەی بۆ عوتەبەی باوکی گێڕایەوە و بەمشێوەیە لەناو خەڵکدا بڵاو بوویەوە و قوڕەیشییەکان باسیان دەکرد.

عەباس دەڵێت: بەرەبەیان بەدەوری کەعبەدا دەسووڕماوە. ئەبوجەهل لەگەڵ دەستەیەك لەقوڕەیشییەکان دانیشتبوون و باسی خەوەکەی عاتیکەیان دەکرد. کاتێك منی بینی، وتی: ئەی باوکی فەزڵ، کاتێك تەواو بوویت، وەرە بۆ لای ئێمە.

دەڵێت: کاتێك تەواو بووم، ڕۆشتمە لایان و دانیشتم.

ئەبوجەهل وتی: ئەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیب، ئەم پێغەمبەرە ژنە کەی لەناو ئێوەدا دەرکەوت.

وتم: مەبەستت چییە؟

وتی: ئەو خەوەی عاتیکە بینیویەتی.

وتم: چ خەوێکی بینیووە؟

وتی: ئەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیب ئەوە بەس نەبوو تەنیا پیاوەکانی ئێوە پێغەمبەری بکەن، ژنەکانیشتان بوونە پێغەمبەر! عاتیکە دەڵێت خەوێکی بینیووە کەکەسێك هاواری کردووە سێ ڕۆژی دیکە بۆ کوشتارگەکەی خۆتان بڕۆن، ئێمە سێ ڕۆژ چاوەڕێ دەبینین. ئەگەر ئەوەی عاتیکە باسی دەکات، ڕاست بێت، ڕوودەدات و ئەگەر دوای ئەو سێ ڕۆژە هیچ ڕوونەدات، نامەیەك دەنووسم کەئێوە درۆزنترین بنەماڵەی عەرەبن.

عەباس دەڵێت: سوێند بەخوا قسەی زۆرم کرد و حاشام کرد و وتم عاتیکەی خەوی بەوشێوەی نەبینیووە. دوای ئەوە بڵاو بووینەوە و شەوانە هەموو ژنەکانی بنەماڵەی عەبدولموتەلیب هاتنە لای من و وتیان: ڕێگەتان بەم پیاوە خراپەکارەدا سەرکۆنەی پیاوەکانی ئێوە بکات و ئێستا سەرکۆنە و قسەی ناشیرین بەژنەکانتان دەڵێت، تۆ بیستت و هیچت نەکرد.

عەباس دەڵێت: سوێند بەخوا ئێوە ڕاست دەکەن و هیچم نەوت، بەڵام جارێکی دیکە

دەڕۆمە لای و ئەگەر وتەکانی دووبارە کردەوە، سزای دەدەم.

دەڵێت: بەرەبەیانی ڕۆژی سێیەمی خەوەکەی عاتیکە، تووڕە بووم و گومانم دەکرد دەرفەتێکم لەدەستداوە و دەمویست بەدەستی بێنمەوە. بەرەو مزگەوت بەرێکەوتم و ئەبوجەهلم بینی. بەرەو لای ڕۆشتم تا شتێك لەو بارەوە باس بکات و وەڵامی بدەمەوە. ئەو پیاوێکی دەمپیس و چاوحیز بوو. بینیم بەپەلە بەرەو دەرگای مزگەوتەکە ڕۆشت. بەخۆمم وت: ئەو مەلعوونە لەترسی نەبیستنی قسەکانی من، بەپەلە دەڕواتە ناو مزگەوتەکە.

دەڵێت: ئەو، دەنگی زەمزەمی غەفاری بیستبوو بەڵام من نا. لەناو دۆڵەکەدا لەسەر وشترەکەی خۆی وەستابوو، لووتی وشترەکەی بڕیبوو، کراسەکەی خۆی دڕاندبوو و هاواری دەکرد: مەترسی، مەترسی، کاڵا و سامانی ئێوە کەلەدەستی ئەبوسوفیاندایە، لەلایەن محەممەد و هاوەڵانی مەترسی لەسەرە و دەترسم ئەگەر پێیان نەگەن. فریاکەون، فریا کەون.

دەڵێت: من سەرقاڵی ڕووداوەکە بووم و ئەو سەرقاڵی من بوو، خەڵك بەخێرایی دەهاتن و دەیانوت: مەگەر محەممەد و هاوەڵانی گومان دەکەن ئەمەیش کاروانەکەی کوڕی حەزرەمییە، هەرگیز، خوا دەزانێت کەوانییە. هەرکەس نەیدەتوانی بۆ شەڕ بڕوات کەسێکی لەجێگەی خۆی دەنارد. هەموو قوڕەیشییەکان ڕۆشتن. سەرکردەکانیش کەسیان نەمایەوە جگە لەئەبو لەهەب کوڕی عەبدولموتەلیب کە عاس کوڕی هوشام کوڕی موغەیرەی لەجیاتی خۆی نارد چوونکە کوڕی هوشام چوار هەزار دیناری قەرزار بوو و عاس دارایی خۆی لەدەستدابوو. ئەوی بەکرێ گرت تا قەرزەکەی بداتەوە. عاس لەجیاتی ئەو ڕۆشت و ئەبولەهەب مایەوە.

عەبدوالله کوڕی ئەبی نەجیح دەڵێت: ئومەییە کوڕی خەلەف کەپیرێکی بەڕێز بوو، دەیویست بمێنێتەوە. کاتێك لەمزگەوت لەناو خەڵکان دانیشتبوو، عوقەبە کوڕی ئەبی موعیت بەئاتەشدانێك کەئاگر و بۆنی خۆشی تیا بوو، ڕۆشت و ئاتەشدانەکەی لەبەردەم ئەودا دانا، وتی: ئەی باوکی عەلی، بخور بسووتێنە چوونکە تۆ لەڕیزی ژناندایت.

ئومەییە وتی: خوا قێزەونت بکات چوونکە شتێکی قێزەونت هێنا.

دەڵێت: ئومەییە خۆی ئامادە کرد و لەگەڵ خەڵکان بەرێکەوت.

کاتێك قوڕەیشییەکان ئامادە بوون و دەیانویست بەرێبکەون، شەڕی نێوان خۆیان و مناڵەکانی بەکر کوڕی عەبدمانتیان بیر کەوتەوە و وتیان: دەترسین لەپشتەوە هێرشمان

بکەنەسەر.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەم کاتەدا ئیبلیس لەروخساری سوراقە کوڕی جوعشەمی مودەلیجی لەگەورەکانی کەنانە ، دەرکەوت و وتی: دڵنیابن لەلایەن کەنانەوە زیان بەئێوە ناگات. قورەیشییەکان بەپەلە بەرێکەوتن.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) رۆژی سێیەمی مانگی رەمەزان، لەگەڵ سێسەد و دە و چەند پیاوێك لەهاوەڵانی خۆی بەرێکەوت. لەژمارەی زیاتر لەدە بیروراکان جیاوازن. دەستەیەك دەڵێن: سێسەد و سیانزە کەس بوون.

بەراء دەڵێت: هەمیشە دەمانوت ژمارەی ئەسحابەکانی بەدر بەئەندازەی ژمارەی ئەسحابەکانی تالووت یانی سێسەد و سیانزە کەس بوون کە لەرووبار پەڕینەوە.

لەکوڕی عەباس دەگێڕنەوە: لەرۆژی بەدر موهاجیرەکان حەفتاو حەوت کەس بوون و ئەنسارییەکان دووسەد و سی و شەش کەس. ئالآداری پێغەمبەر(د.خ) عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئالآداری ئەنسارییەکان سەعد کوڕی عوبادە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: بەدرییەکان سێسەد و چواردە کەس بوون کە لەشەڕەکە ئامادە بوون یا تالآنییان بەرکەوت. دەستەیەکی دیکە وتوویانە سێسەد و هەژدە کەس بوون بەلآم زۆرینەی رابردووان وتوویانە ژمارەیان سێسەد و دە و چەند کەسێك بوو.

لەسەدی دەگێڕنەوە: تالووت لەگەڵ سێسەد و چەند کەس لەرووبار پەڕییەوە، بەئەندازەی ژمارەی شەڕکەرانی بەدر.

هەروەها لەقتادە دەگێڕنەوە: لەرۆژی بەدر سێسەد و دە و چەند کەس هاورێیەتی پێغەمبەریان دەکرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: چەند رۆژ لەرەمەزان بەسەر چبوو کەپێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەسحابەکانی خۆی بەرێکەوت و قەیس کوڕی ئەبی سەعسەعە برای مازن کوڕی نەجاڕی وەك فەرماندەی دواوەی سوپاکەی دەستینشان کرد. کاتێك لەسەفراء نزیك کەوتەوە، بەسبەس کوڕی عەمرۆ جوهەنی و عودەی کوڕی ئەبی زەغبای جوهەنی بۆ بەدەستهێنانی دەنگ و باسەکانی کاروانەکەی ئەبوسوفیان بۆ بەدر نارد. دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت. ئەوانی لەپێشەوە رەوانە کردبوو و کاتێك گەیشتە سەفراء کەگوندێکە لەنێوان دوو کێوە. سەبارەت بەناوی دوو کێوەکە پرسیاری کرد، وتیان: یەکیان مەسلەحە و ئەوی دیکەیان مەخری، سەبارەت بەخەڵکی گوندەکە پرسی، وتیان:

منالەکانی نار و منالەکانی حەراق کەدوو تیرە لەهۆزی غەفارن، پێغەمبەر(د.خ) دوو کێوەکە و تێپەڕین لەناو ئەوانی پەسەند نەکرد، بەشێوەیەکی خراپ لێکدانەوەی بۆ ناوی دوو کێوەکە و خەڵکەکە کرد. دوو کێوەکە و سەفرای لای چەپی خۆی بەجێهێشت و لەلای راست بەرەو ناوچەی زەفران بەرێکەوت. کاتێك لەوێ دەرۆشتەدەر، ئاگادار بوویەوە قورەیشییەکان بۆ پارێزگاری لەکاروانەکەی خۆیان بەرێکەوتون. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆی راوێژی کرد و لەهاتنی قورەیشییەکان ئاگاداری کردنەوە. ئەبوبەکر هەستا و قسەی کرد و بەشێوەیەکی پەسەندکراو ئاخاوت. دوای ئەو، عومەر کوڕی خەتاب هەستا و بەشێوەیەکی جوان قسەی کرد. میقداد کوڕی عەمرۆ هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەوەی خواوەند فەرمانی پێدەدات، ئەنجامی بدە چوونکە ئێمە لەگەڵ تۆین و هاوشێوەی منالەکانی ئیسرائیل کە بەمووسایان وت، ناپەیڤین. چوونکە ئەوان بەموسایان وت برۆ لەگەڵ خواکەت شەڕیان لەگەڵ بکە و ئێمە لێرە دانیشتووین. ئێمە دەڵێین هاورێ لەگەڵ خواکەت شەڕ بکە و ئێمەیش هاورێ لەگەڵ ئێوە شەڕ دەکەین. سوێند بەو خوایەی تۆی بەراستی ڕەوانە کردووە، ئەگەر تا بەرك الغماد، یانی حەبەشە، بمانبەیت، شەڕیان لەگەڵ دەکەین تا سەرکەوتن بەدەست بێنیت.

پێغەمبەر(د.خ) وتارەکەی پەسەند و دوعای خێری بۆ کرد.

عەبدوالله کوڕی مەسعود دەڵێت: میقدادم لەباروودۆخێکدا بینی حەزم دەکرد لەجیاتی ئەو بم. پیاوێکی بوێر بوو. سەرکوڵمی پێغەمبەر(د.خ) لەتووڕەییدا سوور ببوویەوە کەمیقداد هاتە پێش و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، دڵخۆش بە چوونکە ئێمە وتەی منالەکانی ئیسرائیل دووبارە ناکەینەوە کەبەموسایان وت برۆ لەگەڵ خواکەت شەڕ بکە و ئێمە لێرە دادەنیشین، بەڵکو سوێند بەو خوایەی تۆی بەراستی ناردووە، لەبەردەم و لەپشت سەر و لەراست و چەپی تۆدا دەبین تا سەرکەوتن بەدەست بێنیت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بۆچوونی خۆتان باس بکەن. مەبەستی ئەنسارییەکان بوو. لەبەر ئەوەی زۆرینە بوون و هەم لەبەر ئەوەی کاتێك لەعەقەبە بەیعەتیان لەگەڵ بەست، وتبوویان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە ناتوانین بتپارێزین تا دەگەیتە لای ئێمە و کاتێك گەشتیت لەپەنای ئێمەدایت و هاوشێوەی هاوسەر و منالەکانی خۆمان دەتپارێزین.

پێغەمبەر(د.خ) دەترسا ئەنسارییەکان هاوکاری کردنی ئەو تەنیا لەکاتێکدا

بەپێویست بزانن کەدوژمنەکانی هێرش بکەنە سەر مەدینە و پێغەمبەر(د.خ) نابێت ئەوان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ دوژمنەکانی ببات.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەمە وتەی هێنایە سەرزمان، سەعد کوڕی مەعاز وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، گومان دەکەم مەبەستت ئێمە بێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

سەعد وتی: ئێمە باوەڕمان بەتۆ هێنا و وتەکانی تۆمان پشتڕاست کردەوە و شایەتوومانمان هێنایە سەرزمان. دڵنیابووین کەدینەکەی تۆ راستە و بەڵێنماندا شوێنکەوتەی تۆ بین. ئێستا بۆ کوێ دەخوازیت برۆ. سوێند بەو خوایەی بەراستی تۆی ڕەوانە کردووە، ئەگەر بەرەو دەریامان ببەیت و بڕۆیتە ناو دەریا، بەدوای تۆدا دێین و کەس لەئێمە ناگەڕێتەوە. لەڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن ترسمان نییە و لەکاتی شەڕ خۆڕاگر و لەکاتی رووبەروو بوونەوە راست کردارین. ئەگەری هەیە لەکردەوەکانی ئێمە رازی ببیت، بەفەرمانی خواوەند، بۆ پێشەوەمان ببە.

پێغەمبەر(د.خ) لەوتەکانی سەعد رازی و هێزی وەرگرت. فەرمووی: بەبەرەکەتی خواوەند بەرێکەون چوونکە خواوەند بەڵێنی یەکێك لەم دوو دەستەی بەمن داوە، وەك دەڵێی لەئێستاوە کوشتارگەی ئەوان دەبینم.

پێغەمبەر(د.خ) لەزەفرانەوە بەرێکەوت و ڕۆشت تا لەنزیك بەدر دابەزی. لەگەڵ یەکێك لەهاوەڵانی خۆی سەرکەوت و لای یەکێك لەپیرەکانی عەرەب وەستا و پرسیاری کرد کەسەبارەت بە محەممەد و هاوەڵانی و قورەیشییەکان چی بیستووە؟

پیر وتی: تا نەڵێن لەکوێوە دێن، وەڵام نادەمەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتێك بەئێمەت وت، ئێمەیش پێت دەڵێین.

پیر وتی: بیستوومە محەممەد و هاوەڵانی لەفلان رۆژ بەرێکەوتوون و ئەگەر ئەم هەواڵە راست بێت، هەنووکە لەفلان شوێنن، ئەو شوێنەی پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی لەوێ دابەزیبوون، ناوی برد. هەروەها بیستوومە قورەیشییەکان دوو رۆژە بەرێکەوتوون و ئەگەر ئەم هەواڵە ڕاست بێت، هەنووکە لەفلان شوێنن. شوێنی قورەیشییەکانی ناو برد. کاتێك کۆتایی بەقسەکانی هێنا، وتی ئێوە کێن؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئێمە لەئاوین و ڕۆشت. پیر دەپرسی: کام ئاوە، ئاوی عێراق؟

پێغەمبەر(د.خ) بۆ لای ئەسحابەکان گەڕایەوە و شەوانە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و زوبەیر کوڕی عەوام و سەعد کوڕی ئەبی وەقاسی لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانی خۆی بۆ دۆزینەوەی چالاوی بەدر ڕەوانە کرد. وەك لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق ئامارەی پێدراوە، ئاوهەڵگرەکانی قوڕەیشییان بینی کەئەسلەم، کۆیلەی حەجاج و عەریزی ئەبو یەسار، کۆیلەی منالەکانی عاس لەناویاندا بوون. هەردووکیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) نوێژی دەخوێند. ئەوان پرسیاریان لەکۆیلەکان دەکرد و کۆیلەکان دەیانوت: ئێمە ئاوهەڵگرەکانی قوڕەیشین. ئێمەیان ناردووە ئاویان بۆ بەرین.

ئەسحابەکان لەهاتنی قوڕەیشییەکان ئاگادار نەبوون و هیوایان دەخواست کۆیلەی کاروانەکەی ئەبوسوفیان بن. لێیاندان تا وتیان: ئێمە لەکاروانی ئەبوسوفیانین. ئەوسا دەستیان لێهەڵگرتن..

پێغەمبەر(د.خ) رکوع و دوو سوجدەی برد، سلاوی دایەوە و فەرمووی: کاتێك راستی دەهێننە سەرزمان، لێیان دەدەن و کاتێك درۆ دەکەن، دەستیان لێ هەڵدەگرن. سوێند بەخوا ئەوان لەقوڕەیشن.

دواتر فەرمووی: پێم بڵێن قوڕەیشییەکان لەکوێن؟

دوو کۆیلەکە وەلامیان دایەوە: لەپشت ئەم تەپۆڵکەوەن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چەند کەسن؟

وتیان: زۆرن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ژمارەیان چەندە؟

وتیان: نازانین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: رۆژانە چەند وشتر سەر دەبڕن؟

وتیان: رۆژێك نۆ وشتر و رۆژێك دە وشتر.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەنێوان نۆسەد بۆ هەزار کەس دەبن.

دواتر پرسی: لەگەورەکانی قوڕەیش کێ هاورێیەتیان دەکات؟

وتیان: عوتبە کوڕی رەبیعە و شەیبە کوڕی رەبیعە و باوکی بەختەری کوڕی هوشام و حەکیم کوڕی حەزام و نەوفل کوڕی خوەیلد و حارس کوڕی عامر کوڕی نەوفل و توعەیمە کوڕی عودەی و نەزر کوڕی حارس کوڕی کەلدە و زەمعە کوڕی ئەسوەد و ئەبوجەهل کوڕی هوشام و ئومەییە کوڕی خەلەف و نەبیە و مونبە کوڕانی حەجاج و سوهەیل کوڕی عەمرۆ و عومەر کوڕی عەبدود.

پێغەمبەر(د.خ) رووی کردە ئەسحابەکان و فەرمووی: مەککە، لەتە جەرگەکانی خۆی بۆ ئێوە هاویشتووە.

دەڵێن: بەسبەس کوڕی عەمرۆ و عودی کوڕی ئەبی زەغبا ڕۆشتن تا لەبەدر دابەزین. وشترەکانی خۆیان لەنزیك تەپۆڵکەیەك لای ئاوەکە خەواند. سەتڵێکیان هەڵگرت تا ئاو هەڵبکێشن. مەجدی کوڕی عەمرۆ جوهەنی لای ئاوەکە دانیشتبوو. عودەی و بەسبەس بیستیان کەکەنیزێك لای ئاوەکە داوای قەرزەکەی لەکەنیزێکی دیکە دەکرد. کەنیزە قەرزارەکە دەیوت: بەیانی یا دووبەیانی کاروانەکە دەگات و من کاریان بۆ دەکەم تا قەرزەکەی تۆ بدەمەوە. مەجدی وتی: راست دەکەیت. ئەوانی لەیەك جیا کردەوە.

کاتێك عودەی و بەسبەس ئەم وتانەیان بیست، سوار وشترەکانی خۆیان بون و ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و لەوەی بیستبوویان ئاگاداریان کردەوە.

ئەبوسوفیان بۆ دوورئەندێشی، پێش کاروانەکە هات تا گەیشتە قەراغ ئاوەکە و لەمەجدی کوڕی عەمرۆی پرسی: ئایا کەست نەبینیووە؟

وەڵامی دایەوە: کەسێك گومانی لێ بکەم، نا، بەڵام دوو سوارم بینی وشترەکانی خۆیان لای تەپۆڵکەکە خەواند، هاتن ئاویان هەڵگرت و ڕۆشتن.

ئوبوسوفیان ڕۆشتە شوێنی خەوتنی وشترەکان. پشکڵی وشترەکانی هەڵگرت و شکاندی و وتی: سوێند بەخوا لەکای یەسربیان خواردووە. بەخێرایی بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە و ڕێگەی کاروانەکەی گۆڕی و ڕێگەی کەناری گرتەبەر. بەدری لای چەپی خۆی بەجێهێشت و ڕۆشت تا لێی دوور کەوتەوە.

قورەیشییەکان هاتن و لەجوحەفە دابەزین. جوهەیم کوڕی سەڵت کوڕی مەخریمە کوڕی موتەلیب کوڕی عەبدمەناف خەوێکی بینی و وتی: لەنێوان خەو و بەئاگایی سوارکارێکم بینی، هات. وشترێکی پێبوو و بەردەوام دەیوت: عوتبە کوڕی ڕەبیعە و شەیبە کوڕی ڕەبیعە و باوکی حەکەم کوڕی هوشام و ئومەییە کوڕی خەلەف و فلاَن و فلاَن (ناوی ئەو کەسانەی برد کە لەڕۆژی بەدر کوژران) کوژراون. دواتر شمشێری لەملی وشترەکەی خۆیدا و ئەوی لەناو ئوردوەکە بەرەڵا کرد. خێوەتێك نەمایەوە خوێنی وشترەکەی پێنەگات.

دەڵێت: ئەم هەواڵە بەئەبوجەهل گەیشت و وتی: ئەمەیش پێغەمبەرێکی دیکەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیبە. بەڵام بەیانی کاتێك رووبەروو بووینەوە دەزانێت کێ

دەكوژرێت.

كاتێك ئەبوسوفیان زانی چیتر مەترسی لەسەر كاروانەكەی نەماوە، كەسی بۆ لای قورەیشییەكان نارد و وتی: ئێوە بۆ پارێزگاری كردن لەكاروان وپیاوەكانی خۆتان هاتوون، بگەڕێنەوە چوونكە خواوەند كاروانەكەی پاراست.

بەڵام ئەبوجەهل وتی: سوێند بەخوا ناگەڕێینەوە تا دەگەینە بەدر و بۆ ماوەی سێ رۆژ لەوێ دەمێنینەوە و وشتر دەكوژین و خواردن دەخۆین و شەراب دەخۆینەوە. كەنیزەكان دەبێت دەف بژەنن و عەرەبەكان ببیستن و هەست بەگەورەیی و هێزی ئێمە بكەن. بڕۆین. بەدر ناو چەیەك بوو عەرەبەكان ساڵانە لەوێ بازارێكیان دروست دەكرد.

ئەخنەس كوڕی شەریق هاوپەیمانی مناڵەكانی زوهرە لەجوحفە پێی وتن: ئەی مناڵەكانی زوهرە، خواوەند سامان و كاڵاكانی ئێوەی پاراست و هاورێكەی ئێوە، مەخریمە كوڕی نەوفل رزگاری بوو، ئێوە هاتبوون تا پارێزگاری لەخۆی و سامانەكەی بكەن، گوناحی ئەم ترسە بەئەستۆی من وبگەڕێنە و گوێ لەوتەكانی ئەبوجەهل مەگرن.

مناڵەكانی زوهری گەڕانەوە و كەسیان بەشداری شەڕی بەدری نەكرد چوونكە گوێڕایەڵی وتەكانی ئەخنەس بوون. لەهەموو تیرەكانی قورەیش كەسانێك بۆ بەدر هاتبوون جگە لەمناڵەكانی عودەی كوڕی كەعب كەكەسیان بەشداری نەكرد. مناڵەكانی زوهرە لەگەڵ ئەخنەس كوڕی شەریق گەڕانەوە و لەبەر ئەمە كەس لەو هۆزە بەشداری شەڕی بەدری نەكرد.

قورەیشییەكان بەرێكەوتن. لەنێوان تالیب كوڕی ئەبی تالب و دەستەیەك لەقورەیشییەكان دەمەبۆڵەیەك دروست بوو، وتیان: سوێند بەخوا ئەی مناڵەكانی هاشم، هەرچەند لەگەڵ ئێمەدا هاتوون بەڵام دەزانین، دڵتان لای محەممەدە. تالیب بەرەو مەككە گەڕایەوە.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: بەوتەی كوڕی كەلبی تالیب كوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ ناباوەران هاتەبەدر بەڵام نابەدڵخواز هات. ئەویان لەناو كوژراوان یا ئەسیرەكاندا نەبینی و بۆ لای كەسەكانی خۆیشی نەگەڕایەوە.

كوڕی ئیسحاق دەڵێت: قورەیشییەكان ڕۆشتن تا لەنزیك بەدر دابەزین. خواوەند بارانێكی نارد و زەوی تەڕ بوو. پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی لەڕۆشتن دوانەكەوتن بەڵام شوێنی قورەیشییەكان بەشێوەیەك بوو بەقوڕ و لیتە رێگەی ڕۆشتنی لێگرتن.

بەمشێوەیە پێغەمبەر(د.خ) زووتر لەوان گەیشتە ئاوەکە و لەسەر لێواری گەورەترین چاڵی بەدر دابەزی.

دەڵێت: حوباب کوڕی مونزەر کوڕی جەموح وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، خواوەند فەرمانی پێداویت لەم شوێنە دابەزیت و نابێت بۆ پێشەوە و دواوە بڕۆیت یا ئەوەی بۆچوونە و فرت و فێڵ.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆچوونەو فرت و فێڵ.

حوباب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، نابێت لێرەدا بمێنینەوە، خەڵك ببەسەر ئەو چاڵاوەی لەقوڕەیشییەکانەوە نزیکە. پێیان بڵێ چاڵاوەکانی دیکە کوێر بکەنەوە و لای چاڵاوەکەی خۆیان، حەوزێك دروست بکەن و لێوانلێوی بکەن لەئاو. شەڕیان لەگەڵ دەکەین لەکاتێکدا ئێمە ئاومان هەیە و ئەوان نییانە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆچوونی ڕاست ئەوەیە. لەگەڵ ئەسحابەکانی ڕۆشت تا گەیشتنە چاڵاوەکەی نزیك قوڕەیشییەکان. لەوێ دابەزی و فەرمانی کوێر کردن و پڕکردنەوەی چاڵاوەکانیدا. حەوزێکیان بەدەوری چاڵاوەکەی خۆیان دروست کرد.

دەڵێت: سەعد کوڕی مەعاز وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سایەوانێك لەلق و گەڵای دارەکان بۆ تۆ دروست دەکەین تا لەوێ بمێنیتەوە و چوارپێکانی تۆ ئامادە بن. ئێمە ڕووبەرووی دوژمن دەبینەوە، ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین و سەرکەوتین، بەمەبەستی خۆمان گەیشتووین و ئەگەر پێچەوانەکەی ڕوویدا، سوار چوارپێکەت دەبیت و دەگەڕێیتەوە بۆ لای خەڵکەکەی ئێمە لەمەدینە چوونکە کەسانێکی زۆر لەمەدینەن کەهاوشێوەی ئێمە تۆیان خۆش دەوێت و ئەگەر گومانی شەڕیان بکردایە، بەدڵنیاییەوە دەهاتن. ئەوان پشتیوانیت لێدەکەن و چاکەخوازی تۆدەبن و هاوڕێ لەگەڵ تۆ لەڕێگەی خوادا جیهاد دەکەن. پێغەمبەر(د.خ) سپاس و دۆعای خێری بۆ کرد.

سایەوانێکیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) ئامادە و لەوێ حەسایەوە.

بەرەبەیان قوڕەیشییەکان بەرێکەوتن و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بینی کە لەلای تەپۆڵکەکەوە دەهاتن، فەرمووی:خواوەندا، قوڕەیشییەکان بەشانازی و غرووری خۆیانەوە هاتوون دوژمنایەتی تۆ بکەن و پێغەمبەرەکەت بەدرۆ بخەنەوە، خواوەندا، سەرکەوتنمان پێببەخشە، خواوەندا، سزایان بدە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) عوتەبە کوڕی ڕەبیعەی لەناو قوڕەیشییەکاندا بینی کەسوار

وشترێکی موو سوور بوو، فەرمووی: ئەگەر خێر لەناو ئەواندا هەبێت، لای خاوەنی ئەو وشترە سوورەیە، ئەگەر گوێڕایەڵی وتەکانی بن، ڕێگەی ڕاستیان گرتۆتەبەر.

خەفاف کوڕی ئەیما غەفاری لەگەڵ باوکی ئەیماء، کاتێك قورەیشییەکان لەنزیك ئەوانەوە تێپەڕین، کوڕەکەی خۆی لەگەڵ چەند وشترێك نارد و وشترەکانی پێشکەش بەوان کرد و و تی: ئەگەر دەتانەوێت بەپیاوی شەڕکەر هاوکاریتان دەکەم. قورەیشییەکان لەوەڵامدا وتیان: ئەگەر لەگەڵ خزمان چاکە بکەیت، ئەرکی سەرشانی خۆت بەجێهێناوە چوونکە ئەگەر مەبەستی شەڕکردنمان لەگەڵ خەڵکان هەبێت، سوێند بەخوا ناتەوان نین بەڵام ئەگەر بەو شێوە بێت کە محەممەد دەڵێت لەگەڵ خوادا شەڕدەکەن، کەس ناتوانێت لەبەرابەر خواوەند، خۆڕاگری بکات.

کاتێك دابەزین، دەستەیەك لەقورەیشییەکان لەحەوزەکەی پێغەمبەر(د.خ) نزیك کەوتنەوە، فەرمووی: ڕێگەیان بدەن ئاو ببەن. هەرکەس لەوان لەو ڕۆژەدا ئاوی خواردەوە، کوژرا جگە لەحەکیم کوڕی حەزام کەنەکوژرا و سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی گیانی رزگاری کرد. دواتر باوەڕی هێنا و کاتێك دەیویست سوێندێکی گەورە بخوات، دەیوت: سوێند بەو کەسەی لەرۆژی بەدر منی رزگار کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك قورەیشییەکان ریزیان بەست و جێگیر بوون، عومەیرە کوڕی وەهبی جومەحییان نارد و وتیان: بزانە هاوەڵانی محەممەد چەند کەسن؟ ئەو بەئەسپەکەی خۆی بەدەوری ئوردوی موسوڵمانانـدا سووڕایەوە و گەڕایەوە و وتی: سێسەد کەسن، کەمێك زیاتر یا کەمتر، بەڵام نازانم ئایا بۆسەیان ناوەتەوە یا پشتیوانیان لەگەڵدایە.

دەڵێت: دوورتر ڕۆشت بەڵام هیچی نەبینی و گەڕایەوە و وتی: هیچم نەبینی جگە لەکەسانێك کەتەنیا پاڵپشتیان شمشێرەکانیانە، کەس لەوان ناکوژرێت مەگەر ئەوەی کەسێك لەئێوە بکوژێت، ئەگەر بەژمارەی خۆیان لەئێوە بکوژن، چیتر ژیان سوودی نییە، لەکار و کردەوەی خۆتان ورد ببنەوە.

حەکیم کوڕی حەزام کاتێك ئەم وتەی بیست بەرێکەوت و ڕۆشتە لای عوتەبە کوڕی رەبیعە و وتی: ئەی باوکی وەلید، هەنووکە تۆ سالاری قورەیشیت وگوێڕایەڵی تۆن، کارێك بکە تا کۆتایی رۆژگار بەچاکە ناوت ببەن.

عوتەبە وتی: چی بکەم.

حەکیم کوڕی حەزام وتی: خەڵکان بگەڕێنەرەوە و خوێنبایی حەکیم کوڕی عەمرۆ

حەزرەمی لەئەستۆ بگرە.

عوتەبە وتی: ئەو کارە دەکەم و تۆ شایەت بە، ئەو هاوپەیمانی من و زیان و داراییەکانی لەئەستۆی مندایە، برۆ بۆ لای کوڕی حەنزەلییە چوونکە کەس جگە لەو دژایەتی ناکات. مەبەستی ئەبوجەهل بوو.

ڕۆشتمە لای ئەبوجەهل، دەستەیەك لەپشت و لەبەردەمی دانیشتبوون. براکەی کوڕی حەزەرمی کوژراو، لەسەر سەری وەستابوو و دەیوت: پەیمانی خۆم لەگەڵ مناڵەکانی شەمس بڕی و لەگەڵ منالەکانی مەخزوم پەیمانم بەست. بەئەبوجەهلم وت: عوتەبە کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: ئایا پیاوەکانی خۆت لەشەڕ کردن لەگەڵ کوڕە مامەکانت دوور دەخەیتەوە.

ئەبوجەهل وتی: کەسی جگە لەتۆ دەست نەکەوت بینێرێت؟

وتم: نە، منیش تەنیا دەبمە نێردراوی کەسێکی وەك ئەو.

دەڵێت: گەڕامەوە بۆ لای عوتەبە کوڕی ڕەبیعە تا بزانم دەنگ و باس چییە؟ عوتەبە پشتی بەئەیمە کوڕی روخسەی غەفاری دابوو. ئەو، دەوشتری وەك دیاری بەقوڕەیشییەکان بەخشیبوو. لەم کاتەدا ئەبوجەهل هات و نیشانەکانی شەڕ و تورە بوون بەروخسارییەوە دیار بوو، بەعوتەبەی وت: بەتەواوی ترساویت.

عوتەبە وتی: دەبینین.

ئەبوجەهل شمشێری دەرکێشا و لەئەسپەکەی خۆیدا و ئەیمە کوڕی روخسە وتی: کردەوەیەکی چاك نییە و شەر دەستی پێکرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عوتەبە کوڕی ڕەبیعە دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: ئەی خەڵکی قوڕەیش لەشەڕ و کوشتن لەگەڵ هاوەڵانی محەممەد چیتان دەستدەکەوێت، سوێند بەخوا ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنن، بەردەوام کەسێك سەیری یەکێکی دیکە دەکات و لەسەیر کردنی خۆی بێزارە چوونکە ئامۆزا یا پورزای یەکێك لەهۆزەکەی ئێوەی کوشتووە، بگەڕێنەوە و محەممەد وعەرەبەکان بەتەنیا جێبێڵن، ئەگەر لەناویان برد بەمەبەستی خۆتان گەیشتوون و ئەگەر پێچەوانەکەی ڕوویدا، ئێوە ڕووبەڕووی نەبوونەتەوە.

حەکیم کوڕی حەزام دەڵێت: ڕۆشتمە لای ئەبوجەهل و بینیم زرێیەکی لەکیسەیەکی چەرمین دەرهێناوە و دەیەوێت بیپۆشێت، پێم وت: ئەی باوکی حەکەم، عوتەبە منی

ناردووە و ئەمە پەیامەکەیەتی.

ئەبوجەهل وتی: سوێند بەخوا لەبینینی محەممەد وهاوەڵانی ئەو ترساوە، هەرگیز ناگەڕێینەوە تا خواوەند لەنێوان ئێمە و محەممەد داوەری بکات، عوتبە ئەم قسانە لەدڵەوە ناکات، بەڵکو محەممەد و هاوەڵانی ئەوی بینیووە کەوشتر دەخۆن و کوڕەکەیشی هاورێیەتی ئەوان دەکات، دەترسێت کوڕەکەی بکوژن.

ئەبوجەهل کەسی بۆ لای عامر کوڕی حەزرەمی نارد و پێی وت کاتی تۆڵەسەندنەوەی تۆ نزیکە بەلاّم هاوپەیمانە کەی تۆ دەخوازێت خەڵکان بگەڕێنێتەوە، هەستە و کوژرانی براکەتییان بیر بێنەرەوە.

عامر کوڕی حەزرەمی هەستا و خۆی رووت کردەوە و هاواری کرد: ئەی هاوار لەعەمرۆی من، هاوار عەمرۆی برام، ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و ئاشتی لەئارادا نەما و بۆچوونە خێرەکەی عوتبە بەفیڕۆ چوو.

کاتێك عوتبە کوڕی رەبیعە بیستی ئەبوجەهڵ دەڵێت، عوتبە ترساوە، وتی: ئەو کەسەی جێگەکەی خۆی زەرد کردووە دەزانێت کێ ترساوە، ئەو یا من. داوای خودەیەکی کرد بەئەندازەی سەری بێت، بەلاّم لەسوپاکەی خودەیەك بۆ سەری ئەو دەستنەکەوت چوونکە سەری گەورە بوو، لەبەر ئەمە خاولییەکی بەسەرییەوە بەست.

ئەسوەد کوڕی عەبدئەسوەدی مەخزومی کەپیاوێکی شەڕئەنگێز و کردار پیس بوو، ڕۆشت و وتی: پەیمان لەگەڵ خوا دەبەستم لەحەوزەکەیان ئاو بخۆمەوە و وێرانی بکەم یا دەکوژرێم. حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب رووبەرووی بوویەوە و لەنزیك حەوزەکە گورزێکی لێدا و قاچی ئەوی تا قولاپەی بڕی، ئەو، کەوتە سەرپشت و خوێن لەقاچی دەچۆڕی. بەلاّم بەرەو حەوزەکە ڕۆشت و کەوتە ناو حەوزەکە بۆ ئەوەی پەیمانەکەی بەسەر بردبێت، حەمزە شوێنی کەوت و چەندین گورزی دیکەی لێدا و لەناو حەوزەکەدا کوشتی.

عوتبە کوڕی رەبیعە و براکەی شەیبە کوڕی رەبیعە و وەلید کوڕی عوتبە روویان لەگۆڕەپانی شەڕ کرد و کاتێك لەریزی قورەیشییەکان جیابوونەوە و داوای شەڕکەریان کرد، سیان لەگەنجەکانی ئەنسار بەناوەکانی عەوف و مەسعود کوڕەکانی حارس و عەبدوالله کوڕی رەواحە رووبەروویان بوونەوە. عوتبە و هاوەڵانی پرسییان: ئێوە کێن؟

وتیان: لەئەنسارین.

وتیان: شەڕ لەگەڵ ئێوە ناکەین.

هاواریان کرد ئەی محەممەد خزمەکانی خۆمان رەوانە بکە و پێغەمبەر فەرمووی: حەمزە هەستە، عوبەیدە هەستە، عەلی هەستە.

کاتێك هەستان و لەعوتەبە نزیك کەوتنەوە، پرسییان: ئێوە کێن.

عوبەیدە و حەمزە و عەلی ناوی خۆیان وت: ئەوان وتیان: بەڵێ، ئێوە هاوشێوەی ئێمە بەڕێزن.

عوبەیدە لەهەموویان بەتەمەنتر بوو، رووبەرووی عوتەبە بوویەوە، حەمزە لەگەڵ شەیبە و عەلی لەگەڵ وەلید. زۆری نەخایاند حەمزە شەیبەی کوشت، عەلی وەلیدی کوشت بەڵام عوبەیدە و عوتەبە شمشێرێیان لەیەك دەدا، هێشتا نەکەوتبوون. حەمزە و عەلی بەشمشێر هێرشیان کردە سەر عوتەبە و خوێنیان ڕشت. عوبەیدەیان بردە لای پێغەمبەر، قاچی قرتا بوو، کاتێك گەیشتە لای پێغەمبەر، وتی: ئەی پێغەمبەر ئایا وەك شەهید حسێبم بۆ دەکرێت؟

پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ.

عوبەیدە وتی: ئەگەر ئەبوتالیب زیندوو دەبوو، دەیزانی، ئەم قسەیە مافی خۆمە کەبڵێم، بەدەوری محەممەد گیانیمان دەبەخشین و چاو لەژن و منداڵەکانمان دەپۆشین.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك گەنجە ئەنسارییەکان ناوونیشانی خۆیانیان وت، عوتەبە پێی وتن: ئێوە بەڕێزن بەڵام دەخوازین شەڕکەران لەخەڵکەکەی خۆمان ڕووبەرووومان ببنەوە.

دوای ئەوەی خەڵکان هاتنە پێش و لەیەك نزیك کەوتنەوە، پێغەمبەر فەرمانی دابوو هێرش نەبەن تا کاتێك خۆی فەرمان دەدات و ئەگەر دوژمن لێیان نزیك کەوتەوە، تیربارانیان بکەن. لەوکاتەدا پێغەمبەر لەناو سایەوانەکەی دانیشتبوو و ئەبوبەکر هاوڕێیەتی دەکرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: شەڕی بەدر لەڕۆژی هەینی، حەڤدەی مانگی رەمەزان روویدا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەڕۆژی شەڕی بەدر پێغەمبەر شەڕکەرانی خۆی ریز کرد. تیرێکی بەدەستەوە بوو کەسەکانی پێ بەرابەر دەکرد و کاتێك گەیشتە لای سواد کوڕی غەزییە کە لەریزەکە ڕۆشتبوویەدەر، بەتیرەکە کێشای بەسکی ئەودا و فەرمووی: سواد لەناو ریزەکەدا بێستە.

سواد وتی: ئەی پێغەمبەر، ئازارم پێگەیشت، خواوەند تۆی بەراستی ناردووە و

دەبێت قەرەبوو بکەمەوە.

دەڵێت: پێغەمبەر سکی خۆی خستە بەردەستی و فەرمووی: قەرەبووی خۆت بکەرەوە.

سواد سکی پێغەمبەری گرت و ماچی کرد.

پێغەمبەر فەرمووی: بۆ ئەم کارەت کرد.

سواد وتی: ئەی پێغەمبەر، شەڕ لەئارادایە و ئەگەری هەیە بکوژرێم. ویستم لەم دوایین ساتانەدا پێستم بەر پێستی تۆ کەوتبێت.

پێغەمبەر دوّعای خێری بۆ کرد.

دوای ئەوەی پێغەمبەر ریزەکانی رێکخست، بۆ ناو سایەوانەکەی گەڕایەوە و ئەبوبەکری لەگەڵ خۆیدا برد. کەس جگە لەئەبوبەکر لەگەڵ پێغەمبەردا نەبوو. پێغەمبەر دەپاڕایەوە و داوای سەرکەوتنی لەخواوەند دەکرد و دەیفەرموو: خواوەندا، ئەگەر ئەم خەڵکان لەناو بچن، چیتر لەسەر زەوی کەس تۆ ناپەرەستێت.

ئەبوبەکر دەیوت: ئەی پێغەمبەر، دوّعا بەسە چوونکە خواوەند بەڵێنەکەی خۆی دەهێنێتەدی.

عومەر کوڕی خەتاب دەڵێت: لەرۆژی بەدر کاتێك پێغەمبەر ژمارەی ناباوەڕانی بینی و هاوەڵانی خۆی سێسەد و چەند کەس بوون، رووی کردە قیبلە و دەستی بەپاڕانەوە کرد و دەیفەرموو: خواوەندا، بەڵێنەکەی خۆت بێنەدی، خواوەندا ئەگەر ئەم دەستەیە لەناو بچن، چیتر کەس لەسەر زەوی تۆ ناپەرەستێت. بەردەوام دەپاڕایەوە تا ئەوەی عاباکەی کەوتەخوار. ئەبوبەکر عاباکەی خستە سەرشانی و لەپشت سەرییەوە وەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر، دایك و باوکم بەقوربانت بێت، دوّعا کردن بەسە چوونکە خواوەند بەڵێنەکەی خۆی دەهێنێتەدی. خواوەند ئەم ئایەی ناردەخوار:

((اذ تستغیثون ربکم فاستجاب لکم انی ممد کم بالف من الملائکة مردفین.

واتاکەی: ئەو کاتەی داوای هاوکاریتان لەپەروەردگاری خۆتان دەکرد و پەروەردگار دوّعاکەی ئێوە دەهێنێتەدی و بەهەزار فریشتەی ریزبەستوو، هاوکاریتان دەکات.))

کوڕی عەباس دەڵێت: لەرۆژی شەڕی بەدر پێغەمبەر لەناو خێوەتەکەی خۆیدا بوو و دەیفەرموو: خواوەندا، بەڵێنەکەی خۆت بێنەدی، خواوەندا، ئەگەر ئەم شەڕکەرانە لەناو بچن، کەس لەسەر زەوی تۆ ناپەرەستێت. ئەبوبەکر دەستی گرت و وتی: ئەی پێغەمبەر بەسە چوونکە زۆر پێداگریت لەگەڵ خواوەند کرد. پێغەمبەر زرێی لەبەردا بوو، هاتەدەر

و ئەم ئایانەی خوێندەوە:

((سیهزم الجمع و یولون الدبر، بل الساعة موعدهم و الساعة ادهی و امر.

واتاکەی: بەم زوانە ئەم دەستەیە شکست دەخوات و پشت دەکەنە شەڕ، بەڵکو شوێنی دیاریکراوی ئەوان رۆژی هەستانەوەیە و رۆژی پەسڵان تاڵتر و سەختترە.))

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر لەناو سایەوانەکەدا بوو، بۆ ساتێك خەو ئەوی بردەوە، دواتر چاوی کردەوە و فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر، هاوکاری خواوەند گەیشت، ئەوە جبرەئیل بوو هەوساری ئەسپەکەی خۆی بەدەست رادەکێشا و قاچەکانی تەپ و تۆزاوی بوو.

دەڵێت: تیرێك بەر موهەجیع کۆیلەی عومەر کوڕی خەتاب کەوت و کوژرا. ئەمە یەکەم کوژراوی موسوڵمانان بوو. دوای ئەوە حارسە کوڕی سوراقە تیرێکی هاویشت و یەکێك لەمناڵەکانی عودەی کوڕی نەجاری کوشت کە لەحەوزەکە ئاوی دەخواردەوە. پێغەمبەر هات و هاوەڵانی خۆی بۆ شەڕ هاندا و فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، هەرکەس ئەمڕۆ بۆ رەزامەندی خواوەند پێداگری بکات و پشت نەکاتە گۆڕەپانی شەڕ و بکوژرێت، دەرواتە بەهەشت. عومەیر کوڕی حەمام کەمشتێك خورمای بەدەستەوە بوو و دەیخوارد، وتی: بە! بە! بۆ ئەوەی بڕۆمە بەهەشت دەبێت ئەمانە بمکوژن. خورماکەی فڕێدا و شمشێری هەڵگرت و شەڕی کرد تا کوژرا. ئەو، هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە دەخوێندەوە:

((بەرەو لای خواوەند بڕۆن

چوونکە هیچ توێشوویەکتان جگە لەچاکەکاری و کردەوەی ئاخیرەت

و پێداگری لەجیهاد

پێویست نییە.

هەر توێشوویەك جگە لەچاکەکاری و خواپەرەستی، رووبەرووی

لەناوچوون دەبێتەوە.))

قتادە دەڵێت: عەوف کوڕی حارس لە پێغەمبەری پرسی: چ شتێك خواوەند لەبەندەکەی رازی دەکات؟

پێغەمبەر فەرمووی: ئەوەی کەسێکی بێ زرێ، دەستی بەخوێنی دوژمن سوور بکات.

عەوف زرێکەی دەرهێنا و فڕیدا. شمشێری هەڵگرت و شەڕی کرد تا کوژرا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك هەر دوو دەستەکە رووبەرووی یەکبوونەوە، ئەبوجەهل وتی: خواوەندا، هەرکام لەم دوو دەستەیە، ڕێزی پەیوەندی خزمایەتی ناگرێت و کارە ناڕەواکان ئەنجام دەدات، سزای بدە. لەزیانی خۆی دۆعای کرد.

پێغەمبەر مشتێ خۆڵی هەڵگرت و رووی کردە قوڕەیش و فەرمووی: رووتان ڕەش و قێزەون بێت. خۆڵەکەی بەسەر و روخساری ئەواندا پرژاند و بەهاوەڵانی خۆی وت: هێرش ببەن. شکست کەوتە ناو ناباوەڕان و خواوەند گەورەکانی قورەیشی کوشت و تەسلیمی هاوەڵانی پێغەمبەری کرد. کاتێك موسوڵمانان دەستیان بەگرتنی ئەسیرەکان کرد، پێغەمبەر لەناو سایەوانەکەدا بوو، سەعد کوڕی مەعاز شمشێر بەدەست لەگەڵ دەستەیەك لەئەنسار پاسەوانی پێغەمبەری دەکرد چوونکە دەترسان دوژمن هێرش بکاتە سەری. پێغەمبەر لەروخساری سەعددا بینی لەکاری موسوڵمانان رازی نییە، پێی فەرموو: دەڵێی ئەسیر کردنی ناباوەڕانت پێ خۆش نییە.

سەعد وتی: بەڵێ، ئەمە یەکەم جارە ناباوەڕان شکست دەخۆن، کوژرانی ئەوان باشترە لەوەی ئەسیر بکرێن.

کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: کەسانێك لەمناڵەکانی هاشم و کەسانیتر نابەدڵخواز هاتوونەدەر و ئارەزوومەندی شەڕ کردن لەگەڵ ئێمە نەبوون. هەرکەس لەئێوە کەسێك لەمناڵەکانی هاشمی بینی، نەیکوژێت، هەرکەس باوکی بەختەری بینی، نەیکوژێت و هەرکەس عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبی باوکی منی بینی، نەیکوژێت چوونکە نابەدڵخواز بۆ ئەم شەڕە هاتووە.

باوکی حوزەیفە کوڕی عوتەبە کوڕی ڕەبیعە وتی: باوك و مناڵ و براکانی خۆمان بکوژین و عەباس ئازاد بکەین، سوێند بەخوا ئەگەر ببینم دەیکوژم.

وتەکەی بەگوێی پێغەمبەر گەیشت و بەعومەر کوڕی خەتابی فەرموو: ئەی باوکی حەفس، بیستت حوزەیفە دەڵێت شمشێر لە پێغەمبەری خوا بەرز دەکەمەوە؟

عومەر وتی: ئەی پێغەمبەر، ڕێگەم بدە بەشمشێر بیکوژم چوونکە کەسێکی مونافیقە. دواتر عومەر دەیوت: ئەمە یەکەم جار بوو پێغەمبەر بەنازناوی باوکی حەفس بانگی کردم.

باوکی حوزەیفە بەردەوام دەیوت: لەو وتەی ئەو ڕۆژە هێنامە سەرزمان، ئاسوودە نیم و بەردەوام لێی دەترسم مەگەر ئەوەی بەشەهید بوون قەرەبووی بکەمەوە. ئەو،

لەشەڕی یەمامە کوژرا.

دەڵێت: پێغەمبەر کوشتنی باوکی بەختەری یاساغ کرد لەبەر ئەوەی لەمەککە زیانی بە پێغەمبەر نەدەگەیاند و پێغەمبەر هیچ شتێکی ناخۆشی لێ نەبینیبوو. ئەو، لەو کەسانە بوو بۆ هەڵوەشاندنەوە پەیمانی قورەیشییەکان دژی بنەماڵەی هاشم وبنەماڵەی موتەلیب، هەوڵیدابوو. لەکاتی شەڕەکەدا، مەجزەر کوڕی زیادی بەلەوی ئەوی بینی و وتی: پێغەمبەر کوشتنی تۆی یاساغ کردووە. جونادە کوڕی مەلیجە کە لەگەڵ باوکی بەختەری لەمەککە هاتبوویەدەر، هاوڕێیەتی دەکرد و وتی: هاوڕێکەم چی بەسەر دێت.

مەجزەر وتی: هاوڕێکەی تۆ دەکوژین چوونکە پێغەمبەر تەنیا فەرمانی نەکوشتنی تۆی پێداوین.

باوکی بەختەری وتی: سوێند بەخوا من و ئەو هەردووکمان دەمرین تا ژنانی قورەیش نەڵێن من لەبەر رزگاری کردنی ژیانی خۆم، هاوڕێکەم پشتگوێ خست. کاتێک مەجزەر رووبەرووی باوکی بەختەری بوویەوە، ئەو، هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

(( هیچ ئازادەیەك هاوڕێکەی خۆی پشتگوێ ناخات

تا بمرێت یا رێگەکەی خۆی بناسێتەوە.

شەڕیان کوشت و مەجزەر ئەوی کوشت. هاتە لای پێغەمبەر و وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بەراستی ڕەوانە کردووە، هەوڵمدا ئەسیری بکەم بەڵام ئەو رازی نەبوو، شەڕمان کرد و ئەوم کوشت.

عەبدولرەحمان کوڕی عەوف دەڵێت: ئومەییە کوڕی خەلەف لەمەککە هاوڕێی من بوو. ناوی من عەبد عەمرۆ بوو و کاتێك لەمەککە باوەڕم هێنا، ناوەکەم بۆ عەبدولرەحمان گۆڕا. ئومەییە کاتێك منی دەبینی، دەیوت: ئەی عەبدعەمرۆ، ئەو ناوەی باوکت پێیبەخشی، پشتگوێت خست، ناوێك دیاری بکە تا بەو ناوە بانگت بکەم چوونکە کاتێك بەناوە کۆنەکەت بانگت دەکەم وەڵامم نادەیتەوە، منیش بەناوێك کە نازانم چییە، بانگت ناکەم.

وتم: ئەی باوکی عەلی، هەر ناوێك پێتخۆشە، دیاری بکە.

وتی: ناوی عەبدوالله.

وتم: باشە.

هەرکاتێك لای ئەو تێدەپەڕیم، دەیوت عەبدواللە. من وەڵامم دەدایەوە و قسەم لەگەڵ دەکرد. لەرۆژی بەدر لای ئەو تێپەڕیم کە لەگەڵ کوڕەکەی عەلی کوڕی ئومەییە وەستا بوو. دەستی ئەوی لەدەستا بوو. من چەند زرێیەکی تاڵانیم هەڵگرتبوو و کاتێك منی بینی، ئومەییە وتی: ئەی عەبد عەمرۆ، وەڵامم نەدایەوە. وتی: ئەی عەبدواللە.

وتم: بەڵێ.

وتی: دەتوانیت من ئەسیر بکەیت چوونکە لەزرێکان باشترم بۆ تۆ.

وتم: وەرە. زرێکانم فڕێدا و دەستی خۆی و کوڕەکەیم گرت. دەیوت: رۆژێکی لەم شێوەم نەبینیوە مەگەر پێویستتان بەنەرمی نواندن نییە. ئەوانم پێش خۆم خست.

دەڵێت: ئەو کاتەی دەڕۆشتین، ئومەییە پێی وتم: ئەی عەبدواللە، ئەو پیاوەی پەڕی وشتر مری بەسینگەوەیە، کێیە؟

وتم: حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب.

وتی: ئەو ئەم بەڵای بەسەر ئێمەدا هێنا.

عەبدولرەحمان دەڵێت: لەم کاتەدا بیلال ئومەییە بینی. ئومەییە، لەمەککە بەلالی ئەشکەنجە کردبوو تا لەئیسلام پەشیمان ببێتەوە. ئەوی لەسەر پشت لەسەر بەرد و لمە سوورەوە بووەکان دەخەواند و فەرمانی دەدا بەردێکی گەورە بخەنە سەر سکی و دەیوت: بەمشێوەیە دەمێنیتەوە تا ئەو کاتەی لەدینەکەی محەممەد پەشیمان دەبیتەوە. بەڵام بیلال لەو کاتەدا دەیوت ئەحەد، ئەحەد. کاتێك ئومەییەی بینی، وتی: ئومەییە سەرکردەی کوفرە، نابێت رزگاری بێت.

وتم: بیلال، ئەسیرەکەی من؟

بەلال وتی: نابێت رزگاری بێت.

بەئومەییەم وت: دەبیستی، دەڵێت، نابێت رزگارت بێت.

بیلال هاواری کرد: ئەی هاوەڵانی خواوەند، سەرکردەی کافرەکان، ئومەییە کوڕی خەلەف نابێت رزگاری بێت.

دەوری ئێمەیان گرت و من بەرگریم لەئومەییە دەکرد. یەکێك لەکوڕەکەی ئومەییەیدا و کەوت. ئومەییە هاواری دەکرد کەهەرگیز هاوشێوەیم نەبیستبوو، پێم وت: رابکە، رابکە، چوونکە ناتوانم هیچ بکەم. بەڵام موسوڵمانان شمشێربارانیان کردن تا ئەوەی کوژران.

عەبدولرەحمان کوڕی عەوف هەمیشە دەیوت: خواوەند لەبیلال خۆش نەبێت،

زرێکانم لەدەست چوو و ئەسیرەکانی بەکوشتن دام.

یەکێك لەمنالەکانی غەفار دەڵێت: من و کوڕە مامەکەم، هەردووکمان ناباوەڕ بووین، بەسەر کێوێکدا سەرکەوتین و لەوێوە سەیری بەدرمان دەکرد. چاوەڕوان بووین بزانین کام دەستەیە شکست دەخوات و لەگەڵ تالانچییەکان بەشدار بین.

دەڵێت: کاتێك لەسەر بەرزایی کێوەکە بووین، هەورێك لێمان نزیك کەوتەوە، دەنگی ئەسپەکانی لێدەبیسترا، بیستمان کەسێك دەیوت: حیزوم پێشکەوە، پەردەی دڵی کوڕە مامەکەم دڕا و مرد. ئەوەندەی نەما بوو خۆیشم بمرم، بەڵام بەسەر خۆمدا زاڵبووم.

باوکی داوودی مازنی بەشدار لەشەڕی بەدر، دەڵێت: لەرۆژی بەدر شوێن یەکێك لەناباوەڕان کەوتم تا بیکوژم بەڵام پێش ئەوەی شمشێرەکەی منی پێبگات، سەری لەجەستەی جیابوویەوە و زانیم کەسێکی دیکە ئەوی کوشتووە.

ئەبی ئومامە کوڕی سەهل کوڕی حەنیف دەڵێت: باوکم دەیوت: کوڕی خۆم لەرۆژی بەدر، یەکێك لەئێمە بەشمشێرەکەی ئاماژەی بەیەکێك لەناباوەڕان دەکرد و پێش ئەوە شمشێرەکەی پێبگات، سەری لەجەستەی جیا دەبوویەوە.

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: لەرۆژی بەدر فریشتەکان جامانەی سپییان لەسەردا بوو و لەرۆژی حەنین، جامانەکانیان سوور. فریشتەکان تەنیا لەشەڕی بەدر شەڕیان کرد و لەشەڕەکانی دیکە تەنیا هاوکارییان دەکردین بەڵام شمشێریان نەدەوەشاند.

مەعاز کوڕی عەمرۆ کوڕی حەموح دەیوت: کاتێك پێغەمبەر لەکاری دوژمن تەواو بوو، وتی: لەناو کوژراوەکاندا بۆ ئەبوجەهل بگەڕێن. یەکەم کەس ئەبوجەهلی بینی، من بووم. دەیانوت: کەس دەستی بەباوکی حەکەم ناگات. کاتێك ئەم وتەیەم بیست، مەبەستی ئەوم کرد. پەلامارمدا و بەشمشێر قاچیم قرتاند. کەوتە سەرزەوی و کوڕی عێکرەمە شمشێری لەبازووی مندا و دەستی بڕیم . بەڵام لەگەرماوگەرمی شەڕەکە ئاگام لەدەستم نەبوو. تەواوی رۆژ شەڕم دەکرد و دەستم بەدوای خۆمدا رادەکێشا و کاتێك ئازارەکەی زیادی کرد، بەتەواوی لەجەستەم، جیام کردەوە و فڕێمدا.

مەعاز تا رۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان زیندوو بوو.

دوای ئەو، مەعوز کوڕی عەفراء لای ئەبوجەهل تێپەڕی کە لەسەر زەوی کەوتبوو. چەند گورزێکی لێدا کە لەجووله کەوت بەڵام هێشتا گیانی لەبەردا مابوو. مەعوز ئەوی بەجێهێشت و شەڕی کرد تا کوژرا.

کاتێك پێغەمبەر فەرمووی: لەناو کوژراوەکاندا بەدوای ئەبوجەهلدا بگەڕێن، عەبدوالله کوڕی مەسعود بەدوایدا گەڕا و پێغەمبەر فەرمووی: ئەگەر بەئاسانی نەتانتوانی بیدۆزنەوە، ورد ببنەوە چوونکە شوێنەواری برینێك بەرانییەوە دیارە. من و ئەو رۆژێك لەسەر سفرەی عەبدوالله کوڕی جودعان شەڕمان بوو. هەردووکمان گەنج بووین. من بچوکتر بووم. پاڵێکم پێوەنا، کەوت و یەکێك لەڕانەکانی بریندار و هێشتا شوێنەوارەکەی ماوە.

عەبدوالله کوڕی مەسعود دەڵێت: کاتێك ئەبوجەهلم دۆزییەوە، هێشتا نەمردبوو، قاچم خستە سەر ملی چوونکە جارێك لەمەککە زۆری ئەشکەنجە کردم و بەشەق تێی هەڵدابووم. وتم: ئەی دوژمنی خوا، خواوەند ریسوای کردیت.

وتی: چۆن ریسوایی کردووم، پیاوێك بووم بەدەستی ئێوە کوژرام، پێم بڵێ، کێ سەرکەوت.

وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی.

وتی: ئەی شوانی مەڕەکان، بەشوێنێکی بەرزدا سەرکەوتوویت. سەری ئەبوجەهلم بڕی و بردم بۆ لای پێغەمبەر و وتم: ئەمە سەری دوژمنی خوا، ئەبوجەهلە.

پێغەمبەر فەرمووی: سوێند بەوخوایەی جگە لەو خوایەك نییە، خۆیەتی. پێغەمبەر بەمشێوەیە سوێندی دەخوارد.

عایشە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر فەرمووی کوژراوەوکانی بەدر بخەنە ناو چاڵێك، هەموویان خستە ناو چاڵ جگە لەئومەییە کوڕی خەلەف لەبەر ئەویە ئاوسا بوو و کاتێك ویستیان بیجوڵێنن، لەیەك جیابوویەوە. ئەویان لەشوێنێکدانا و بەرد و خۆڵیان کرد بەسەریا تا ئەوەی لەژێر خاك داپۆشرا بوو.

کاتێك کوژراوەکانیان خستە ناوچاڵ، پێغەمبەر لەسەر چاڵەکە وەستا و فەرمووی: ئەی خەڵکی ناو چاڵەکە، ئایا بینیتان بەڵێنەکانی خواوەند هاتەدی؟ من بەڵێنەکەی خواوەندم بینی.

هاوەڵانی پێغەمبەر وتیان: ئەی پێغەمبەر، ئایا لەگەڵ مردووەکان قسە دەکەیت؟

پێغەمبەر فەرمووی: ئەوان زانییان ئەو پەیمانەی بەڵێنمدابوو، هاتەدەی و راستە.

عایشە دەڵێت: کەسان گومانیان کرد پێغەمبەر فەرمووی: بیستیان. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە: زانییان.

ئەنس کوڕی مالیك وتی: هاوەڵانی پێغەمبەر لەتاریکایی شەو بیستیان

کەدەفەرمێت: ئەی خەڵکی ناو چاڵەکە، ئەی عوتبە کوڕی رەبیعە، ئەی شەیبە کوڕی رەبیعە، ئەی ئومەییە کوڕی خەلەف، ئەی ئەبوجەهل کوڕی هوشام، ناوی هەموو کوژراوەکانی ناو چاڵەکەی برد- ئایا بینیتان کەبەڵێنەکەی خواوەند دێتەدی؟ من بەڵێنەکەی خواوەندم بینی.

موسوڵمانان وتیان: ئەی پێغەمبەر ئایا لەگەڵ مردووەکان قسە دەکەیت.

پێغەمبەر فەرمووی: ئێوە باشتر لەوان قسەکانی من نابیستن بەڵام ئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر لەرۆژی بەدر فەرمووی: ئەی خەڵکی ناو چاڵەکە، ئێوە بۆ پێغەمبەرەکەتان هۆزێکی خراپ بوون، حاشاتان لەراستی من کرد و کەسانی دیکە پشتڕاستییان کردمەوە. دەرتان کردم و کەسانی دیکە پەنایاندام، شەڕتان لەگەڵ من کرد و کەسانی دیکە هاوکارییان کردم. دواتر فەرمووی: ئایا بینیتان بەڵێنەکەی خواوەند دێتەدی؟ من بینیم بەڵێنەکەی خواوەند هاتەدی.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر فەرمووی کوژراوەکان بخەنە ناو چاڵ، عوتبە کوڕی رەبیعەیان راکێشا و بەرەو چاڵەکەیان برد. پێغەمبەر سەیری روخساری باوکی حوزەیفە کوڕی عوتبەی کرد و بەخەمبار و دڵتەنگی بینی. فەرمووی: ئەی باوکی حوزەیفە، ئەگەری هەیە لەبەر باوکت، شتێکت لەدڵدا هەڵگرتبێت؟

باوکی حوزەیفە وتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەر! هیچکات لەکارەکانی باوکم و کوشتنی ئەو دوودڵ نەبووم بەڵام ئەوم بەکەسێکی خاوەن ڕا و زیرەك و بیرمەند دەبینی و هیوادار بووم باوەڕ بێنێت و کاتێك سەرئەنجامەکەی ئەمە بوو، بیرم لەمە کردەوە کە باوکم سەرئەنجام لەسەر ناباوەڕی مرد و خەمبار بووم.

دەڵێت: پێغەمبەر بۆی پاڕایەوە و بەشێوەیەکی باش لەگەڵی ئاخاوت. دوای ئەوە پێغەمبەر فەرمانیدا تاڵانییەکان کۆبکەنەوە. کێشە لەناو موسوڵمانان دروست بوو. ئەوانەی تاڵانییەکانیان گرتبوو، دەیانوت: هی خۆمانە چوونکە پێغەمبەر خۆی فەرمووبەتی. ئەوانەی شەڕیان لەگەڵ دوژمن کردبوو، دەیانوت: ئەگەر ئێمە نەدەبووین، ئێوە تاڵانییتان دەست نەدەکەوت. ئەوانەی پارێزگارییان لە پێغەمبەر دەکرد، دەیانوت: مافی ئێوە زیاتر لەئێمە نییە، ئێمە دەمانتوانی دوژمن بکوژین چوونکە لەبەر دەستی ئێمەدا بوون، دەمانتوانی تاڵانییەکان کۆبکەینەوە چوونکە کەس بەرگری لێنەدەکردن

بەڵام دەترساین هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر و لەبەر ئەمە تەنیا پارێزگاریمان لە پێغەمبەر دەکرد. کەواتە مافی ئێوە زیاتر لەئێمە نییە.

ئەبو ئومامەی باهلی دەڵێت: لەعوبادە کوڕی سامت سەبارەت بەئایەکانی ئەنفال پرسیارم کرد و وتی: سەبارەت بەشەڕکەرانی بەدر هاتەخوار چوونکە لەسەر تالآنییەکان گرفتاری کێشە بووین و بەشێوەیەکی ناشیرین لەگەڵ یەك مامڵەمان کرد. خواوەند تالآنییەکانی لەئێمە سەندەوە و لای پێغەمبەر کەڵەکەو بەشێوەیەکی بەرابەر لەناو موسوڵماناندا دابەشی کرد. ترسی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر و بەرژەوەندی موسوڵمانانی تیا بوو.

دەڵێت: کاتێك سەرکەوتنمان پێبڕا، پێغەمبەر، عەبدوالله کوڕی ڕەواحەی وەك مژدەگەیێنەر بۆ سەرەوەی مەدینە و زەید کوڕی حارسەی بۆ خوارەوەی مەدینە نارد.

ئوسامە کوڕی زەید دەڵێت: کاتێك روقییە کچی پێغەمبەرمان بەخاك سپارد، هەواڵی سەرکەوتنەکە گەیشت.

رۆقییە، هاوسەری عوسمان کوڕی عەفان بوو. پێغەمبەر من و عوسمانی بۆ چاودێری کردنی ئەو لەمەدینە بەجێهێشت. کاتێك زەید کوڕی حارسە هات، ڕۆشتینە لای ئەو، لای نوێژگە وەستا بوو و خەڵکان دەوریاندا بوو، دەیوت: عوتەبە کوڕی ڕەبیعە و شەیبە کوڕی ڕەبیعە و ئومەییە کوڕی خەلەف ومونەبە و نەبییە کوڕەکانی حەجاج کوژران.

پێم وت: باوکە گیان ڕاست دەکەیت؟

وتی: بەڵێ، کوڕی خۆم.

پێغەمبەر مەبەستی گەڕانەوە بۆ مەدینە کرد. تالآنییەکانییان لەگەڵ خۆیان هێنا و هەموویانی بەدەستی عەبدوالله کوڕی کەعب سپاردبوو و کاتێك گەیشتە دۆڵی سەفرا، لای تەپۆڵکەیەك بەناوی سیرە دابەزی و تالآنییەکانی بەشێوەیەکی یەکسان لەنێوان موسوڵماناندا دابەش کرد. لەچاڵاوی ئەرواق ئاویان بۆ هێنا.

پێغەمبەر بەرێکەوت تا گەیشتە روحا. موسوڵمانان هاتن و پیرۆزبایی سەرکەوتنیان لێکردن. سەلمە کوڕی سەلامە کوڕی وەقش وتی: پیرۆزبایی چی دەکەن دەستەیەك پیری سەرتاس بوون کەهاوشێوەی وشترە بەستراوەکان کوشتارمان کردن.

پێغەمبەر بزەیەکی گرت و فەرمووی: ئەی برازا، ئەوانە گەورەی خەڵکان بوون.

دەڵێت: ناباوەڕە ئەسیرەکان لەگەڵ پێغەمبەر ژمارەیان دەگەیشتە چل وچوار کەس.

ژمارەی کوژراوەکانیش چل وچوار کەس بوو. عوقبە کوڕی ئەبی موعیت و نەزر کوڕی حارس لەناو ئەسیرەکاندا دەبینران و کاتێك گەیشتە سەفرا، نەزر کوڕی حارسی کوشت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی کوشت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: وەك یەکێك لەشارەزایانی دانیشتووی مەککە پێی وتم، پێغەمبەر بەرێکەوت تا گەیشتە عەرەق زەبییە و عوقبە کوڕی ئەبی موعیتی کوشت و کاتێك پێغەمبەر فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد، فەرمووی: ئەی محەممەد کێ سەرپەرەستی منداڵەکانم دەکات؟

پێغەمبەر فەرمووی: جەهەننەم.

دەڵێت: عاسم کوڕی سابت کوڕی ئەبی ئەفلەحی ئەنساری ئەوی کوشت.

هەروەها لەعەرەق زەبییە، باوکی هیند، کۆیلەی فەروە کوڕی عومەری بەیازی کە پەردەداری پێغەمبەر بوو، هاتە پێش. ئەو لەبەدر بەجێمابوو بەڵام بەشداری هەموو شەڕەکانی دیکەی کرد. پێغەمبەر فەرمووی: باوکی هیند یەکێك لەئەنسارە، هاوسەری پێبدەن و کچەکانی بکەنە هاوسەری خۆتان.

پێغەمبەر بەرەو مەدینە بەرێکەوت و ڕۆژێك پێش ئەسیرەکان گەیشتە ناو شارەکە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئەسیرەکانیان هێنا ناو شارەکە، سودە کچی زەمعە هاوسەری پێغەمبەر، لای بنەماڵەی عەفرا بوو و بۆ عەوف و مەعوز کوڕەکانی عەفرا دەگریان. ئەمە پێش ئەوە بوو حیجابی ژنان ببێتە کارێکی پێویست.

سودە دەڵێت: لای منداڵەکانی عەفرا بووم، هاتن و وتیان ئەسیرەکانیان هێنا. گەڕامەوە بۆماڵەکەی خۆم. پێغەمبەر لەماڵەوە بوو و باوکی یەزید سوهەیل کوڕی عەمرۆ لەسووچێکی ژوورەکە، دەستی بەملییەوە بەسترابوو. کاتێك ئەوم بەمشێوەیە بینی، نەمتوانی خۆم بگرم و وتم: ئەی باوکی یەزید، خۆتان بەدەستەوەدا، بۆ بوێرانە شەڕتان نەکرد؟

وتارەکەی پێغەمبەر بەئاگای هێنامەوە کەفەرمووی: ئەی سوودە دژی خوا و پێغەمبەر قسە دەکەیت؟

وتم: ئەی پێغەمبەر، سوێند بەخەوایەی تۆی بەراستی ناردووە، کاتێك دەستە بەستراوەکانی باوکی یەزیدم بینی، نەمتوانی خۆم بگرن و ئەم وتەم هێنایە سەرزمان.

نەبییە کوڕی وەهب دەڵێت: کاتێك ئەسیرەکانییان هێنا، پێغەمبەر ئەوانی لەناو

هاوەڵانی خۆیدا بڵاو کردەوە و فەرمووی: چاکەکارییان لەگەڵ بکەن.

دەڵێت: باوکی عەزیز کوڕی عومەیر برای مەسعەب کوڕی عومەیر لەناو ئەسیرەکاندا دەبینرا.

باوکی عەزیز دەڵێت: مەسعەبی برام لای من تێپەڕی و یەکێك لەئەنسارییەکان منی ئەسیر کرد. مەسعەب پێی وت: بەتوندی بیبەستەرەوە چوونکە دایکی دەوڵەمەند و ئەگەری هەیە ئازادی ئەو لەتۆ بکڕێتەوە.

دەڵێت: کاتێك لەبەدرەوە منیان بۆ مەدینە گواستەوە، لەگەڵ دەستەیەك لەئەنسار بووم و کاتێك بۆ نان خواردن دادەنیشتن، نانیان بەمن دەدا و خۆیان خورمایان دەخوارد. ئەمە لەبەر پێشنیارەکەی پێغەمبەر بوو سەبارەت بەئەسیرەکان. هەرکەس لەتە نانێکی بەمن دەدا. شەرمەزار بووم و نانەکانم بۆ گەڕاندنەوە. دووبارە نانەکەیان بۆ دەهێنامەوە و نەیاندەخوارد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەکەم کەس هەواڵی شکستی ناباوەڕانی گەیاندە مەدینە، حەیسمان کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەیاس بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: واقدی حەیسمانی بەکوڕی حابسی خوزاعی زانییووە.

کاتێك حەیسمان هات، پرسییان: چ هەواڵێکت پێیە؟

وتی: عوتەبە کوڕی ڕەبیعە و شەیبە کوڕی ڕەبیعە و باوکی حەکەم کوڕی هوشام و ئومەییە کوڕی خەلەف و زەمعە کوڕی ئەسوەد و باوکی بەختەری کوڕی هوشام و نەبییە و مونەبە کوڕەکانی حەجاج کوژران و ناوی سەرکردەکانی دیکەی قوڕەیشی برد. سەفوان کوڕی ئومەییە لەسوچێکدا دانیشتبوو، وتی: سوێند بەخوا ئەمە تێناگات، سەبارەت بەو لەمن بپرسن.

بەحەیسمانیان وت: سەفوان کوڕی ئومەییە چی بەسەرهات؟

وتی: سەفوان لێرە دانیشتووە، بەڵام بینیم باوك و براکەی کوژران.

باوکی ڕافیع کۆیلەی پێغەمبەر دەڵێت: من کۆیلەی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب بووم. ئیسلام گەیشتە ماڵی ئێمە و دایکی فەزڵ باوەڕی هێنابوو. منیش باوەڕم هێنا. عەباس لەخەڵکەکەی خۆی دەترسا و نەیدەویست کردەوەکانی دژی ئەوان بێت. باوەڕ هێنانی خۆی شاردەوە لەبەر ئەوەی سامان و دارایی زۆری لەناو خەڵکاندا بڵاوکردبوویەوە. دوژمنی خواوەند ئەبولەهەب نەکوژرا چوونکە عاس کوڕی هوشام کوڕی موغەیرەی لەجیاتی خۆی نارد.

((هەرکەس نەڕۆشتبوو کەسێکی لەجیاتی خۆی ناردبوو و کاتێك هەواڵ هات قورەیشییەکان لەبەدر شکستیان خواردووە، ریسوا بوو. ئێمە هەستمان بەهێز و سەرفەرازی دەکرد)).

دەڵێت: پیاوێکی لاواز بووم و لای زەمزەم تیرم دەتاشی. سەرقاڵی کارەکەی خۆم بووم و دایکی فەزل لای من دانیشتبوو. لەهەواڵەکەی بەدر دڵخۆش بووین. ئەبولەهەبی ناباوەڕ هات. قاچەکانی خۆی رادەکێشا. لای من دانیشت و پشتی بەمنەوەدا. لەم کاتەدا خەڵکان وتیان: ئەبوسوفیان کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب هات.

ئەبولەهەب وتی: کوڕی برا وەرە دانیشە چوونکە هەواڵەکان لای تۆیە. شەڕ کردنی خەڵکان چۆن بوو؟

ئەبوسوفیان وتی: سوێند بەخوا هیچ نەبوو، کاتێك رووبەروویان بووینەوە، تەسلیم بووین. ئەوانیش چۆنیان ویست ئێمەیان کوشت و ئەسیریان کردین. سوێند بەخوا سەرکۆنەی کەس ناکەم چوونکە لەنێوان ئاسمان و زەوی پیاوە سپیپۆشەکانم بینی سوار ئەسپە ئەبڵەقەکان ببوون و کەس نەیدەتوانی لەبەرابەر ئەوان بەرگری بکات.

باوکی رافیع دەڵێت: تەنافەکانی خێوەتەکەم بەرز کردەوە و وتم: ئەوان فریشتە بوون. ئەبولەهەب دەستی بەرز کردەوە و شەقەزللەیەکی لەروخسارمدا.

دەڵێت: پەلاماریدام، منی بەرز کردەوە و کێشامی بەزەویدا و کەوتە سەرسکم. لێیدەدام و من کەپیاوێکی بێهێز بووم نەمدەتوانی بەرگری لەخۆم بکەم. دایکی فەزل هەستا و یەکێك لەستوونەکانی خێوەتەکەی هەڵگرت و لێیدا. سەری بریندار بوو و وتی: بەکەسێکی لاوازی دەزانی و دزانی خاوەنەکەی لێرە نییە. ئەبولەهەب هەستا و ڕۆشت. زیاتر لەحەوت رۆژ زیندوو نەبوو. خواوەند گیرۆدەی نەخۆشی ئاوڵەی کرد و کوشتی. کوڕەکانی بۆ ماوەی دوو یا سێ رۆژ بەخاکیان نەسپارد،ئەوەی بۆنی گرت. لەبەر ئەوە بوو قورەیشییەکان لەبڵاوبوونەوەی ئاوڵە هاوشێوەی تاعوون دەترسان،

سەرئەنجام یەکێك لەقورەیشییەکان پێی وتن: شەرم ناکەن باوکتان لەماڵەوە بۆنی گرتووە و بەخاکی ناسپێرن؟

کوڕەکانی ئەبولەهەب وتیان: لەئاوڵە دەترسین.

پیاوی قورەیشی وتی: وەرن منیش هاوکاریتان دەکەم. ڕۆشتن و لەدوورەوە ئاویان پیاکرد تا دەستی لێنەدەن. دواتر جەستەی ئەویان هەڵگرت و لەسەرەوەی مەککە

خستییانە بن دیوارێك و بەبەرد دایانپۆشی.

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو شەوەی خەڵکان لەشەڕی بەدر گەڕانەوە و ئەسیرەکان لەناو گۆڕەپانەکەدا ئەسیر بوون، پێغەمبەر خەوی لێنەکەوت و هاوەڵانی وتیان: چی بوو خەوت لێنەکەوت؟

پێغەمبەر فەرمووی: ناڵەی عەباس دەبیستم.

هەروەها کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو کەسەی عەباسی لەبەدر ئەسیر کرد، باوکی ئەلیەسر کەعب کوڕی عەمرۆ بوو. عەباس پیاوێکی چوارشانە و بەهێز بوو. پێغەمبەر بەباوکی ئەلیەسری فەرموو: چۆن عەباست ئەسیر کرد؟

وەڵامی دایەوە: ئەی پێغەمبەر پیاوێك کەهەرگیز نەمبینیبوو و هەرگیز نەمدییەوە، هاوکاری کردم.

پێغەمبەر فەرمووی: فریشتەیەك هاوکاری تۆی کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: قورەیشییەکان بۆ کوژراوەکانی خۆیان شینیان گێڕا و ناڵاندییان. دواتر وتیان: ئەم کارە مەکەن چوونکە هاوەڵانی محەممەد دەیبیستنەوە و بۆ ئەم کارە سەرکۆنەتان دەکەن. کەس بۆ ئازادی ئەسیرەکانتان مەنێرن تا ماوەیەك بوگزەرێت بۆ ئەوەی محەممەد و هاوەڵانی بۆ ئازاد کردنی ئەوان مەرج دانەنێن.

دەڵێت: ئەسوەد کوڕی عەبدیەغوس سێ لەکوڕەکانی خۆی لەدەستدابوو: زەمعە کوڕی ئەسوەد و عەقیل کوڕی ئەسووەد و حارس کوڕی ئەسوەد. دەیویست شین بۆ کوڕەکانی بگێڕێت. لەشەودا دەنگی گریانی بیست و لەبەر ئەوەی کوێر بوو، بەکۆیلەکەی خۆی وت: بزانە ئایا گریان ڕێگەی پێدراوە و قورەیشییەکان بۆ مردووەکانی خۆیان دەگرین تا منیش بۆ ئەبی حەکیمە بگریم چوونکە دڵم ئاگری گرتووە. مەبەستی لەئەبی حەکیمە، زەمعەی کوڕی بوو.

کاتێك کۆیلەکەی گەڕایەوە، ئاگاداری کردەوە کەژنێك بۆ وشترە ونبووەکەی خۆی دەگریت. ئەو هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

(( بۆ وشترە ونبووەکەی خۆی دەگریت

خەوی لێناکەوێت

بۆ وشتر مەگری چوونکە دەبێت بۆ بەدر بگرین

کوڕەکانی مناڵەکانی حەسیس و مەخزوم و دەستەی باوکی وەلید

ئەگەر دەتەوێت بگری، بۆ عەقیل بگری

وبۆ حارس کەسەرکردەی سەرکردەکان بوو
بۆ هەمووان بگری و ناوی کەس مەهێنە
چوونکە ئەبی حەکیمە هاوتای نەبوو
کەسانێك بوونە سالار
کەئەگەر شەڕی بەدر نەدەبوو، سالارییان دەست نەدەکەوت.))

دەڵێت: لەناو ئەسیرەکان، باوکی وەداعە کوڕی زوبەیرەی سەهمی دەبینرا و پێغەمبەر فەرمووی: ئەو کوڕێکی زیرەك و بازرگان و دەوڵەمەندی هەیە و بۆ کڕینی ئازادی باوکی دێت. کاتێك قورەیشییەکان وتییان: بۆ کڕینەوەی ئازادی ئەوان پەلە مەکەن بۆ ئەوەی مەرجەکانی محەممەد و هاوەڵانی دژوار نەبێت، موتەلیب کوڕی ئەبی وەداعە کە پێغەمبەر ئاماژەی پێدابوو، وتی: راست دەکەن، لەکڕینەوەی ئەسیرەکان نابێت پەلە بکەن. بەڵام لەتاریکی شەو بەرەو مەدینە بەرێکەوت و چوار هەزار درەمی لەگەڵ خۆی برد و باوکی گەڕاندەوە.

قورەیشییەکان بۆ کڕینەوەی ئەسیرەکانی خۆیان کەسیان ڕەوانە کرد. مەکرەز کوڕی حەفس بۆ کڕینەوەی سوهەلی کوڕی عەمرۆ هات، ئەو ئەسیری مالك کوڕی دەخشەم بوو، لێوی خوارەوەی قەڵشا بوو.

عومەر کوڕی خەتاب سەبارەت بەسوهەیل کوڕی عەمرۆ بە پێغەمبەری وت: دوو دانەکە پێشەوەی ئەو دەربێنە تا زمانی لەدەمی بێتەدەر و هەرگیز نەتوانێت دژایەتی تۆ بکات.

پێغەمبەر فەرمووی: کەم ئەندامی ناکەم چوونکە خواوەند دەمکاتە کەم ئەندام هەرچەند پێغەمبەریش بم.

دەڵێت: بیستم پێغەمبەر لەمبارەوە بەعومەری فەرموو: ئەگەری هەیە سەبارەت بەشتێك قسە بکات کەپەسەندی بکەیت. کاتێك مەکرەز سەبارەت بەئازادی سوهەیل قسەی کرد و ڕەزامەندییان نیشاندا، وتیان: بەهای ئازادی ئەو بێنە.

مەکرەز وتی: من لەجیاتی ئەو ئەسیر و ئەو ئازاد بکەن تا بڕوات و بەهای ئازادی خۆی بێنێت.

دەڵێت سوهەیلیان ئازاد کرد و مەکرەزەیان لەجیگەی ئەو گرت..

کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب گەیشتە مەدینە،

پێغەمبەر پێی فەرموو: تۆ دەوڵەمەندیت، بەهای ئازادی خۆت و دوو برازاکەت، عەقیل کوڕی ئەبی تالیب و نەوفل کوڕی حارس و هاوپەیمانەکەت، عوتەبە کوڕی عەمرۆ بدە.

عەباس وتی: ئەی پێغەمبەر، من موسوڵمان بووم، بەڵام خەڵکەکەم بەناچاری منیان هێنا.

پێغەمبەر فەرمووی: خواوەند باشتر لەئیسلامی تۆ شارەزایە، ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت راست بێت، خواوەند پاداشتت دەداتەوە بەڵام تۆ بەرواڵەت دژی ئێمە وەستاوییت و دەبێت بەهای ئازادی خۆت بدەیت.

پێشتر بیست ئوقییەی زێر لەعەباسەوە کەوتبووە دەستی پێغەمبەر.

عەباس وتی: ئەی پێغەمبەر، ئەوەی لای تۆیە، وەك بەهای ئازادی من هەڵیبگرە.

پێغەمبەر فەرمووی: نە، ئەوە شتێکە خواوەند بەئێمەی بەخشییوە.

عەباس وتی: دارایيم نییە.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەو سامانەی لەکاتی هاتنەدەر لەمەککە لای دایکی فەزل کچی حارس بەجێتهێشت و کەس جگە لەئێوە ئامادە نەبوو و پێت وت ئەگەر لەم سەفەرەدا کوژرام، ئەوەندەی بۆ فەزل بێت و ئەوەندەی بۆ عەبدواللە و ئەوەندەی بۆ قیسەم و ئەوەندەی بۆ عوبیداللە، چی لێهات؟

عەباس وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بەراستی ناردووە، جگە لەمن و ئەو کەس ئەمەی نەدەزانی و ئێستا دەزانم تۆ پێغەمبەری خواییت، دواتر بەهای ئازادی خۆی و دوو برازاکەی و هاوپەیمانەکەیدا.

دەڵێن: عەمرۆ کوڕی ئەبی سوفیان لەناو ئەسیرەکاندا دەبینرا. بەئەبوسوفیانیان وت: بەهای ئازادی ئەو بدە.

ئەبوسوفیان وتی: هەم خوێنم بڕوات هەم سامانەکەم، حەنزەلەیان کوشت و بەهای ئازادی عەمرۆیش بدەم. با تا ئەو کاتەی دەیانەوێت لەمەدینە رایبگرن. عەمرۆ لەمەدینە زیندانی بوو.

سەعد کوڕی نەعمان کوڕی ئەکال بەمەبەستی حەج کردن رووی لەمەککە کرد. ئەو پیرەپیاوێکی بەتەمەن لەگەڵ مەڕەکانی لەنەقیع ژیانی بەسەر دەبرد. لەوێوە رووی کردە مەککە و گومانی نەدەکرد لەمەککە بیگرن چوونکە قوڕیشییەکان رێگەیان لەحاجییەکان نەدەگرت بەڵام ئەبوسوفیان ئەوی گرت و لەجیاتی کوڕەکەی خۆی عەمرۆ لەمەککە زیندانی کرد و هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی خەڵکانی ئەکال، وەڵامی داواکارییەکەی بدەنەوە
پەیمانتان بەستووە هیچ پیرەپیاوێکی بەتەمەن پشتگووێ نەخەن
بەراستی منداڵەکانی عەمرۆ ریسوا و زەلیلن
ئەگەر ئەسیرەکەی خۆیان ئازاد نەکەن))

منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف ڕۆشتنە لای پێغەمبەر و داستانەی کوڕی ئەکالیان بۆ باس کرد. داوایان کرد عەمرۆ کوڕی ئەبوسوفیان ئازاد بکات تا پیرەکەی خۆیان ئازاد بکەن. پێغەمبەر ئەو کارەی کرد و عەمرۆیان بۆ لای ئەبوسوفیان نارد و سەعدیان ئازاد کرد.

هەروەها لەناو ئەسیرەکان باوکی عاس کوڕی رەبیع دەبینرا کەزاوای پێغەمبەر بوو. باوکی عاس بۆ سامان و ئەمانەت و بازرگانی لەناودارەکانی قوڕەیش و دایکی،هالە کچی خوەیلد بوو. داوای لە پێغەمبەر کرد کچەکەی خۆی پێبدات. پێغەمبەر نارەزایی بەرابەر بەبڕیارەکانی خەدیجە نیشان نەدەدا و ئەمە پێش هاتنە خوارەوەی وەحی بوو و کچێکی خۆی کردە هاوسەری ئەو. خەدیجە ئەوی وەك منداڵی خۆی هەژمار دەکرد.

کاتێك خواوەند مژدەی پێغەمبەرایەتی بەپێغەمبەرەکەی بەخشی و خەدیجە و کچەکانی باوەڕیان پێی هێنا، باوکی عاس لەسەر ناباوەڕی خۆی مایەوە.

پێغەمبەر یەکێك لەکچەکانی خۆی، رۆقییە یا دایکی کولسومی بە عوتەبە کوڕی ئەبی لەهەب دابوو. کاتێك فەرمانی خواوەندی لەگەڵ قوڕەیشییەکان باس کرد و ئەوان خۆیان لە پێغەمبەر بەدوور گرت، وتیان: ئێوە گرفتارییەکانتان لەکۆڵی محەممەد کردۆتەوە، کچەکانی تەڵاق بدەن تا بەوانەوە سەرقاڵ بێت. ڕۆشتنە لای باوکی عاس کوڕی رەبیع و وتیان: لەهاوسەرەکەی خۆت جیاببەرەوە و ئێمە کام لەژنەکانی قوڕەیش کەبخوازیت دەیکەینە هاوسەری تۆ.

باوکی عاس وتی: هەرگیز لەهاوسەرەکەی خۆم جیانابمەوە و لەجیات ئەو هیچ کام لەژنەکانی قوڕەیشم ناوێت. پێغەمبەر وەسفی چاکەی زاواکەی کرد.

دوای ئەو ڕۆشتنە لای عوتەبە کوڕی ئەبی لەهەب و پێیان وت: کچەکەی محەممەد تەڵاق بدە و یەکێك لەقوڕەیشییەکان بکەرە هاوسەری خۆت.،

عوتەبە وتی: ئەگەر کچی ئەبان کوڕی سەعید کوڕی عاس یا کچی سەعید کوڕی عاس بکەنە هاوسەری من، لێی جیادەبمەوە.

بەمشێوەیە کچی عاسیان کردە هاوسەری ئەو و لەکچی پێغەمبەر کەهێشتا نەپۆشتبوویە ماڵی دوژمنی خواوەند، جیابوویەوە و خواوەند رێزی کچی پێغەمبەرو زەلیلی کوڕی ئەبی لەهەبی دەویست، جیایی لەنێوان ئەوان دروست کرد. ئەم کچە دواتر بوو بەهاوسەری عوسمان کوڕی عەفان.

پێغەمبەر لەمەککە دەسەڵاتی نەبوو. حەرام و حەڵاڵی نەدەکرد و ئیسلام لەنێوان زێنەب کچی پێغەمبەر موسوڵمان و باوکی عاسی ناباوەڕ، جیایی دروست کرد بەڵام پێغەمبەر نەیدەتوانی ئەوان لەیەك جیابکاتەوە. زێنەب باوەڕدار مایەوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەر کۆچی کرد.

کاتێك قورەیشییەکان روویان لەبەدر کرد، باوکی عاس کوڕی رەبیع هاورێیەتی کردن و لەرۆژی بەدر ئەسیر کرا و لەمەدینە لای پێغەمبەر مایەوە.

عایشە دەڵێت: کاتێك خەڵکانی مەککە، بەهای ئازادی ئەسیرەکانی خۆیانیان نارد، زێنەب کچی پێغەمبەر، بەهای ئازادی باوکی عاس کوڕی رەبیعی نارد. ئەو گەردنبەندە بوو خەدیجە لەکاتی مردن پێی بەخشیبوو.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر گەردنبەندەکەی بینی، دڵی پڕ بوو و وتی: ئەگەر دەتوانن، ئەسیرەکەی ئازاد بکەن و گەردنبەندەکەی بۆ بگێڕنەوە.

وتیان: ئەو کارە دەکەین. باوکی عاسیان ئازاد و گەردنبەندەکەی زێنەبیان گەڕاندەوە.

پێغەمبەر داوای لەباوکی عاس کردبوو زێنەب تەڵاق بدات یا ئەمە یەکێك بوو لەمەرجەکانی ئازادی باوکی عاس بەڵام لەمبارەوە هیچیان قسەیان نەکرد تا راستییەکان دەرکەوێت.

کاتێك باوکی عاس ئازاد کرا و بۆ مەککە گەڕایەوە، پێغەمبەر زەید کوڕی حارسە و یەکێك لەئەنسارییەکانی نارد و فەرمووی: لەدۆڵی یاجج بمێننەوە تا زێنەب بێت و لەگەڵ ئەو بۆ مەدینە بگەڕێنەوە. ئەوان یەك مانگ یا کەمتر دوای شەڕی بەدر بەرەو مەککە بەرێکەوتن.

کاتێك باوکی عاس گەیشتە مەککە بەزێنەبی وت: بۆ لای باوکت بڕۆ. ئەو، کەرەستەکانی سەفەری ئامادە کرد.

زێنەب دەڵێت: لەو کاتەی لەمەککە خۆم ئامادە دەکرد تا بۆ لای باوکم کۆچ بکەم، هیند کچی عوتەبە هاتە لای من و وتی: کچی محەممەد، بیستوومە دەتەوێت بۆ لای

باوکت کۆچ بکەیت؟ وتی: نا.

وتی: کچی مام وا مەڵێ ئەگەر سامان یا شتێکت پێویستە پێم بڵێ تا بۆتی ئامادە بکەم چوونکە ئەوەی لەنێوان پیاواندایە لەناو ژناندا نییە.

دەڵێت: سوێند بەخوا دڵنیا بووم ئەوەی دەیهێنێتە سەرزمان، ئەنجامی دەدات بەڵام لێی دەترسام وبۆیە وتم: ناڕۆم.

کاتێك کچی پێغەمبەر کەرەستەکانی سەفەرەکەی ئامادە کرد، کەنانە کوڕی رەبیع برای مێردەکەی وشترێکی پێدا تا سواری بێت. تیروکەوانەکەی خۆی هەڵگرت و لەڕۆژدا ئەوی لەمەککە بردەدەر. زێنەب لەناو کەژاوەدا بوو.

پیاوانی قورەیش باسی ڕۆشتنی زێنەبیان دەکرد و شوێنی کەوتن. لەزی تەوا پێیگەیشتنەوە. یەکەم کەسان بینییان، هوبار کوڕی ئەسوەد کوڕی موتەلیب و نافیع کوڕی عەبدقەیس فیهری بوون. هوبار زێنەبی لەناو کەژاوەکەیدا ترساند و وەك وتوویانە زێنەب، دووگیان بوو. منداڵەکەی لەبارچوو. برای مێردەکەی لەسەر زەوی راکشا، تیردانەکەی کردەوە و وتی:

هەرکەس لەمن نزیك بکەوێتەوە، دەیکوژم. خەڵکان گەڕانەوە.

ئەبوسوفیان و سەرکردەکانی قورەیش کۆبوونەوە و وتیان: تیر مەهاوێژە تا قسەت لەگەڵ بکەین.

کوڕی رەبیع دەستی لەتیرهاویشتن هەڵگرت. ئەبوسوفیان هات، وەستاو وتی: ئەمە راست نییە لەبەرچاوی ئێمەدا زێنەبت هێنایەدەر بۆ ئەوەی ڕەوانەی بکەیت. تۆ زیان و ئازارەکانی ئێمە دەزانیت کە لەدەست محەممەد چیمان بەسەر هاتووە و ئەگەر بەئاشکرا کچەکەی ئەو لەنێوان ئێمە ببەیتەدەر، خەڵکان گومان دەکەن لەئازار و ترسی ئەو ریسوا و زەلیل بووین. ئێمە نامانەوێت ئەو لێرە بهێڵینەوە، بیگەڕێنەرەوە و کاتێك دەنگ و ئاژاوە دامرکایەوە و خەڵکان وتیان ئەومان گەڕاندەوە، بەنهێنی بۆ لای باوکی ڕەوانەی بکە.

کوڕی رەبیع ئەو کارەی کرد و کاتێك دەنگەدەنگ نەما، شەوانە و بەنهێنی ئەوی بەرێخست و تەسلیم بەزەید کوڕی حارسە و هاورێکەی کرد کەهێنایان بۆ لای پێغەمبەر.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: باوکس عاس لەمەککە و زێنەب لەمەدینە لای پێغەمبەر بوو.

ئیسلام جیایی لەنێوان ئەوان دروست کرد. ماوەیەك بەر لەگرتنی مەککە باوکی عاس بەمەبەستی بازرگانی کردن رووی لەشام کرد. سامانی پێبوو لەبەر ئەوەی ئەمینی سامانی قورەیشییەکان و کالاَکانی خۆیانیان بەو سپاردبوو.

کاتێك لەبازرگانی و مامڵە کردن تەواو بوو، گەڕایەوە. دەستەیەك کە پێغەمبەر ئەوانی ڕەوانە کردبوو، ئەویان بینی و سامانەکەیان ڕفاند و هەلاَتن. کاتێك نێردراوان ماڵی کوڕی عاسیان بردە لای پێغەمبەر، باوکی عاس لەتاریکی شەو ڕۆشتە لای زێنەب و داوای کرد پەنای بدات. زێنەب پەنای پێدا تا سامانەکەی وەربگرێتەوە.

بەرەبەیان پێغەمبەر ڕۆشتەدەر، تەکبیری وت و خەڵکان تەکبیریان وت. زێنەب لەناو ریزی ژنان هاواری کرد: ئەی خەڵکینە من پەنام بەباوکی عاسداوە.

کاتێك پێغەمبەر سلاَوی دایەوە، رووی کردە خەڵکان و فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئایا ئەوەی من بیستم ئێوەیش گوێتان لێ بوو؟

وتیان: بەڵێ.

فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، ئاگام لەم رووداوە نەبوو تا ئێستا لەگەڵ ئێوەدا گوێبیستی بووم.

پێغەمبەر ڕۆشتە لای کچەکەی و وفەرمووی: کچی خۆم، رێزی لێبگرە بەلاَم ڕێگە مەدە لەگەڵت بخەوێت چوونکە حەلاَلی نیت.

عەبدوالله کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: پێغەمبەر ئەو کەسانەی بانگ کرد کەسامانی کوڕی عاسیان گرتبوو، فەرمووی: پەیوەندی ئەم پیاوە لەگەڵ ئێمە دەزانن، ئێوە دەستتان بەسەر سامانی ئەودا گرتووە، حەز دەکەم چاکە بکەن و بۆی بگەڕێننەوە، ئەگەر نەخوازن تالاَنییە و خواوەند بەئێوەی بەخشیووە.

وتیان: ئەی پێغەمبەر، سامانەکەی بۆ دەگەڕێنینەوە.

دەڵێت: سامانی کوڕی عاسیان گەڕاندەوە بێ کەم و کوڕی.

باوکی عاس سامانەکەی بۆ مەککە برد. هەموو ئەمانەتی قورەیشییەکانی بۆ خاوەنەکانیان گەڕاندەوە، وتی: ئەی قورەیشییەکان، ئایا کەستان شتی لای من ماوە وەرینەگرتبێت؟

وتیان: نە، خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە چوونکە وەفادار و ئەمانەتدار بوویت.

وتی: ئێستا شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە نییە و محەممەد نێردراو و بەندەی ئەوە. وتی: نەڕۆشتمە لای موسوڵمانان لەبەر ئەوەی نەکا گومان بکەن دەمەوێت

سامانی ئێوە بخۆم، ئێستا کەسامانەکاتان بۆ گەڕاوەتەوە، باوەڕم هێنا.

عەبدوالله کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر زێنەبی دوای شەش مانگ، جارێکی دیکە لەباوکی عاس مارە کردەوە.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: دوای ڕووداوی بەدر، عومەیر کوڕی وەهبی جومەحی لەگەڵ سەفوان کوڕی ئومەییە لەحیجر دانیشتبوو. عومەیر کوڕی وەهب یەکێك بوو لەشەیتانەکانی قورەیش و لەریزی ئەو کەسانەدا بوو ئازاری پێغەمبەر و موسوڵمانانی دەدا. کوڕی وەهب یەکێك بوو لەئەسیرەکانی بەدر.

عومەیر باسی کوژراوەکانی ناو چاڵەکەی کرد و سەفوان وتی: سوێند بەخوا ژیان دوای ئەوان سوودی نییە.

عومەیر وتی: راست دەکەیت، ئەگەر قەرزار نەدەبووم و نانخۆری زۆر لەسەر سفرەم دانەدەنیشت، سوار دەبووم و دەڕۆشتمە مەدینە و محەممەدم دەکوشت چوونکە کوڕەکەی من لای ئەوان ئەسیرە.

سەفوان کوڕی ئومەییە ئەم هەلەی قۆستەوە و وتی: قەرزەکەی تۆ دەدەمەوە و نانخۆرەکانی تۆ لەسەر سفرەکەی خۆم دادەنێم و هیچیان لیّ درێغ ناکەم.

عومەیر وتی: ئەم گفتوگۆیە نهێنی بێت.

سەفوان وتی: رازیم.

عومەیر وتی شمشێرەکەی تیژ و ژەهراوی بکەن. بەرێکەوت تا گەیشتە مەدینە و کاتێك عومەر کوڕی خەتاب و دەستەیەك لەموسوڵمانان باسی شەڕی بەدر و ڕووداوەکانی ئەو رۆژەیان دەکرد، عومەر بینی عومەیر وشترەکەی لەبەردەم دەرگای مزگەوتا خەواند. شمشێرەکەی هەڵواسرابوو، وتی: ئەم سەگە، دوژمنی خوا بۆ شەڕ هاتووە، ئەمە ئەو کەسەیە رۆژی بەدر خەڵکانی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێمە هاندەدا و چەند کەسێکی لەئێمە کوشت.

عومەر ڕۆشتە لای پێغەمبەر و وتی: ئەی پێغەمبەر، دوژمنی خوا، عومەیر کوڕی وەهب هاتووە و شمشێری بەستووە.

پێغەمبەر فەرمووی: بیهێنە بۆ لای من.

عومەر ڕۆشت و بەندی شمشێرەکەی ئەوی گرت و بەچەند کەسێك لەئەنساری وت: بڕۆنە لای پێغەمبەر و دانیشن و ئاگاتان لەم گڵاوە بێت و نابێت لێی ئاسوودە بن.

عومەیری بردە لای پێغەمبەر.

کاتێك پێغەمبەر بینی عومەر بەندی شمشێرەکەی گرتووە، فەرمووی: بەرەڵای بکە. بەعومەیری فەرموو: وەرە پێش.

کاتێك عومەیر ڕۆشتە پێش، وتی: ڕۆژتان باش. ئەمە سڵاو کردنی سەردەمی جاهلییەت بوو.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەی عومەیر، خواوەند سڵاوێکی باشتری لەوەی تۆ بەئێمە بەخشیووە، یانی سڵاو کردن کەتایبەتە بەبەهەشتییەکان.

عومەیر وتی: سوێندە بەخوا تازە دەیبیستم.

پێغەمبەر فەرمووی: بۆ چی هاتوویت؟

عومەیر وتی: بۆ ئازادی ئەسیرەکەم کە لەدەستی ئێوەدایە.

پێغەمبەر فەرمووی: بۆ شمشێرت بەستووە؟

عومەیر وتی: ئەم شمشێرانە زۆر خراپن چوونکە هاوکاری ئێمەیان نەکرد؟

پێغەمبەر فەرمووی: راستی بڵێ، بۆ چی هاتوویت؟

عومەیر وتی: بۆ ئازادی ئەسیرەکەم.

پێغەمبەر فەرمووی: تۆ و سەفوان کوڕی ئومەییە لەحوجر دانیبشتبوون و بیری کوژراوەکانی ناو چاڵ کەوتنەوە. تۆ وتت ئەگەر قەرز و نانخۆری زۆرم نەدەبوو، دەڕۆشتم و محەممەدم دەکوشت. سەفوان قەرز و نانخۆرەکانی تۆی لەئەستۆ گرت تا من بکوژت بەڵام خواوەند لەنێوان من و تۆ لەمپەرێکی دروست کرد.

عومەیر وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خواییت، کاتێك باسی هەواڵی ئاسمانەکانت دەکرد وتەکانی تۆم بەدرۆ دەزانی و هاتنەخوارەوەی وەحیم بەراست نەدەزانی، لەم گفتوگۆیەدا جگە لەمن و سەفوان کەس ئامادە نەبوو و دەزانم خواوەند تۆیی لەو وتوێژە ئاگادار کردۆتەوە، سپاس بۆ خوا کە بۆئیسلام رێنوێنی کردم و منی خستە سەر ئەو رێگەیە. ((دواتر شایەتوومانی هێنایە سەرزمان.))

پێغەمبەر فەرمووی: فێرکارییە دینییەکان فێری براکەی خۆتان بکەن. قورئانی بۆ بخوێنن و ئەسیرەکەی ئازاد بکەن.

دەڵێت: ئەو کارەیان کرد.

عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەر هەوڵم دەدا ڕووناکی خواوەند بکوژێنمەوە و ئەشکەنجەی موسوڵمانانم دەکرد. حەز دەکەم مۆڵەتم پێ بدەیت بڕۆم بۆ مەککە و

پێشنیاری ئیسلام بەکەسەکانی خۆم بکەم ئەگەری هەیە خوا ڕێنوێنییان بکات و گەرنە ئەشکەنجەیان دەکەم.

پێغەمبەر مۆڵەتی پێدا و عومەیر ڕێگەی مەککەی گرتەبەر.

کاتێك عومەیر لەمەککە هاتەدەر، سەفوان بەقوڕەیشییەکانی دەوت: دڵخۆش بن چوونکە لەم ڕۆژانەدا هەواڵێکتان پێدەگات کەزیانی شەڕی بەدرتان لەبیر دەباتەوە. لەکاروانییەکان سەبارەت بەباس و خواسەکان پرسیاری دەکرد تا ئەوەی کەسێك پێی وت عومەیر باوەڕی هێناوە. سەفوان سوێندی خوارد هیچ کات قسەی لەگەڵ نەکات و هیچ کارێکی بۆ نەکات.

کاتێك عومەیر گەیشتە مەککە، پێشنیاری ئیسلامی بەخەڵکان دەکرد و ئەشکەنجەی ئەو کەسانەی دەدا دژایەتییان دەکرد. ژمارەیەکی زۆر لەکەسەکان لەسەر دەستی ئەو باوەڕیان بەئیسلام هێنا.

کاتێك ڕووداوی بەدر کۆتایی پێهات، خواوەند هەموو سووڕەی ئەنفالی سەبارەت بەو شەڕە بۆ پێغەمبەر ناردەخوار.

عومەر کوڕی خەتاب دەڵێت: لەڕۆژی بەدر کەهەر دوو دەستەکە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، خواوەند شکستی بەناباوەڕان بەخشی و حەفتا کەسییان لێکوژرا و حەفتایان ئەسیرکرا. پێغەمبەر لەگەڵ عەلی و ئەبوبەکر و عومەر سەبارەت بەئەسیرەکان ڕاوێژی کرد.

ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەر، ئەمانە برا و خزمەکانی ئێمەن. بەبۆچوونی من بەهای ئازادی ئەوان وەربگرە تا ببێتە هۆی بەهێزی موسوڵمانان. ئەگەری هەیە خواوەند بۆ ئیسلام ڕێنوێنیان بکات و ببنە موسوڵمان و هاوڕێی ئێمە.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەی کوڕی خەتاب بۆچوونی تۆ چییە؟

وتم: سوێند بەخوا بۆچوونی من هاوشێوەی ئەبوبەکر نییە، بۆچوونی من ئەوەیە فلان کەس تەسلیمی من بکەیت تا بیکوژم و براکەی حەمزە تەسلیم بەخۆی بکەیت تا بیکوژێت و عەقیل تەسلیمی عەلی بکەیت بۆ ئەوەی بیکوژێت تا خوا بزانێت ئێمە بەرابەر بەناباوەڕان لێبوردەمان نییە چوونکە ئەوانە سەرکردەکانی کوفر و ناباوەڕین.

دەڵێت: پێغەمبەر بۆچوونەکەی ئەبوبەکری پەسەند کرد و ئەوەی منی پشتگوێ خست و بەهای ئازادی ئەسیرەکانی وەرگرت.

عومەر کوڕی خەتاب دەڵێت: ڕۆژێکی دیکە ڕۆشتمە لای پێغەمبەر، لەگەڵ ئەبوبەکر دانیشتبوو و دەگریان. بەپێغەمبەرم وت: پێم بڵێن بۆ دەگرین، ئەگەر شتێکە ڕوویداوە با منیش بگریم و ئەگەر هیچ ڕووینەداوە، با نەهێڵم ئێوەیش بگرین.

پێغەمبەر فەرمووی: بەهۆی ئەو بەهای ئازادییەی هاوەڵانی تۆ بەمنیان وت، ئازاری خوایی لەم دارە نزیکترە. ئاماژەی بۆ دارێك کرد کەخواوەند ئەم ئایەی ناردۆتە خوار:

(( ما كان لنبى ان يكون له اسرى حتى يثخن فى الارض تريدون عرض الدنيا و الله يريد الاخرة و الله عزيز حكيم.

واتاکەی: شیاو نییە بۆ پێغەمبەرێك کەئەسیرانی هەبێت بۆ ئەوەی لەسەر زەوی کوشتار بکەن. ئێوە مەبەستەکانی دنیاتان دەوێت و خواوەند پاداشتی ئەو جیهانەی بۆ ئێوە دەوێت چوونکە خواوەند بەهێز و فرەزانە.))

دواتر تالانییەکان بۆ موسوڵمانان حەلاڵ کرا و لەساڵی دواتر لەشەڕی ئوحود سەرئەنجامی کارەکەی خۆیانیان بینی و حەفتا کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر کوژران و حەفتا کەسیان لێ ئەسیر کرا و دانی پێغەمبەر شکا و خودەکەی لەسەریدا ورد بوو و خوێن بەروخساریدا هاتەخوار. هاوەڵانی پێغەمبەر هەڵاتن و بەکێوەکەدا سەرکەوتن و خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((اولما اصابتكم مصيبة قداصبتم مثليها قلتم انى هذا قل هو من عند انفسكم ان الله على كل شيئى قدير).

واتاکەی: بۆ کاتێك زیانتان بەرکەوت لەکاتێکدا دوو بەرابەری ئەوە زیانتان گەیاندبوو، وتتان: ئەم زیانە لەکوێوە بەر ئێمە کەوت؟ بڵێ: ئەمە لەلایەن خۆتانەوە بوو چوونکە خواوەند بۆ هەموو شتێك بەتوانایە))

هەروەها ئەم ئایەی ناردەخوار:

((اذتصعدون و لا تلون على احدوالرسول يدعوكم فى اخراكم فاثابكم غما بغم لكيلا تحزنوا على مافاتكم و لا ما اصابكم و الله خبير بما تعملون. ثم انزل عليكم من بعد الغم امنة.

واتاکەی: ئەو ساتەی دوور دەکەوتنەوە و گرنگیتان بەکەس نەدەدا و پێغەمبەر لەدواوە بانگی ئێوەی دەکرد و خواوەند خەمێکی بۆ خستنە سەر خەمێکی دیکە، بۆ ئەوەی؛ بۆ ئەوەی لەدەستتان داوە خەم نەخۆن و خواوەند لەوەی ئەنجامی دەدەن،

ئاگاداره. سەرئەنجام دوای خەمەکان، ئارامی وئاسایشی بۆ ئێوه نارد.))

عەبدوالله کوڕی مەسعود دەڵێت: لەرۆژی شەڕی بەدر، کاتێك ئەسیرەکانیان هێنا، پێغەمبەر فەرمووی: سەبارەت بەئەسیرەکان بۆچوونتان چییە؟

ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەر، خزم وکەس و کاری تۆن، بەزیندووی بیانهێڵەرەوە و مۆڵەتییان پێبدە ئەگەری هەیە خواوەند بەتۆبەکەی ئەوان رازی ببێت.

بەڵام عومەر وتی: ئەی پێغەمبەر، حاشایان لەخواوەندی تۆ کرد و دەریان کردیت، بیانهێنە و بیانکوژە.

عەبدوالله کوڕی رەواحە وتی: ئەی پێغەمبەر، بەدوای دۆڵێکی پڕ چیلکە و چەوێڵدا بگەڕێت و ئەسیرەکان لەناو دۆڵەکەدا بسووتێنە.

عەباس پێی وت: خزمەکانت لەتۆ دەپچڕێن.

پێغەمبەر بێدەنگ بوو و هیچ نەوت و ڕۆشتە ژوور.

خەڵکان وتیان: وتەکانی ئەبوبەکر پەسەند دەکات.

کەسانێکی دیکە وتیان: وتەکانی عومەر پەسەند دەکات.

کەسانی دیکە وتیان: بۆچوونەکەی عەبدوالله کوڕی رەواحە پەسەند دەکات.

پێغەمبەر هاتەدەر و فەرمووی: خواوەند دڵی ئەو کەسانە بۆ باوەڕهێنان نەرم دەکات کە لەشیر نەرمتر بن و دڵی ئەو کەسانە ڕەق دەکات کە لەبەرد ڕەقتر بن. ئەی ئەبوبەکر نمونەکەی تۆ هاوشێوەی ئیبراهیمە کەوتی: هەرکەس شوێن من کەوێت لەمنە و هەرکەس نافەرمانی من بکات، خواوەندا تۆ بەخشندە و مێهرەبانی. و نمونەکەی تۆ هاوشێوەی عیسایە کەوتی: ئەگەر سزایان بدەیت، بندەکانی تۆن و ئەگەر بیانبەخشیت، تۆ بەهێز و دانایت. بەڵام نمونەکەی تۆ ئەی عومەر هاوشێوەی نوحە کەوتی: خواوەند هیچ کەس لەکافرەکان لەسەر زەوی بەزیندووی مەهێڵەرەوە و نمونەکەی تۆ هاوشێوەی وتەکەی موسایە کەوتی: خواوەندا سامانەکەیان لەناو ببە و دڵیان ڕەق بکە بۆ ئەوەی هیچ کات باوەڕ نەهێنن تا ئازابێکی مەترسیدارتر بچێژن.

دواتر پێغەمبەر فەرمووی: هەنووکە ئێوە خێزاندارن، هیچ ئەسیرێك لەدەست مەدەن تا بەهای ئازادییەکەی وەردەگرن.

دەڵێت، وتم: مەگەر سوهەیل کوڕی بەیزا کەباسی ئیسلامی دەکرد. پێغەمبەر وەڵامی نەدایەوە، ترسام بەردێك لەئاسمانەوە بکەوێتە خوار و بەرسەرم بکەوێت تا ئەو کاتەی

پێغەمبەر فەرمووی: مەگەر سوهەیل کوڕی بەیزا. خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((ما كان لنبى ان يكون له اسرى حتى يثخن فى الارض. تريدون عرض الدنيا و الله يريد الاخرة و الله عزيز حكيم. لولا كتاب من الله سبق لسكم فيما اخذتم عذاب عظيم. فكلوامما غنمتم حلالا طيبا و اتقواالله غفور رحيم.

واتاکەی: شیاو نییە بۆ پێغەمبەر ئەسیری هەبێت بۆ ئەوەی لەسەر زەوی کوشتار بکەن، ئێوە مەبەستەکانی ئەم جیهانەتان دەوێت و خواوەند بۆ ئێوە مەبەستەکانی ئەو دنیا چوونکە خواوەند بەهێز و فرەزانە. ئەگەری خواوەند نەیدەخواست لەبارەی ئەو ئەسیرانەوە ئازابێکی مەترسیدارتان پێدەبرا. ئەوەی وەك تالآنی هەڵتانگرتووە، بۆ ئێوە حەلآڵ و ڕەوایە و لەنافەرمانی خۆتان بەدوور بگرن چوونکە خواوەند بەخشەر و ڕەحیمە)).

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئایەی ما کان لنبی هاتەخوار، پێغەمبەر فەرمووی: ئەگەر لەئاسمانەوە ئازاب دەباری، کەس جگە لەسەعد کوڕی مەعاز لێی ڕزگار نەدەبوو لەبەر ئەو وتەی هێنایە سەرزمان: ئەی پێغەمبەر زێدەڕۆیی کردن لەکوشتارمان زیاتر بەلاوە پەسەند بوو تا هێشتنەوەی کەسەکان.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی کوڕی ئیسحاق ژمارەی موهاجیرەکانی ئامادە بوو لەشەڕی بەدر کە پێغەمبەر تالآنی لەناویاندا دابەش کرد هەشتا و سێ کەس بوو و هەموو ئەوسییەکانی ئامادە لەشەڕەکە کەتالآنییان بەرکەوت، شەست و یەك کەس و خەزەرجییەکانی ئامادە لەشەڕەکە سەد و حەفتا کەس. چواردە کەس لەموسوڵمانەکان کوژران، شەشیان لەموهاجیرەکان و هەشتیان لەئەنسار.

بەوتەی واقدی ژمارەی ناباوەڕان نۆسەد و پەنجا کەس و سەد ئەسپیان لەگەڵدا بوو. هەروەها بەوتەی ئەو لەڕۆژی بەدر پێغەمبەر ڕێگەی نەدا بەو کەسانەی تەمەنیان کەم بوو بەشداری لەشەڕەکەدا بکەن. عەبدوالله کوڕی عومەر و ڕافیع کوڕی خەدیج و بەرا کوڕی عازەب وزەید کوڕی سابت و ئەسید کوڕی زوهەیر و عومەیر کوڕی ئەبی وەقاس لەناویاندا دەبینران. بەڵام دوای ئەوەی ڕێگەی لەعومەیر گرت، مۆڵەتی پێدا بەشداری لەشەڕەکە بکات و کوژرا.

پێغەمبەر پێش ئەوەی بڕواتە مەدینە، تەڵحە کوڕی عوبیدالله و سەعید کوڕی زەید کوڕی عەمرۆ کوڕی نوفەیلی بۆ بەدەست هێنانی هەواڵی کاروانەکە بۆ سەر ڕێگەی شام

نارد کە لەرۆژی بەدر گەڕانەوە بۆ مەدینە. کاتێك پێغەمبەر لەبەدرەوە بەرەو مەدینە گەڕایەوە، لەتوربان، پەیوەستی پێغەمبەر بوون.

واقدی دەڵێت: پێغەمبەر لەگەڵ سێسەد و پەنجا کەس ڕۆشتەدەر، حەفتا و چوار کەسیان لەموهاجیرەکان و ئەوانی دیکە لەئەنسار بوون. تالآنی شەڕی بەهەشت کەسدا کەبەشداری شەڕیان نەکرد: سییان لەموهاجیرەکان، عوسمان کوڕی عەفان کە لەسەر سەری کچی پێغەمبەر مابوویەوە تا مرد، تەڵحە کوڕی عوبەیدالله و سەعید کوڕی زەید کەئەوانی بۆ بەدەست هێنانی هەواڵی کاروانەکە ناردبوو. پێنج کەس لەئەنسار، باوکی لەبابە کوڕی بەشیر کوڕی عەبدولمونزەر کەوەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشانی کردبوو، عاسم کوڕی عودەی عێجلان کە ئەوی لەناوچەی مەدینە دانابوو و حارس کوڕی حاتب کە لەئەروحا بەهۆی ئەو شتەی سەبارەت بەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف بیستبووی، ئەوی بۆ لای ئەوان نارد و حارس کوڕی سەمە و خەوات کوڕی جوبەیر کە لەروحا نەخۆش کەوتن.

دەڵێت: موسوڵمانەکان حەفتا و دوو وشتر و دو ئەسپیان پێبوو. ئەسپێکیان هی میقداد کوڕی عەمرۆ و ئەوی دیکەیان هی مورسەد کوڕی ئەبی مورسەد بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەرۆژی بەدر پێغەمبەریان شمشێر بەدەست بینیبوو شوێن ناباوەڕان دەکەوت و دەیفەرموو: ئەم دەستەیە لەناو بچێت و شکست لەناویاندا بڵاو ببێتەوە.

دەڵێت: لەشەڕی بەدر پێغەمبەر زولفەقاری مونەبە کوڕی حەجاجی وەك تالآنی هەڵگرت لەگەڵ وشترەکەی ئەبوجەهل کەوشترێکی تیژپێ بوو. سوار لەسەر ئەو وشترە بەشداری شەڕەکانی دەکرد و بۆ کشتوکاڵ کەڵکی لێوەردەگرت.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: دوای بەدر پێغەمبەر لەمەدینە نیشتەجێ بوو. کاتێك بۆ مەدینە کۆچی کرد پەیمانی لەگەڵ جولەکەکان بەست کە دژی ئەو، هاوکاری کەس نەکەن و ئەگەر دوژمنێك هێرشی کردە سەر موسوڵمانان، پێویستە هاریکاریان بن. کاتێك دەستەیەك لەناباوەڕان لەبەدر کوژران، جولەکەکان رژدییان برد و وتیان: محەممەد ڕووبەرووی کەسانێك بوویەوە شارەزای چۆنییەتی شەڕ کردن نەبوون، ئەگەر ڕووبەرووی ئێمە ببێتەوە، شەڕێك دەبینێت کەهاوشێوەی نەبینیبێت. پەیمانەکەی خۆیان شکاند.

## شەڕی مناڵەکانی قینقاع

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: داستانی مناڵەکانی قینقاع بەو شێوەیە: پێغەمبەر ئەوانی لەبازاڕ کۆکردەوە و فەرمووی: ئەی دەستەی یەهوود لەخوا بترسن چوونکە زیانێکی هاوشێوەی قوڕەیشییەکان بەسەر ئێوەدا دەبارێنێت، باوەڕ بەخوا بێنن چوونکە دەزانن من پێغەمبەری نێردراوم و ئەمە لەکتێبەکەی خۆتاندا دەبینن.

جوولەکەکانی مناڵەکانی قینقاع وتیان: ئەی محەممەد گومان دەکەیت ئێمەیش هاوشێوەی خەڵکەکەی تۆین، لەخۆت بایی مەبە چوونکە ڕووبەڕووی کەسانێك بوویتەوە شارەزای جەنگ نەبوون و دەرفەتێکت دەست کەوت. سوێند بەخوا ئەگەر ڕوبەڕووی ئێمە ببیتەوە، دەزانیت ئێمە چۆن شەڕکەرانێکین.

قتاد دەڵێت: جوولەکەکانی مناڵەکانی قینقاع یەکەم دەستەی جوولەکە بوون لەنێوان بەدر و ئوحود پەیمانی خۆیانیان شکاند و شەڕیان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کرد.

زوهری دەڵێت: شەڕی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ مناڵەکانی قینقاع لەشوالیساڵی دووەمی کۆچ ڕوویدا.

عورو دەڵێت: جبرەئیل ئەم ئایەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) هێنا:

((و اما تخافن من قوم خیانة فانبذ الیهم علی سواء.

واتاکەی: ئەگەر خیانەتت لەدەستەیەك بینی، دادپەروەرانە پێیان ڕابگەیێنە.))

کاتێك جبرەئیل کۆتایی بەئایەکە هێنا، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من لەمناڵەکانی قینقاع دەترسم. بەپێی ئەم ئایە بۆ شەڕی ئەوان خۆی ئامادە کرد.

واقدی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ گەمارۆی خستە سەر جوولەکەکانی مناڵەکانی قینقاع، کەس لەوان بۆ شەڕ نەهاتەدەر، دواتر لەسەر فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) تەسلیم بوون و دەستی ئەوانیان بەستەوە. پێغەمبەر(د.خ) دەیویست بیانکوژێت بەڵام عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی سەبارەت بەوان ناوبژیوانی کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك جولەکەکان لەسەر فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) تەسلیم بوون، عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی محەممەد چاکە لەگەڵ خزمەکانی ئێمە بکە. بۆیە ئەم کارەی کرد چوونکە جوولەکەکانی مناڵەکانی قینقاع هاوپەیمانی خەزرەجییەکان بوون.

پێغەمبەر(د.خ) وەڵامی نەدایەوە و دووبارە عەبدوڵلله گەڕایەوەو وتی: ئەی محەممەد چاکە لەگەڵ خزمەکانی ئێمە بکە. پێغەمبەر(د.خ) پشتی تێکرد.

دەڵێت: عەبدوڵلله دەستی بۆ گیرفانی پێغەمبەر(د.خ) برد کەفەرمووی: دەستم بەردە و تورە بوو بەشێوەیەك کەروخساری ڕەش داگیرسا، دووبارە وتی: دەستم بەردە.

عەبدوڵلله وتی: سوێند بەخوا دەستت بەرنادەم تا چاکە لەگەڵ خزمەکانی من بکەیت، دەتەوێت چوارسەد زریٚ پۆش و سێسەد بیٚ زریٚ لەیەك ڕۆژدا بکوژیت کە منیان لەڕەش و سوور پاراستووە. من لەڕوداوەکان ئاسوودە نیم وبۆ داهاتووی خۆم دەترسم.

قتادە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئازادیان بکە کەخوا نەحلەتیان بکات و عەبدوڵللەیش لەگەڵ ئەوان بەنەحلەت بکات.

جوولەکەکانیان ئازاد کرد و فەرمانیان پێدان سەرزەمینەکەی خۆیان بەجێبێڵن. سامانی ئەوان وەك تالانی بەموسوڵمانان برا، زەوییان نەبوو. کاری ئەوان زێرنگەری بوو. بەمشێوەیە پێغەمبەر(د.خ) سامان و چەکی زۆری لەوان دەستکەوت. عوبادە کوڕی سامت ئەوانی لەگەڵ ژن و منداڵەکان لەمەدینەوە برد تا گەیشتنە زەباب ودەیوت: هەرچی دوورتر باشتر.

لەشەڕی منداڵەکانی قینقاع پێغەمبەر(د.خ)، باوکی لوبابە کوڕی عەبدولمونزەری وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: یەکەم جار بوو پێغەمبەر(د.خ) پێنج یەکی وەرگرت، پێنج یەکی تالانییەکانی هەڵگرت و چوار بەشەکەی دیکەی لەناو هاوەڵانی خۆیدا دابەش کرد.

دەڵێت: ئالای پێغەمبەر(د.خ) لەشەڕی منداڵەکانی قینقاع سپی و لەدەستی حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیبدا بوو.

پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە گەڕایەوە و جەژنی ڕەمەزانییان کرد. دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) و دەوڵەمەندەکان لەرۆژی دەی زیحەججە قوربانییان کرد. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ خەڵکان ڕۆشتە نوێژگە و نوێژی خوێند و ئەمە یەکەم جار بوو لەگەڵ خەڵکان لەنوێژگەدا نوێژی خوێند. بەدەستی خۆی دوو بزن و بەوتەیەك بزنێکی کردە قوربانی.

جابر کوڕی عەبدوڵلله دەڵێت: کاتێك لەشەڕی منداڵەکانی قینقاع گەڕاینەوە،

بەرەبەیانی دەی زیحەججە جەژنی قوربانمان کرد و ئەمە یەکەم جەژنی قوربان بوو موسوڵمانان کردیان و ئێمە، لەناو منداڵەکانی سەلمە قوربانیمان کرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کوڕی ئیسحاق بۆ شەڕی منداڵەکانی قینقاع کاتی دیاری نەکردووە جگە لەوەی دەڵێت: لەنێوان غەزوەی سەویق بوو و ڕۆشتنی پێغەمبەر(د.خ) تا منداڵەکانی سولەیم و بوحران کەدوو کانەکەی حیجاز بوو، بەمەبەستی غەزای قوڕەیش.

دەستەیەك وتوویانە: لەغەزوەی بەدری یەکەم تا شەڕی منداڵەکانی قینقاع سێ غەزا و سەفەری جەنگی ڕوویانداوە و گومانیان کردووە پێغەمبەر(د.خ) نۆی سەفەری ساڵی سێیەمی کۆچ، هێرشی کردە سەر منداڵەکانی قینقاع و ئەمە دوای گەڕانەوە لەبەدر بوو و ڕۆژی چوارشەممە هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی ڕەمەزان گەڕایەوە بۆ ناو مەدینە. پاشماوەی ڕەمەزانی لەمەدینە بەسەر برد و کاتێك ئاگادار بوویەوە منداڵەکانی سولەیم و غەتەفان کۆبوونەتەوە، بۆ غەزای قرقرەی ئەلکەدر ڕۆشتەدەر و لەڕۆژی هەینی، شواڵی ساڵی دووەمی کۆچ، دوای هەڵاتنی هەتاو، مەبەستی ئەو دیارەی کرد.

بەڵام کوڕی حەمید لەکوڕی ئیسحاق دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەبەدر بۆ مەدینە گەڕایەوە و کۆتایی هاتنی بەدر لەکۆتاییەکانی ڕەمەزان یا سەرەتای شەوال بوو، زیاتر لەحەوت ڕۆژ لەمەدینە نەمایەوە و خۆی بۆ غەزا بەرێکەوت و مەبەستی منداڵەکانی سولەیمی کرد. ڕۆشت تا گەیشتە ئاوی کەدری منداڵەکانی سولەیم و سێ ڕۆژی لەوێ بەسەر برد و بۆ مەدینە گەڕایەوە بێ ئەوەی هیچ پێشهاتێك ڕوویدات. پاشماوەی شوال و زیقەعدەی لەمەدینە بەسەر برد و لەم کاتەدا زۆربەی ئەسیرەکانی قوڕەیش بەهای ئازادی خۆیانیان دا.

بەڵام بەوتەی واقدی پێغەمبەر(د.خ) لەموحەڕەمی ساڵی سێیەمی کۆچ بۆ غەزای کەدر مەدینەی بەجێهێشت و عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاڵای ئەوی هەڵدەگرت. کوڕی دایکی مەکتوومی موعەیسی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا.

دەستەیەك وتوویانە: پێغەمبەر(د.خ) دوای شەڕی کەدر بۆ مەدینە گەڕایەوە و مەڕوماڵاتی لەگەڵ خۆی هێنا بێ ئەوەی هیچ پێشهاتێك ڕوویدات. دەی شەواڵ گەیشتە مەدینە و ڕۆژی پانزەی ئەو مانگە، غالیب کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی لەگەڵ دەستەیەك بۆ هێرش کردنە سەر منداڵەکانی سولەیم و غەتەفان ڕەوانە کرد کەخەڵکانیان کوشت و مەڕوماڵاتێکی زۆریان دەستکەوت و ڕۆژی چواردەی شەواڵ لەگەڵ تاڵانییەکان بۆ

مەدینە گەڕانەوە. لەم شەڕەدا سێ کەس لەموسوڵمانەکان کوژرا و پێغەمبەر(د.خ) تا زیحەججە لەناو مەدینە مایەوە و ڕۆژی شەممە حەوت ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججە بۆ غەزای سوەیق بەرێکەوت.

غەزوەی سوەیق

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی کوڕی ئیسحاق کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەغەزای کەدر بۆ مەدینە گەڕایەوە، پاشماوەی شەوال و زیقەعدەیی ساڵی دووەمی کۆچی لەوێ بەسەر برد، دواتر لەمانگی زیحەججە بۆ غەزوەی سوەیق ڕووبەڕووی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب بوویەوە.

دەڵێت: لەم ساڵەدا ناباوەڕان هەڵسووڕاندنی کاروباری حەجیان لەدەستدا بوو.

عەبدوالله کوڕی کەعب کوڕی مالیك لەشارەزایانی مێژووی ئەنسار ، دەڵێت: کاتێك ئەبوسوفیان کوڕی حەرب لەگەڵ کاروانەکەی گەیشتە مەککە و پاشماوەی قوڕەیشییەکان لەشەڕی بەدر گەڕانەوە، نەزری کرد دوای نزیك بوونەوە ئاو لەخۆی نەدات تا شەڕ لەگەڵ محەممەد بکات و لەگەڵ دووسەد کەس لەقوڕەیشییەکان بەرێکەوت تا سوێندەکەی خۆی بەسەر بردبێت. لەرێگەی نەجدییەوە تا سەدری قەنات بەرێکەوت گەیشتە کێوی تیت لەیەك مەنزڵی مەدینە و لەتاریکی شەو، ڕۆشتە لای منالەکانی نەزیر. لای حەیی کوڕی ئەختەب دابەزی و لەدەرگای ماڵەکەیدا. حەیی ترسا و دەرگای نەکردەوە. ئەبوسوفیان لەوێوە ڕۆشتە لای سەلام کوڕی مەشکەم سالار و گەنجینەداری منالەکانی نەزیر. سەلام ئەوی بردە ماڵەکەی خۆی و میوانداری کرد و باس و خواسەکانی بۆ گێڕایەوە.

ئەبوسوفیان بۆ لای هاورێکانی خۆی گەڕایەوە و چەند کەسێك لەقوڕەیشییەکانی بۆ نزیك مەدینە ڕەوانە کرد کە تا سنووری عەریز ڕۆشتنە پێش و چەند دارخورمایەکیان سووتاند و یەکێك لەئەنسارییەکانیان کوشت کە لەگەڵ هاوپەیمانەکەی خۆی سەرقاڵی کار لەزەوییەکەیدا بوو.

چەند کەسێك هەواڵەکەیان بەمەدینە گەیاند و پێغەمبەر(د.خ) تا قرقرە ئەلکەدر شوێنیان کەوت و لەوێوە گەڕایەوە بێ ئەوەی دەستی بەئەبوسوفیان و قوڕەیشییەکان کەوتبێت. ئەو توێشوو و کەل و پەلانەی قوڕەیشییەکان لەزەوییە کشتوکاڵییەکە بەجێیان هێشتبوو بۆ ئەوەی بەئاسانی بتوانن ڕابکەن، کەوتە دەستی موسوڵمانان.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ موسوڵمانەکان گەڕایەوە، لێیان پرسی: هیوات هەیە چاوەڕوانی پاداشتی غەزا بین؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

کاتێك ئەبوسوفیان بۆ بەڕێکەوتن لەمەککەوە بۆ مەدینە خۆی ئامادە دەکرد، بۆ هاندانی قورەیشییەکان هۆنراوەیەکی بەم ناوەڕۆکە خوێندەوە:

((هێرش بکەنە سەر یەسرب و دەستەکانیان

تا ئەوەی کۆیان کردۆتەوە، ببێتە تالآنی ئێوە

ئەگەر لەرۆژی چاڵ ئەوان سەرکەوتن

دوای ئەوە نۆرەی ئێوەیە

سوێندم خواردووە لەژنان نزیك نەبمەوە

خۆم نەشۆم

تا هۆزەکانی ئەوس و خەزرەج لەناو ببەن

چوونکە ئاگری خەم لەدڵمدا بڵێسە دەسێنێت))

بەلأم بەوتەی واقدی، غەزوەی سوەیق لەزیقەعدەی ساڵی دووەمی کۆچی روویدا.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ دووسەد کەس لەموهاجیر و ئەنسارەکان ڕۆشتەدەر. گێڕانەوەکەی هاوشێوەی گێڕانەوەی کوڕی ئیسحاقە، جگە لەوەی دەڵێت: ئەبوسوفیان لەعەریز رووبەرووی سەعید کوڕی عەمرۆ و کرێکارەکەی ئەو بوویەوە و هەردووکیانی کوشت و چەند ماڵێك و بڕێك کای سووتاند و گومانی کرد سوێندەکەی هێناوەتەدی. ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر(د.خ) گەیشت و خەڵکانی کۆکردەوەو شوێن ئەبوسوفیان کەوتن بەلأم نەیانگرت.

دەڵێت: ئەبوسوفیان و قورەیشییەکان کیسەکانی سوەیقیان فڕێدەدا بۆ ئەوەی بارەکەیان سووك بێت. زۆربەی بارەکەی ئەوان سوەیق بوو، لەبەر ئەمە ئەم غەزوەیە بەغەزوەی سوەیق ناو دەبەن.

واقدی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) باوکی لوبابە کوڕی عەبدولمونزەی کردە جێگری خۆی لەمەدینە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەزیحەججەی ساڵی دووەمی کۆچ، عوسمان کوڕی مەزعون مرد و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەبەقیع ئەسپەردە کرد و بەردێکی وەك کێلی قەبر لەسەر گۆڕەکەی دانا.

دەڵێن: حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەم ساڵەدا چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی واقدی، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، فاتیمە کچی پێغەمبەری(ص) لەزیحەجە، بیست و دوو مانگ دوای کۆچ، بردە ماڵەکەی خۆی و ئەگەر ئەم وتەیە راست بێت، وتەی یەکەم هەڵەیە.

دەڵێن: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) پێڕستی خوێنبایی نووسی کە بەشمشێرەکەیەوە هەڵواسرا بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی سێیەمی کۆچ

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەغەزوەی سوەیق گەڕایەوە، پاشماوەی زیحەججە وموحەڕەمی لەمەدینە بەسەر برد. دوای ئەوە بۆ غەزای نەجد بەڕێکەوت و مەبەستی هێرش کردنە سەر هۆزی غەتەفان بوو. ئەم غەزوەیە بەزی ئەمر ناو دەبەن. هەموو سەفەری لەنەجد بەسەر برد. دواتر بۆ مەدینە گەڕایەوە بێ ئەوەی هیچ ڕووداوێك ڕوبدات. بەشی زۆری ڕەبیع الاول لەمەدینە مایەوە و دواتر بۆ غەزا هاتەدەر و مەبەستی هێرش کردنە سەر قوڕەیش و مناڵەکانی سولەیمی کرد و گەیشتە بوحران کەکانێکە لەحیجاز و مانگی ڕەبیع الاخری و جەمادی الاولی لەوێ بەسەر برد و بۆ مەدینە گەڕایەوە بێ ئەوەی ڕووداوێك ڕوبدات.

## بەسەرهاتی کەعب کوڕی ئەشرەف

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) کەسانێکی بۆ کوشتنی کەعب کوڕی ئەشرەف ڕەوانە کرد.

بەوتەی واقدی ڕووداوەکە لەرەبیع الاولی ئەم ساڵەدا ڕوویدا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بەسەرهاتی کەعب کوڕی ئەشرەف بەم شێوەیە: کاتێك قوڕەیشییەکان لەبەدر کوژران و زەید کوڕی حارسە و عەبدوالله کوڕی رەوانە بۆ مەدینە گەڕانەوە تا مژدەی سەرکەوتن و هەواڵی کوشتاری ناباوەڕان بەخەڵکان بگەیێنن، کەعب کوڕی ئەشرەف لەخەڵکانی هۆزی نەبی و دایکی لەجوولەکەکانی مناڵەکانی نەزیر بوو، کاتێك ئەم هەواڵەی بیست، وتی: ئەی هاوار! ڕاست دەکەن؟ محەممەد ئەو کەسانەی کوشتووە کەئەم دوو پیاوە باسی دەکەن. ئەوان گەورەکانی عەرەب و سەرکردەی خەڵکان بوون، سوێند بەخوا ئەگەر محەممەد ئەوانی کوشتبێت، مەرگ بۆ ئێمە خۆشترە.

کاتێك کەعب لەراستی هەواڵەکان دڵنیا بوویەوە، بەرەو مەککە بەڕێکەوت ولای کوڕی موتەلیب ئەبی وەداعە مەنزڵی کرد. موتەلیب ڕێزی گرت و کەعب بەهاندانی ئەو چەندین هۆنراوەی دژی پێغەمبەر(د.خ) هۆنییەوە و بۆ کوژراوەکانی بەدر دەگریا. دوای ئەوە بۆ مەدینە گەڕایەوە و لەهۆنراوەکانی خۆی باسی ژنە موسوڵمانەکانی دەکرد کەبووەی هۆی ڕەنجانی ئەوان. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کێ شەڕی ئەشرەف کوڕی

کەعب کەم دەکاتەوە؟

محەممەد کوڕی موسلیمە وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من ئەو کارە دەکەم و دەیکوژم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بیکە.

کاتێك محەممەد کوڕی موسلیمە لای پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت، سێ ڕۆژ نەهیچی خوارد و نەهیچی خواردەوە. پێغەمبەریان لەم کارەی ئاگاداری کردەوە، بانگی کرد و پێی فەرموو: بۆ خواردن و خواردنەوە ناخۆیت؟

وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بەڵێنێکم داوە ودڵنیا نیم لەوەی بتوانم ئەنجامی بدەم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تەنیا ڕێگە چارەی تۆ هەوڵدانە.

وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بەناچاری دەبێت هەندێ قسە بکەین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چیت پێخۆشە بیڵێ.

وتی: محەممەد کوڕی موسلیمە و باوکی نائیلەی سەلەکان کوڕی سەلامە کە شیربرای کەعب بوو و عوباد کوڕی بیشر و حارس کوڕی ئەوس و باوکی عەبەس کوڕی جەبر بۆ کوشتنی کەعب کوڕی ئەشرەف پەیمانیان بەست، باوکی نائیلەی شاعیریان بۆ لای ئەو نارد کەکاژێرێك لەگەڵی پەیڤی و هۆنراوەیەکی بۆ خوێندەوە و دوای ئەوە پێی وت: ئەی کوڕی ئەشرەف، بۆ نیازێك هاتوومە لای تۆ، بەڵام لای کەس باسی مەکە.

وتی: ئەو کارە دەکەم.

وتی: هاتنی ئەم پیاوە زیان بوو، عەرەبەکان دوژمنایەتی ئێمە دەکەن و دژی ئێمە پەیمانییان بەستووە. ڕێگاکان داخراون و ژن و منداڵەکانی ئێمە برسییەتی تەنگی پێهەڵچنیوون و ئازار و ڕەنج بەرۆکی هەمووانی گرتووە.

کەعب وتیك بەمن دەڵێن کوڕی ئەشرەف! پێشتر پێم وتبووی سەرئەنجامی ئەم کارە چی دەبێت.

کوڕی نائیلە وتی: دەمەوێت خوراردنمان پێ بفرۆشیت و ئێمە شتێك لای تۆ دادەنێین.

کەعب وتی: منداڵەکانی خۆتان لای من دانێنن.

وتی: دەتەوێت ریسوامان بکەیت؟ من چەند کەسێکم لەگەڵدایە، دەمەوێت ئەوان بێنمە لای تۆ تا خواردنمان پێبدەیت و چاکەمان لەگەڵ بکەیت و ئێمە چەکەکانمان لای تۆ دادەنێین. دەیویست کاتێك هاوڕێکانی بەسیلاحەوە دەڕۆنە لای، گومانی خراپیان

لێنەکات.

کەعب وتی: بەسیلاحەکان رازی دەبم.

دەڵێت: سەلەکان بۆ لای هاورێکانی گەڕایەوە و بەسەرهاتەکەی بۆ باس کردن و پێی وتن چەکەکانیان هەڵگرن و لای ئەو کۆببنەوە.

دواتر هەموویان ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) کەتا بەقیعی غەرقەد لەگەڵیان ڕۆشت و ئەوانی بەرێکرد و فەرمووی: بەناوی خواوەند بڕۆن. دۆعای کرد و فەرمووی: خواوەندا، هاریکاریان بە.

پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. شەوێکی مانگەشەو بوو. ئەوان ڕۆشتن تا گەیشتنە قەڵاکەی کەعب. باوکی نائیلە بانگی کرد وکەعب کە تازە ژنی هێنا بوو، لەجێگەکەی راچەنی، ژنەکەی دەستی گرت و وتی: تۆ لەبارودۆخی شەڕدایت و پیاو لەبارودۆخی شەڕ بەمشێوەیە ناڕواتە خوار.

کەعب وتی: ئەوە باوکی نائیلەیە و ئەگەر بزانێت خەوتووم، هەڵم ناستێنێت.

ژن وتی: سوێند بەخوا لەدەنگی ئەودا نیشانەی بەڵا و شەڕ دەبینم.

کەعب وتی: ئەگەر پیاو بۆ شەڕ بانگێشت بکەن، رازی دەبێت.

دواتر لەشوێنەکەی خۆی هاتەدەر و بۆ ماوەی کاژێرێك لەگەڵیان پەیڤی، پێیان وت: با بڕۆینە دۆڵی عەجوز و پاشماوەی شەو بەدەمەتەقێ بەسەر ببەین.

کەعب وتی: هەر چۆنتان پێخۆشە.

بەرێکەوتن و بۆ ماوەی کاژێرێك بەرێگادا ڕۆشتن. دواتر باوکی نائیلە دەستی بەسەری کەعبدا هێنا و بۆنی کرد و وتی: تا ئێستا بۆنێکی بەم خۆشییەم نەبینیووە. دووبارە کاژێرێکی دیکە بەرێگادا ڕۆشتن و ئەو کارەی دووبارە کردەوە تا کەعب دڵنیا بوو. کاژێرێك دواتر دووبارە دەستی بەسەری کەعبدا هێنا، قژی گرت و وتی: دوژمنی خوا بکوژن. شمشێرەکان بەسەر سەریدا داباڕین، بەڵام کەعب نەمرد.

محەممەد کوڕی موسلیمە دەڵێت: کاتێك بینیم شمشێرەکان نەیانتوانی بیکوژن و دوژمنی خوا هاواری دەکرد و ئاگر لەهەموو قەڵاکان بڵێسەی دەسەند، بیری کێردە بچوکەکەی خۆم کەوتمەوە، دەرمهێنا و لەورگیم چەقاند تا گەیشتە کەلەکەی. دوژمنی خوا کەوت.

دەڵێت: لەشمشێرەکانی خۆمان برینێك بەر سەر یا قاچی حارس کوڕی ئەوس کەوت. بەرێکەوتین و هاتین و لەشوێنی مناڵەکانی ئومەییە کوڕی زوبەیر و مناڵەکانی

قورەیزە و بەعاس تێپەڕمان کرد تا گەیشتینە حەرەی عەریز. ئەوس کوڕی حارس بەهێواشی ڕێگەی دەبڕی چوونکە خوێنی لێ دەڕۆشت. کاژێرێك چاوەرێمان کرد. ئەو بەدواماندا دەهات، سەرئەنجام هەڵمانگرت و لەکۆتایی شەو گەیشتینە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) بۆ نوێژ وەستابوو و نوێژی دەخوێند. سڵاومان کرد و هاتە لای ئێمە و لەکوژرانی دوژمنی خوا ئاگادارمان کردەوە و پێغەمبەر(د.خ) ئاوی دەمی کردە سەر برینی هاورێکەمان و بۆ ماڵەوە گەڕاینەوە.

بەرەبەیان جولەکەکان لەکوژرانی دوژمنی خوا ترسان. هەموو جولەکەکان لەگیانی خۆیان دەترسان. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەر کەسێکی جوولەکەتان بینی، خوێنی برێژن. موحەیسە کوڕی مەسعود هێرشی کردە سەر کوڕی سەنینە و خوێنی ڕشت. ئەو یەکێك بوو لەبازرگانەکانی جوولەکە کە لەگەڵ موحەیسە و کەسەکانی هاتوچۆ و بازرگانی دەکرد. حوەیسە کوڕی مەسعود هێشتا باوەڕی نەهێنابوو و کاتێك موحەیسە جولەکەکەی کوشت، لێی دەدا و دەیوت: دوژمنی خوا، پیاوێکت کوشت کەهەموو چەوربیەکانی سکت، هی ئەوە.

موحەیسە دەڵێت: پێم وت ئەگەر ئەو کەسەی فەرمانی کوشتنی ئەوی پێداوم، فەرمانی کوشتنی تۆم پێبدات، دەتکوژم. ئەمە سەرەتای باوەڕهێنانی حوەیسە بوو، دەیوت: سوێندت دەدەم بەخوا ئەگەر محەممەد فەرمانی کوشتنی من بدات، دەمکوژی؟

وتم: بەڵێ، سوێند بەخوا ئەگەر ئەو فەرمانەم پێبدات، دەتکوژم.

وتی: ئەو دینەی ئەم بەلای بەسەر تۆدا هێناوە، سەیرە. باوەڕی هێنا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی واقدی سەری کەعب کوڕی ئەشرەفیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ).

هەروەها بەوتەی ئەو لەرەبیع الاولی ئەم ساڵە عوسمان کوڕی عەفان دایکی کولسوم کچی پێغەمبەری کردە هاوسەری خۆی و لەجومادی الاخر ئەوی بردە ماڵەکەی و لەرەبیع الاولی ئەم ساڵە، پێغەمبەر(د.خ) بۆ غەزای ئەنمار مەدینەی بەجێهێشت کەبەغەزوەی زو ئەمر بەناوبانگە.

پێشتر ئاماژەمان بەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق لەمبارەوەدا.

واقدی دەڵێت: لەدایك بوونی سایب کوڕی یەزید کوڕی ئەخت ئەلنەمر لەم ساڵەدا بوو.

## غەزوەی قەردە

واقدی دەڵێت: لەجومادی الاخری ئەم ساڵە غەزای قەردە روویدا و سالارەکەی زەید کوڕی حارسە بوو. ئەمە یەکەم جار بوو زەید کوڕی حارسە دەبووە سەرکردەی خەڵکان.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی کوڕی ئیسحاق زەید کوڕی حارسە لەسەفەرێك کە پێغەمبەر(د.خ) ئەوی ڕەوانە کرد، لەقەردە، یەکێك لەئاوەکانی نەجد، کاروانی قوڕەیشی گرت کەئەبوسوفیان هاوڕێیەتی دەکرد.

دوای شەڕی بەدر قوڕەیشییەکان لەرێگەی شام دەترسان و رێگەی عێراقیان گرتەبەر. دەستەیەك لەبازرگانەکان بەرێکەوتن. ئەبوسوفیان لەناویاندا دەبینرا وبڕێکی زۆر زیوی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو. زۆربەی کاڵای بازرگانی ئەوان زیو و پیاوێکیان لەبەکر کوڕی وائل بەناوی فورات کوڕی حەییان بەکرێ گرت تا رێگەیان نیشان بدات. پێغەمبەر(د.خ) زەید کوڕی حارسەی ڕەوانە کرد ولەسەر ئاوی قەردە رووبەروویان بوویەوە و پیاوەکانیان هەڵاتن و سامانی کاروانەکەیان تاڵان کرد و بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕانەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی واقدی غەزاکە بەمشێوە بوو کەقوڕەیشییەکان وتیان:

محەممەد رێگەی بازرگانی کردنی ئێمەی گرتووە. ئەبوسوفیان و سەفوان کوڕی ئومەیە وتیان: ئەگەر لەمەککە بمێنینەوە، سەرمایەکانی خۆمان دەخۆین.

زەمعە کوڕی ئەسوەد وتی: یەکێکتان پێ دەناسێنم ئەگەر چاو بەستراو بەرێگەی نەجدییەدا بڕوات، رێگە دەدۆزێتەوە.

سەفوان پرسی: ئەوە کێیە، ئێمە زۆرمان پێویست بەئاو نییە چوونکە لەزستاندا دەڕۆین.

زەمعە وتی: فورات کوڕی حەییان.

قوڕەیشییەکان ئەویان بەکرێ گرت و لەکاتی زستان لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن و لەزات عەرەق تێپەڕین و گەیشتنە غەمورە.

هەواڵی کاروانەکە بەپێغەمبەر(د.خ) گەیشت و ئاگادار بوویەوە کەسامان و دەفری زیوینی زۆر لەناو کاروانەکەدایە وسەفوان کوڕی ئومەییە لەگەڵ خۆی دەیبات. زەید

کوڕی حارسە بەرێکەوت و رێگەی کاروانەکەی گرت. ئەوانی گەمارۆدا و گەورەکانی خەڵك هەڵاتن و پێنج یەکی سامانی کاروانەکە بیست هەزار بوو. پێغەمبەر(د.خ) هەڵیگرت و چوار بەشەکەی دیکەی لەناو زەید و هاوەڵانیدا دابەش کرد. فورات کوڕی حەییانی ئەسیریان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێیان وت ئەگەر باوەڕ بێنیت، ناتکوژێت و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) پێشنیاری ئیسلامی پێکرد، باوەڕی هێنا و ئازاد بوو.

## کوژرانی باوکی رافیعی جوولەکە

ئەبوجەعفەر دەڵێت: وەك وتوویانە کوشتنی رافیعی جوولەکە لەم ساڵەدا بوو و هۆکارەی ئەوە بوو کەئەو، کەعب کوڕی ئەشرەفی بۆ دژایەتی کردنی پێغەمبەر(د.خ) پشتڕاست دەکردەوە و پێغەمبەر(د.خ) لەنیوەی جومادی الاخر ئەم ساڵە، عەبدوالله کوڕی عەتیکی بۆ کوشتنی ئەو نارد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) چەند کەسێکی لەئەنسار بۆ لای باوکی رافیعی جوولەکە نارد و سالاری نێردراوان عەبدوالله کوڕی عوقەبە یا عەبدوالله کوڕی عەتیك بوو. باوکی رافیع پێغەمبەری ئازار دەدا و دژی ئەو خەڵکانی هاندەدا. ئەو، لەقەڵاکەی خۆی لەسەرزەمینی حیجاز نیشتە جێ بوو.

کاتێك نێردراوەکانی پێغەمبەر(د.خ) لەشوێنەکەی نزیك کەوتنەوە، هەتاو ئاوا ببوو و خەڵکان مەڕوماڵاتەکەی خۆیان دەبردەوە. عەبدوالله کوڕی عوقەبە یا عەبدوالله کوڕی عەتیك بەهاوەڵانی خۆی وت: لێرە بمێننەوە تا من بڕۆم و لەگەڵ دەرگاوانەکە قسە بکەم، ئەگەری هەیە بتوانم بڕۆمە ژوور.

دەڵێت: کاتێك لەدەرگاکە نزیك کەوتەوە، دەمامی لەروخسار بەست، وەك بڵێی دەست بەئاو دەگەیەنێت، دەرگاوانەکە هاواری کرد: ئەی بەندەی خوا، ئەگەر دەخوازیت وەرەر ژوور چوونکە دەمەوێت دەرگاکە ببەستم.

عەبدوالله دەڵێت: ڕۆشتمە ژوور و لەتەویلەی کەرێك خۆم داشارد و کاتێك کەسەکان هاتن، دەرگاکەی داخست و کلیلەکانی بەبزمارێکەوە هەڵواسی. هەستام و کلیلەکانم هەڵگرت. باوکی رافیع لەسەرەوەی ماڵەکەی سەرقاڵی قسە کردن لەگەڵ کەسەکانی خۆی بوو. کاتێك ئەوان ڕۆشتن، من ڕۆشتمە سەر و هەر دەرگایەکم دەکردەوە، لەناوەوە دەمبەست و بەخۆمم وت ئەگەر کەسەکانی بۆ هاوکاری کردنی بێن، بەمن ناگەن تا ئەو

کاتەی دەیکوژم. سەرئەنجام گەیشتمە لای باوکی رافیع کە لەژوورێکی تاریك لەنێوان کەسەکانی ماڵەکەی دابوو. نەمدەزانی کوێیە و وتم: ئەی باوکی رافیع!

باوکی رافیع وتی: ئەمە کێیە.

دەڵێت: بۆ لای دەنگەکە ڕام کرد و بەشمشێر لێمدا. سەرمسوڕما چوونکە شمشێرەکەم کاریگەری لەسەر ئەو دانەنا. باوکی رافیع هاواری کرد و من لەژوورەکە ڕۆشتمەدەر. ساتێك دواتر وتم: ئەم هاوارە چی بوو؟

باوکی رافیع وتی: کەسێك لەژوورەوە بوو و بەشمشێر لەمنیدا.

دەڵێت: دووبارە بەشمشێر لێمدا، بریندار بوو بەڵام نەکوژرا. نووکی شمشێرەکەم لەسکی چەقاند کە لەپشتییەوە هاتەدەر و دڵنیابووم کوشتوومە، دواتر یەك لەدوای یەك دەرگاکانمە کردەوە تا گەیشتمە قادرمەیەك. قاچم خستەسەر و گومانم کرد قاچم گەیشتۆتە سەرزەوی. مانگە شەو بوو، کەوتم و قاچم شکا. بەدەستارەکەی سەرم قاچم بەست و ڕۆشتم و لای درەگاکە دانیشتم و وتم: سوێند بەخوا ناڕۆم تا لەکوژرانی ئەو دڵنیا دەبم.

دەڵێت: کاتێك کەڵەشێر بانگی بەرز کردەوە، یەکێك لەسەر دیواری قەڵاکە هاواری کرد: باوکی رافیع، بازرگانی خەڵکی حیجاز مرد. گەڕامەوە بۆ لای هاورێکانم و وتم: ڕابکەن. خواوەند باوکی رافیعی کوشت. بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕامەوە و بەسەرهاتەکەم بۆ باس کرد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: قاچت درێژ بکە. قاچم درێژ کرد و دەستی بەقاچمدا هێنا وەك بڵێی هیچ کات ئازاری پێنەگەیشتووە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی واقدی پێغەمبەر(د.خ) لەزیحەججەی ساڵی چوارەمی کۆچ، کەسێکی بۆ کوشتنی باوکی رافیع سەلام کوڕی ئەبی حەقیق نارد و نێردراوەکانی ئەو باوکی قەتادە و عەبدوالله کوڕی عەتیك و مەسعود کوڕی سەنان و ئەسوەد کوڕی خوزاعی و عەبدوالله کوڕی ئەنیس بوون.

کوڕی ئیسحاق بەمشێوەیە داستانەکە دەگێڕێتەوە: سەلام کوڕی حەقیق، باوکی رافیع، لەدەستەی ئەو کەسانە بوو دژی پێغەمبەر(د.خ) خەڵکانی کۆدەکردەوە و پێش شەڕی ئوحود، ئەوسییەکان، کەعب کوڕی ئەشرەفی دوژمنی خوایان کوشتبوو، خەزرەجییەکان داوایان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد تا سەلام کوڕی حەقیق بکوژن. پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی ئەو کارەی پێدان.

باوکی شیهابی زوهری دەڵێت: یەکێك لەو نیعمەتانەی خواوەند بە پێغەمبەری

بەخشیبوو ئەوە بوو دوو هۆزی ئەنسار، ئەوس و خەزرەج وەك دوو مەڕ بۆ خزمەت کردنی پێغەمبەر(د.خ) کێبڕکێیان دەکرد و هەر کاتێك ئەوسییەکان خزمەتێکیان بە پێغەمبەر(د.خ) دەکرد، خەزرەجییەکان دەیانوت: سوێند بەخوا بەم کارەیان لای پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان پێش ئێمە ناکەون. ئارام و ئاسوودە نەدەبوون تا کارێکی هاوشێوەی ئەوان ئەنجام بدەن. کاتێکیش خەزرەجییەکان کارێکیان ئەنجامدەدا، ئەوسییەکان بەوشێوەیە قسەیان دەکرد.

کاتێك ئەوسییەکان کەعب کوڕی ئەشرەف دوژمنی پێغەمبەریان کوشت، خەزرەجییەکان وتییان: بەم کارەیان پێش ئێمە ناکەون. لەناو خۆیاندا قسەیان کرد تا بزانن پیاوێکی هاوشێوەی کەعب کوڕی ئەشرەف کەدوژمنایەتی پێغەمبەر(د.خ) دەکات، کێیە. ناوی سەلام کوڕی حەقیقی نیشتەجێی خەیبەر، هاتە ناو. داوای مۆڵەتی کوشتنی ئەویان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد. پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی پێدان و هەشت کەس لەخەزرەجییەکانی بۆ کوشتنی ئەو، ڕەوانە کرد. عەبدوالله کوڕی عەتیك و مەسعود کوڕی سەنان و عەبدوالله کوڕی ئەنیس و باوکی قەتادە و خوزاعی کوڕی ئەسوەد لەناویاندا دەبینران. پێغەمبەر(د.خ) سەرکردایەتی ئەوانی بە عەبدوالله کوڕی عەتیك سپارد و فەرمووی: لەکوشتنی ژن و منالْ خۆیان بەدوور بگرن. ئەوان ڕۆشتن تا گەیشتنە خەیبەر و شەوانە بۆلای ماڵەکەی کوڕی حەقیق بەرێکەوتن. ڕۆشتنە سەرەوە تا گەیشتنە دەرگای چوونە ژوورەوە و داوای مۆڵەتیان کرد. ژنەکەی هاتەدەر و پرسی: ئێوە کێن؟

وتیان: لەخەڵکانی عەرەبین و توێشوومان دەوێت.

وتی: لەوێیە، بڕۆنە لای.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتینە ژوور، دەرگای ژوورەکەمان بەسەر ژنەکەدا بەست چوونکە دەترساین کێشەمان بۆ دروست بکات. ئەو هاواری کرد و ئەوانی لەبوونی ئێمە ئاگادار کردەوە. باوکی رافیع لەسەر جێگەکەی ڕاکشابوو. بەشمشێر هێرشمان کردە سەر. لەتاریکی شەو سوودمان لەسپییەتی ئەو وەردەگرت کەهاوشێوەی ژنێکی قیبتی نوستبوو. کاتێك ژنەکە هاواری کرد شمشێرمان دەرکێشا بۆ ئەوەی بیکوژین بەڵام وتەکەی پێغەمبەرمان بیرکەوتەوە کەرێگەی کوشتنی ژن و منالی لێدەگرتین. دەستمان لەژنەکە هەڵگرت و ئەگەر لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) نەدەبوو، دەمانکوشت.

کاتێك بەشمشێر لەباوکی رافیعماندا، عەبدوالله کوڕی ئەنیس شمشێری لەسکی چەقاند و ئەو دەیوت: بەس، بەس.

دەڵێت: هاتینەدەر و عەبدوالله کوڕی عەتیك بەجوانی نەیدەبینی، لەقادرمەکان کەوت و ئازاری پێگەیشت. ئەومان هەڵگرت و بەرەو رووبار بەرێکەوتین و لەوێ جێگەمان گرت.

جوولەکەکان ئاگریان داگیرساند و لەهەر سووچ و کەنارێکدا بەدوای ئێمەدا دەگەڕان. کاتێك هیوابڕوا بوون، بۆ لای باوکی رافیع گەڕانەوە و دەوریان گرت.

دەڵێت: وتمان: چۆن دەتوانین لەکوژرانی ئەو دڵنیا ببینەوە. یەکێك لەئێمە وتی: بڕۆین و بزانین. ڕۆشت و خۆی خستە ناو خەڵکان. کەسانێك لەجوولەکەکان لەدەوری باوکی رافیع بوون. ژنەکەی سەیرێکی کرد و دەیوت: سوێند بەخوا دەنگی کوڕی عەتیکم ناسییەوە بەڵام بڕوام نەدەکرد کوڕی عەتیك لەکوێ و ئێرە لەکوێ. دواتر بۆ لای باوکی رافیع ڕۆشت تا سەیری بکات، وتی: سوێند بەخوا مرد.

هاورێکەمان گەڕایەوە و وتی: هیچ کات وتەیەکی لەوە خۆشترم نەبیستبوو.

کاتێك هاورێکەمان گەڕایەوە و باس و خواسەکانی پێ ڕاگەیاندین، کوڕی عەتیکمان هەڵگرت و گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و لەکوژرانی دوژمنی خوا ئاگادارمان کردەوە. لەسەر ئەوە کێشەمان بۆ دروست بوو کە چ کەسێك ئەوی کوشتووە چوونکە هەموومان خۆمان بەبکوژی باوکی رافیع دەزانی.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: شمشێرەکانی خۆتان بێنن. کاتێك شمشێرەکانمان برد، پێغەمبەر(د.خ) سەیری کرد و کاتێك شمشێری کوڕی ئەنیسی بینی، فەرمووی: ئەم شمشێرە ئەوی کوشتووە، چوونکە نیشانەکانی ئیسقانی پێوە دەبینم.

حەسان کوڕی سابت سەبارەت بەکوژرانی کەعب کوڕی ئەشرەف و سەلام کوڕی ئەبی حەقیق هۆنراوەیەکی هۆنییەوە کەکورتەی ناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

(( هاوار بۆ کوڕی حەقیق و هاواری بۆ کوڕی ئەشرەف

دەستەیەکی بوێر و دلێر بوون

کەکاتێك بەشمشێری تیژ هێرشیان کردە سەر ئێوە

بەمەرگ ئێوەیان داپۆشی

چوونکە لەکاری دینەکەی خۆیان شارەزا بوون

و هۆکاری لاوازی ستەم))

کچی عەبدوالله کوڕی ئەنیس دەڵێت: ئەو کەسانەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ کوشتنی کوڕی ئەبی حەقیق ڕەوانەی کردن، عەبدوالله کوڕی عەتیك و عەبدوالله کوڕی ئەنیس و باوکی قتادە و یەکێك لەئەنسار بوون ولەشەودا گەیشتنە خەیبەر.

عەبدوالله کوڕی ئەنیس دەڵێت: ئێمە دەرگاکانمان بەست و کلیلەکانمان هەڵگرت تا ئەوەی هەموو دەرگاکان داخران. کلیلەکانمان خستە ناو چاڵێك و دواتر بۆ سەرەوەی ماڵەکە بەرێکەوتین کە کوڕی حەقیق لەوێ بوو. من و عەبدوالله کوڕی عەتیك ڕۆشتینەسەر و هاوەڵانی ئێمە لەخوارەوە دانیشتن. عەبدوالله کوڕی عەتیك داوای مۆڵەتی کرد و ژنەکەی کوڕی ئەبی حەقیق وتی: ئەمە دەنگی عەبدوالله کوڕی عەتیکە.

کوڕی ئەبی حەقیق وتی: عەبدوالله کوڕی عەتیك لەیەسربە و چۆن دەتوانێت لێرە بێت، دەرگاکە بکەرەوە چوونکە جوامێر لەم کاتەی شەو کەس لەدەرگاکەی خۆی دوور ناخاتەوە.

ژنی کوڕی ئەبی حەقیق هەستا و دەرگاکەی کردەوە. من و عەبدوالله کوڕی عەتیك ڕۆشتینە ژوور. عەبدوالله پێی وتم: ژنەکە بکوژە. شمشێرم دەرکێشا و ڕۆشتم تا ژنەکە بکوژم بەلاّم بیرم کەوتەوە کە پێغەمبەر(د.خ) ئێمەی لەکوشتنی ژن و منداڵەکان دوور خستۆتەوە، لەبەر ئەمە لەکوشتنی ژنەکە پەشیمان بوومەوە.

عەبدوالله کوڕی عەتیك بۆ لای کوڕی ئەبی حەقیق ڕۆشت.

کوڕی عەتیك دەڵێت: کوڕی ئەبی حەقیقم لەسەرەوەی ماڵەکەیدا بینی، زۆر سپی بوو. کاتێك منی بەشمشێرەوە بینی، پشتییەکەی خستە بەر شمشێرەکەی من تا خۆی بپارێزێت. ڕۆشتمە پێش و بەشمشێر لێمدا بەلاّم نەمتوانی بیکوژم و تەنیا برینداریم کرد. عەبدوالله کوڕی ئەنیس هات و وتی: بیکوژم؟

وتم: بەڵێ. عەبدوالله کوڕی ئەنیس ڕۆشت و ئەوی کوشت.

عەبدوالله کوڕی ئەنیس دەڵێت: دواتر گەڕامەوە بۆ لای کوڕی عەتیك و درێژەمان بەرێگەی خۆماندا و ژنەکەی هاواری دەکرد: باوکی رافیعیان کوشت، باوکی رافیعیان کوشت.

دەڵێت: عەبدوالله کوڕی عەتیك لەقادرمەکان کەوتەخوار و وتی: قاچم، قاچم.

ئەوم هەڵگرت و بردمەخوار و وتم: بەرێکەوە، قاچت هیچی لێنەهاتووە. بەرێکەوتین و بیرم کەوتەوە کەوانەکەم لەسەر قادرمەکان بەجێهێشتووە، بۆ هەڵگرتنەوەی گەڕامەوە،

خەیبەرییەکانم بینی شڵەژا بوون و بەدوای بکوژی کوڕی ئەبی حەقیقدا دەگەڕان. منیش هەر کەسێکم دەبینی، دەمپرسی: چ کەسێك کوڕی ئەبی حەقیقی کوشتووە.

دەڵێت: بەقادرمەکاندا سەرکەوتم و خەڵکان هاتوچۆیان دەکرد، کەوانەکەی خۆم هەڵگرت و گەڕامەوە و پەیوەستی هاوەڵانی خۆم بووم و بەرێکەوتین. ڕۆژانە خۆمان دادەشارد و شەوانە ڕێگەمان دەبڕی. لەکاتی ڕۆژ کەسێکمان بۆ پاسەوانی کردن دادەنا بۆ ئەوەی ئەگەر شتێك ببینێت، ئاگادارمان بکاتەوە. کاتێك گەیشتینە بەیزا، من پاسەوانی کردنم گرتە ئەستۆ، ئیشارەم بۆ ئەوان کرد وبەخێرایی ڕۆشتن، منیش بەدوایانەوە بووم، لەنزیك مەدینە پەیوەستیان بووم، وتیان: چی بوو، چیت بینی؟

وتم: هیچ نەبینی، بەڵام بینیم ترساون و ویستم لەترسا ڕابکەن.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەشەعبانی ئەم ساڵە، پێغەمبەر(د.خ) حەفسە کچی عومەر کوڕی خەتابی کردە هاوسەری خۆی. لەسەردەمی جاهلییەت، حەفسە ژنی خونەیس کوڕی حوزافەی سەهمی بوو. مێردەکەی پێشووی مردبوو.

هەروەها لەم ساڵەدا شەڕی ئوحود ڕوویدا.

## گێڕانەوەی شەڕی ئوحود

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هۆکاری شەڕی ئوحود لەنێوان پێغەمبەر(د.خ)و ناباوەڕانی قوڕەیش، شەڕی بەدر بوو کەدەستەیەك لەگەورەکانی قوڕەیش لەو شەڕەدا کوژران و کاتێك پاشماوەی قوڕەیشییەکان بۆ مەککە گەڕانەوە و ئەبوسوفیان کوڕی حەرب کاروانەکەی گەڕاندەوە بۆ مەککە، عەبدوڵلە کوڕی ئەبی ڕەبیعە و عێکرەمە کوڕی ئەبوجەهل و سەفوان کوڕی ئومەییە لەگەڵ چەند کەسێك لەگەورەکانی قوڕەیش کە لەشەڕی بەدر باوك یا برایان کوژرا بوو، لەگەڵ ئەبوسوفیان و هەموو ئەو کەسانەی سامانیان لەناو کاروانەکەدا بوو، ئاخاوتن و وتیان: محەممەد چاکەکانی ئێوەی کوشت، بەسامان و کاروان بۆ شەڕی ئەو هاوکاری بکەن. ئەوان ڕازی بوون و قوڕەیشییەکان و هۆزەکانی کەنانە و خەڵکانی تەهامە کە گوێڕایەڵیان بوون، بۆ شەڕی پێغەمبەر(د.خ) خۆیان ئامادە کرد.

باوکی عێزە عەمرۆ کوڕی عەبدوڵلە جومەحی لەناو ئەسیرەکانی بەدردا بوو. پێغەمبەر(د.خ) بەزەیی پیایدا هاتەوە و لەبەر ئەوەی هەژار و چەند کچی بوو، وتی: ئەی

پێغەمبەر(د.خ))، وەك دەزانی هەژارم و خێزاندارم ونیازمەند، بەزەییت بەمندا بێتەوە. پێغەمبەر(د.خ) بەزەیی بەودا هاتەوە و بەهای ئازادی لێوەرنەگرت و ئازادی کرد.

کاتی خۆ ئامادە کردن بۆ شەڕی ئوحود سەفوان بەباوکی عێزەی وت: تۆ پیاوێکی شاعیریت لەگەڵمان وەرە و بەهۆنراوەکانی خۆت ورەمان پێببەخشە.

باوکی عێزە وتی: محەممەد چاکەی لەگەڵ کردووم و نامەوێت دژی ئەو هاوکاری ئێوە بکەم.

سەفوان وتی: دەبێت هاوکاریم بکەیت و بەڵێنت پێدەدەم ئەگەر گەڕایتەوە، هەموو نیازەکانت بەدیدێنم وئەگەر کوژراییت، کچەکانت دەبەمە لای کچەکانی خۆم و هاوشێوەی ئەوان پەروەردە و بەخێویان دەکەم.

باوکی عێزە لەگەڵیان بەرێکەوت و لەناو خەڵکانی تەهامە دەسوڕایەوە و منداڵەکانی کەنانەی بۆ شەڕی هاندەدا.

موسافیع کوڕی عەبدمەناف بۆ لای منداڵەکانی مالك کوڕی کەنانە ڕۆشت و بۆ شەڕی دژی پێغەمبەر(د.خ) هانیدان.

جوبەیر کوڕی موتعیم، کۆیلەیەکی حەبەشی بوو بەناوی وەحشی کەزوبینی هاوشێوەی حەبەشییەکان دەهاویشت و کەمتر لەنیشانە پێکان هەڵەی دەکرد، بانگی کرد و پێی وت: لەگەڵ خەڵکان برۆ و ئەگەر مامی محەممەد لەتۆڵەی مامی من، توعەیمە کوڕی عودەی بکوژیت، ئازادت دەکەم.

قوڕەیشییەکان لەگەڵ هەموو کەسەکانی خۆیان لەحەبەشییەکان و منداڵەکانی کەنانە و دانیشتووانی تەهامە بەرێکەوتن. ژنانیشیان لەگەڵ خۆیان برد تا پیاوان هان بدەن و رێگر بن لەهەڵاتنیان. ئەبوسوفیان کوڕی حەرب سالاری خەڵکان، هیند کچی عوتبە کوڕی رەبیعەی لەگەڵ خۆی برد و عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل، دایکی حەکیم کچی حارس کوڕی هوشام و حارس کوڕی هوشام، فاتیمە کچی وەلید کوڕی موغەیرەی و سەفوان کوڕی ئومەییە، بەرزە و بەرتەیەك بەرە، کچی مەسعود کوڕی عەمرۆ سەقەفی لەگەڵ خۆی برد کەدایکی عەبدوالله کوڕی سەفوان بوو. عەمرۆ کوڕی عاس ریتە کچی مونەبە کچی حەجاج کەدایکی عەبدوالله کوڕی عەمرۆعاس بوو و تەڵحە کوڕی ئەبی تەڵحە سولافە کچی سەعد کوڕی شەهید کە سێ منداڵی لەو هێنایە دنیا بەناوەکانی موسافیع و جەلاس و کەلاب کەهەر سێکیان لەگەڵ باوکیان لەشەڕی ئوحود کوژران و

خەناس کچی مالیك کوڕی موزریب لەگەڵ کوڕەکەی خۆی ئەبی عەزیز کوڕی عومەیر بەرێکەوتن. ئەو، دایکی مەسعەب کچی عومەیر بوو. عەمورە کچی عەلقەمەیش کە یەکێك لەژنەکانی منالەکانی کەنانە بوو، هاورێیەتی خەڵکانی کرد.

هیند کچی عوتەبە کوڕی ڕەبیعە هەر کاتێك وەحشی دەبینی، دەیوت: کاکە ڕەش، تۆڵەی ئێمە بستێنە. کاکەڕەش، نازناوی وەحشی بوو.

قورەیشییەکان بەرێکەوتن تا لەمەدینە نزیك کەوتنەوە و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، بەموسوڵمانانی فەرموو: لەخەودا مانگایەکم بینی و بەشێوەیەکی باش لێکدانەوەم بۆ کرد و بینیم دەمی شمشێرەکەم قەڵشتی بردبوو. دەستی خۆم بۆ زرێکەم برد و بەمەدینە لێکمدایەوە، ئەگەر دەتانەوێت لەمەدینە بمێننەوە و قورەیشییەکان لەشوێنی خۆیان بەجێبێڵن چوونکە ئەگەر لەوێ بمێننەوە، گرفتاری ڕەنج و بەدبەختی دەبن و ئەگەر هێرش بکەنە سەرمان، لەمەدینە شەڕیان لەگەڵ دەکەین.

قورەیشییەکان لەرۆژی چوارشەممە گەیشتنە ئوحود و ئەو رۆژە و پێنجشەممە و هەینییان لەوێ بەسەر برد. پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی هەینی دوای نوێژی بەیانی، بەرەو دۆڵی ئوحود بەرێکەوت و لەرۆژی دووشەممە هەر دوو دەستەکە رووبەرووی یەکبوونەوە.

بۆچوونی عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی کوڕی سەلوول هاوشێوەی بۆچوونی پێغەمبەر(د.خ) بوو و پێیان وابوو نابێت لەدوژمن نزیك بکەونەوە. پێغەمبەر(د.خ) چوونەدەر لەمەدینەی پەسەند نەدەکرد بەڵام دەستەیەك لەموسوڵمانان کە لەبەدر ئامادە نەبوون و دەستەیەکییان لەئوحود کوژران، وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) با رووبەروویان ببینەوە بۆ ئەوەی نەڵێن ترساو یا لاوازین.

عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) لەمەدینە بمێنەرەوە چوونکە هەر کاتێك لەمەدینەوە بەمەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ دوژمنان بەرێکەوتووین، شکستمان خواردووە و هەر کاتێك دوژمن هاتۆتە ناو مەدینە، شکستی خواردووە. قورەیشییەکان پشتگوێ بخە چوونکە ئەگەر بمێننەوە، گرفتاری ڕەنج و ئازاب دەبن و ئەگەر بێنە ناو مەدینە، پیاوان دەستەویەخە شەڕیان لەگەڵ دەکەن و ژنان و منالان لەسەر بانەکانەوە بەردبارانیان دەکەن و ئەگەر بگەڕێنەوە، بێ هیوا گەڕاونەتەوە.

بەڵام ئەوانەی دەیانویست رووبەرووی دوژمن ببنەوە، بەرادەیەك پێداگرییان کرد کە

پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و زرێی پۆشی. ئەمە لەڕۆژی هەینی دوای نوێژی بەیانی بوو. لەهەمان ڕۆژ یەکێك لەئەنسار بەناوی مالیك کوڕی عەمرۆ، مردبوو. پێغەمبەر(د.خ) نوێژی لەسەر خوێند. دواتر لەگەڵ موسوڵمانان بەرێکەوتن و کەسەکان پەشیمان بوونەوە و وتیان: پێغەمبەر(د.خ) نابەدڵ بەرێکەوت و نەدەبوو پێداگری بکەین.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ناوەڕۆکی گێڕانەوەی سەدی جیاوازە، دەڵێت کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە کە قورەیشییەکان ولایەنگرانی ئەوان گەشتوونەتە ئوحود، بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: لەبۆچوونی خۆتان ئاگادارم بکەنەوە؟

هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) وتیان: ڕێگە بدە ڕووبەڕوویان ببینەوە.

ئەنسارییەکان وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) هەرگیز لەدیاری خۆمان دوژمن بەسەرماندا زاڵ نەبووە، چ بگات بەوەی ئێستا تۆ لەناو ئێمەدایت.

پێغەمبەر(د.خ) عەبدوالله کوڕی ئەبی سەلوولی بانگ کرد وهەرگیز ئەوی بانگ نەکردبوو، لەگەڵ ئەو راوێژی کرد، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، با لەدەرەوەی مەدینە ڕووبەڕوویان ببینەوە. پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی ئەوەی کردبوو دوژمن بێتە ناو مەدینە و لەناو کۆڵانەکانی مەدینە شەڕ لەگەڵ قورەیشییەکان بکات.

نوعمان کوڕی مالیکی ئەنساری وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) لەبەهەشت بێ بەشم مەکە چووکە سوێند بەو خوایەی بەراستی تۆی ڕەوانە کردووە، دەڕۆمە بەهەشت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بە چ هۆکارێك؟

نوعمان وتی: لەبەر ئەوەی شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە نییە و تۆ پێغەمبەری(ص) خواییت و لەشەڕ خۆم نادزمەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ڕاست دەکەیت. نەعمان ئەو ڕۆژە کوژرا.

دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) زرێکەی خۆی پۆشی و کاتێك خەڵکان پێغەمبەریان بەزرێپۆش بینی، پەشیمان بوونەوە و وتیان: خراپمان کرد، پێغەمبەرمان بەکارێك ناچار کرد کەوەحی بۆ دێت. هەستان و داوای بەخشینیان کرد و وتیان: بۆچوونی خۆت بەکار ببە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ڕەوا نییە پێغەمبەر(د.خ) زرێ بپۆشێت و بۆ شەڕ نەڕوات و زرێکەی دەربێنێت.

پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ هەزار کەس بەرەو ئوحود بەڕێکەوت و فەرمووی: ئەگەر خۆڕاگری بکەن، سەرکەوتن بەدەست دێنن. کاتێك لەمەدینە ڕۆشتەدەر، عەبدوالله کوڕی ئەبی سەلوول لەگەڵ سێسەد کەس گەڕایەوە و باوکی جابری سولەمی شوێنیان کەوت بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، بەڵام نەگەڕانەوە و وتیان: شەڕ روونادات، تۆیش بەقسەمان بکە و بگەڕێرەوە. خواوەند فەرمووی: کاتێك دوو دەستە لەئێوە ویستیان بگەڕێنەوە، و ئەوان منداڵەکانی سولەمە و منداڵەکانی حارسە بوون کەدەیانویست لەگەڵ عەبدوالله کوڕی ئەبی بگەڕێنەوە، خواوەند ئەوانی پاراست و پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ حەوتسەد کەس مایەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی ڕۆشتنە دەرەوەی کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) تۆ بەنابەدڵخواز دەبەینەدەر، نەدەبوو ئەم کارە بکەین لەمەدینە بمێنەرەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) زرێ بپۆشێت نابێت دەریبێنێت تا ئەو کاتەی شەڕ دەکات.

پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ هەزار پیاو بەرێکەوت و لەشوت لەنێوان ئوحود و مەدینە، عەبدوالله کوڕی ئەبی سەلوول لەگەڵ یەك لەسەر سێی کەسەکانی لێی جیابوویەوە و وتی: بەقسەی ئەوانی کرد و لەمەدینە هاتەدەر وگرنگی بەبۆچوونەکەی من نەدا، سوێند بەخوا نازانم بۆ لێرەدا خۆمان بەکوشتن دەدەین. لەگەڵ ریاکارانی خەڵکەکەی و شوێنکەوتەکانی، گەڕایەوە و عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزام شوێنیان کەوت و وتی: ئەی خەڵکینە، خواتان لەبیر بێت و پێغەمبەر(د.خ) لەبەرابەر دوژمنەکانی بەتەنیا جێمەهێڵن.

وتیان: ئەگەر لەرووداني شەڕ دڵنیادەبووین، ئێوەمان بەجێنەدەهێشت بەڵام دڵنیایین شەڕ روونادات. کاتێك پێداگرییان کرد، عەبدوالله کوڕی عەمرۆ وتی: خواوەند بەنەحلەتتان بکات چوونکە دوژمنی ئەون و ئەو، ئێمە لەئێوە بێ نیاز دەکات.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی واقدی عەبدوالله کوڕی ئەبی لەشوێنی شەیخەیین لەگەڵ سێسەد کەس جیابوویەوە و پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ حەوتسەد کەس مایەوە. ناباوەڕان سێ هەزار کەس بوون لەگەڵ دووسەد ئەسپ سوار، پانزە ژن هاورێیەتی دەکردن، حەوتسەد کەسیان زرێپۆش بوون لەکاتێکدا موسوڵمانان تەنیا سەد زرێ پۆش لەناویاندا دەبینراو دوو ئەسپ کەیەکیان تایبەت بوو بە پێغەمبەر(د.خ) و ئەوی

دیکەیان بە باوکی کۆیلەی حارسی.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژئاوا لەشوێنی شەیخەیین بەناو شەڕکەرەکانیدا گەڕا وکەسانێکی لەناو ئەوان دەرهێنا کەزەید کوڕی سابت و کوڕی عەمرۆ و ئەسید کوڕی زوهەیر و بەرا کوڕی عازەب و عەرابە کوڕی ئەوس و باوکی سەعیدی خدری لەناویاندا بوون. رافیع کوڕی خەدیجی بەبچوك دەزانی و دەیویست ئەویش بگەڕێنێتەوە بەڵام رافیع لەسەر پەنجەی پێ وەستا و پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی مانەوەی پێدا. سەمورە کوڕی جوندەبیش مۆڵەتی مانەوەی پێدرا.

واقدی دەڵێت: دایکی سەمورە ژنی موری کوڕی سەنان، مامی ئەبو سەعیدی خدری و لەماڵەکەی ئەو گەورەو کرابوو و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بەرەو ئۆحۆد بەرێکەوت و بەناو شەڕکەرانی خۆیدا گەڕا، سەمورە کوڕی جوندەبی لەگەڵ کەم تەمەنەکانی دیکە گۆڕەپانی شەڕ دوور خستەوە و مۆڵەتی بەرافیع کوڕی خەدیجدا. سەمورە بەزڕباوکەکەی خۆی وت: باوکە، مۆڵەتی بەرافیعدا بەڵام بەمن نا، من لەکاتی زۆرانبازی پشتی رافیع لەزەوی دەدەم.

موری کوڕی سەنان بە پێغەمبەری وت: مۆڵەتت بەکوڕەکەی من نەدا و مۆڵەتت بەرافیع کوڕی خەدیجدا بەڵام کوڕەکەی من دەتوانێت پشتی ئەو لەزەوی بدات. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی تا زۆران بگرن و سەمورە، پشتی رافیعی لەزەویدا. بەمشێوەیە پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی مانەوەی بەسەمورەدا تا بەشداری شەڕی ئۆحۆد بکات.

شارەزا و رێگە نیشاندەری رێگەی ئۆحۆد، باوکی حەیسەمەی حارسی بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت و لەحورەی مناڵەکانی حارسە تێپەڕی و لەوێ کلکی ئەسپێك بەر شمشێرێك کەوت کە لەکاڵان دەرکێشرا. پێغەمبەر(د.خ) کەحەزی لەلێکدانەوەی رووداو و پێشهاتەکان دەکرد بەڵام زێدەڕۆیی تیا بەکار نەدەبرد، بەخاوەنی شمشێرەکەی فەرموو: شمشێرەکەی خۆت بکەرە ناو کاڵان چوونکە ئەمڕۆ شمشێرەکان لەکاڵان دەردێن.

پێغەمبەر(د.خ) بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: کێ دەتوانێت ئێمە لەرێگەیێکەوە ببات لای ئەم خەڵکە تێنەپەڕین.

باوکی حەسمە وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من ئەو کارە دەکەم.

باوکی حەسمە پێش کەوت و ئەوی لەحوڕەی مناڵەکانی حارسە تێپەڕاند و گەیشتە

زەوی مورەبەع کوڕی قەیزی کەناباوەڕێکی کوێر بوو. کاتێك لەتێپەڕبوونی پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی ئاگادار بوویەوە، خۆڵی بەسەر و روخساری ئەواندا دەکرد و دەیوت: ئەگەر پێغەمبەری خواییت، بەڕەوای نازانم بەناو باخ و زەوییەکانی مندا تێپەڕیت.

دەڵێت: مشتێك خۆڵی هەڵگرتبوو و دەیوت: ئەی محەممەد، ئەگەر دەمزانی جگە لەتۆ بەر کەسی دیکە ناکەوێت، بەسەرما دەکردی. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ویستیان بیکوژن، بەڵام وتی: ئەو کارە مەکەن چوونکە هەم چاوی کوێرە هەم ئاوزی.

سەعد کوڕی زەیدی ئەشهەلی بەکەوان لێیدا و سەری شکاند.

پێغەمبەر(د.خ) درێژەی بەرێگەدا تا لەدۆڵی ئوحود دابەزی و لەقەراغ رێگە و داوێنی کێوەکە جێگیر بوو. شەڕکەران پشتیان بەکێوەکەوەدا بوو، فەرمووی: کەس شەڕ دەستپێنەکات تا فەرمانی جەنگ دەدەم.

قوڕەیشییەکان ئەسپەکانی خۆیان لەزەوییە کشتوکاڵییەکانی موسوڵمانان بەڕەڵا کردبوو. یەك لەوان وتی: کشتی مناڵەکانی قیلە بلەوەڕێنێت و شەڕ ناکەین.

پێغەمبەر(د.خ) شەڕکەرانی خۆی ئامادە کرد و قوڕەیشییەکانیش ریزیان بەست. ژمارەیان سێ هەزار کەس و دوو سەد ئەسپییان پێبوو کە لەملاولای سوپاکە جێگیر کرابوون. خالید کوڕی وەلیدیان کردە فەرماندەی باڵی ڕاست و عێکرەمە کوڕی ئوبوجەهلیان کردە فەرماندەی باڵی چەپ.

پێغەمبەر(د.خ) عەبدوڵلە کوڕی رەواحەی کردە سەرکردەی تیرهاوێژەکان. ئەو، جل و بەرگی سپی لەبەردابوو. ژمارەی تیرهاوێژەکان دەگەیشتە پەنجا کەس. بە عەبدوڵلەی فەرموو: بەتیر سوارەکان دوور بخەنەوە تا لەپشتەوە هێرش نەکەنە سەر ئێمە. شەڕ لەبەرژەوەندی ئێمە بێت یا لەزیانمان، ئێوە لەشوێنی خۆتان بمێننەوە تا لەم شوێنەوە هێرش نەکەنە سەرمان.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دوو زرێی پۆشیبوو.

بەرا دەڵێت: کاتێك لەرۆژی ئوحود پێغەمبەر(د.خ) رووبەرووی ناباوەڕان بوویەوە، کەسانێکی لەبەرابەر تیرهاوێژەکانی دوژمن جێگیر کرد و عەبدوڵلە کوڕی جوبەیری کردە سەرکردەی ئەوان و فەرمووی: ئەگەر بینیتان بەسەر دوژمندا زاڵ بووین، لەشوێنەکانی خۆتان دوور مەکەونەوە و ئەگەر بینیتان دوژمن بەسەر ئێمەدا زاڵ بوو، بۆ هاوکاری کردنی ئێمە، شوێنەکەی خۆتان بەجێمەهێڵن.

کاتێك دوو دەستەکە ڕووبەڕووی یەك بوونەوە، شکست لەناو ناباوەڕان بلاو بوویەوە تا ئەو شوێنەی ژنە بالاپۆشەکان ڕانی خۆیان دەرخست و خەلخالەکانیان دەرکەوت و تیرهاوێژەکان بەردەوام دەیانوت: تالانی، تالانی.

عەبدوالله کوڕی جوبەیر وتی: ئارام بن، مەگەر بیرتان نییە پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی چی پێداین.

بەلام ئەوان گوێیان نەگرت و ڕۆشتن و کاتێك دوژمن هات، ئەوان سەرقالی کۆکردنەوەی تالانی بوون و حەفتا کەس لەموسولمانان کوژران.

کوڕی عەباس دەلێت: ئەبوسوفیان ڕۆژی سێی شەوال لەئوحود دابەزی و پێغەمبەر(د.خ) خەلکانی کۆکردەوە و زوبەیری کردە فەرماندەی سوارەکان و میقداد کوڕی ئەسوەدی کێندی هاوڕێیەتی دەکرد. ئالاکەی بەمەسعەب کوڕی عومەیردا و حەمزەی کردە فەرماندەی شەڕکەرە بێ زرێکان. ئەوی لەپێشەوە ڕەوانە کرد و خالید کوڕی وەلید لەگەلْ سوارەکانی سوپای قورەیش هات و عێکرەمە کوڕی ئەبوجەهل هاوڕێیەتی دەکرد. پێغەمبەر(د.خ) زوبەیری ڕەوانە کرد و فەرمووی: ڕووبەڕووی خالید جێگیر بە تا فەرمانت پێدەدەم. دەستەیەکی دیکەی لەسەرەوە ڕەوانە کرد و فەرمووی: جێگیر بن تا فەرمانتان پێدەدەم. ئەبوسوفیان کەهەلگری لات و عەزا بوو، هات و پێغەمبەر(د.خ) کەسی بۆ لای زوبەیر نارد و فەرمانی هێرش کردنی پێدا. ئەو، هێرشی کردە سەر خالید کوڕی وەلید و خواوەند ئەوانی تێکشکاند و ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((و لقد صدقكم الله وعده اذتحسونهم باذنه، حتى انفشلتم و تنازعتم في الامرو عصيتم من بعد ما اراكم ما تحبون.

واتاکەی: خواوەند بەلێنەکەی خۆی لەگەلْ ئێوەدا هێنایەدی ئەو کاتەی بەفەرمانی ئەو، ئەوانتان کوشتار کرد تا ئەو کاتەی سست بوون و لەکاروباری شەڕ دووبەرەکی لەناوتاندا سەری هەلدا و نافەرمانیتان کردە پیشە، لەگەلْ ئەوەی خواوەند ئەو شتەی نیشاندابوون کەئارەزوومەندی بوون.

خواوەند بەلێنی بەموسولمانەکان دابوو سەرکەوتنیان پێببەخشێت و پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەکی ڕەوانە کردبوو تا چاودێری و پاسەوانی دواوەی سوپاکەی بکەن و فەرموو بووی: لێرەبن و ڕێگە لەهەلاتوان بگرن و پاسەوانی پشت سەری ئێمە بن. کاتێك پێغەمبەر(د.خ)و هاوەلانی بەسەر دوژمندا سەرکەوتن، بەیەکیان وت: بۆ لای

پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەون و پێش ئەوەی کەسانێتر تالآنییەکان کۆبکەنەوە، تالآنی کۆبکەنەوە. دەستەیەکی دیکە وتیان: گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەرین ولەشوێنەکەی خۆمان دەمێنینەوە. خواوەند فەرمووی: دەستەیەکتان باوەشتان بۆ مەبەستەکانی دنیا کردەوە یانی ئەوانەی تالآنییان دەویست و دەستەیەکتان بەدوای مەبەستەکانی ئەو دنیاوە بوون یانی ئەوانەی وتیان گوێڕایەڵی فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) دەبین و لەشوێنی خۆماندا دەمێنینەوە.

کوڕی مەسعود دەیوت: پێش ڕۆژی ئوحود هەرگیز بیرم لەوە نەکردبوویەوە یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەدوای مەبەستەکانی دنیاوە بێت.

سەدی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەئوحود ڕووبەڕووی دوژمنەکانی بوویەوە، بەتیرهاوێژەکانی فەرموو تا لەداوێنی کێوەکە ڕووبەڕووی سوپای دوژمنان جێگیربن و فەرمووی: ئەگەر بینیتان ئەوانمان شکستدا، لەشوێنی خۆتان مەجووڵێن وئەگەر بینیتان بەسەرماندا سەرکەوتن، لەشوێنی خۆتان بمێننەوە. تا ئەوکاتەی ئێوە لەشوێنی خۆتاندا بن، ئێمە بەسەر دوژمندا زاڵبین. پێغەمبەر(د.خ) عەبدوالله کوڕی جوبەیر برای خوی، کوڕی جوبەیری کردە فەرماندەی ئەوان.

تەڵحە کوڕی عوسمان ئالأداری قوڕەیشییەکان لەناو گۆڕەپانی شەڕ وەستا و وتی: ئەی هاوەڵانی محەممەد گومان دەکەن خواوەند بەخۆی شمشێرەکانی ئێوە ئێمە دەخاتە جەهەننەم و بەهۆی شمشێرەکانی ئێمە ئێوە دەباتە بەهەشت، ئایا کەس لەئێوە ئامادەیە بەشمشێرەکەی من بڕواتە بەهەشت یا بەشمشێرەکەی خۆی من بۆ جەهەننەم بنێرێت؟

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕووبەڕووی وەستا و وتی: سوێند بەو خوایەی گیانی من لەدەستی ئەودایە، لەتۆ جیانابمەوە تا ئەو کاتەی بەشمشێرەکەی خۆم تۆ بۆ جەهەننەم دەنێرم یا بەشمشێرەکەی خۆت من بۆ بەهەشت دەنێریت. عەلی شمشێرێکی وەشاند و قاچی ئەوی قرتاند و شەرمی دەرکەوت و وتی: ئەی کوڕە مام، بەخزمایەتی خۆمان سوێندت دەدەم. عەلی بەرەڵای کرد. پێغەمبەر(د.خ) تە کبیری وت.

هاوەڵانی عەلی پرسییان: بۆچی نەتکوشت؟

عەلی وەڵامی دایەوە: کاتێك شەرمی دەرکەوت، و سوێندیدام، شەرمم کرد بیکوژم.

دوای ئەوە زوبەیر کوڕی عەوام و میقداد کوڕی ئەسوەد هێرشیان کردە سەر ناباوەڕان و شکستیان لەناو ئەواندا بلاو کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی هێرشیان

کردە سەر ئەبوسوفیان و شەڕکەرانی و شکستیاندان. کاتێك خالید کوڕی وەلید هێرشی برد، تیرهاوێژەکان تیربارانیان کرد و بەناچاری پاشەکشێی کرد و کاتێك تیرهاوێژەکان بینیان هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) گەیشتوونەتە ناوەڕاستی ئوردوی دوژمن و سەرقاڵی کۆکردنەوەی تالانییەکانن، دەستەیەکیان بەمەبەستی کۆکردنەوەی تالانی شوێنی خۆیانیان بەجێهێشت و دەستەیەکی دیکە وتیان: فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) پشتگوێ ناخەین. بەڵام زۆرینەیان شوێنەکەی خۆیان بەجێهێشت. خالید کوڕی وەلید کاتێك کەمی تیرهاوێژەکانی بینی، سوارەکانی خۆی کۆکردەوە و هێرشی برد و تیرهاوێژەکانی کوشت و پەلاماری هاوەڵانی پێغەمبەریدا.

کاتێك ناباوەڕان هێرشی سوارەکانی خۆیانیان بینی، هاواریان کرد و هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان و شکستیاندان و ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن.

زوبەیر دەڵێت: لەرۆژی بەدر، پێغەمبەر(د.خ) شمشێرێکی بەدەستەوە گرت و فەرمووی: کێ ئەم شمشێرە وەردەگرێت و مافەکەی خۆی دەدات؟

دەڵێت: هەستام و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من.

پێغەمبەر(د.خ) پشتی تێکردم و دووبارە وتەکەی دووبارە کردەوە.

دووبارە هەستام و وتم: من.

پێغەمبەر(د.خ) پشتی تێکردم و فەرمووی: کێ ئەم شمشێرە دەگرێت و مافی خۆی پێ دەبەخشێت؟

ئەم جارە ئەبودوجانە، سەماك کوڕی خەرەشە، هەستا و وتی: من وەریدەگرم و مافەکەی دەبەخشم، بەڵام مافەکەی چییە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مافی ئەم شمشێرە ئەوەیە هیچ موسوڵمانێکی پێ نەکوژیت و کاتێك ئەم شمشێرەت بەدەستەوە بوو، لەبەرابەر دوژمن رانەکەیت.

دەڵێت: شمشێرەکەی بەئەبودوجانە بەخشی. ئەو عادەتی بوو کاتێك مەبەستی شەڕ کردنی دەکرد، سەربەندێکی دەبەست و من بەخۆم وت: بزانم ئەمڕۆ چی دەکات. بینیم هەرکەسێك دەهاتە بەردەمی، پاڵی پێوەدەنا تا لەژنان نزیك کەوتەوە کە لەداوێنی کێوەکەدا بوون و دەفیان بەدەستەوە بوو. یەکێك لەوان هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەگەر رووبکەنە دوژمن، باوەشتان بۆ دەگرینەوە

راخەری مەخمەڵتان بۆ ڕادەخەین
و ئەگەر پشت بکەنە دوژمن
لەئێوە جیا دەبینەوە
جیابوونەوەی کەسێک کەشەیدا نەبێت))

ئەبودوجانە شمشێرەکەی بەرز کردەوە تا ئەو ژنە بکوژێت بەلاّم دەستی پاراست.

دواتر پێم وت: هەموو کارەکانی تۆم لەبیرە، بیرتە شمشێرت بەرز کردەوە تا ئەو ژنە بکوژی، بۆ ئەو کارەت نەکرد؟

وتی: شمشێرەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەوە بەرێزتر بوو بەخوێنی ژنێك پیسی بکەم.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کێ ئەم شمشێرە وەردەگرێت و مافەکەی خۆی پێدەبەخشێت، چەند کەسێك هەستان بەلاّم شمشێرەکەی بەوان نەدا تا ئەوەی ئەبودوجانە، سەمەك کوڕی خەرەشە هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ماڤ ئەم شمشێرە چییە؟

فەرمووی: ماڤ ئەم شمشێرە ئەوەیە ئەوەندە دوژمنی پێ بکوژێت تا خوار ببێت.

ئەبودوجانە وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەو مافەی پێدەبەخشم.

پێغەمبەر(د.خ) شمشێرەکەی پێبەخشی.

دەڵێت: ئەبودوجانە پیاوێکی بوێر بوو و لەکاتی جەنگ، کەسێکی ڕووداوخواز و کاتێك سەربەندی سووری دەبەست، خەڵکان دەیانزانی ئەو بوێرانە شەڕ دەکات و کاتێك شمشێری لەدەستی پێغەمبەر(د.خ) وەرگرت، سەربەندی سوری بەست و لەنێوان دوو ڕیزەکە لەخۆباییانە هاتوچۆی دەکرد.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) هاتوچۆی لەخۆباییانەی ئەوی بینی، فەرمووی: خواوەند ئەم شێوە ڕێگە ڕۆشتنە بەدوژمن دەزانێت مەگەر لەکاتی شەڕ.

ئەبوسوفیان کەسێکی نارد و وتی: ئەی دەستەی ئەوس و خەزرەج، ئامۆزاکانمان لەگەڵ ئێمە بەتەنیا جێبێڵن تا بڕۆین چوونکە نیازمان بەشەڕ کردن لەگەڵ ئێوە نییە.

ئەنسارییەکان بەتوندی وەلاّمیان دانەوە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: باوکی عامر، عەبدعەمرۆ کوڕی سەیفی، کەنیززادەی یەکێك لەمناڵەکانی ڕەبیعە بوو، لە پێغەمبەر(د.خ) جیاببویەوە و ڕێگەی مەککەی گرتەبەر. پەنجا نەوجەوان لەئەوسییەکان هاوڕێیەتی ئەویان دەکرد کەیەکیان عوسمان کوڕی حەنیف بوو. بەوتەیەك پانزە کەسی لەگەڵدا بوو. بەڵێنی بە

قورەیشییەکاندا ئەگەر رووبەرووی محەممەد ببێتەوە، کەس لەئەنسار دژایەتی ناکات.

دەڵێت: کاتێك دوو دەستەکە رووبەروی یەکبوونەوە، باوکی عامر لەگەڵ حەبەشییەکان و کۆیلەکانی مەککە هاتە پێش و هاواری کرد: ئەی ئەوسییەکان، من باوکی عامرم.

ئەوسییەکان وتیان: ئەی ریاکار، خواوەند کەس بەتۆ دڵخۆش ناکات.

لەسەردەمی جاهلییەت بەباوکی عامریان دەوت راهیب بەڵام پێغەمبەر(د.خ) نازناوی ریاکاری پێبەخشی.

کاتێك باوکی عامر وەڵامی ئەوسییەکانی بیست، وتی: خەڵکەکەی من دوای من، گیرۆدەی چ شەڕێك بوون. شەڕێکی قورسی دەستپێکرد و بەبەردباران کردنی موسوڵمانانەوە سەرقاڵ بوو.

دەڵێن: رۆژی پێش شەڕەکە ئەبوسوفیان منداڵەکانی عەبدئەلداری بۆ شەڕ هاندا کەئالاّ هەڵگرەکانی قورەیش بوون، وتی: ئەی منداڵەکانی عەبدئەلدار، ئێوە رۆژی بەدر ئالاّداری ئێمە بوون و بەو شێوە بوو کەبینیتان. خەڵکان چاو دەبڕنە ئالاّکە و ئەگەر پاشەکشێ بکات، پاشەکشێ دەکەن. یا وەك پێویست دەبێت پارێزگاری لەئالاّکە بکەن یا تەسلیم بەخۆمانی بکەنەوە تا بەو شێوەی دەبێت بۆ پێشەوەی ببەین.

منداڵەکانی عەبدئەلدار مەبەستی کوشتنی ئەویان کرد و وتیان: ئالاّکەی خۆمان بدەین بەتۆ؟ بەیانی کەرووبەروو بووینەوە، دەبینیت چۆن شەڕ دەکەین. ئەبوسوفیان ئەمەی دەویست.

کاتێك دوو دەستەکە رووبەروی یەکبوونەوە، کچی عوتەبە لەگەڵ ژنەکانی هاورێی، دەستان و دەف لێدانیان دەستپێکرد و بۆ هاندانی ئەوان بۆ شەڕ کردن، هۆنراوە و گۆرانییان دەخوێند.

خەڵکان شەڕیان کرد تا ئەوەی تەنووری شەڕ گەرم بوو. ئەبودوجانە شەڕی کرد و لەگەڵ حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب و عەلی کوڕی ئەبی تالیب و چەند کەسێك لەموسوڵمانان هێرشیان کردە سەر دڵی سوپای قورەیش و خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین و بەڵێنەکەی خۆی هێنایە دی. بەشمشێر کەوتنە گیانی دوژمن و پاشەکشێیان پێکرد. شکست لەناو دوژمندا بلاّو بوویەوە.

زوبەیر دەڵێت: من خزمەتکارەکانی هیند کچی عوتەبە و هاورێکانی ئەوم دەبینی

کە بەپەلە دەڕۆشتن و گرتنی ئەوان ئاسان بوو. کاتێك دوژمنمان لەئوردوگاکەیان دوورخستەوە، تیرهاوێژەکان شوێنەکانی خۆیان بەجێهێشت تا تاڵانییەکان کۆبکەنەوە و بەمشێوەیە پشت سەری ئێمەیان بۆ دوژمن چۆڵ کرد. دوژمن، لەوێوە هێرشی کردە سەرمان و کەسێك هاواری کرد محەممەد کوژراوە. ئێمە بڵاوبووینەوە و دوژمن هێرشی هێنا. پێش ئەوە بەرادەیەك لەئاڵادارەکانمان کوشتبوو کەس لەئاڵاکە نزیك نەدەکەوتەوە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئاڵاکە کەوتبووە سەر زەوی تا ئەوەی عەمورە کچی عەلقەمەی حارسی هەڵیگرت و قوڕەیشییەکان ئاڵاکەیان بەرز کردەوە و لەدەوری کۆبوونەوە. ئاڵاکە لەدەستی سەواب کۆیلەی حەبەشی ئەبی تەڵحە بوو و دوایین کەس بوو ئاڵاکەی بەرز کردەوە و شەڕی کرد تا دەستی قرتا و کەوتە سەر ئاڵاکە و بەسینە و گەردنی خۆی ئاڵاکەی بەبەرزی ڕاگرت. تا کوژرا، دەیوت: خواوەندا ئایا ئەرکەکەی خۆم ئەنجامدا.

باوکی کورەیب دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاڵادارەکانی دەکوشت، پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەك لەناباوەڕانی قوڕەیشی بینی و بەعەلی فەرموو: هێرش بکەرە سەر ئەوان. عەلی هێرشی بردە و بڵاوەی پێکردن. عەمرۆ کوڕی عەبدوالله جومەحی لەسەردەستی عەلی کوژرا.

دەڵێت: دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەکی دیکەی بینی و بەعەلی فەرموو: هێرش بکە سەر ئەوان.

عەلی هێرشی برد و بڵاوەی پێکردن و شەیبە کوڕی مالیکی لەهۆزی مناڵەکانی عامر کوڕی لوئەی کوشت و جبەرئیل وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەخۆ بوردوویی ئەمەیە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو لەمنە و من لەوم.

جبرەئیل وتی: منیش لەئێوەم.

دەڵێت: لەم کاتەدا دەنگێك بەرز بوویەوە کەشمشێرێك جگە لەزولفەقار نییە و کەس لەعەلی جوامێرتر نییە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك لەپشتەوە هێرش کرایە سەر موسوڵمانەکان، پاشەکشێیان کرد و ناباوەڕان چەندین کەسیان لەوان کوشت. کاتێك زیان لەناو موسوڵمانەکاندا بڵاوبوویەوە، سێ دەستە بوون: دەستەیەکیان کوژران، دەستەیەکیان بریندار و دەستەیەکیان شکستیان خوارد و بەشێوەیەك شڵەژابوون، نەیاندەزانی چی

بکەن. دانی پێغەمبەر(د.خ) زیانی بەرکەوت و لێوی قەڵشا و روخسار و ناوچاوی خوێناوی بوو. کوڕی قەمیئە بەشمشێر لەکەلەکەی پێغەمبەریدا و عوتبە کوڕی ئەبی وەقاس ئەوی برینداری کرد.

ئەنس کوڕی مالیك دەڵێت: کاتێك لەرۆژی ئوحود دانی پێغەمبەر(د.خ) شکا و روخساری خوێناوی بوو، بەدەست خوێنەکەی سڕی و فەرمووی: خەڵکێك کەروخساری پێغەمبەری خۆیان خوێناوی کرد، چۆن رزگاریان دەبێت؟ ئەوانی نفرین کرد و خواوەند فەرمووی: ئەم کارە لەدەستی تۆدانییە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك دوژمنان گەمارۆیان خستە سەر پێغەمبەر(د.خ)، فەرمووی: چ کەسێك گیانی خۆی دەبەخشێت؟ زیاد کوڕی سەکەن و بەوتەیەك عومارە کوڕی زیاد کوڕی سەکەن لەگەڵ پێنج کەس لەئەنسارییەکان هاتنە پێش و لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ) شەڕیان کرد تا ئەوەی هەموویان کوژران. دوایین کەسیان زیاد یا عومارە کوڕی زیاد لەبەر برینی زۆر لەدەست و پێ کەوت، دواتر دەستەیەك لەموسوڵمانەکان هاتن و دوژمنیان لە لەو دوورکردەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو بێنن بۆ لای من.

کاتێك ئەویان بردە لای پێغەمبەر(د.خ)، قاچی خۆی کردە سەرین بۆی و لەکاتی گیاندان، روخساری لەسەر قاچی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

لەم کاتەدا ئەبودوجانە خۆی کردە قەڵغانی پێغەمبەر(د.خ)، لەسەر ئەو چەمابوویەوە و تیرەکان بەرپشتی ئەو دەکەوت. چەندین تیر لەپشتی چەقی.

سەعد کوڕی ئەبی وەقاس لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ)، تیری بۆ دوژمن دەهاویشت. دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) تیرێکی پێدەدام و دەیفەرموو: دایك و باوکم قوربانت بن، بیهاوە. هەندێ کات تیری پێدەدام کەنووکی پێوە نەمابوو، و دەیفەرموو: بیهاوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەکەوانەکەی خۆی ئەوەندە تیری هاویشت کەزێی کەوانەکەی پچڕا و قتادە، هەڵیگرتەوە. لەو رۆژەدا چاوی قتادە زیانی بەرکەوت و کەوتە سەر روخساری. پێغەمبەر(د.خ) بەدەستی خۆی خستییەوە شوێنەکەی خۆی بەشێوەیەك کە لەچاوەکەی دیکەی باشتر و تیژبینتر بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: مەسعەب کوڕی عومەیر ئاڵا بەدەست لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ) شەڕی کرد تا کوژرا و کوڕی قەمیئەی لەیسی شمشێری لێدا و گومانی کرد پێغەمبەرە. کوڕی قەمیئە گەڕایەوە بۆ لای قورەیشییەکان و وتی: محەممەدم کوشت.

کاتێك مەسعەب کوژرا، پێغەمبەر(د.خ) ئالآکەی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب سپارد.

حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب لەگەرماوگەرمی شەڕەکە، ئەرتات کوڕی عەبدی کوشت کەیەکێك بوو لەئالآدارەکانی قورەیش. دوای ئەو سەباع کوڕی عەبدولعوزەی غەبشانی لای ئەو تێپەڕی و حەمزە وتی: وەرە پێش دایکت قیتکەی ئافرەتانی دەبڕی. دایکی ئەو کەنیزی شەریق کوڕی عەمرۆ کوڕی وەهبی سەقەفی و لەمەککە خەتێنەی ئافرەتانی دەکرد. کاتێك رووبەرووی یەکبوونەوە، حەمزە بەشمشێر لێیدا و کوشتی.

وەحشی کۆیلەی جوبەیر کوڕی موتعیم دەڵێت: حەمزەم بینی پیاوەکانی بەشمشێر دروێنە دەکرد و هاوشێوەی وشترێکی خۆڵەمێشی بەهەر کەسێك دەگەیشت، لەناوی دەبرد. کاتێك سەباع کوڕی عەبدولعوزەی لێی نزیك کەوتەوە، حەمزە وتی: وەرە پێش کەدایکت قیتکەی دەبڕی. شمشێرێکی لێدا، بەرسەری نەکەوت. من، زوبینەکەی خۆم ڕاوەشاند بەجوانی نیشانەم گرت و دواتر هەڵمدا. زوبینەکە بەر سنگی حەمزە کەوت و لەنێوان قاچەکانییەوە هاتەدەر. مەبەستی کوشتنی منی کرد بەڵام لەپێ کەوت. چاوەڕێم کرد تا گیانیدا و دواتر ڕۆشتم و زوبینەکەی خۆم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ ئوردووگا. چیتر کارم نەمابوو ئەنجامی بدەم.

عاسم کوڕی سابت کوڕی ئەبی ئەفلەح، موسافیع کوڕی تەڵحە و براکەی کەلاب کوڕی تەڵحەی بەتیر کوشت و سەلافە دایکی موسافیع هات و سەری ئەوی خستە داوێنی و وتی: کوڕی خۆم، کێ بەتیر تۆی کوشت؟

وتی: ئەو کەسەی تیری دەهاویشت، وتی: من کوڕی ئەفلەحم.

سەلافە وتی: ئاسوودەبە. نەزری کرد ئەگەر سەری عاسمی بەردەست بکەوێت، شەرابی تیا بخواتەوە. عاسمیش نەزری کرد هیچ کات کاری خراپە نەکات.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەنس کوڕی نەزر مامی ئەنس کوڕی مالیك، عومەر کوڕی خەتاب و تەڵحە کوڕی عوبەیداللەی بینی کە لەگەڵ دەستەیەك لەموهاجیر و ئەنسارەکان دانیشتبوون و دەستیان خستبووە سەردەست، وتی: بۆ دانیشتوون؟

وتیان: محەممەد، پێغەمبەری خوا کوژرا.

وتی: دوای ئەو چی لەژیانی خۆتان دەکەن، هەستن و هاوشێوەی پێغەمبەر(د.خ) پیاوانە بمرن.

هێرشی کردە سەردوژمن و شەڕی کرد تا کوژرا. ئەنس کوڕی مالیك ناوی خۆی لەو وەرگرت.

ئەنس کوڕی مالیك دەڵێت: ئەو ڕۆژە ئەنس کوڕی نەزر، شوێنەواری حەفتا برین بەجەستەیەوە بوو. خوشکەکەی بەهۆی پەنجەکانییەوە ئەوی ناسییەوە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەکەم کەسێك دوای شکستی موسوڵمانان و بڵاوبوونەوەی هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر(د.خ) ئەوی ناسییەوە، کەعب کوڕی مالیك بوو کەوتی: چاوەکانیم بینی دەدرەوشایەوە و هاوارم کرد: ئەی موسوڵمانان مزگێنی، ئەوە پێغەمبەری خوایە، پێغەمبەر(د.خ) ئیشارەی کرد بێدەنگ بم.

کاتێك موسوڵمانان پێغەمبەریان ناسییەوە، ئەویان بەرەو دۆڵەکە برد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەبوبەکری کوڕی ئەبی قوحافە و عومەر کوڕی خەتاب و تەڵحە کوڕی عوبەیدالله و زوبەیر کوڕی عەوام و حارس کوڕی سەمە لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەموسوڵمانان هاورێیەتییان دەکرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بەرەو دۆڵەکە دەڕۆشت، ئەبی کوڕی خەلەف دەرکەوت و دەیوت: محەممەد لەکوێیە، ڕزگارم نەبێت ئەگەر ڕێگە بدەم ڕزگاری بێت.

موسوڵمانان وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، با یەکێك لەئێمە ڕووبەڕووی ببێتەوە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ڕێگە بدەن با بێت.

کاتێك نزیك کەوتەوە، پێغەمبەر(د.خ) زوبینەکەی حارس کوڕی سەمەی هەڵگرت و زەربەیەکی لەگەردنی کوڕی خەلەفدا کە لەسەر ئەسپەکەی چەند جارێك لەرزی.

ئەبی کاتێك لەمەککە پێغەمبەری دەبینی، دەیوت: ئەی محەممەد ئەسپێکم هەیە ڕۆژانە دەفرێك گەنمەشامی پێدەدەم تا سوار لەسەر ئەو ئەسپە، تۆ بکوژم.

پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: بەخواستی خوا، من تۆ دەکوژم.

کاتێك ئەبی بۆلای قورەیشییەکان گەڕایەوە، برینێکی بچوك بەملیەوە بووکەخوێنی لێ دەچۆڕا و وتی: سوێند بەخوا محەممەد منی کوشت.

وتیان: ئاوزت لەدەستداوە، تۆ هیچت نییە.

وتی: سوێند بەخوا لەمەککە پێی وتم کەدەمکوژێت، ئەگەر ئاوی دەمی بۆ من هاویشتبێت، من دەکوژێت. ئەبی لەکاتی گەڕانەوەی قورەیشییەکان بۆ مەککە لەسەرف، مرد.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە لێواری دۆڵەکە، عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشت و قەڵغانەکەی خۆی پڕ کرد لەئا و بۆ پێغەمبەری برد تا لێی بخواتەوە، لەبەر

ئەوەی ئاوەکە بۆنی دەهات نەیخواردەوە بەڵکو خوێنی روخساری پێ پاك کردەوە و دەیفەرموو: هەرکەس روخساری پێغەمبەر(د.خ) خوێناوی بکات، گیرۆدەی قورسترین ئازابی خواوەند دەبێتەوە.

سەعد کوڕی ئەبی وەقاس دەیوت: هەرگیز بۆ کوشتنی کەسێکی وەك عوتەبە کوڕی ئەبی وەقاس تامەزرۆ نەبووم و دەمزانی ئەو بێزراو و کردار خراپی خەڵکەکەی خۆیەتی. کاتێك بیستم پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەو دەفەرمێت: هەرکەس روخساری پێغەمبەر(د.خ) خوێناوی بکات، رووبەروی قورسترین ئازابی خوایی دەبێتەوە، چاوم لەکوشتنی ئەو پۆشی.

سەدی دەڵێت: کوڕی قەمیئەی حارسی هات و بەردێکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) هاویشت کەلوت و دانی ئەوی شکاند و روخساری بریندار کرد. کارەکانی پێغەمبەر(د.خ) لاواز و هاوەڵانی بڵاوبوونەوە. دەستەیەکیان بۆ مەدینە گەڕانەوە و دەستەیەکیان بەکێوەکەدا سەرکەوتن و لەوێ مانەوە: پێغەمبەر(د.خ) هاواری دەکرد: ئەی بەندەکانی خوا، لەدەوری من کۆببنەوە، لەدەوری من کۆببنەوە. سی کەس لەدەوری کۆبوونەوە و تێپەڕین و جگە لەتەڵحە و سەهل کوڕی حەنیف کەس نەوەستا. تەڵحە خۆی کردە قەڵغانی ئەو کەتیرێك بەردەستی کەوت و دەستی وشك کرد.

لەو کاتەدا ئەبی کوڕی خەلەف جومەحی سوێندی خواردبوو پێغەمبەر(د.خ) بکوژێت و پێغەمبەر(د.خ) فەرموو بووی من تۆ دەکوژم. ئەبی هات و بە پێغەمبەری وت: ئەی درۆزن بۆ کوێ رادەکەیت؟ هێرشی کردە سەر پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ) بەیەخەی زرێکەی زەربەیەکی لێدا کە برینێکی کەمی دروست کرد. ئەبی کەوت و هاوشێوەی گا دەیبۆڕاند.

قورەیشییەکان ئەویان بردە و وتیان: تۆ بریندار نەبوویت، بۆ دەناڵێنیت؟

ئەبی وتی: مەگەر نەیوتووە تۆ دەکوژم، ئەگەر بەهەموو خەڵکانی رەبیعە و موزێری دەوت دەتانکوژم، بەدڵنیاییەوە ئەوانی دەکوشت.

رۆژێك تێپەڕی و لەئازاری برینەکەی مرد.

کاتێك هەواڵی کوژرانی پێغەمبەر(د.خ) بڵاوبوویەوە، دەستەیەك لەو کەسانەی لەسەر تاشەبەردەکان و لەسەر کێوەکە بوون، وتیان: خۆزگە کەسێکمان بۆ لای عەبدوالله کوڕی ئەبی دەنارد تا لەئەبوسوفیان ئەمانمان بۆ وەربگرێت، ئەی خەڵکینە محەممەد کوژرا، پێش ئەوەی خەڵکەکەتان بێن و بتانکوژن، خۆتان تەسلیم بکەن.

ئەنس کوڕی نەزر وتی: ئەی خەڵکینە، ئەگەر محەممەد کوژرا بێت، خواوەندی محەممەد نەکوژراوە. لەرێگەی ئەو دینەی محەممەد شەڕی بۆ دەکرد، شەڕ بکەن. خواوەندا، من لەوتەکەی ئەوان داوای لێبوردن دەکەم و لەقسەکانی ئەوان بێزارم. دواتر بەشمشێر هێرشی برد و شەڕی کرد تا کوژرا.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و خەڵکانی بانگ دەکرد تا گەیشتە لای ئەو کەسانەی لەسەر تاشەبەردەکان بوون. کاتێك ئەویان بینی، یەکیان تیری خستە کەوان بۆ ئەوەی بەتیر لێی بدات و فەرمووی: من پێغەمبەری خوام. کاتێك بینیان پێغەمبەر(د.خ) زیندووە، دڵخۆش بوون و پێغەمبەر(د.خ) شادمان بوو چوونکە پاشماوەی موسوڵمانەکان بەرگرییان لێدەکرد.

کاتێك کەسانی سەر بەردەکان لەووری پێغەمبەر(د.خ) کۆبوونەوە، خەمیان نەما.باسی ئەو سەرکەوتنەیان دەکرد کە لەدەستییان دابوو. خواوەند سەبارەت بەوانەی وتبوویان محەممەد کوژراوە، بۆ لای خەڵکەکەتان بگەڕێنەوە، فەرمووی:

((وما محمد الا رسول قدخلت من قبله الرسل افأن مات او قتل انقلبتم على اعقابكم و من ينقلب على عقيبه فلن يضر الله شيئا و سيجزى الله الشاكرين.

واتاکەی: محەممەد تەنیا نێردراوێکە کە پێش ئەویش نێردراوەکان مردوون، ئایا ئەگەر بمرێت یا بکوژرێت، پاشەکشێ دەکەن، هەر کەس پاشەکشێ بکات، هیچ زیانێك بەخوا ناگەیێنێت و خواوەند پاداشتی سپاسکەران دەداتەوە.))

ئەبوسوفیان هات و لەسەر سەری ئەوان وەستا. کاتێك ئەویان بینی، گفتوگۆکەی خۆیان لەبیر کرد و باسی ئەو هاتە ئاراوە، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نابێت لەسەرەوەی ئێمە بن، خواوەندا ئەگەر ئەم دەستەیە لەناو بچن، چیتر کەس نییە تۆ پەرەستش بکات. هاوەڵانی خۆی نارد، ئەوانیان بەردباران و لەو شوێنە دووریان خستەوە.

ئەبوسوفیان وتی: ئێستا خوبەل سەرکەوت. حەنزەلەیەك لەبەرابەر حەنزەلەیەك و ڕۆژێك لەبەرابەر ڕۆژی بەدر. ئەم وتەی بۆیە هێنایە سەرزمان چوونکە حەنزەلە کوڕی راهیبیان کوشتبوو، فریشتەکان ئەویان شۆرد و حەنزەلە کوڕی ئوبوسوفیان لەرۆژی شەڕی بەدر کوژرا بوو.

ئەبوسوفیان وتی: ئێمە عەزامان هەیە و ئێوە نیتانە.

پێغەمبەر(د.خ) بەعومەر کوڕی خەتابی فەرموو: پێی بڵێ، خواوەند مەولای ئێمەیە و

ئێوە مەولاتان نییە.

ئەبوسوفیان وتی: ئایا محەممەد لەناو ئێوەدایە؛ ئەندامی دەستەیەك لەكوژراوەكانی ئێوەیان بڕیوەتەوە هەرچەند من فەرمانی ئەو كارەم پێنەدابوون و ڕێگریشم لیٚ نەكردن، نە لێی ڕازی بووم، نە بێزار.

خواوەند ئاماژە بەسەركەوتنی ئەبوسوفیان دەدات و دەفەرمێت:

((فاثابكم غما بغم لكيلا تحزنواعلى مافاتكم و لا ما اصابكم.

واتاكەی: (خواوەند) بۆ سزادانتان خەمێكی خستە سەر خەمەكانتان تا بۆ ئەوەی لەدەستتان داوە و ئەوەی بەدەستتان نەهێنا، خەم نەخۆن.))

خەمی یەكەم لەدەستدانی سەركەوتن و تالاٚنییەكان بوو و خەمی دووەم سەركەوتنی دوژمن.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی كوڕی ئیسحاق كاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەودەستە لەهاوەڵانی خۆی لەناو دۆڵەكەدا بوو، دەستەیەك لەقورەیشییەكان بەكێوەكەدا سەركەوتن و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەندا بەرەوای مەزانە، ئەوان لەسەرەوەی ئێمە بن.

عومەر كوڕی خەتاب و دەستەیەك لەموهاجیرەكان ڕووبەڕوویان بوونەوە و ناچاریان كردن لەكێوەكە بڕۆنە خوار.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) هەستا تا بڕواتە سەر تاشەبەردێك بەلاٚم لەبەر ئەوەی سەنگین و دوو زرێی لەبەردابوو، نەیتوانی، تەڵحە كوڕی عوبەیداللە شانی بۆ دانا و لەسەر شانی ئەو بەتاشەبەردەكەدا سەركەوت.

زوبەیر دەڵێت: بیستم پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: ئەو ڕۆژەی تەڵحە ئەو كارەی كرد، بەهەشتی بۆ خۆی دەستەبەر كرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: موسوڵمانەكان شكستیان خوارد و دەستەیەكیان تا (منقی) ڕۆشتن، عوسمان كوڕی عەفان و عوقبە كوڕی عوسمان و سەعد كوڕی عوسمان كەدووان لەئەنسار بوون، هەلاٚتن و گەیشتنە جەعلەب كەكێوەكە لەسنوری مەدینە و بۆ ماوەی سیٚ ڕۆژ لەویٚ مانەوە.

دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) بەوانی فەرموو: زۆر دوور كەوتنەوە.

دەڵێت: حەنزەلە كوڕی ئەبو عامر كەئەویان بەناوی (غسيل الملائكه) شۆردراو بەدەستی فریشتەكان ناو دەبرد. ڕووبەڕووی ئەبوسوفیان كوڕی حەرب بوویەوە و

شەڕی لەگەڵ کرد. شەداد کوڕی ئەسوەد کەپێیان دەوت کوڕی شەعوب، کاتێك بینی حەنزەلە بەسەر ئەبوسوفیاندا زاڵ بووە، شمشێرێکی لێدا و ئەوی کوشت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: فریشتەکان هاورێکەی ئێوە (حەنزەلە) دەشۆن، لەژنەکەی بپرسن و بزانن ئەم بەسەرهاتە چۆنە؟

هاوسەرەکەی وتی: کاتێك ڕۆشتەدەر، لەشپیسی لەخۆی دەرنەکردبوو.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەبەر ئەمە بوو فریشتەکان شۆردییان.

شەداد کوڕی ئەسوەد سەبارەت بەکوشتنی حەنزەلە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((خۆم و هاورێکەم

بەلێدانێکی هاوشێوەی تیشکی خۆر

دەپارێزم))

ساڵح کوڕی کەیسان دەڵێت: هیند کچی عوتەبە و ژنەکانی هاورێی دەستیان بەلەت و پەت کردنی ئەندامەکانی موسوڵمانە کوژراوەکان کرد و گووێ و لوتی ئەوانیان بڕی. هیند لەگووێ و لوتی ئەوان گەردنبەند و خەڵخاڵی دروست کرد و خەڵخاڵ و گەردنبەندەکەی خۆی بەوەحشی کۆیلەکەی جوبەیر کوڕی موتعیم بەخشی. جەرگی حەمزەی دەرهێنا ودەستی بەجاوینی کرد بەڵام نەیتوانی بیخوات و تفی کردەوە. دواتر بەسەر تاشەبەردێك سەرکەوت و بەدەنگی بەرز هۆنراوەیەکی سەبارەت بەسەرکەوتنی قورەیشییەکان بەسەر موسوڵمانان خوێندەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەبوسوفیان کوڕی حەرب لەموسوڵمانان نزیك کەوتەوە و دووبارە وتی:

ئایا محەممەد لەناو ئێوەدایە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە.

سێ جار دووبارەی کردەوە: ئایا کوڕی ئەبی قوحافە لەناو ئێوەدایە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە.

دواتر سێ جار وتی: ئایا کوڕی خەتاب لەناو ئێوەدایە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە.

کاتێك وەڵامی نەبیست بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەوان کوژراون چوونکە ئەگەر زیندوو

بوونایە وەڵامیان دەدایەوە. لەم کاتەدا عومەر کوڕی خەتاب چیتر نەیتوانی خۆی بگرێت و وتی: ئەی دوژمنی خوا، درۆت کرد، خواوەند ئەوانی بەزیندووی هێشتۆتەوە تا تۆ ریسوا بکەن.

ئەبوسوفیان وتی: هوبەل سەرکەوت، هوبەل سەرکەوت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وەڵامی بدەنەوە.

وتیان: چی بڵێین.

فەرمووی: بڵێن خوا گەورەترە و لەپێشترە.

ئەبوسوفیان وتی: ئێمە عوزامان هەیە و ئێوە نیتانە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وەڵامی بدەنەوە.

وتیان: چی بڵێین.

فەرمووی: بڵێن خواوەند مەولای ئێمەیە و ئێوە مەولاتان نییە.

ئەبوسوفیان وتی: رۆژێك لەبەرابەر رۆژی بەدر و جەنگ هەرکات و لەبەرژەوەندی کەسێکدایە، ئەندامی کوژراوەکانی ئێوەیان بڕیوە، من فەرمانی ئەو کارەم نەدابوو بەڵام لێیشی بێزار نیم.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب وەڵامی ئەبوسوفیانی دایەوە، ئەبوسوفیان وتی: وەرە ئێرە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڕۆ.

عومەر ڕۆشتە لای ئەبوسوفیان، پێی وت: عومەر، سوێندت دەدەم پێم بڵێ ئایا محەممەدمان کوشتووە یا نە.

عومەر وتی: نا، سوێند بەخوا ئێستا گوێی لەوتەکانی ئێمەیە.

ئەبوسوفیان وتی: تۆ لەکوڕی قەمیئە راستگۆتری. بۆیە ئەم قسەی کرد چوونکە کوڕی قەمیئە بەقورەیشییەکانی وتبووی: محەممەدم کوشتووە.

دواتر ئەبوسوفیان دەنگی بەرز کردەوە و وت: کوژراوەکانی ئێوەیان لەت و پەت کردووە، سوێند بەخوا لەو کارەیان رازی نەبووم بەڵام بێزاریشی نەکردم.

حەلیس کوڕی زەبان سەرکردەی حەبەشییەکان ، لای ئەبوسوفیان تێپەڕی کە لەسەر جەستەی حەمزە وەستابوو و بەرم لەچەناکەی ئەوی دەدا، وتی: ئەی خەڵکی کەنانە ئەمە سالاری قورەیشییەکانە، ئەم بەڵایە بەسەر ئامۆزاکەی خۆی دێنێت.

ئەبوسوفیان وتی: ئەمە لای کەس باس مەکە چوونکە هەڵەیەك بوو روویدا.

کاتێك ئەبوسوفیان و هاوەڵانی مەبەستی گەڕانەوەیان کرد، هاواری کرد و وتی:

ساڵی داهاتوو لەبەدر ڕووبەڕووی یەکدەبینەوە.

پێغەمبەر(د.خ) بەهاوەڵانی خۆی وت: بڵێن، بەڵێ، لەوێ ڕووبەڕووی یەك دەبینەوە.

پێغەمبەر(د.خ) عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕەوانە کرد و فەرمووی: بەدوای قوڕەیشییەکاندا بڕۆ بزانە چی دەکەن و بۆ کوێ دەڕۆن. ئەگەر ئەسپەکانیان بەدوای خۆیان ببەن و سوار وشترەکان بن، بەرەو مەککە دەڕۆن و ئەگەر سوار ئەسپەکان بوون و وشترەکانیان پێش خۆیاندا، هێرش دەکەنە سەر مەدینە. سوێند بەو خوایەی گیانم لەدەستی ئەودایە ئەگەر بەرەو مەدەینە بڕۆن، شەڕیان لەگەڵ دەکەم.

عەلی دەڵێت: بەدوای خەڵکاندا ڕۆشتم بۆ ئەوەی بزانم بەرەو کوێ دەڕۆن. پێغەمبەر(د.خ) فەرموو بووی هەر کارێکیان کرد بەنهێنی بیهێڵمەوە و لای کەس باسی نەکەم تا دەگەمەوە لای خۆی. دەڵێت کاتێك بینیم ئەسپەکان بەدوای خۆیاندا رادەکێشن و سوار وشترەکان بوون، دڵنیا بووم بەرەو مەککە دەڕۆن. لەخۆشحاڵیدا هاوارم کرد و نەمتوانی بابەتەکە ئاشکرا نەکەم بەهەمان شێوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدابووم.

دواتر کەسەکان بەدوای کوژراوەکانی خۆیاندا گەڕان.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بزانن سەعد کوڕی ڕەبیعە چی بەسەر هات، ئایا زیندووە یا مردووە؟

یەکێك لەئەنسارییەکان وتی: من دەڕۆم و بەدوایدا دەگەڕێم. ئەوی بەبریندارى بینی بەڵام هێشتا گیانی بەبەردا مابوو و وتی: پێغەمبەر(د.خ) منی ناردووە تا بزانم تۆ زیندوویت یا نە.

سەعد وتی: من لەریزی مردووەکاندام، سڵاوی پێغەمبەر(د.خ) بگەیێنە و بڵێ: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە و بەخەڵکەکەت بڵێ: ئەگەر کەسێکیتان زیندوو بێت و دوژمن دەستی بە پێغەمبەر(د.خ) بگات، لای خوا سەرفەراز نەبن.

ئەنساری دەڵێت: لەوێ بووم کەسەعد گیانیدا. بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕامەوە و لەوتەکانی ئاگادارم کردەوە.

دواتر پێغەمبەر(د.خ) بەدوای حەمزەدا گەڕا و ئەوی لەناو دۆڵەکەدا بینی کەسکی هەڵدڕا بوو و لووت و دوو گوێچکەیان بڕیبوو.

جەعفەر کوڕی زوبەیر دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بینی چ بەڵایەکیان بەسەر حەمزەدا هێناوە، فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر سەفییە خەمبار نەدەبوو یا ئەم کارە

لەناو خەڵکاندا بڵاو نەدەبوویەوە، جەستەی حەمزەم دادەنا تا بڕواتە ناو سکی دڕندە و چینەدانی باڵندەکان، ئەگەر خواوەند لەشەڕی داهاتوو سەرکەوتنم بەسەر قوڕەیشییەکان پیّ ببەخشێت، ئەندامی سی کەس لەوان لەت لەت دەکەم.

کاتێك موسوڵمانان خەم و پەژارەی پێغەمبەریان بۆ مەرگی مامەی بینی، وتیان: سوێند بەخوا ئەگەر بەسەر قوڕەیشییەکاندا سەرکەوین، ئەندامی ئەوان بەشێوەیەك لەت و پەت دەکەین کەس لەعەرەبەکان هاوشێوەی نەبینیبێت.

کوڕی عەباس دەڵێت: خواوەند سەبارەت بەفەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی ئەم ئایەی ڕەوانە کرد:

((و ان عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم بة ولئن صبرتم لهو خير للصابرين.

واتاکەی: ئەگەر تۆڵە دەستێننەوە، هاوشێوەی ئەوەی بینیوتانە تۆڵە بستێننەوە و ئەگەر خۆڕاگر بن، خۆڕاگری بۆ خۆڕاگران باشترە.))

پێغەمبەر(د.خ) لەو کارە چاوی پۆشی و خۆڕاگری کردە پیشە و بڕینی ئەندامی کوژراوانی یاساغ کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: سەفییە کچی عەبدولموتەلیب خوشکی حەمزە هات تا جەستەی کوژراوی ئەو ببینێت.

بەڵام پێغەمبەر(د.خ) بەزوبەیری فەرموو: بڕۆ بیگەڕێنەرەوە با برا کوژراوکەی نەبینێت.

زوبەیر بۆ لای سەفییە ڕۆشت و وتی: دایکە، پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمێت بگەڕێرەوە.

سەفییە وتی: بۆ بگەڕێمەوە، بیستوومە ئەندامەکانی براکەمیان بڕیوە و ئەمە لەرێگەی خوادا زۆر نییە. بەوەی ڕوویداوە ڕازیم و بەخواستی خوا خۆڕاگر دەبم.

کاتێك زوبەیر گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەمەی وت، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ڕێگەی بدەن با بیبینێت. سەفییە ڕۆشتە سەر جەستەی کوژراوی براکەی بەکوڵ گریا و انا لله خوێند و داوای بەخشینی بۆ کرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا و حەمزەیان بەخاك سپارد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دەستەیەك لەمناڵەکانی عەبدوالله کوڕی جەحش دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) جەستەی عەبدواللەی لەگەڵ حەمزەدا بەخاك سپارد چوونکە ئەندامەکانی ئەویشیان بڕیبوو بەڵام جەرگیان دەرنەهێنابوو. دایکی ئومەییە کچی عەبدولموتەلیب و حەمزە خاڵۆی ئەوە. من ئەم وتەم لەمناڵەکانی ئەو نەبیستووە.

مەحمود کوڕی لوبەید دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بەرەو ئۆحوّد دەڕۆشت، حوسەیل کوڕی جابر و سابت کوڕی وەقشی لەناو قەڵاکان لای ژن و منالّەکان بەجێهێشت. یەکیان بەوی دیکەیانی وت:

((سوێند بەخوا لەتەمەنی ئێمە چەند ساڵێك ماوەتەوە، ئەمڕۆ یا بەیانی دەمرین، با شمشێر هەڵگرین و پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) ببین ئەگەری هەیە خواوەند شەهیدبوونمان پێ ببەخشێت.

شمشێریان هەڵگرت و پەیوەستی شەڕکەران بوون. کەس ئاگادار نەبوو. سابت کوڕی وەقش بەدەستی ناباوەڕان کوژرا و حوسەیل کوڕی جابر لەگەرماوگەرمی شەڕەکە بەشمشێری موسوڵمانان کوژرا. موسوڵمانەکان ئەویان نەناسییەوە و حوزەیفەی کوڕی هاواری کرد: ئەی هاوار باوکم،

وتیان: سوێند بەخوا نەمانناسی و راستیان دەکرد.

حوزەیفە وتی: خوا دەتانبەخشێت چوونکە بەخشندە و میهرەبانە.

پێغەمبەر(د.خ) ویستی خوێنبایی ئەو بدات بەڵام حوزەیفە خوێنبایی باوکی بەموسوڵمانان بەخشی و بەم شێوەی رێزی ئەو لای پێغەمبەر(د.خ) زیادی کرد.

عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادە دەڵێت: یەکێك لەئەنسارییەکان بەناوی حاتب کوڕی ئومەییە کوڕێکی بوو بەناوی یەزید کە لەرۆژی ئۆحوّد بریندار بوو. لەسەرە مەرگدا ئەویان گەیاندەوە ماڵ. ئەندامانی ماڵەکەی لەدەوری کۆبوونەوە و ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو، وتیان: ئەی یەزید، مژدەمان بەژێ چوونکە دەڕۆیتە بەهەشت. حاتبی باوکی کەپیرەپیاو و لەرۆژگاری جاهلییەت گەورە ببوو، ئەو رۆژە دووروویی خۆی نیشاندا و وتی: مژدەی کام بەهەشتەی پێدەدەن، سوێند بەخوا ئەم کوڕەتان فریودا و جەرگی منتان سووتاند.

هەروەها دەڵێت: لەناو ئێمەدا پیاوێك دەژیا دیار نەبوو رەچەڵەکی لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت. ناوی قەزمان و هەرکاتێك باسی ئەو دەکرا، پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: لەجەهەنەمییەکانە. بەڵام لەرۆژی ئۆحوّد پیاوانە شەڕی کرد و بەدەستی خۆی هەشت کەس لەناباوەڕانی کوشت. پیاوێکی بوێر و کاتێك بریندار بوو، لەپێ کەوت. ئەویان بۆ شوێنی منالّەکانی زەفەر برد و کەسانێك لەموسوڵمانان پێیان وت: ئەمڕۆ بوێرانە شەڕت کرد، مژدەی بەهەشتت لێ بێت.

قەزمان وتی: چ مژدەیەك، من لەبەر خەڵکەکەی خۆم شەڕم کرد و ئەگەر ئەوان نەدەبوون، کەس لەگۆڕەپان منی نەدەبینی.

کاتێك ئازار تەنگی پێ هەڵچنی، تیرێکی لەتیردانەکەی خۆی دەرهێناو دەمارەکانی دەستی خۆی بڕی و مرد. کاتێك پێغەمبەریان ئاگادار کردەوە، وتی: بەراستی پێغەمبەری خوام، چوونکە پێشتر لەبەسەر هاتی ئەو ئاگادارم کردبوونەوە.

یەکێك لەو کەسانەی لەرۆژی شەڕی ئۆحوّد کوژرا، موخەیریقی جوولەکە لەمناڵەکانی سەعلەبە بوو، لەرۆژی جەنگ وتی: ئەی جوولەکەکان دەزانن دەبێت هاوکاری محەممەد بکەن.

جوولەکەکان وتیان: ئەمرۆ شەممەیە.

موخەیریق وتی: پێویست ناکات رێزی شەممە بگرین. شمشێر و چەکی هەڵگرت و وتی: ئەگەر کوژرام ماڵەکەم بۆ محەممەدە. دواتر پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) بوو و شەڕی کرد تا کوژرا و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: موخەیریق لەهەموو جولەکەکان باشتر بوو.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دەستەیەك لەموسوڵمانان کوژراوەکانی خۆیان بردەوە بۆ مەدینە و لەوێ بەخاکیان سپارد بەلاّم پێغەمبەر(د.خ) رێگەی ئەم کارەی لێگرتن و وتی: لەهەر شوێنێك کوژراون، لەوێ بەخاکیان بسپێرن.

کوڕی ئیسحاق کوڕی یەسار وتی: لەکاتی ئەسپەردە کردنی کوژراوەکانی شەڕی ئۆحوّد پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: عەمرۆ کوڕی جەموح و عەبدوالله کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزام لەم دنیا هاورێی گیانی گیانی بوون، ئەوان لەیەك گۆڕدا بەخاك بسپێرن..

دەڵێت: کاتێك معاویە ئەو شوێنەی هەڵکەند، هەردووکیان بەیەکەوە لەگۆڕەکە هاتنەدەر وەك بڵێی رۆژێك پێشتر بەخاك سپێردرابوون.

پێغەمبەر(د.خ) بەرەو مەدینە بەرێکەوت. لەرێگا حەمنە کچی جەحشی بینی. پێغەمبەر(د.خ) لەکوژرانی براکەی عەبدوالله کوڕی جەحش ئاگاداری کردەوە و اناللە وت و داوای بەخشینی بۆ کرد. ئەوسا لەکوژرانی حەمزە کوڕی عەبدولمەتەلیبی خاڵی ئاگاداری کردەوە و داوای بەخشینی بۆ ئەو کرد. دوای ئەو لەکوژرانی مەسعەب کوڕی عومەیر ئاگاداری کردەوە کەهاوسەری بوو. لەم کاتەدا ژنەکە هاواری بەرز کردەوە و ناڵاندی. پێغەمبەر(د.خ) کەئارامی و بێدەنگی ئەوی لەکاتی ئاگادار بوون لەکوژرانی برا و خاڵەکەی بینیبوو، فەرمووی: هاوسەر بۆ ژن پێگە و جێگەیەکی گرنگی هەیە.

پێغەمبەر(د.خ) لای ماڵی یەکێك لەئەنسارییەکان تێپەڕی و بیستی بۆ کوژراوەکانی خۆی شین و ڕۆڕۆ دەکەن. فرمیسك لەچاوەکانی قەتیس بوو، فەرمووی: بەڵام کەس شین بۆ حەمزە ناگێڕێت. کاتێك سەعد کوڕی مەعاز و ئەسید کوڕی حوزەیر گەڕانەوە بۆ گەڕەکی منداڵەکانی عەبدئەشهەل، بەژنانی هۆزەکەیان وت: کارەکانی خۆیان تەواو بکەن و بڕۆن شین بۆ مامی پێغەمبەر(د.خ) بگێڕن.

ئیسماعیل کوڕی محەممەد دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لای ژنێك لەتایەفەی منداڵەکانی دینار تێپەڕی کە هاوسەر و برا و باوکی لەئوحود کوژرا بوون. کاتێك ئاگادارییان کردەوە، وتی: پێغەمبەر(د.خ) حاڵی چۆنە؟

وتیان: باشە.

وتی: سەرەتا ئەوم نیشان بدەن.

کاتێك پێغەمبەریان نیشاندا، وتی: کاتێك تۆ زیندوو بیت، هیچ بەڵا و کارەساتێك گرنگییان نییە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە ماڵەکەی، شمشێرەکەی بەفاتیمەدا و فەرمووی: خوێنەکەی بشۆ و عەلی کوڕی ئەبی تالیبیش شمشێرەکەی پێدا و وتی: ئەمەیش بشۆ، چوونکە ئەمڕۆ بەباشی کاری دەکرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تۆ زۆر بوێرانە جەنگاییت و سەهل کوڕی حەنیف و ئەبودوجانەیش بەهەمان شێوە.

دەڵێن: کاتێك عەلی شمشێرەکەی بەفاتیمەدا، هۆنراوەیەکی خوێندەوە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

((فاتیمە، ئەمە شمشێرێکی زۆر باشە

من لەرێگەی خۆشەویستی ئەحمەد و پەرەستینی خواوەند

شەڕم کرد.

شمشێرەکەم هاوشێوەی شەهاب لەدەستمدا دەلەرزی

بڕیم و شکاندم

تا ئەوەی دوژمن بڵاوەیان لێکرد و

دڵمان ئاسوودە بوو))

ئەبودوجانە دەڵێت: کاتێك شمشێرەکەم لەدەستی پێغەمبەر(د.خ) وەرگرت و شەڕم

کرد، کەسێکم بینی بوێرانە شەڕ دەکات، ڕووبەرووی بوومە و هێرشم کردەسەر و بۆم دەرکەوت ژنە. نەمویست بەشمشێری پێغەمبەر(د.خ) ژنێك بکوژم.

گەڕانەوەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە لەرۆژی شەممە یانی هەمان رۆژی شەڕی ئوحود بوو.

عێکرەمە دەڵێت: شەڕی ئوحود لەرۆژی شەممە نیوەی شەوال ڕوویدا و لەرۆژی یەکشەممە شانزەی مانگ پێغەمبەر(د.خ) جاڕیدا تا خەڵکان شوێن دوژمن بکەون، بەڵام ئەوانەی بەشداری شەڕی ئوحودیان نەکرد، هاورێیەتیمان نەکەن.

جابر کوڕی عەبدوالله ئەنساری بەپێغەمبەری وت: باوکم منی لای حەوت خوشکەکەم بەجێهێشت و وتی: ڕەوا نییە، ئەم ژنانە بەبێ پیاو بەجێبێڵین، من بەرەکەتی شەڕکردن لەرێگەی خوا و شان بەشانی پێغەمبەر(د.خ) بەتۆ نابەخشم، لای خوشکەکانت بمێنەرەوە. من مامەوە. پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی پێدا هاورێیەتیان بکات.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتەدەر دوژمن بترسێنێت و کاتێك ئاگادار ببنەوە شوێنیان کەوتوون، گومان بکەن هێشتا هێز و دەسەڵاتی هەیە و شکستی ئوحود ئەوانی لاواز نەکردووە.

یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەتایەفەی مناڵەکانی عەبدئەشهەل کە بەشداری شەڕی ئوحودی کرد، دەڵێت: من و براکەم بریندار لەئوحود گەڕاینەوە و کاتێك جاڕچی پێغەمبەر(د.خ) جاڕیدا بۆ شوێنکەوتنی دوژمن بەرێکەوین، من و براکەم بەیەکمان وت: چۆن دەبێت لەغەزای پێغەمبەر(د.خ) ئامادە نەبین. چوارپێمان نەبوو سواری بین و هەردووکمان بریندار و ناتەوانین. بەڵام پێکەوە ڕۆشتین و هەرکاتێك براکەم لاوازی بەسەریدا زاڵ دەبوو، دەمخستە سەرشان.

پێغەمبەر(د.خ) تا حمرائەلئەسەد پێشڕەوی کرد کەتا مەدینە هەشت میل ڕێگەیە. رۆژی دووشەممە و سێ شەممە و چوار شەممەی لەو ناوچەیە بەسەر برد و دواتر گەڕایەوە.

لەوێ بوو کەمەعبەدی خوزاعی هاتە لای پێغەمبەر(د.خ). خەڵکی خوزاعە لەتەهامە نیشتەجێ بوون، بەموسوڵمان و ناباوەڕەوە پێغەمبەریان خۆشدەویست و هیچ شتێکیان لێ دریغ نەدەکرد.

مەعبەد بە پێغەمبەری وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەو بەڵای بەسەر تۆ و هاورێکانت هات، خەمبار بووین و ئارەزوومان دەکرد، لەو بەڵایە بەدوور بن. دواتر پێغەمبەری

بەجێهێشت تا گەیشتە ئەبوسوفیان و دارودەستەکەی لەروحا مابوونەوە و بڕیاریاندابوو دوبارە هێرش بکەنە سەر موسوڵمانان، دەیانوت. گەورەکان و ژمارەیەکی زۆر لەئەسحابەکانی ئەومان کوشت بەڵام پێش ئەوەی بەتەواوەتی لەناویان ببەین، گەڕاینەوە دەبێت بگەڕێینەوە و کوشتاریان بکەین.

کاتێک ئەبوسوفیان مەعبەدی بینی، پرسی: چ هەواڵێکت پێیە؟

مەعبەد وتی: محەممەد لەگەڵ دەستەیەکی فراوان کەهاوشێوەیم نەبینیووە و لێوانلێون لەتوڕەیی، شوێنتان کەوتووە، هەموو ئەو کەسانەی لەرۆژی ئۆحوْد بەشدارییان نەکرد، هاورێیەتی دەکەن. ئەوان لەئامادە نەبوونی خۆیان پەشیمان بوونەتەوە و ڕقی ئێوەیان لەدڵدایە.

ئەبوسوفیان وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

مەعبەدە وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئێستا لێرە بڕۆیت، تەوێڵی ئەسپەکان دەبینی.

ئەبوسوفیان وتی: ئێمە مەبەستی ئەوەمان کردووە هێرشیان بکەینە سەر و بەتەواوی لەناویان ببەین.

مەعبەد ئەوی لەسوپاکەی پێغەمبەر(د.خ) ترساند و بڕیارەکەی ئەبوسوفیان و ناباوەڕان لاواز و لەگەڕانەوە پەشیمان بوونەوە.

لەم کاتەدا کاروانێکی مناڵەکانی عەبدئەلقەیس لای ئەبوسوفیان تێپەڕی و لەوانیان پرسی: بۆ کوێ دەڕۆن.

وتیان: بەرەو مەدینە.

وتیان: بۆ چ مەبەستێك.

وتیان: دەڕۆین خواردەمەنی و توێشوو بێنین.

وتی: پەیامێك لەمنەوە بۆ محەممەد ببەن و کاتێك هاتنە عوکاز، بارێك کشمیشتان پێ دەدەم.

وتیان: باشە.

وتی: پێی بڵێن، ئێمە بڕیارمانداوە بگەڕێینەوە و پاشماوەی هاوەڵانی لەناو ببەین.

کاروان لەحەمرائەلئەسەد پێغەمبەری بینی و لەوتەکەی ئەبوسوفیان ئاگادارییان کردەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئێمە خوامان بەسە چوونکە پشتیوانێکی بەهێزە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: دوای سێ ڕۆژ مانەوە لە حەمرا ئەلئەسەد پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە گەڕایەوە.

دەستەیەك لەشارەزایان دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) لەسەفەری حەمرائەلئەسەد دەستی بەمعاویە کوڕی موغەیرە و باوکی عێزەی جومەحی گەیشت. پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی ڕۆشتن کوڕی دایکی مەکتوومی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا، ساڵی سێیەمی کۆچ، حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب چاوی بەدنیا هەڵهێنا و هەروەها لەم ساڵەدا فاتیمە بەحسەین کوڕی عەلی دووگیان بوو. لەلەدایك بوونی حەسەن تا دووگیان بوونی فاتیمە بەحسەین، پەنجا ڕۆژ بوو.

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی شەوال جەمیلە کچی عەبدوالله کوڕی ئەبی، بە عەبدوالله کوڕی حەنزەلە دووگیان بوو.

## گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی چوارەمی کۆچی

ساڵی چوارەمی کۆچ دەستی پێکرد و لەسەفەری ئەم ساڵەدا غەزوەی ڕەجیع ڕوویدا.

گێڕانەوەکەی لەزمانی قتادەوە بەمشێوەیە: دوای ئۆحۆد دەستەیەک لەخەڵکانی عەزل و قارە هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتیان: ئیسلام و کردارچاکی لەنێوان ئێمەدا بڵاو بۆتەوە، کەسانێك لەهاوەڵانی خۆت بنێرە تا زانستی دین و شەریعەتمان فێربکەن و قورئانمان بۆ بخوێننەوە.

پێغەمبەر(د.خ) شەش کەس لەهاوەڵان خۆی، مورسەدی غەنەوی و خالید کوڕی بوکەیر و عاسم کوڕی سابت و خەبیب کوڕی عودەی و زەید کوڕی دەئنە و عەبدوالله کوڕی تارقی لەگەڵ ئەواندا نارد و مورسەدی کردە سەرکردەی ئەوان.

ئەوان لەگەڵ خەڵکانی عەزل و قارە بەرێکەوتن تا گەیشتنە ڕەجیع کەئاوی تایەفەی منداڵەکانی هوزەیل لەوێیە. لەوێ خەڵکانی عەزل و قارە خیانەتیان کرد و دەنگیان بەرز کردەوە و خەڵکانی هوزەیلیان دژی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) هاندا. ئەو شەش کەسە لەناکاو خۆیان لەناو بازنەی گەمارۆی خەڵکاندا بینییەوە. شمشێریان دەرکێشا بۆ ئەوەی شەڕ بکەن بەڵام هێرشبەران وتیان: سوێند بەخوا نامانەوێت بتانکوژین، بەڵکو دەمانەوێت لەبەرابەر ئێوە شتێك لەخەڵکانی مەککە وەربگرین و پەیمان دەدەین نەتانکوژین.

مورسەدی غەنەوی و خالید کوڕی بوکەیر و عاسم کوڕی سابت وتیان: ئێمە بەپەیمانی ناباوەڕان ڕازی نابین. شەڕیان کرد تا هەر سێکیان کوژران.

بەڵام زەید کوڕی دەئنە و خەبیب کوڕی عودەی و عەبدوالله کوڕی تاریق نەرمییان لەخۆیان نیشاندا و خوازیاری زیندوو مانەوە بوون. خۆیان بەدەستەوەداو خەڵکانی هوزەیل ئەوانیان ئەسیر کرد و بردیان بۆ مەککە تا بیانفرۆشن.

کاتێك گەیشتنە موڕئەلزەهران، عەبدوالله کوڕی تاریق بەندی دەستی خۆی کردەوە و شمشێری دەرکێشا. هوزەلییەکان لێی دوورکەوتنەوە و بەردبارانییان کرد تا مرد. گۆڕەکەی ئەو لەزەهرانە.

خەبیب کوڕی عودەی و زەید کوڕی دەئنەیان بردە مەککە و فرۆشتییان. حەجیر

کوڕی ئەبی ئەهاب خەبیبی بۆ حارس کوڕی عامر کڕی تا لەتۆڵەی خوێنی باوکی بیکوژێت. زەید کوڕی دەئنە لەلایەن سەفوان کوڕی ئومەییەوە کڕا تا لەتۆڵەی خوێنی ئومەییەی باوکی، خوێنی بڕێژێت.

کاتێك هوزەلییەکان عاسم کوڕی سابتیان کوشت، دەیانویست سەری بڕن تا بیفرۆشن بەسولافە کچی سەعد چوونکە کاتێك باوکی سولافە لەئوحود بەدەستی عاسم کوژرا، نەزری کرد ئەگەر سەری ئەوی دەستبکەوێت، شەرابی تیا بخواتەوە. بەلام زەردەواڵەی زۆر دەوری جەستەی عاسمییاندا و نەیانتوانی دەستیان بەجەستەی بگات و وتیان: چاوەڕوان دەبین تا شەو دادێت و زەردەواڵەکان لەدەوری بلاوە دەبنەوە. شەو، لافاو هات و جەستەی عاسمی لەگەڵ خۆی برد. ئەو نەزری کرد هەرگیز دەست لەجەستەی ناباوەڕێك نەدات و داوای لەخواوەند کردبوو، هیچ ناباوەڕێك دەستی لێنەدات.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب بیستی زەردەواڵەکان ڕێگەیان نەداوە ناباوەڕان دەست لەجەستەی عاسم بدەن، وتی: ئەو شێوەی خواوەند بەندەکەی خۆی پاراست، سەرنج ڕاکێشە، عاسم نەزری کردبوو لەژیاندا دەست لەجەستەی هیچ ناباوەڕێك نەدات و داوای لەخواوەند کردبوو ڕێگە نەدا هیچ ناباوەڕێك دەست لەجەستەی بدات. خواوەند دوای مەرگیش ڕێگەی نەدا ناباوەڕان دەست لەجەستەی بدەن.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: گێڕانەوەی باوکی هورەیرە لەغەزوەی ڕەجیع بەشێوازێکی دیکەیە، دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دەکەسی ڕەوانە کرد عاسم کوڕی سابتی کردە سەرکردەی ئەوان. کاتێك گەیشتنە هەدا، تایفە منداڵەکانی بەحیان لەخەڵکانی هوزەیل، ئاگادار بوونەوە و سەد تیرهاوێژیان شوێن ئەوان خست و ئەو شوێنەیان دۆزییەوە کەخورمایان لێخواردبوو، وتیان: ئەمە ناوکی خورمای یەسربە. شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرت تا ئەوەی عاسم و هاوەڵانی ئەوانیان لەدوورەوە بینی و پەنایان بۆ کێوێك برد، ناباوەڕان دوریان گرتن و وتیان: وەرنەخوار، وەرنەخوار. پەیمانیان پێدان نەیانکوژن و عاسم وتی: من لەسەر پەیمانی ئەوان لەکێوەکە ناڕۆمە خوار، خواوەندا، پێغەمبەر(د.خ) لەبارودۆخی ئێمە ئاگادار بکەرەوە.

کوڕی دەئنە و خەبیب و کەسێکی دیکە هاتنەخوار. ناباوەڕان ئەوانیان بەستەوە و یەکیان بریندار بوو، وتی: ئەمە سەرەتای خیانەتە، سوێند بەخوا لەگەڵ ئێوەدا نایەم، لێیاندا تا کوژرا. خەبیب و کوڕی دەئنەیان بۆ مەککە برد. خەبیبیان بەمنداڵەکانی حارس

کوڕی عامر فرۆشت کەئەوی لەشەڕی ئوحود کوشتبوو.

لەو کاتەی کەخەبیب لای کچەکانی حارس بوو، مووسێکی لەیەکیان وەرگرت تا تیژی بکاتەوە. لەناکاو بینی خەبیب منالەکەی ئەوی لەباوەش گرتووە و مووسەکەی بەدەستەوەیە. قیژاندی.

خەبیب وتی: دەترسی بیکوژم؟ خیانەت پیشەی ئێمە نییە.

ئەو ژنە دواتر دەیوت:هیچ کات ئەسیرێکی باشتر لەخەبیبم نەبینیوە، میوە لەمەککەدا نەبوو، بەلام بۆلەترێم بەدەستی ئەو بینی لێیدەخوارد و ئەم رۆزییە لەلایەن خواوەندەوە بوو. دەستەیەك لەقورەیشییەکان لەتێك لەگۆشتی عاسم بێنن چوونکە لەرۆژی ئوحودەوە دەیانویست تۆلەی لێبکەنەوە. خواوەند زەردەوالەکانی نارد و پارێزگاری لەجەستەی عاسم کرد و نەیانتوانی گۆشتی لیٚ بکەنەوە.

کاتێك خەبیبیان لەحەرەم بردەدەر بۆ ئەوەی بیکوژن، وتی: رێگەم بدەن دوو رەکعەت نوێژ بخوێنم. رێگەیان پێدا و دوو رەکعەت نوێژی خوێند. ئەم کارە بوو بەسونەت کەهەرکەس بەناحەق و نارەوا بکوژرێت، دوو رەکعەت نوێژ دەخوێنێت.

خەبیب وتی: ئەگەر نەتاندەوت لەمەرگ دەترسم، نوێژەکەم درێژ دەکردەوە بەلام گرنگ نییە کاتێك بکوژرێم بەکام لادا بکەوم، خواوەندا لەناویان ببە.

باوکی سەروعە کوڕی حارس ئەوی گرت و کوشتی.

ئومەییە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) منی نارد تا هەواڵی قورەیشییەکانی بۆ ببەم. لەو دارە نزیك کەوتمەوە کەخەبیبیان پێوە هەڵواسیبوو، دەترسام کەسێك بمبینێت، بەدارەکەدا سەرکەوتم و جەستەی خەبیبم داگرت. کەوتە سەرزەوی. کەمێك دوور کەوتمەوە و دواتر سەیرم کرد جەستەی ئەوم نەبینی، وەك بڵێی زەوی جەستەی ئەوی قووتدا بێت، هیچ شوێنەوارێك لەجەستەی خەبیب نەدەبینرا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: سەفوان کوڕی ئومەییە زەید کوڕی دەئنەی بەکۆیلەکەی خۆی نەستاس لەحەرەم بردەدەر تا لەتەنعیم بکوژێت. دەستەیەك لەقورەیشییەکان لەویٚ بوون کەئەبوسوفیان کوڕی حەرب لەناویاندا دەبینرا. کاتێك زەیدیان هێنایە پێش بۆ ئەوەی بیکوژن، ئەبوسوفیان وتی: سوێندت دەدەم بەخوا، راستیم پێبلێ، حەزت دەکرد ئێستا محەممەد لەجێگای تۆ دەبوو و ئێمە ئەومان دەکوشت و تۆ لەناو خێزانەکەی خۆتا بوویتایە.

زەید وتی: سوێند بەخوا نامەوێت چقڵێك ئازار بە محەممەد بگەیێنێت و من لەناو کەسەکانی خۆمدا بم.

ئەبوسوفیان وتی: کەسم نەبینیووە وەك محەممەد خۆشەویستی هاوەڵانی خۆی بێت.

## گێڕانەوەی بەسەرهاتی عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری

کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەخیانەتی خەڵکانی عەزل و قارە کوژران و پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە، عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری لەگەڵ یەکێك لەئەنسارییەکان بۆ مەککە نارد تا ئەبوسوفیان بکوژن.

عەمرۆ دەڵێت: لەگەڵ یەکێك لەهاوەڵان بەرێکەوتین. سواری وشتر بووم بەڵام هاورێکەم وشتری نەبوو. قاچی ناتەوان و ئەوم سواری وشترەکەی خۆم کرد تا گەیشتینە دۆڵی یاجج. ئەژنۆی وشترەکەمان بەستەوە. بەهاورێکەم وت: بەرەو ماڵی ئەبوسوفیان دەڕۆین چوونکە دەمەوێت بیکوژم. ئەگەر شوێن تۆ کەوتن یا لەشتێك ترساییت، بگەڕێرەوە و سوار وشترەکە بە و بەرەو مەدینە بەرێکەوە و پێغەمبەر(د.خ) لەکارەکان ئاگادار بکەرەوە. گووێ بەمن مەدە چوونکە ئەم شارە بەباشی شارەزام. بەرەو مەککە بەرێکەوتین. خەنجێرێکم هەڵگرتبوو بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێك، کێشەی بۆ دروست کردین، بیکوژم.

هاورێکەم وتی: با بڕۆین و حەوت جار بەدەوری کەعبەدا بسوڕێینەوە و دوو رەکەت نوێژ بخوێنین.

وتم: دانیشتووانی مەککە باشتر لەتۆ دەناسم، کاتێك شەو دابێت، بەردەرکی ژوورەکان ئاوپرژێن دەکەن و لەوێ دادەنیشن. من شارەزای مەککەم.

دەڵێت: ئەو پێداگری کرد تا ئەوەی بەناچار ڕۆشتینە کەعبە و حەوت جار بەدەوری ماڵی خوا سووڕاینەوە و دوو رەکعەت نوێژمان خوێند و ڕۆشتینەدەر. لای یەکێك لەگەورەی خەڵکان گوورزەمان کرد. یەکیان منی ناسی وهاواری کرد ئەوە عەمرۆ کوڕی ئومەییەیە.

دەڵێت: خەڵکانی مەککە دەوریان گرتین و وتیان: سوێند بەخوا عەمرۆ بۆ کاری خێر نەهاتۆتە مەککە، ئەو شەڕی بەدەستەوەیە.

لەبەر ئەوە ئەم قسەیان کرد چوونکە لەسەردەمی جاهلییەت عەمرۆ کەسێکی

پیاوکوژ و خراپەکار بوو.،

دەڵێت: خەڵکانی مەککە شوێن خۆم و هاورێکەم کەوتن. بەهاورێکەم وت رابکە، من لەمەدەترسام و چیتر دەستمان بەئەبوسوفیان ناگات. بەخێرایی هەڵاتین تا گەیشتینە سەرەوەی کێوەکە و ڕۆشتینە ناو ئەشکەوتێك و شەومان لەوێ بەسەر برد. ئێمەیان نەدۆزییەوە گەڕانەوە. کاتێك ڕۆشتمە ناو ئەشکەوتەکە، بەردێکم لەدەرگەکەی دانا. دواتر بەهاورێکەم وت: دەوەستین تا ئەوان ئارام دەبنەوە چوونکە ئەمشەو تا سبەی شەو بەدوای ئێمەدا دەگەڕێن.

دەڵێت: لەئەشکەوتەکەدا بووین عوسمان کوڕی خالید هات. ئەسپەکەی بەدوای خۆیدا رادەکێشا و لەبەردەم دەرگای ئەشکەوتەکە وەستا. بەهاورێکەم وت: سوێند بەخوا ئەگەر بمانبینێت، خەڵکانی مەککە ئاگادار دەکاتەوە. هاتمەدەر و خەنجێرم لەسکی چەقاند. هاواری کرد کەخەڵکانی مەککە بیستیان و بۆ لای دەنگەکە هاتن. بۆ لای هاورێکەم گەڕامەوە و وتم: ئارام بە.

دەڵێت: خەڵکانی مەککە بەدوای دەنگەکەدا هاتن. عەمرۆیان دۆزییەوە، هێشتا نەمردبوو و وتیان: کێ تۆی کوشت؟

وتی: عەمرۆ کوڕی ئومەییە. دوای ئەوە مرد و ئەوان نەیانتوانی شوێنەکەی ئێمە بدۆزنەوە، وتیان: دەمانزانی بۆ کاری خێر نەهاتووە. مەرگی عوسمان ئەوانی لەگەڕان بەدوای ئێمەدا دوور خستەوە. ئێمە دوو رۆژ لەئەشکەوتەکەدا ماینەوە تا ئەوەی چیتر لەگەڕان بەدوای ئێمە دەستیان هەڵگرت. دواتر بەرەو تەنعیم بەرێکەوتین کەدارەکەی خەبیب لەوێ بوو، هاورێکەم وتی: دەتەوێت خەبیب دابگرین؟

وتم: لەکوێیە؟

وتی: لێرەیە.

وتم: بەڵێ، بەلام مۆڵەت بەمن بدە و کەمێك دوور بکەوەرەوە.

دەڵێت: چەند کەسێك بەدەوری دارەکەی خەبیب پاسەوانییان دەدا. بەهاورێکەم وت ئەگەر لەشتێك ترسایت، سوار وشترەکە ببە و بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) بگەڕێرەوە و رووداوەکەی بۆ باس بکە. هێرشم بردە سەردارەکە و جەستەی خەبیبم خستە سەرشان. زیاتر لەچل زەراع نەڕۆشتبووم کەپاسەوانەکان ئاگادار بوونەوە. جەستەکەم فرێدا. سوێند بەخوا هەرگیز دەنگی کەوتنی جەستەکە لەبیر ناکەم. پاسەوانەکان شوێنم

کەوتن. ڕێگەی سەفەرم گرتەبەر. نەیانتوانی بمگرن و گەڕانەوە. هاوڕێکەم گەڕابوویەوە بۆ لای و پێغەمبەر(د.خ) و ڕووداوەکەی بۆ باس کردبوو.

دەڵێت: ڕۆشتم تا گەیشتمە زەجنان. چوومە ناو ئەشکەوتێك. تیروکەوانەکەم پێبوو. کاتێك لەناو ئەشکەوتەکەدا بوم، پیاوێکی باڵابەرزی یەك چاو لەمناڵەکانی دوئەل کەمەڕەکانی خۆی دەلەوەڕاند، هاتە ناو ئەشکەوتەکە و پرسی: تۆ کێیت؟

وتم: لەتایەفەی مناڵەکانی بەکرم.

وتی: منیش لەتایەفەی بەکر و لەهۆزی مناڵەکانی دوئەلم.

دواتر لەناو ئەشکەوتەکەدا خەوت و دەنگی بەرز کردەوە و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((تا ئەو کاتەی زیندووم باوەڕ ناهێنم

و نابمە موسوڵمان))

وتم: دەبینیت. زۆری نەخایاند ئەو عەرەبە بیابانییە خەوی لێکەوت. هەستام و بەقێزەونترین شێوە کوشتم. کەوانەکەی خۆم لەچاوە ساغەکەی چەقاند کە لەپشت سەرییەوە هاتەدەر.

دواتر هاتمەدەر و بەرێکەوتم تا گەیشتنە نەقیع. چاووم بەدوو کەس لەخەڵکانی مەککە کەوت کە بۆ بەدەست هێنانی هەواڵەکانی تایبەت بە پێغەمبەر(د.خ) هاتبوونەدەر. ئەوانم ناسییەوە وتم: خۆتان بەدەستەوە بدەن.

وتیان: تەسلیمی تۆ ببین؟

بەتیر لەیەکیانمدا و کوشتم. ئەوی دیکەیانم ئەسیر کرد وبەرەو مەدینە بەرێکەوتم. چاوم بەدەستەیەك لەئەنسار کەوت، وتیان: ئەوە عەمرۆ کوڕی ئومەییە.

کاتێك مناڵەکان ئەم قسەیان بیست، بۆلای پێغەمبەر(د.خ) ڕایان کرد تا ئاگاداری بکەنەوە. پەنجەی ئەسیرەکەی خۆم بەزێی کەوانەکەم بەستبوو. پێغەمبەر(د.خ) سەیری کردم و بەشێوەیەك پێکەنی کەهەموو دانەکانی دەرکەوتن. دواتر پرسیاری کرد و من، هەموو ڕوداوەکانم بۆ باس کرد. پێغەمبەر(د.خ) دوعای خێری بۆ کردم.

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) زێنەبی کچی خوزەیمەی کردە هاوسەری خۆی کە نازناوی دایکی هەژارەکان و لەتایەفەی مناڵەکانی هیلال بوو. ئەم هاوسەرگیرییە لەمانگی ڕەمەزان ڕوویدا. دوانزە ونیو ئۆقییە مارەیی ئەو بوو. زێنەب پێشتر ژنی توفەیل کوڕی حارس بوو و تەلاقی لیَ وەرگرت.

## بەسەرهاتی بیئر مەعوونە

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا، یانی ساڵی چوارەمی کۆچ، پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەکی ڕەوانە کرد کە لەبیئر مەعوونە کوژران.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دوای شەڕی ئوحود پاشماوەی شەوال و زیقەعدە و زیحەججە و موحەرەمی لەمەدینە بەسەر برد. لەو ساڵەدا ناباوەڕان کاروباری حاجییان و حەج کردنیان لەئەستۆدابوو. لەمانگی سەفەر چوار مانگ دوای ئوحود دەستەیەکی بۆ بیئر مەعوونە نارد.

کوڕی ئیسحاق کوڕی یەسار دەڵێت: باوکی بەرا عامر کوڕی مالیك ناسراو بەملاعب الاسنە سالاری تایەفەی منالەکانی عامر کوڕی سەعسەعە، لەمەدینە گەیشتە خزمەتی پێغەمبەر(د.خ). دیارییەکی بۆ هێنا. پێغەمبەر(د.خ) وەرینەگرت و فەرمووی: دیاری ناباوەڕ وەرناگرم، ئەگەر دەتەوێت دیارییەکەت وەربگرم دەبێت باوەڕ بێنیت. پێغەمبەر(د.خ) پێشنیاری ئیسلامی پێکرد و باسی پاداشتە خواییەکانی کرد کەخواوەند بەڵێنی بەباوەڕداران داوە و قورئانی بۆ خوێندەوە بەڵام باوکی بەرا باوەڕی نەهێنا و حاشای لەراستی وتەکانی پێغەمبەر(د.خ) کرد و وتی: ئەی محەممەد، دینەکەی تۆ چاك و پەسەندە، ئەگەر کەسانێك لەهاوەڵانی خۆت بۆ لای دانیشتووانی نەجد بنێرێت، هیوادارم باوەڕ بەئایینەکەی ئێوە بێنن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەدانیشتووانی نەجد بۆ گیانی هاوەڵانی خۆم دەترسم.

باوکی بەرا وتی: من پەنایان دەدەم، بیاننێرە تا بانگەشە بۆ دینەکەی تۆ بکەن.

پێغەمبەر(د.خ) مونزەر کوڕی عەمرۆی لەگەڵ چل کەس لەموسوڵمانە ناودارەکان ڕەوانە کرد کەحارس کوڕی سەممە و حەرام کوڕی مەلحان و عوروە کوڕی ئەسما و نافیع کوڕی بودەیلی خوزاعی و عامر کوڕی فوهەیرە موالی ئەبوبەکر لەناویاندا دەبینران.

ئەنس کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) مونزەر کوڕی عەمری لەگەڵ حەفتا سوار ڕەوانە کرد. ئەوان ڕۆشتن تا لەبیئر مەعوونە دابەزین کە لەنێوان سەرزەمینی منالەکانی عامر و حوڕەی منالەکانی سولەیم جێگیرە. حەرام کوڕی مەلحانیان هاوڕێ لەگەڵ نامەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ لای عامر کوڕی توفەیل نارد بەڵام سەیری نامەکەی نەکرد و هەڵگری

نامەکەی کوشت و منداڵەکانی عامری بۆ کوشتنی نێردراوان هاندا. خەڵکان رازی نەبوون و وتیان: ئێمە کەسانێك ناکوژین کەباوکی بەرا پەنای داون. عامر کوڕی توفەیل هۆزەکانی منداڵەکانی سولەیمی دژی نێردراوەکانی پێغەمبەر(د.خ) هاندا، رازی بوون و هاتن و گەمارۆیان خستە سەر ئەو حەفتا کەسە.

کاتێك نێردراوانی پێغەمبەر(د.خ) باروبۆخیان بینی، شمشێریان دەرکێشا و شەڕیان کرد تا هەموویان کوژران جگە لەکەعب کوڕی زەید کەهێشتا نیوە گیانی بەبەردا مابوو. کەعب لەناو کوژراوەکان هەستا و زیندوو مایەوە تا ئەوەی لەشەڕی خەندەك کوژرا. عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری و یەکێك لەئەنسار کەسەرقاڵی لەوەڕاندنی وشترەکانی بوو بەهۆی ئەو مەلانەی بەسەر گۆڕەپانی شەڕ هەڵدەفڕین، لەکوژرانی هاوەڵانی خۆیان ئاگادار بوونەوە و وتیان: سوێند بەخوا کارەساتێك روویداوە. هاتن و بینییان نێردراوانی پێغەمبەر(د.خ) لەخاك و خوێندا کەوتوون و دوژمن لەسەر سەریانە. پیاوی ئەنساری بەعەمرۆ کوڕی ئومەییەی وت: بۆچوونی تۆ چییە؟

عەمرۆ وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بڕۆینە لای پێغەمبەر(د.خ) و لەم رووداوە ئاگاداری بکەینەوە.

ئەنساری وتی: من ئەو شوێنە بەجێ ناهێڵم کەعەمرۆ کوڕی مونزەری تیا کوژراوە چوونکە دەبمە بنێشتە خۆشەی سەرزاران. شەڕی لەگەڵ دوژمنان کرد و ئەویش کوژرا. عەمرۆ کوڕی ئومەییەیان ئەسیر کرد و لەبەر ئەوەی وتی لەتایەفەی منداڵەکانی موزەرە، عامر کوڕی توفەیل ئازادای کرد بەڵام قژی ناوچاوی دەرکێشا.

عەمرۆ کوڕی ئومەییە ڕۆشت تا گەیشتە قرقرە. دوو کەس لەخەڵکانی منداڵەکانی عامر لەوێ دابەزین کە لەلایەن پێغەمبەرەوە پەنایان پێ بەخشرا بوو بەڵام عەمرۆ بێ ئاگا بوو. پرسی: لەچ تایەفەییێکن؟ وتیان: لەمنداڵەکانی عامر. عەمرۆ چاوەڕوانی کرد تا هەردووکیان خەوتن. ئەوانی کوشت و گومانی کرد بەمشێوەیە توانیوویەتی تۆڵە لەمنداڵەکانی عامر بستێنێتەوە.

کاتێك عەمرۆ گەیشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و رووداوەکەی بۆ باس کرد، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوو کەست کوشت کەدەبێت خوێنبایی ئەوان بدەم. فەرمووی: ئەمە ئەنجامی کرداری باوکی بەرا بوو، من ڕەوانە کردنی ئەم دەستەیەم پەسەند نەدەکرد و دەترسام. ئەم وتە بەباوکی بەرا گەیشت. کردەی عامر کوڕی توفەیل کەرێزی پەنای ئەوی نەگرت و ئەو بەڵای بەسەر هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) هێنایی، بۆ

ئەو دژوار بوو.

یەکێك لەوکەسانەی لەبیێری مەعوونە کوژرا، عامر کوڕی فوهەیرە بوو.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عامر کوڕی توفەیل وتی: کاتێك ئەم پیاوە کوژرا، لەنێوان ئاسمان و زەوی بەرز کرایەوە، من ئەوم لەئاسمان بینی، کێ بوو؟

وتیان: عامر کوڕی فوهەیرە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: جەبار یەکێك بوو لەو کەسانەی لەرۆژی بیێر مەعوونە هاوڕێیەتی عامر کوڕی توفەیلی دەکرد و دواتر باوەڕی هێنا، دەیوت: هۆکاری باوەڕ هێنانی من ئەوە بوو: ئەو ڕۆژە بەڕمەکەی خۆم لەپشتی یەکێك لەموسوڵمانەکانمدا و لەسکییەوە هاتەدەر، بیستم، وتی: سوێند بەخوا رزگارم بوو. بەخۆم وت: چۆن رزگاری بوو؟ مەگەر نەمکوشت؟ دواتر سەبارەت بەم رزگارییە پرسیم. وتیان: رزگاری شەهادەتە و بەخۆم وت: بەراستی رزگاری بووە.

حەسان کوڕی سابت و کەعب کوڕی مالیك هۆنراوەیەکیان بۆ سەرکۆنە کردنی کردەوەکەی عامر کوڕی توفەیل کەپەنای باوکی بەرای شکاند و هاوەڵانی پێغەمبەری کوشت، هۆنییەوە و کاتێك رەبیعە کوڕی بەرا هۆنراوەکەی ئەوانی بیست، هێرشی کردە سەر عامر کوڕی توفەیل، بەڵام ڕمەکەی رەبیعە کاریگەری لەسەر عامر دانەنا و لەئەسپەکەی کەوتەخوار و وتی: ئەمە کاری باوکی بەرا ە، ئەگەر مردم خوێنەکەم بۆ مامم و کەس تۆڵە نەکاتەوە، ئەگەر زیندوومام، خۆم دەزانم چیبکەم.

ئەنس کوڕی مالیك دەڵێت: نازانم نێردراوەکانیب بیێرمەعوونە چل کەس بوون یا حەفتا.

عامر کوڕی توفەیل لەسەر ئاوەکە بوو. نێردراوانی پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتن تا لەئەشکەوتێك لەنزیك ئاوەکە دابەزین و وتیان: چ کەسێك پەیامی پێغەمبەر(د.خ) بەم خەڵکە دەگەیێنێت؟

کوڕی مەلحانی ئەنساری وتی: من. بەرێکەوت تا گەیشتە خێوەتەکانی ئەوان و وتی: ئەی خەڵکانی بیێر مەعوونە، من نێردراوی پێغەمبەری خوام و شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە. ئێوەیش باوەڕ بەخوا و پێغەمبەر(د.خ) بێنن. لای خێوەتەکانەوە ڕمێك هاتەدەر و لەکەلەکەی چەقی و لەولای کەلەکەی هاتەدەر. کوڕی مەلحان وتی: الله اکبر، رزگارم بوو.

دوژمنان هاتن و هاوەڵانی کوڕی مەلحانیان لەناو ئەشکەوتەکە دۆزییەوە. عامر کوڕی توفەیل هەموویانی کوشت.

ئەنس کوڕی مالیك دەڵێت: خواوەند سەبارەت بەکوژراوانی بیئر مەعوونە ئایەیێکی ڕەوانە کرد:

((بلغوا عنا قومنا انا قد لقینا ربنا فرضی عنا و رضینا عنه.

واتاکەی: بەخەڵکەکەی ئێمە بڵێ ئێمە خواکەی خۆمان بینی و لەئێمە رازی بوو و ئێمەیش لەو رازی.))

بەڵام ئەم ئایە کە ماوەیەکی زۆر دەخوێندرایەوە، هەڵوەشایەوە و بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان و خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((ولا تحسبن الذین قتلوا فی سبیل الله امواتا بل احیاء عند ربهم یرزقون.

واتاکەی: گومان مەکە ئەوانەی لەرێگەی خوادا دەکوژرێن، مردوون، ئەوان زیندوون و لای پەروەردگاری خۆیان رۆژی دەخۆن.))

هەروەها لەم ساڵەدا یانی ساڵی چوارەمی کۆچ، پێغەمبەر(د.خ) خەڵکانی مناڵەکانی نەزیری لەسەرزەمینی خۆیان دەرکرد.

## گێڕانەوەی چۆنییەتی دەرکردنی مناڵەکانی نەزیر لەدیاری خۆیان

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هۆکاری ئەم ڕووداوە کوژرانی دووکەس بوو کە پێغەمبەر(د.خ) پەنای پێبەخشیبوون و عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری لەکاتی گەڕانەوەی لەبیئر مەعوونە خوێنی ئەوانی ڕشت.

دەڵێت: عامر کوڕی توفەیل نامەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی: دووکەس کە تۆ ئەمانت پێبەخشیبوون، بەدەستی موسوڵمانان کوژراوە و دەبێت خوێنبایی ئەوان بنێریت. پێغەمبەر(د.خ) بەرەو قوبا بەرێکەوت و لەوێوە ڕووی کردە سەرزەمینی مناڵەکانی نەزیر تا بۆ دانی خوێنبایی هاوکارییان لێوەربگرێت. دەستەیەك لەموهاجیر و ئەنسار و لەوان ئەبوبەکر و عومەر و عەلی و ئەسید کوڕی حوزەیر هاوڕێیەتی پێغەمبەریان دەکرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بۆ لای مناڵەکانی نەزیر ڕۆشت تا بۆ خوێنبایی دوو کوژراوەکە هاوکارییان لێوەربگرێت چوونکە کوژراوەکان لەمناڵەکانی عامر بوون و لەنێوان مناڵەکانی عامر و مناڵەکانی نەزیر پەیمانێك لەئارادابوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ مناڵەکانی نەزیر قسەی کرد، وتیان: بەڵێ، ئەی باوکی قاسم، هاوکاری تۆ دەکەین.

نەزیرییەکان لەناو خۆیاندا راوێژیان کرد و وتیان: هیچ کات بەمشێوەیە ئەم پیاوە ناکەوێتە بەردەستی ئێوە. پێغەمبەر(د.خ) پاڵی بەدیواری ماڵی یەکێك لەوان دابوویەوە و دانیشتبوو، وتیان: کێ دەتوانێت لەسەرەوەی بانی ئەوە ماڵە بەردێك بخاتەخوار و بیکوژێت و ئاسوودەمان بکات. یەکێك لەجوولەکەکان بەناوی عەمرۆ کوڕی جەحش کوڕی کەعب وتی: من ئەو کارە دەکەم. ڕۆشت تا بەردەکە بەسەر پێغەمبەر(د.خ) بخاتەخوار. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ چەند کەس لەهاوەڵانی خۆی و لەناویان ئەبوبەکر و عومەر و عەلی لەبن دیوارەکەدا بوون.

پێغەمبەر(د.خ) بەهۆی وەحی ئاسمانییەوە لەمەبەستی ئەو خەڵکە ئاگادار بوویەوە و بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: لێرە بمێننەوە تا من دەگەڕێمەوە. بۆ مەدینە گەڕایەوە و کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ماوەیەك چاوەڕوانییان کرد، بەدوایدا گەڕان. کەسێکیان بینی کە لەمەدینەوە دەهات و کاتێك پرسیاریان لێکرد، وتی: پێغەمبەرم بینی ڕۆشتە

ناو مەدینە. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە گەڕانەوە. پێغەمبەر(د.خ) لەمەبەستی خیانەت کردنی جوولەکەکان ئاگاداری کردنەوە و فەرمانی پێدان بۆ جەنگ خۆیان ئامادە بکەن.

پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ شەڕکەرە موسوڵمانەکان بەرەو مناڵەکانی نەزیر بەڕێکەوت. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا دارخورماکانیان بڕنەوە و بیسوتێنن. جولەکەکان هاواریان کرد: ئەی محەممەد، تۆ ڕێگە لەخراپەکاری دەگریت و سەرکۆنەی ئەو کارەت دەکرد، کەواتە سووتاندن و بڕینەوەی دارخورماکان بۆ چییە؟

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەپێی گێڕانەوەی واقدی، کاتێك نەزیرییەکان پلانی کوشتنی پێغەمبەریان داڕشت، سەلام کوڕی مەشکەم ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتن و لەهەڵگیرسانی شەڕ ئاگاداری کردنەوە بەڵام بەوتەکانی رازی نەبوون. عەمرۆ کوڕی جەحش ڕۆشتە سەر بانەکە تا بەردەکە بەسەر پێغەمبەر(د.خ) بخاتەخوار. لەئاسمانەوە پێغەمبەریان ئاگادار کردەوە و لەشوێنەکەی خۆی هەستا وەك بڵێی دەیویست دەست بەئاو بگەیێنێت. هاوەڵانی چاوەڕوانییان کرد و کاتێك ڕۆشتنی ئەو زۆری خایاند، جوولەکەکان وتیان: بۆ باوکی قاسم نەگەڕایەوە و هاوەڵانی ڕۆشتن؟ کەنانە کوڕی سوریا وتی: لەئاسمانەوە لەمەبەستەکەی ئێوە ئاگادار کرایەوە.

دەڵێت: کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) گەڕانەوە لای کە لەمزگەوتا دانیشتبوون، وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، چاوەڕوانی تۆمان دەکرد و تۆ گەڕایتەوە بۆ مەدینە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: جولەکەکان دەیانویست بمکوژن. خواوەند منی ئاگادار کردەوە، محەممەد کوڕی موسلیمە بانگ بکەن. کاتێك محەممەد کوڕی موسلیمە هات، پێی فەرموو: بڕۆ لای جوولەکەکان و پێیان بڵێ، ئێوە مەبەستی ئەوەتان کرد خیانەت بکەن، لەسەرزەمینەکەی ئێمە بڕۆن و چتیر لێرە مەمێننەوە.

کاتێك محەممەد کوڕی موسلیمە ڕۆشتە لای جوولەکەکان و وتی: پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت سەرزەمینەکەی بەجێبێڵن، وتیان: ئەی محەممەد، هەرگیز گومانمان نەدەکرد یەکێك لەئەوسییەکان ئەم پەیامە بۆ ئێمە بێنێت.

محەممەد کوڕی موسلیمە وتی: دڵەکان گۆڕانیان بەسەر هاتووە و ئیسلام پەیمانەکانی هەڵوەشاندۆتەوە.

قورەزییەکان وتیان: دەڕۆین.

بەڵام عەبدوالله کوڕی ئەبی کەسی نارد و پەیامیدا: مەڕۆن چوونکە لەعەرەبەکان و

پیاوەکان دووهەزار کەسم هەیە کەشوێنکەوتەی منن و پشتیوانی ئێوە، جوولەکەکانی منالەکانی قورەیزەیش هاوکاریتان دەکەن.

کاتێك کەعب کوڕی ئەسەد کەبەنوێنەرایەتی منالەکانی قورەیزە پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەستبوو، ئەم قسەی بیست، وتی: تا ئەو کاتەی من زیندووم کەس لەمنالەکانی قورەیزە پەیمانەکەی خۆی ناشکێنێت.

سەلام کوڕی مەشکەم بەحەیی کوڕی ئەختەبی وت: بەوتەکانی محەممەد رازی ببە با لەمە خراپتر نەبێت چوونکە شەرەف ئێمە پەیوەستە بەسامانی ئێمە.

حەیی وتی: خراپتر لەمە چییە؟

سەلام وتی: سامانی ئێمە ببەن و ژن و منالەکانمان ئەسیر و پیاوەکانمان کوشتار بکەن.

بەلام حەیی گرنگی بەوتەکانی سەلام نەدا و جودەی کوڕی ئەختەبی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و وتی: ئێمە سەرزەمینی خۆمان بەجێناهێڵین، هەرکارێکت پێخۆشە بیکە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ)تەکبیری وت و فەرمووی: جوولەکەکان دەیانەوێت شەڕ بکەن. موسوڵمانان تەکبیریان وت.

جودەی ڕۆشتە لای عەبدوالله کوڕی ئەبی تا هاوکاری لێوەربگرێت، دەڵێت: عەبدواللەم بینی لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی دانیشتبوو، جارچی پێغەمبەر(د.خ) جاریدەدا تا موسوڵمانان سیلاح هەڵگرن. عەبدوالله کوڕی عەبدوالله کوڕی ئەبی هات و سیلاحی هەڵگرت و بەخێرایی ڕۆشت. من دانیشتبووم و لەهاوکاری کردنی ئەو بێ هیوا. بەحەییم وت و ئەو وتی: ئەمە فریوی محەممەدە.

پێغەمبەر(د.خ) هێرشی کردە سەر منالەکانی نەزیر و ماوەی پانزە ڕۆژ گەمارۆی خستنە سەر. دواتر پەیمانی ئاشتییان بەست بۆ ئەوەی گیانیان پارێزراو و سامانەکانیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) بێت.

کوڕی عەباس دەڵێت:پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ گەمارۆی خستە سەر خەڵکانی نەزیر و کاتێك تەنگیان پێهەڵچنرا، تەسلیم بوون. پێغەمبەر(د.خ) بڕیاریدا گیانیان پارێزراو بێت و سەرزەمینەکەی خۆیان بەجێبێڵن و رووبکەنە ئەزرەعاتی شام. هەر سێ کەس وشترێك و موشکێکی پێدان.

زوهری دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بڕیاریدا هەرکامیان یەك باری وشتر لەگەڵ خۆیان ببەن بەڵام سیلاح نەبەن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دەستەیەك لەمناڵەکانی عەوف کوڕی خەزرەج و لەناویان عەبدوالله کوڕی ئەبی کوڕی سەلول و وەدیعە و مالیك کوڕی ئەبی قوقل و سوەید و داعس کەسیان بۆ لای مناڵەکانی نەزیر ڕەوانە کرد کەبمێننەوە و خۆتان بەدەستەوە مەدەن چوونکە هاوکاریتان دەکەین، ئەگەر شەڕ بکەن، شان بەشانی ئێوە دەجەنگین و ئەگەر بڕۆن، هاوڕێی ئێوە دەبین. جوولەکەکان چاوەڕوانیان کرد بەڵام ئەوان هیچ کارێکیان پێنەکرا. خواوەند دڵی جوولەکەکانی لێوانلێو کرد لەترس و داوایان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد گیانیان بپارێزێت و بەئەندازەی باری یەك وشتر لەسامانەکەی خۆیان ببەن جگە لەسیلاح. کەسی وا دەبینرا ماڵەکەی خۆی وێران و بەئەندازەی باری وشترێکی لێ بار دەکرد. هەموویان روویان کردە خەیبەر. دەستەیەکیان رێگەی شامیان گرتەبەر. لەگەروەکانی خەڵك کەروویان کردە خەیبەر، سەلام کوڕی ئەبی حەقیق و حەیی کوڕی ئەختەب بوون و کاتێك لەوێ دابەزین، خەڵکان گوێرایەڵی خۆیانیان نیشاندا.

دەڵێت: کاتێك خەڵکانی نەزیر هاوڕێ لەگەڵ ژن ومناڵەکانی خۆیان دەڕۆشتن، دەف و دەهۆڵیان دەژەنی. دایکی عەمرۆیار عوروە کوڕی وەردی عەبەسی کە یەکێك بوو لەژنەکانی مناڵەکانی غەفار و ئەویان لەعوروە کڕیبوو، هاوڕێیەتی دەکردن. بەشێوەیەك لەخۆباییانە بەرێگەدا دەڕۆشتن کەهاوشێوەی نەبینراوە. سامانەکەیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) بەجێما کەتایبەت بوو بەخۆی بۆ ئەوەی هەرچۆنێك بخوازێت، خەرجی بکات. پێغەمبەر(د.خ) لەناو موهاجیراندا دابەشی کرد و هیچی بەئەنسار نەدا جگە لەسەهل کوڕی حەنیف و ئەبودوجانە کەئاماژەیان بەنەداری خۆیاندا و پێغەمبەر(د.خ) بەشی ئەوانیدا. لەمناڵەکانی نەزیر کەس باوەڕی نەهێنا جگە لەیامین کوڕی عومەیر و باوکی سەعد کوڕی وەهب کەباوەڕیان هێنا و سامانی خۆیانیان پاراست.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ)کاتێك بۆ غەزای مناڵەکانی نەزیر مەدینەی بەجێهێشت، کوڕی دایکی مەکتوومی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا و ئاڵاکەی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب سپارد.

لەجومادی الاول ئەم ساڵە عەبدوالله کوڕی عوسمان کوڕی عەفان لەتەمەنی شەش ساڵی مرد و پێغەمبەر(د.خ) نوێژی لەسەر خوێند. عوسمان وەك نەریتی موسوڵمانان

پێش جەنازەکە ڕۆشتە ناو گۆڕەکە. هەروەها لەشەعبانی ئەم ساڵە حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

سەبارەت بەرووداوەکان دوای غەزای منداڵەکانی نەزیر گێڕانەوەکان جیاوازن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دوای غەزای منداڵەکانی نەزیر، مانگەکانی رەبیع الاول و ربیع الثانی و بەشێك لەجومادی الاولی لەمەدینە بەسەر برد. دوای ئەوە بەمەبەستی هێرش کردنە سەر منداڵەکانی موحاریب و منداڵەکانی سەعلەبە لەهۆزی غەتەفان رووی کردە نەجد و لەنەخل دابەزی. رووبەرووی دەستەیەك لەمنداڵەکانی غەتەفان بوویەوە بەڵام شەڕ روویندا. هەردوولا لەیەك دەترسان. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ هاوەڵانی خۆی نوێژی ترسی خوێند و گەڕایەوە. ئەم غەزوەیان بەزات ئەلرقاع ناو بردووە.

بەڵام بەوتەی واقدی غەزوەی زات ئەلرقاع لەموحەڕەمی ساڵی پێنجەمی کۆچی روویدا و ناوەکەی لەکێوەی زات ئەلرقاعەوە سەرچاوەی گرتووە کەڕەنگەکانی ڕەش و سپی و سوورە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەم غەزایە، عوسمان کوڕی عەفانی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا.

ئەبوهورەیرە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەرەو نەجد بەرێکەوتین و کاتێك لەنەخل گەشتینە کێوی زات ئەلرقاع، رووبەرووی دەستەیەك لەغەتەفانییەکان بووینەوە بەڵام شەڕ روویندا. موسوڵمانان لەوان دەترسان و نوێژی ترس هاتە خوار. پێغەمبەر(د.خ) هاوەڵانی خۆی بۆ دوودەستە دابەش کرد. دەستەیەکیان رووبەرووی دوژمن وەستان و دەستەیەکیان لەپشت پێغەمبەر(د.خ) ریزیان بەست. پێغەمبەر(د.خ) تەکبیری دەوت و ئەوان تەکبیریان دەوت. دواتر پێغەمبەر(د.خ) و دەستەی پشت سەری ئەو رکوع و سوجدەیان برد و کاتێك لەنوێژ کردن تەواو بوون، تا نزیك ریزی دەستەکەیتر پاشەکشێیان کرد و ئەوان هاتن و یەك رەکعەت نوێژیان خوێند. دواتر هەستان و پێغەمبەر(د.خ) یەك رەکعەت نوێژی لەگەڵ خوێندن و دانیشتن. ئەوانەی رووبەرووی دوژمن بوون، دووبارە گەڕانەوە و رەکعەتی دووەمی نوێژەکەیان خوێند. هەموویان پێکەوە دانیشتن و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) سڵاوی نوێژەکەیان دایەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: سەبارەت بەنوێژی پێغەمبەر(د.خ) لەسەرزەمینی نەخل،

گێڕانەوەکان جیاوازە بەڵام لێرەدا ئاماژەم پێنەدا بۆ ئەوەی باسەکەمان درێژ نەبێتەوە و بەخواستی خوا لەکتێبی بسیط القول احکام شرایع الاسلام لەکتێبی نوێژی ترس ئاماژەی پێدەدەم.

سلێمانی یەشکری دەڵێت: بەرەو ڕێگەی کاروانی قورەیش ڕۆشتین کە لەشامەوە دەهات و کاتێك گەیشتینە نەخل، یەکێك لەغەتەفانییەکان هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی محەممەد ئایا لەمن دەترسیت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نە.

وتی: کێ تۆ لەبەرابەر من دەپارێزێت؟

فەرمووی: خواوەند.

ئەو کەسە شمشێری دەرکێشا و هەڕەشەی لە پێغەمبەر(د.خ) کرد.

پێغەمبەر(د.خ) سیلاحی هەڵگرت وهەرئەوەندەی بانگی نوێژیان بەرز کردەوە، پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی نوێژی خوێند و دەستەیەکی دیکە بەپاسەوانی کردن سەرقاڵ بوون. لەگەڵ کەسانی نزیك، دوو رەکعەت نوێژی خوێند. دواتر ئەوان ڕۆشتن و لەجیاتی پاسەوانەکان، پاسەوانی کردنیان گرتە ئەستۆ و پاسەوانەکان هاتن و دوو رەکعەت نوێژیان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) خوێند. بەمشێوەیە پێغەمبەر(د.خ) چوار رەکعەت نوێژی خوێند بەڵام موسوڵمانان هەرکام یەکی دوو رەکعەت. لەو ڕۆژەدا خواوەند فەرمانی نوێژی کورتی ناردەخوار و باوەڕداران راسپێردران لەکاتی نوێژ سیلاح هەڵبگرن.

لەجابر کوڕی عەبدوالله ئەنساری دەگێڕێتەوە: یەکێك لەمناڵەکانی موحاریب بەخەڵکەکەی خۆی وت: دەتانەوێت محەممەد بکوژم؟

وتیان: بەڵێ بەڵام چۆن دەیکوژیت؟

وتی: بەشێوەیەکی لەناکاو دەیکوژم.

ئەو پیاوە موحاربییە هاتە لای پێغەمبەر(د.خ)، دانیشتبوو. شمشێرەکەی لای خۆی دانابوو، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) دەتوانم سەیری شمشێرەکەت بکەم؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

پیاوی موحاربی شمشێرەکەی هەڵگرت و لەکالان دەریکێشا و رایدەوەشاند. مەبەستی کوشتنی پێغەمبەری کرد بەڵام خواوەند ڕێگەی ئەو کارەی پێنەدەدا. وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) لەمن ناترسیت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆ دەبێت لەتۆ بترسم؟

وتی: بۆ ئەوەی شمشێر لەدەستی منداپە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەند دەمپارێزێت.

دەڵێت: پیاوەکە شمشێری خستە ناو کالآن و خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((یا ایها الذین آمنوا اذکروا نعمة الله علیکم اذهم قوم ان یبسطوا الیکم ایدیهم فکف ایدیهم عنکم و اتقوا الله و علی الله فلیتو کل المؤمنون.

واتاکەی: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هەیە، نیعمەتەکانی خواتان لەبیر بێت ئەو کاتەی دەستەیەك دەیانویست دەستەکانی خۆیان بۆ کوشتنی ئێوە ئاوەڵآ بکەن و خواوەند ڕێگەی لەدەستی ئەوان گرت. لەخوا بترسن و باوەڕداران دەبێت پشت بەخوا ببەستن.))

هەروەها جابر کوڕی عەبدوالله دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەرەو زات ئەلرقاع دەڕۆشتین و یەکێك لەموسوڵمانان دەستدرێژی کردە سەر ژنێك. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی گەڕانەوەی کرد، هاوسەری ئەو ژنە هات و کاتێك لەڕووداوەکە ئاگادار بوویەوە سوێندی خوارد دانەنیشێت تا خوێنی یەکێك لەهاوەڵآنی پێغەمبەر(د.خ) بڕێژێت. شوێن پێغەمبەر(د.خ) کەوت و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەمەنزڵێك دابەزی، فەرمووی: کێ ئەمشەو پاسەوانی ئێمە دەکات؟

یەکێك لەموهاجیرەکان و یەك لەئەنسار وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە پاسەوانی دەکەین.

پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵآنی لەدۆڵێکدا دابەزیبوون و کاتێك ئەو دوو کەسە ڕۆشتنە دەروازەی دۆڵەکە، موهاجیری بەئەنساری وت: من چ کاتێك کێشك بگرم، سەرەتای شەو یا کۆتایی شەو؟

موهاجیری وتی: سەرەتای شەو تۆ کێشك بگرە.

موهاجیری خەوت و ئەنساری دەستی بەنوێژ خوێندن کرد. هاوسەری ژنەکە هات و کاتێك ئەوی بینی، زانی لەموسوڵمانانە. تیرێکی بۆ هاویشت و بەر پیاوی ئەنساری کەوت. ئەنساری تیرەکەی دەرهێنا بێ ئەوەی نوێژەکەی ببڕێت.

دواتر پیاوی غەتەفانی تیرێکی دیکەی هاویشت وبەر ئەنساری کەوت. ئەنساری تیرەکەی دەرهێنا و نوێژەکەی نەبڕی. ئەو پیاوە تیری سێیەمی بۆ هاویشت و

لەجەستەی ئەنساری چەقی. ئەنساری تیرەکەی دەرکێشا و فڕیدا، رکوع و سوجدەی برد، دواتر هاورێکەی خۆی بانگ کرد و وتی: هەستە چوونکە منیان کوشت.

دەڵێت: موهاجیری هەستا و کاتێك غەتەفانی بینی، زانی خەڵکەکەی ئاگادار دەبنەوە. کاتێك موهاجیری پیاوی ئەنساری بینی کەلە ناو خوێنی خۆیدا دەتلێتەوە، وتی: بۆ یەکەم جار کەتیرت بەرکەوت، منت لەخەو هەڵنەستاند؟

ئەنساری وتی: سوورەیەکەم دەخوێندەوە و نەمویست نیوە ناچڵ کۆتایی پێبێنم، کاتێك تیرەکان بەردەوام بوون، رکوعم کرد و تۆم لەخەو هەستاند. سوێند بەخوا ئەگەر ترسی ئەوەم نەدەبوو ئەو شوێنەی پێغەمبەر(د.خ) ئێمەی بۆ پاسەوانی کردنی راسپاردووە، دەکەوێتە دەستی دوژمن، پێش ئەوەی کۆتایی بەسوڕەکە بێنم، گیانم ئەسپەردە کردبوو.

## گێڕانەوەی غەزوەی سورەیق

غەزوەی سوەیق بەدری دووەمە کە پێغەمبەر(د.خ) بۆ شوێنی بەڵێندراو و رووبەروو بوونەوە لەگەڵ ئەبوسوفیان مەدینەی بەجێهێشت. کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەغەزای زات ئەلرقاع گەڕایەوە، پاشماوەی مانگی جومادی الاول و جومادی الاخر و رەجەبی لەمەدینە بەسەر برد و لەمانگی شەعبان بەرەو شوێنی دیاریکرا و رووبەروو بوونەوە لەگەڵ ئەبوسوفیان بەرێکەوت. لەوێ دابەزی و بۆ ماوەی هەشت ڕۆژ چاوەڕوانی ئەبوسوفیانی کرد.

ئەبوسوفیانیش لەگەڵ خەڵکانی مەککە بەرێکەوت و لەمەڕئەلزەهران گەیشتە مەجنە و بەوتەیەك لەعوسفانیش تێپەڕی بەڵام بیری لەگەڕانەوە کرد و وتی: ئەی قورەیشییەکان، دەبێت لەساڵێکدا بێین باران فراوان بێت بۆ ئەوەی لەبەری دارەکان و شیر بخۆین و یەکمان نەکەوێت، ئەم ساڵە وشکە، من دەگەڕێمەوە، ئێوەیش بگەڕێنەوە.

خەڵکانی مەککە ئەم دەستەیان بەسوپای سوەیق ناو برد. وتیان: ئێوە ڕۆشتبوون تا سوەیق بخۆن.

پێغەمبەر(د.خ) لەبەدر چاوەڕوانی ئەبوسوفیانی دەکرد. مەخشی کوڕی عەمرۆ زەموری کە لەغەزوەی وەدان سەبارەت بەکاروباری منداڵەکانی زەموورە پەیمانی لەگەڵ بەستبوو، هات و وتی: ئەی محەممەد هاتوویت لەنزیك ئاوەکە شەڕ لەگەڵ

قورەیشییەکان بکەیت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ و ئەگەر دەتەوێت ڕێز لەپەیمانەکەی نێوان خۆمان نەگرین، لەگەڵ تۆ دەجەنگین تا خواوەند لەنێوان ئێمە داوەری بکات.

مەخشی وتی: ئەی محەممەد پێویستمان بەو کارە نییە.

بەڵام بەوتەی واقدی پێغەمبەر(د.خ) بەهۆی ئەو بەڵێنەی لەرۆژی ئوحود بەئەبوسوفیانی دابوو، لەمانگی زیقەعدە یەك ساڵ دوای شەڕی ئوحود، هاوەڵانی خۆی بۆ غەزای بەدر برد.

دەڵێت: نەعیم کوڕی مەسعودی ئەشجەعی بەمەبەستی ئەنجامدانی حەجی عەمرە لەمەککە بوو، ڕۆشتە لای قورەیشییەکان، پێیان وت: ئەی نەعیم لەکوێوە دێیت؟

وتی: یەسرب.

وتیان: ئایا محەممەد سەرقاڵی خۆئامادە کردنە؟

وتی: بەڵێ بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێوە خۆی ئامادە دەکرد. ئەمە پێش ئەوە بوو نەعیم باوەڕ بەئیسلام بێنێت.

ئەبوسوفیان پێی وت: ئەی نەعیم، ئەم ساڵە وشکە، دەبێت لەساڵێکدا شەڕ بکەین وشترەکان بتوانن لەدارەکان بلەوەڕێن و ئێمە شیرمان دەستکەوێت، ئێستا کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی محەممەد هاتووە، بۆ مەدینە بگەڕێرەوە و بیانترسێنە و بڵێ ژمارەی ئێمە فراوانە و ناتوانن لەبەرابەر ئێمە خۆڕاگری بکەن تا ئەوان بەڵێنەکەی خۆیان نەبەنەسەر. ئەگەر ئەم کارە بکەیت، دە سەر مەڕ بەسوهەیل کوڕی عەمرۆ دەدەم تا بەتۆی ببەخشێت.

کاتێك سوهەیل کوڕی عەمرۆ هات، نەعیم پێی وت: بەڵێن دەدەت ئەو دەسەر مەڕە بەمن بدەیت تا بڕۆمە لای محەممەد و لەهاتن بۆ گۆڕەپانی شەڕ پەشیمانی بکەمەوە؟

سوهەیل وتی: بەڵێ.

نەعیم گەڕایەوە بۆ مەدینە و بینی خەڵکان خۆیان بۆ شەڕ ئامادە دەکەن، پیلانێکی داڕشت و وتی: ئەم کارە پاداشتی تیا نییە، مەگەر محەممەد بریندار نەکرا؟ مەگەر هاوەڵانی نەکوژران؟ خەڵك لەجموجۆڵ کەوتن و کاتێك ئەم هەواڵە بەگوێی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت، فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی من لەدەستی ئەودایە، ئەگەر یەك کەس نەیێت بەتەنیایی دەڕۆم.

خواوەند موسوڵمانانی وشیار کردەوە و لەگەڵ کاڵا بازرگانییەکان ڕۆشتن و لەهەر درەمێك دوو درەم سوودیان دەستکەوت و ڕووبەڕووی دوژمن نەبوونەوە. ئەمە ئەو بەدرەیە کەپێشتر بەڵێنیان دابوو. لەسەردەمی جاهلییەت ساڵانە بازارێك لەوێ سازدەکرا و ماوەی هەشت ڕۆژ خەڵکان بۆ مامڵە کردن کۆدەبوونەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم غەزوەیە پێغەمبەر(د.خ) عەبدوالله کوڕی ڕەواحەی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد.

واقدی دەڵێت: لەشوالی ئەم ساڵە، پێغەمبەر(د.خ) دایکی سەلمە کچی ئەبی ئومەییەی مەخزومی وەك هاوسەر دەستنیشان و بۆ ماڵەکەی خۆی برد.

دەڵێت: هەروەها پێغەمبەر(د.خ) لەم ساڵەدا زەیدی راسپارد فێری ڕێنووسی جولەکەکان ببێت و فەرمووی: دەترسم نامەکانی من بەراستی نەنووسن.

لەم ساڵەدا ناباوەڕان سەرپەرەستی بەڕێوبردنی کاروبارەکانی حەج و حاجییەکان بوون.

## گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی پێنجەمی کۆچ

لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) زێنەب کچی جەحشی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی حەبان دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەر(د.خ) بەرەو ماڵی زەید کوڕی حارسە ڕۆشت، زەید، بەزەید کوڕی محەممەد ناو دەبەن و زۆر جار پێغەمبەر(د.خ) بەدوایدا دەگەڕا ودەیفەرموو: زەید لەکوێیە؟ کاتێك بۆ بینینی ئەو ڕۆشتە ماڵەکەی، زەید لەماڵ نەبوو، زێنەب کچی جەحش هاوسەری زەید بەجل وبەرگی ناو ماڵ هاتەدەر و پێغەمبەر(د.خ) پشتی تێکرد.

زێنەب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، زەید لێرە نییە، دایك و باوکم قوربانی تۆبن، وەرە ژوور.

بەڵام پێغەمبەر(د.خ) نەیویست بڕواتە ژوور. کاتێك وتیان پێغەمبەر(د.خ) لەبەر دەرگایە، زێنەب کاتی ئەوەی دەستنەکەوت جل و بەرگ بپۆشێت و بەخێرایی هات و پێغەمبەر(د.خ) لەبینینی ئەو سەریسوڕما، ڕۆشت و بەهێواشی دەیوت: پاك و خاوێنە پەروەردگار، پاك و پیرۆزە ئەو خوایەی گۆڕانکاری لەدڵەکاندا دروست دەکات.

دەڵێت: زەید گەڕایەوە بۆ ماڵ و هاوسەرەکەی لەهاتنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگاداری کردەوە.

زەید وتی: بۆ نەتوت بێتە ژوور؟

وتی: وتم: بەڵام ڕازی نەبوو.

زەید وتی: هیچت لێ بیست.

وتی: کاتێك دەڕۆشت، بیستم دەیفەرموو: پاك و خاوێنە پەروەردگار، پاك و پیرۆزە ئەو خوایەی گۆڕانکاری لەدڵەکاندا دروست دەکات.

زەید ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بیستوومە ڕۆشتوویتە بەردەرکی ماڵەکەی من، دایك و باوکم قوربانت بن، بۆ نەڕۆشتیتە ژوور، ئەگەر زێنەب بۆتە هۆی سەرسوڕمانی تۆ، من لێی جیادەبمەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هاوسەری خۆتە.

بەلاّم زەید دوای ئەو رۆژە دەستی بەزێنەب نەگەیشت و هەر کاتێك دەڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، ڕووداوەکەی بۆ باس دەکرد و پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: هاوسەرەکەت بپارێزە.

سەرئەنجام زەید لەزێنەب جیابوویەوە. ڕۆژێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ عایشە قسەی دەکرد، وەحی بۆ هاتەخوار و کاتێك هاتەوە خۆی، دەم بەبزە بوو، دەیفەرموو: کێ دەڕواتە لای زێنەب و مژدەی پێدەدات کەخواوەند ئەوی وەك هاوسەری من هەڵبژاردووە. ئەم ئایەی خوێندەوە:

((واذ تقول للذی انعم الله علیه و انعمت علیه امسك علیك زوجك و اتق الله و تخفی فی نفسك ما الله مبدیه و تخشی الناس و الله احق ان تخشاه، فلما قضی زید منها و طرازوجنا کها لکی لا یکون علی المؤمنین حرج فی ازواج ادعیائهم اذاقضوا منهن و طراوکان امرالله مفعولا.

واتاکەی: کاتێك بەو کەسەی خواوەند نیعمەتی خۆی پێبەخشیبوو و تۆیش نیعمەتی خۆتت پێبەخشیبوو، وتت، ژنەکەی خۆت بپارێزە و لەخوا بترسە و شتێك کەخوا ئاشکراکەری بوو، لەناخی خۆتا شاردتەوە چوونکە لەخەڵکان دەترساییت و شیاو بوو لەخواوەند بترسیت و کاتێك زەید خۆی لەو بەدوور گرت، کردمانە هاوسەری تۆ تا باوەڕداران سەبارەت بەزڕ کوڕەکان کاتێك زڕ کوڕەکانیان داوایەکیان بۆ ئەوان بەرز کردبێتەوە، هیچ لێپرسراویەتییەکەیان نەبێت و فەرمانی خواوەند ئەنجام دەدرێت.))

عایشە دەڵێت: پەرێشان بووم چوونکە باسی جوانی ئەوم بیستبوو و جیاواز لەوە ئەوەی کەخواوەند ئەوی وەك هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) هەڵبژارد. وتم: زێنەب بەم هاوسەرگیرییە شانازی بەخۆیەوە دەکات (چوونکە خواوەند ئەوی هەڵبژاردووە)

دەڵێت: سەمل خزمەتکاری پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای زێنەب و هەموو شتێکی بۆ باس کرد. زێنەب، زیوەکانی خۆی بەو بەخشی.

یونس کوڕی عەبدولعەلی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) زێنەب کچی جەحش کچی پووری خۆی وەك هاوسەر بۆ زەید هەڵبژارد. ڕۆژێك بۆ بینینی زەید ڕۆشتە ماڵەکەی، پەردەیەکی موویین بەدەرگاکەوە بوو، بەهۆی هەڵکردنی با پەردەکە بەرز بوویەوە و زێنەب کە لەژوورەکەی خۆی سەری ڕووت بوو، سەرەنجی پێغەمبەری ڕاکێشا. زەید خۆی لەو دوورخستەوە و ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: دەمەوێت لەهاوسەرەکەم جیا ببمەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مەگەر شتێکی خراپت لەو بینیوە؟

زەید وتی: هەرگیز جگە لەچاکی هیچم لێ نەبینیوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ژنەکەی خۆت بپارێزە و لەخوا بترسە.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا لەمانگی رەبیع الاول پێغەمبەر(د.خ) بەمەبەستی غەزای دومەئەلجەندەل مەدینەی بەجێهێشت. هۆکارەکەی ئەوە بوو ئاگادار کرایەوە دەستەیەك لەوێ کۆبوونەتەوە. پێغەمبەر(د.خ) بەمەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان تا دومەئەلجەندەل پێشڕەوی کرد. شەڕ روویندا و سیباع کوڕی عەرەفتەی غەفاری وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ عوێەیینە کوڕی حوسن پەیمانی بەست تا لەتەغلەمین و دەوروبەری مەڕوماڵاتەکەی بلەوەڕێنێت.

محەممەد کوڕی عەمرۆ دەڵێت: لەدیاری عوێەیینە وشکەساڵی روویدا و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمانی بەست تا لەتەغلەمین و دەوروبەری مەروماڵاتەکەی بلەوەڕێنێت. ئەم ناوچەیە سەرسەوز و پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی ئەو کارەی پێدا.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا کاتێك سەعد کوڕی عوبادە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی دومەئەلجەندەل، مەدینەی بەجێهێشت، دایکی مرد.

## گێڕانەوەی شەڕی خەندەك

لەشەوالی ئەم ساڵەدا شەڕی خەندەك روویدا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: هۆکاری شەڕی خەندەك ئەوە بوو کە: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) جوولەکەکانی مناڵەکانی نەزیری لەدیاری خۆیان دەرکرد، دەستەیەك لەجوولەکەکانی مناڵەکانی نەزیز و مناڵەکانی وائل و لەناویان سەلام کوڕی ئەبی حەقیقی نەزیری و هوزە کوڕی قەیسی وائلی وباوکی عومارەی وائیلی ڕۆشتنە مەککە و قوڕەیشییەکانیان بۆ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان هاندا و وتیان: ئێمە پشتیوانیتان دەکەین بۆ ئەوەی بەتەواوی لەناویان ببەین.

قوڕەیشییەکان بەجوولەکەکانیان وت: ئێوە شوێنکەوتەی کتێبن و ئاگاداری جیاوازییەکانی نێوان ئێمە و محەممەدن، ئایا دینەکەی ئێمە باشترە یا دینی ئەو؟

جوولەکەکان وتیان: دینی ئێوە باشتر و لەراستییەوە نزیکترە. خواوەند ئەم ئایەی سەبارەت بەوان ناردەخوار:

((الم ترالى الذين اوتوا نصيبا من الكتاب، يؤمنون بالجبت و الطاغوت و يقولون للذين كفروا هؤلاء اهدى من الذين آمنوا سبيلا. اولئك الذين لعنهم الله و من يلعن الله فلن تجدله نصيرا. ام لهم نصيب من الملك فاذالايؤتون الناس نقيرا. ام يحسدون الناس على ما آتاهم الله من فضله، فقد آتينا آل ابراهيم الكتاب و الحكمة و آتيناهم ملكا عظيما غمنهم من آمن به و منهم من صدعنه و كفى بجهنم سعيرا.

واتاکەی: مەگەر ئەو کەسانە نابینیت کە لەکتێبی ئاسمانی بەهرەیەکیان پێبڕاوە، نابینی کەشوێن بت و یاخییەکان دەکەونو سەبارەت بەکافرەکان دەڵێن، ئەم دەستەیە لەباوەڕداران، رزگارترن. ئەوان، ئەو کەسانەن خواوەند بەنەحلەتی کردوون و هەر کەس خواوەند بەنەحلەتی بکات، هیچ کات پشتیوانێکی دەست ناکەوێت. مەگەر ئەوان لەم پاشایەتییە بەهرەیەکیان هەیە کە لەو شێوەدا پێستی ناوکی خورمایەك بەکەس نادەن و یا رژدی بەخەڵکان دەبەن بۆ ئەوەی خواوەند لەبەخششی خۆی پێی بەخشییون، بەراستی ئێمە کتێب و زانستمان بەمناڵەکانی ئیبراهیم بەخشی و پاشایەتییەکی مەزنمان پێدان. کەسانێکیان باوەڕیان پێی هێنا و کەسانێکیان حاشایان لێکرد و ئاگری جەهەننەم بۆ ئەوان بڵێسە دەسەنێت.

کاتێك ئەم وتەیان هێنایە سەرزمان، قورەیشییەکان شادمان و بۆ شەڕ کردن دژی پێغەمبەر(د.خ) هەوڵەکانیان چڕ کردەوە.

جوولەکەکان ڕۆشتنە لای هۆزی غەتەفان و بۆ شەڕ دژی پێغەمبەر(د.خ) هانیاندان و وتیان پشتیوانییان لێدەکەن و قورەیشییەکانیان لەگەڵدایە و خەڵکانی غەتەفانیش بەپێشنیارەکەیان ڕازی بوون.

قورەیشییەکان بەسەرکردایەتی ئەبوسوفیان مەککەیان بەجێهێشت و لەخەڵکانی غەتەفان تایەفەی مناڵەکانی فەزارە بەسەرکردایەتی عۆیەیینە کوڕی حوسن و مناڵەکانی موڕە بەسەرکردایەتی حارس کوڕی عەوف و مەسعود کوڕی رەخیلە لەگەڵ شوێنکەوتنەکانی خۆی لەهۆزی ئەشجەع بەرێکەوتن. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە و بەمەبەستەکەی ئەوانی زانی، بەدەوری مەدینەدا خەندەکی هەڵکەند.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: سەلمان بە پێغەمبەری وت خەندەك هەڵبکەنێت و ئەمە یەکەم شەڕ بوو سەلمان بەشداری تیا دەکرد. لەو کاتەدا ئازاد بوو و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە لەولاتی فارس کاتێك گەمارۆیان دەخستینە سەر، خەندەکمان هەڵدەکەند.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بۆ هاندانی موسوڵمانان بۆ هەڵکەندنی خەندەکەکە خۆی کاری دەکرد و موسوڵمانانیش بەهەمان شێوە. دەستەیەك لەموسوڵمانان کارەکەی خۆیان بەجێهێشت و بێ مۆڵەت وەرگرتن لە پێغەمبەر(د.خ) گەڕانەوە بۆماڵەکانی خۆیان. کاتێك یەکێك لەموسوڵمانان کارێکی دەبوو، مۆڵەتی لە پێغەمبەر(د.خ) وەردەگرت تا بڕوات و کارەکەی ئەنجام بدات و پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی پێدەدا و کاتێك کارەکەی تەواو دەبوو، دەگەڕایەوە و بەهەڵکەندنی خەندەك سەرقاڵ دەبوو. خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((انما المؤمنون الذین آمنوا بالله و رسوله و اذکانوا معه علی امر جامع لم یذهبوا حتی یستأذنوه ان الذین یستأذنونك اولئك الذین یؤمنون بالله و رسوله فاذا استأذنوك لبعض شأنهم فأذن لمن شئت منهم و استغفر لهم ان الله غفور رحیم.

واتاکەی: باوەڕداران تەنیا ئەو کەسانەن باوەڕیان بەخوا و پێغەمبەر(د.خ) هێناوە، ئەگەر دەستەیەکیان بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆیان مۆڵەتیان لەتۆ وەرگرت، بەهەر کامیان کەدەخوازیت، مۆڵەت بدە و داوای بەخشینیان بۆ بکە چوونکە خواوەند بەخشەر

و میهرەبانە.))

ئەم ئایە سەبارەت بەباوەڕدارانی شوێنکەوتەی پێغەمبەر(د.خ) بوو و هەروەها سەبارەت بەریاکاران کە بێ وەرگرتنی مۆڵەت کارەکەیان بەجێدەهێشت، ئەم ئایە هاتەخوار:

((لاتجعلوا دعاء الرسول بينكم كدعاء بعضكم بعضا قد يعلم الله الذين يتسللون منكم لو اذا فليحذر الذين يخالفون عن امره ان تصيبهم فتنة او يصيبهم عذاب اليم. الا ان الله مافي السموات و الارض، قد يعلم ما انتم عليه.

واتاکەی: خواوەند لەناو ئێوە ئەوکەسانەی بەنهێنی خۆیان دەدزنەوە، دەناسێت، کەسانێك کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن، بترسن لەو بەڵای بەسەریاندا دێت یا ئەو ئازابەی مەترسیدارەی دەیانگرێتەوە. بزانن ئەوەی لەئاسمان و زەمین دایە، تایبەتە بەخوا و دەزانێت ئێوە لەچ حاڵ وبارودۆخێکدان.))

باوەڕداران هەوڵیاندا تا ئەوەی هەڵکەندنی خەندەك کۆتایی هات.

عەمرۆ کوڕی عەوف موزنی دەڵێت: لەساڵی شەڕی ئەحزاب پێغەمبەر(د.خ) خەندەکی لەدارستانی شەیخەین لەگەڕەکی مناڵەکانی حارسە تا مەزاز کێشا و بۆ هەر کەسێك چل زەراعی دەستنیشان کرد. موهاجیر و ئەنسارییەکان لەسەر سەلمان کێشەیان بۆ دروست بوو لەبەر ئەوەی سەلمان پیاوێکی بەهێز بوو. ئەنسارییەکان دەیانوت: سەلمان لەئێمەیە و موهاجیرەکان دەیانوت: سەلمان لەئێمەیە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سەلمان لەبنەماڵەی ئێمەیە.

عەمرۆ کوڕی عەوف دەڵێت: من و سەلمان و حوزەیفە کوڕی یەمان و نەعمان کوڕی موقەڕن و شەش کەس لەئەنسار چل زەراعمان هەڵکەند. خواوەند لەدڵی خەندەکە بەردێکی سپی و سەختی نیشاندایـن. پاچەکانمان شکا و کارەکە بۆ ئێمە دژوار بوو. بەسەلمانمان وت برۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و لەبوونی ئەم بەردە ئاگاداری بکەرەوە و بپرسە ئایا چاوی لێ بپۆشین یا نە. با فەرمانی خۆی بەئێمە بدات چوونکە حەز ناکەین هێڵە دیاریکراوەکەی ئەو ببەزێنین.

دەڵێت: سەلمان ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) کە لەخێوەتێکی تورکیدا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، دایك و باوکم قوربانی تۆ بن، بەردێکی سپی و ڕەق دەرکەوتووە پاچەکانی ئێمەی شکاند و کارەکەمانی دژوار کرد. ناتوانین بەردەکە بشکێنین، فەرمانی خۆت بفەرموو چوونکە نامانەوێت هێڵە دیاریکراوەکەی تۆ ببەزێنین.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ سەلمان هاتە سەر خەندەکە. ئێمە نۆ کەس لەناو خەندەکە هاتینەدەر. پێغەمبەر(د.خ) پاچەکەی لەدەستی سەلمان وەرگرت و زەربەیەکی لەبەردەکەدا و شکا و بروسکەیەکی لێهاتەدەر و ئەملاولای مەدینەی رووناك کردەوە هاوشێوەی چرایەك لەناو ماڵێکی تاریکدا. پێغەمبەر(د.خ) تەکبیری سەرکەوتنی فەرموو و موسوڵمانانیش بەدوای ئەودا تەکبیریان وت. پێغەمبەر(د.خ) دەستی سەلمانی گرت و لەخەندەکە هاتەدەر. سەلمان وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، دایك و باوکم قوربانی تۆ بن، شتێکم بینی کەهاوشێوەییم نەبینیبوو.

پێغەمبەر(د.خ) سەیری خەڵکانی کرد و فەرمووی: ئەوەی سەلمان باسی دەکات، ئێوەیش بینیتان؟

وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بینیمان زەربەت لەبەردەکە دەدا و بروسکەیەك وەك شەپۆل دەهاتەدەر. بیستمان کەتەکبیرت وت و ئێمەیش تەکبیرمان وت. جگە لەمە هیچی دیکەمان نەبینی.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: راست دەکەن، کاتێك زەربەی یەکەمم لەبەردەکەداو ئەو بروسکەی ئێوە بینیتان، کۆشکەکانی حیرە و مەداینی کەسرا ئەنەوشیروانم بینی کەهاوشێوەی کەڵبەی سەگ بوو. جبرەئیل ئاگاداری کردمەوە خەڵکەکەم دەست بەسەر ئەو شوێنانەدا دەگرن. دواتر زەربەی دووەمم لەبەردەکەدا و ئەو بروسکەی ئێوە بینیتان، دەرکەوت و من کۆشکە سوورەکانی سەرزەمینی رۆمم بینی هاوشێوەی کەڵبەی سەگ بوو. جبرەئیل ئاگاداری کردمەوە کەخەڵکەکەم دەست بەسەر ئەم ناوچانەیشدا دەگرن. کۆشکەکانی سەنعام بینی هاوشێوەی کەڵبەی سەگ و جبرەئیل ئاگاداری کردمەوە ئۆمەتەکەم بەسەر ئەم ناوچەیشدا زاڵ دەبن. مژدەتان لێبێت چوونکە سەرکەوتن بەدەست دێنن، مژدەتان لێ بێت چوونکە سەرکەوتن بەدەست دێنن.

موسوڵمانان شادمان بوون و وتیان: ئەمە بەڵێنی راستییە چوونکە خواوەند دوای گەمارۆ مژدەی سەرکەوتنمان پێدەبەخشێت.

ئەحزاب دەرکەوتن و موسوڵمانان وتیان: ئەمە بەڵێنی خوایە و خواوەند و پێغەمبەر(د.خ) راستییان فەرموو. بەمشێوەیە باوەڕ و ئیمانیان زیادی کرد. ریاکاران وتیان: سەرتان لەقسەکانی سوڕنامێنێت کەبەڵێنی ناڕاست بەخەڵکان دەدات و دەڵێت لەیەسربەوە کۆشکەکانی حیرە و مەداین و کەسرا دەبینێت کەئێوە دەستی بەسەردا

دەگرن، بەلاّم ئێوە خەندەك هەڵدەكەنن و ناتوانن بۆ دەست بەئاو گەیاندن شوێنەكەی خۆتان بەجێ بێڵن. ئەم ئایە هاتەخوار:

((واذ یقول المافقون و الذین فی قلوبهم مرض ماوعدنا الله و رسوله الاغرورا.

واتاكەی: ئەو كاتەی ریاكاران و ئەو كەسانەی دڵیان نەخۆش بوو، وتیان: خواوەند و پێغەمبەرەكەی تەنیا بەڵێنی درۆیان بەئێمەدا.

كوڕی ئیسحاق دەڵێت: كاتێك لەرۆژگاری خەلافەتی عومەر كوڕی خەتاب و عوسمان كوڕی عەفان دەست بەسەر ئەم ناوچانەدا گیرا، ئەبوهورەیرە دەیوت: هەر شوێنێك دەخوازن دەستی بەسەردا بگرن، سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، هەر شارێك دەستتان بەسەردا گرتووە، یا تا رۆژی كۆتایی دەستی بەسەردا دەگرن، پێشتر كلیلەكانیان بە محەممەد سپاردووە.

هەروەها دەڵێت: دانیشتووانی خەندەك سێ هەزار كەس بوون. كاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەهەڵكەندنی خەندەك، تەواو بوو، قورەیشییەكان لەگەڵ دەهەزار كەس لەخەڵكانی حەبەشە و كەنانە و تەهامە هاتن و لەنێوان جوف و دارستان دابەزین. غەتەفانییەكان و خەڵكانی نەجد لەتەنیشت ئۆحۆد جێگەیان گرت. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ سێ هەزار كەس لەموسوڵمانەكان هات و لای سەلع ئوردوی لێدا. خەندەك لەنێوان موسوڵمانان و دوژمندا بوو. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا تا ژن و منداڵەكان لەماڵەكاندا حەشار بدەن.

دوژمنی خوا حەیی كوڕی ئەختەب ڕۆشتە لای كەعب كوڕی ئەسەدی قورەزی كە بەنوێنەرایەتی لەخەڵكانی قورەز پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) مۆر كردبوو. كاتێك كەعب دەنگی ئەوی بیست، دەرگای ماڵەكەی خۆی داخست و رێگەی نەدا. حەیی هاواری دەكرد، ئەی كەعب دەرگا بكەرەوە.

كەعب وتی: تۆ پیاوێكی شوومیت، من پەیمانم لەگەڵ محەممەد واژۆ كردووە و پەیمانەكەی خۆم ناشكێنم چوونكە تەنیا راستی و ئەمەكداریم لێ بینیوە.

حەیی وتی: دەرگا بكەرەوە دەمەوێت گفتوگۆت لەگەڵ بكەم.

كەعب وتی: نایكەمەوە.

حەیی وتی: سوێند بەخوا دەرگات داخست لەبەر ئەوەی نەكا لەنانەكەی تۆ بخۆم. كەعب لەم وتەیە توڕە و دەرگاكەی كردەوە.

حەیی وتی: شەرەفی رۆژگار و دەریایەكی خرۆشانم هێناوە. لەگەڵ سەران و

سەرکردەکانی قورەیش هاتووم کە لەروومە دابەزیون. سەران وسەرکردەکانی غەتەفان لەئۆحۆد جێگیرن. هەموویان پەیمانیان لەگەڵ بەستووم ئەم شارە بەجێناهێڵن تا ڕەگ و ریشەی محەممەد لەبن دەردەهێنن.

کەعب وتی: سوێند بەخوا ریسوایی رۆژگارت لەگەڵ خۆت هێناوە، هەورێك کەبارانەکەی ڕژابێت، دەنەڕێنێت و بروسکەی لێدێتەدەر بەڵام هیچی پێ نییە، دەخوازم رێز لەپەیمانەکەی محەممەد بگرم لەبەر ئەوەی تەنیا راستی وئەمەکداریم لێ بینیوە.

حەیی بەردەوام قسەی بۆ کەعب کرد و پەیمانی لەگەڵ بەست ئەگەر قورەیش و غەتەفان گەڕانەوە و نەیانتوانی محەممەد لەناو ببەن، لەماڵەکەی تۆدا جێگیر دەبم تا ئەوەی بەتۆ دەگات بەمنیش بگات. کەعب پەیمانەکەی شکاند و لە پەیمانەکەی نێوان خۆی و پێغەمبەر، بێزاری نیشاندا.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە، سەعد کوڕی مەعاز سالاری هۆزی ئەوسی لەگەڵ سەعد کوڕی عوبادە ساری هۆزری خەزرەج و عەبدوالله کوڕی رەواحە و خەوات کوڕی جوبەیری نارد و فەرمووی: بڕۆن و بزانن ئایا ئەوەی سەبارەت بەم هۆزە باسی دەکەن، راستە یا نە؟ ئەگەر راست بوو بەئیشارە بەمن بڵێن تا خەڵکان نەترسن و ئەگەر لەسەر پەیمانەکەی خۆیان بوون، بەدەنگی بەرز باسی بکەن.

کاتێك ئەم کەسانە ڕۆشتنە لای قورەزییەکان، لەوەی بیستبوویان، خراپتریان بینی. ئەوان جوێنیان بەپێغەمبەر دەدا و وتیان: هیچ پەیمانێکمان لەگەڵ ئەودا نییە. سەعد کوڕی عوبادە سەرکۆنە و جوێن بارانی کردن و ئەوانیش وەڵامیان دایەوە. سەعد پیاوێکی چوارشانە بوو، سەعد کوڕی مەعاز پێی وت: واز لەجوێندان و سەرکۆنە کردن بێنە چوونکە ئەوەی لەنێوان ئێمە و ئەم خەڵکەدایە، لەجوێندان و سەرکۆنە کردن زیاترە.

دوو سەعد و هاورێکانیان گەڕانەوە و سڵاویان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد و وتیان: ((عەزل و قارە) یانی خیانەتێك هاوشێوەی خیانەتی عەزل و قارە کەبەرابەر بەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) خەبیب کوڕی عودەی و هاورێکانی ئەو ئەنجامیاندا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خوا گەورەیە. ئەی موسوڵمانان دڵخۆش بن. بەڵا گەورەتر و ترس زیادی کرد. دوژمن لەهەر کەرانێکەوە دەهات. باوەڕداران گومانی خراپیان کرد و دووڕوویی ریاکاران دەرکەوت تا ئەو جێگەی موعتەب کوڕی قوشەیر وتی: محەممەد

بەڵێنمان پێدەدات کە گەنجەکانی خوسرەو و قەیسەر دەخۆین بەڵام ناتوانین بۆ دەست بەئاو گەیاندن شوێنەکەی خۆمان بەجێ بێڵین.

ئەوس کوڕی قەیزی بەئامادە بوونی خەڵکەکەی خۆی وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ماڵەکانی ئێمە، بەهیچ شێوەیەك پارێزراو نییە، ڕێگە بدە بۆ گەڕەکەکەی خۆمان بڕۆین کە لەدەرەوەی مەدینەیە.

پێغەمبەر(د.خ) بیست و چەند ڕۆژ مایەوە و ناباوەڕان گەمارۆیان دابوو. لەم ماوە شەڕ تەنیا تیر هاویشتن و گەمارۆ خستنە سەر بوو.

کاتێك ڕەنج و گرفتاری موسوڵمانان زیادی کرد، پێغەمبەر(د.خ) کەسی بۆ لای عۆیەیینە کوڕی حوسن و حارس کوڕی عەوف، سەرکردەکانی غەتەفان نارد و بەڵێنیدا یەك لەسەر سێی داهاتی مەدینە بەوان بدات تا لەگەڵ شەڕکەرانی خۆیان گەمارۆی سەر پێغەمبەر(د.خ) بشکێنن و بڕۆن. ئاشتی لەنێوان ئەوان جێگیر و نامەیەکیان نووسی بەڵام کاروباری تایبەت بەئاشتی کۆتای نەهاتبوو و شایەتییان نەگرتبوو، تەنیا گفتوگۆ و ڕێکەوتن بوو.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی ئەوەی کرد پەیمانی ئاشتییەکە مۆر بکات، سەعد کوڕی عوبادە و سەعد کوڕی مەعازی بانگ وراوێژی لەگەڵ کردن.

هەردوو سەعدە وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئەمە کارێکە خۆت دەخوازیت ئەنجامی بدەیت یا خواوەند فەرمانی ئەو کارەی پێداویت و بۆ ئەنجامدانی ناچارین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەم کارە تەنیا لەبەر ئێوەیە چوونکە دەبینم عەرەبەکان دژی ئێوەی یەکیان گرتووە و دوژمنایەتیتان دەکەن. دەمەوێت ڕەنج و گرفتارییەکانی ئێوە کەم بکەمەوە.

سەعد کوڕی مەعاز وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە و ئەو خەڵکە ناباوەڕ بووین و بتمان دەپەرەستی و خواناس و خواپەرەست نەبووین، بەڵام ئەم خەڵکان جگە لەکاتی میوانی نەیانتوانی یەك دەرنگ خورما لەئێمە بخۆن، ئێستا کەخواوەند بەهۆی ئیسلامەوە ڕێزی لێگرتووین و ڕێگەی ڕزگاری نیشاندایین، سامانی خۆمان بەوان ببەخشین؟ سوێند بەخوا پیویستمان بەو کارە نییە و تەنیا بەشمشێر ڕووبەڕوویان دەبینەوە تا خواوەند لەنێوان ئێمە وئەوان داوەری بکات.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەرچۆنێك ئێوە بخوازن. سەعد پەیمان نامەکەی هەڵگرت و نووسراوەکەی سڕییەوە و وتی: چییان پێخۆشە با بیکەن.

پێغەمبەر(د.خ) بەهەمان شێوە لەلایەن دوژمنەوە گەمارۆی لەسەر بوو بێ ئەوەی شەڕ رووبدات. تەنیا دەستەیەك لەسوارەکانی قورەیش و لەناو ئەوان عەمرۆ کوڕی عەبدوود و عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل و هوبەیرە کوڕی ئەبی وەهبی مەخزومی و نەوفل کوڕی عەبدواللە و زەرار کوڕی خەتاب کوڕی مێرداس بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کرد و سوار ئەسپ بوون. لای خەڵکانی کەنانە تێپەڕین و وتیان: بۆ شەڕ خۆتان ئامادە بکەن چوونکە ئەمڕۆ لەگۆڕەپان دەردەکەوێت سوارکارە بەتواناکان کێن.

ئەم دەستەیە هاتن و لای خەندەکەکە وەستان و وتیان: سوێند بەخوا ئەمە فریوێکە عەرەبەکان هیچ کات بیریان لێ نەکردۆتەوە. دوای ئەوە روویان کردە شوێنێك کەتوانییان بەئەسپەکانی خۆیان لەخەندەکەکە بپەڕنەوە و لەسوێرەڵان لەنێوان سەلع و جەولان دەستیان بەسووڕانەوە کرد.

لەم کاتەدا عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دەستەیەك لەموسوڵمانەکان ڕۆشتن و روبەروویان بوونەوە. سوارەکانی قورەیش پەلاماریاندان.

عەمرۆ کوڕی عەبدوود لەرۆژی بەدر بریندار ببوو. بەشداری شەڕی ئوحودی نەکرد و لەرۆژ خەندەك نیشانەدار تا جێگەکەی ئەو بزانن. کاتێك خۆی و سوارەکانی وەستان، عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێی وت: ئەی عەمرۆ تۆ لەگەڵ خواوەند پەیمانت بەستووە هەرکام لەقورەیشییەکان دوو شتی بوێت، بەیەکیان رازی دەبیت؟

عەمرۆ وتی: بەڵێ، ئەو پەیمانەم داوە.

عەلی وتی: پێشنیاری باوەڕهێنان بەئیسلام و پێغەمبەرت پێدەکەم.

عەمرۆ وتی: پێویستم پێی نییە.

عەلی وتی: کەواتە پێشنیاری شەڕت پێدەکەم.

عەمرۆ وتی: برازاکەم، بۆچی؟ ئارەزوومەندی کوشتنی تۆ نیم.

عەلی وتی: بەڵام سوێند بەخوا من ئارەزوو دەکەم تۆ بکوژم.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عەبدوود تووڕە بوو، لەئەسپەکەی هاتەخوار و قاچی شکاند. رووی کردە عەلی و پەلاماری یەکیاندا. عەلی ئەوی کوشت و سوارەکانی بڵاوەیان لێکرد و بەدەم هەڵاتنەوە لەخەندەکەکە پەڕینەوە. جگە لەعەمرۆ دوو کەسی دیکە کوژران: مونەبە کوڕی عوسمان کەتیری بەرکەوت و لەمەککە مرد و نەوفل کوڕی عەبدواللە کوڕی موغەیرە کە لەکاتی پەڕینەوە لەخەندەکەکە کەوتە ناوی و بەردبارانیان

کرد. ئەو، هاواری دەکرد: ئەی عەرەبەکان کوشتن لەم حاڵە باشترە.

عەلی ڕۆشتە خوار و ئەوی کوشت. جەستەی نەوفل کوڕی عەبدواللە لەبەردەستی موسوڵمانانندا بوو، قوڕەیشییەکان دەیانویست جەنازەکەی لە پێغەمبەر(د.خ) بکڕنەوە. فەرمووی: پێویستمان بەجەنازەکەی یا بەهای جەنازەکەی ئەو نییە، بڕۆن بیبەن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عایشە دایکی باوەڕداران لەڕۆژگاری خەندەك لەقەڵای منداڵەکانی حارسە کە لەهەموو قەڵاکان بەهێزتر و تۆکمەتر بوو، ژیانی بەسەر دەبرد. دایکی سەعد کوڕی مەعاز هاوڕێیەتی دەکرد.

عایشە دەڵێت: ئەمە پێش ئەوە بوو پەردە پێویست بکرێت. سەعد لای ئێمە تێپەڕی و زرێیەکی تەنگی لەبەردابوو، بازووی هاتبووەدەر. زوبینێکی بەدەستەوە بوو، دایکی پێی وت: کوڕم بڕۆ زۆر درەنگە. بەدایکی سەعدم وت: حەزم دەکرد زرێکەی گەورەتر بوایە چوونکە ئەگەری هەیە تیر بەجەستەی بگات. ئەو لەشەڕەکە تیری بەرکەوت و دەماری دەستی بڕی. وەك دەڵێن: کوڕی عەرەقە لەهۆزی منداڵەکانی عامر کوڕی لوئەی تیری بۆ هاویشت. کاتێك تیرەکەی بەرکەوت، وتی: خواوەند ڕوخساری تۆ لەجەهەننەمدا بسووتێنێت، خواوەندا ئەگەر شەڕ لەگەڵ قوڕەیشییەکان ڕوودەدات، بەزیندووی بمهێڵەرەوە چوونکە حەز دەکەم لەگەڵ ئەو خەڵکەی پێغەمبەر(د.خ) بەدرۆزن دەزانن و حاشا لەڕاستی وتەکانی و لەشارەکەی خۆیان دەریان کردووە، بجەنگم و ئەگەر چیتر شەڕ روونادات، بەپلەی شەهید بوون ڕێزم لێبگرە بەڵام مەمکوژە تا ئەو کاتەی دڵم لەتۆڵەی منداڵەکانی قوڕەیزە فێنك دەبێتەوە.

عایشە دەڵێت: لەڕۆژگاری خەندەك ڕۆشتمەدەر و بەرێگەدا دەڕۆشتم. لەو کاتەدا لەدواوەی خۆم دەنگێکم بیست و کاتێك ئاوڕم دایەوە، سەعدم بینی و حارس کوڕی ئەوسی برای کە لەشەڕی بەدر ئامادە بوو، هاوڕێیەتی دەکرد، لەسەر زەوی دانیشتم.

لەگێڕانەوەی محەممەد کوڕی عەمرۆ ئەم زیادەیە باسی کراوە کەحارس قەڵغانێکی پێبوو و سەعد زرێیەك. دەستەکانی لەزرێکە هاتبووە دەر لەبەر ئەوەی سەعد کەسێکی چوارشانە و باڵابەرز بوو. دەترسام دەستەکانی زیانی بەرکەوێت.

دەڵێت: کاتێك سەعد لای من تێپەڕی، هەستام و ڕۆشتمە ناو باخێك، چەند کەسێك لەموسوڵمانان و لەناویان عومەر کوڕی خەتاب لەناو باخەکە دانیشتبوون. کەسێکیان لەگەڵدا بوو ڕوخساری خۆی داپۆشیبوو بەشێوەیەك تەنیا چاوەکانی دیار بوو، عومەر کوڕی خەتاب پێی وتم: زۆر بوێریت، بۆ هاتوویت، چی دەزانیت، ئەگەری هەیە بەڵایەك

بەسەرماندا داباریت یا بمانەوێت ڕابکەین. بەردەوام سەرکۆنەی دەکردم تا ئەو ڕادەی ئارەزووم دەکرد زەوی قەڵش ببات و قووتم بدات. پیاوەکە ڕوخساری خۆی نیشاندا و بینیم تەڵحەیە، بەعومەری وت: زۆر قسە دەکەیت، تەنیا دەتوانین بۆ لای خواوەند هەڵبێین.

دەڵێت: لەو ڕۆژەدا یەکێك بەناوی کوڕی عەرەفە تیرێکی بۆ سەعد هاویشت و وتی: بیگرە، من کوڕی عەرەفەم.

سەعد وتی: خواوەند ڕوخساری تۆ لەجەهەننەمدا بسووتێنێت. تیرەکە بەر دەماری دەستی کەوت و دەماری دەستی بڕی.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەم دەمارەی دەست کە پێی دەڵێن (کحل) کاتێك دەبڕدرێت، بەردەوام خوێنی لێدێت تا ئەو کاتەی کەسەکە دەمرێت.

سەعد وتی: خوایە مەمکوژە تا ئەو کاتەی دڵم لەتۆڵەی منداڵەکانی قوڕەیزە ئاسوودە دەبێت. منداڵەکانی قورەیزە لەسەردەمی جاهلییەت هاوپەیمان و خزمەکانی ئەو بوون.

عوبەیدالله کوڕی کەعب کوڕی مالیك وتبووی: ئەو تیرەی بەر سەعد کەوت، لەلایەن باوکی ئوسامە جوشەمی موالی منداڵەکانی مەخزوم هاوێژرا. خواوەند دەزانێت هاوێژەری تیرەکە کێ بوو.

سەفییە کچی عەبدولموتەلیب لەفارغ ژیانی بەسەر دەبرد کەقەڵای حسان کوڕی سابت بوو.

سەفییە دەڵێت: حسان لەگەڵ دەستەیەك لەژن و منداڵەکانی لەوێ دەژیان. یەکێك لەجوولەکەکان لای ئێمە گوزەری کرد و بەدەوری قەڵاکەدا سووڕایەوە. منداڵەکاین قوڕەیزە مەبەستی شەڕ کردنیان بوو. ئەوان پەیمانەکەی خۆیان شکاند. کەس نەبوو لەبەرابەر ئەوان بەرگری لەئێمە بکات. پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانەکان ڕووبەرووی دوژمن وەستابوون و ئەگەر کەسێك هێرشی دەکردە سەر ئێمە، نەیاندەتوانی بەرگریمان لێبکەن، بەحسانم وت: دەبینی ئەم جوولەکەیە بەدەوری قەڵاکەدا دەسووڕێتەوە، دەترسم شوێنە هەستیارەکانی قەڵاکە بەجوولەکەکان بڵێت. پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان ناتوانن فریامان بکەون، بڕۆ و بیکوژە.

حسان وتی: ئەی کچی عەبدولموتەلیب، خوا لەگوناحەکانت خۆش بێت، تۆ دەزانیت من توانای ئەنجامدانی ئەو کارەم نییە.

دەڵێت: کاتێك حسان ئەم قسەی هێنایە سەرزمان، زانیم ئەو ناتوانێت هیچ کارێك بکات. دارێکم هەڵگرت و لەقەڵاکە هاتمەخوار. بەدارە لەجوولەکەکەمدا تا ئەوەی گیانیدا. کاتێك تەواو بووم، بەحسانم وت: برۆ و جل و بەرگەکانی داکەنە، لەبەر ئەوەی پیاو بوو نەمتوانی دەستی بۆ ببەم.

حسان وتی: پێویستم بەو کارە نییە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت:پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی گرفتاری ڕەنج و بەڵا بوون، دوژمنان دژی ئەوان یەکیانگرتبوو و لەهەموو لایەکەوە لەدەوری ئەوان کۆدەبوونەوە.

نەعیم کوڕی مەسعودی ئەشجەعەی هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) باوەڕم بەئیسلام هێناوە، بەڵام خەڵکەکەم نازانن، هەر فەرمانێك دەدەیت، بفەرموو تا ئەنجامی بدەم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تۆ یەك کەس زیاتر نیت، ئەگەر دەتوانی دووبەرەکی لەناو دوژمندا دروست بکە، چوونکە شەڕ یانی فریو.

نەعیم ڕۆشتە لای منالەکانی قوڕەیزە و وتی: ئەی منالەکانی قوڕەیزە دەزانن پەیوەندی دۆستایەتیم لەگەڵ ئێوەدا هەیە و ئاگاداری ئەو پەیوەندییەن.

وتیان: ڕاست دەکەیت و ئێمە گومانمان لەراستی وتەکانی تۆ نییە.

وتی: قوڕەیش و غەتەفان بۆ شەڕی محەممەد هاتوون، ئێوەیش پەیمانتان لەگەڵ ئەوان بەستووە، شار، شاری ئێوەیە وژن و منالەکانتان لێرەیە و ناتوانن بۆ شوێنێکی دیکە بڕۆن بەڵام ماڵ و ژن و منالی و سەرزەمینی قوڕەیش و غەتەفان لەشوێنێکی دیکەیە، ئەگەر تالانییان دەستکەوێت، و ئەگەر شکست بخۆن بۆ سەرزەمینی خۆیان دەگەڕێنەوە و ئێوە و ئەم پیاوە لێرە بەتەنیا جێدێڵن و دڵنیام بەتەنیا ناتوانن لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکەن. لەبەر ئەمە پێویستە شان بەشانی قوڕەیش و غەتەفان شەڕ نەکەن تا چەند کەسێك لەسەرکردەکانی ئەوان وەك بارمتە لای خۆتان گل بدەنەوە و دڵنیا بن لەوەی شان بەشانی ئێوە لەگەڵ محەممەد شەڕ دەکەن تا ئەو کاتەی لەناوی دەبەن.

منالەکانی قوڕەیزە وتیان: بۆچوونێکی پەسندە.

نەعیم بۆ لای قوڕەیشییەکان ڕۆشت و بەئەبوسوفیان کوڕی حەرب و سەرکردەکانی دیکەی وت: ئەی خەڵکانی قوڕەیش دەزانن پەیوەندی دۆستایەتیم لەگەڵ ئێوەدا هەیە و لە محەممەد و ئایینەکەی بەدوورم. شتێکم بیستووە و دەمەوێت ئێوەی لێ ئاگادار بکەمەوە، بەڵام دەبێت نهێنی بێت.

وتیان: نهێنی دەبێت.

وتی: جوولەکەکان لەشکاندنی پەیمانەکەیان لەگەڵ محەممەد پەشیمان بوونەتەوە و کەسیان بۆ لای ئەو ڕەوانە کردووە و لەپەشیمانی خۆیان ئاگاداریان کردۆتەوە و وتوویانە ئەگەر دەستەیەك لەسەرکردەکانی قورەیش و غەتەفان بگرین و تەسلیمی تۆی بکەین بۆ ئەوەی بیانکوژێت و شان بەشانی تۆ دژی ئەوان شەڕ بکەین، ئایا لەئێمە خۆش دەبیت؟ محەممەد وەڵامی داوەتەوە کە بەڵێ ڕازی دەبم. ئەگەر جوولەکەکان کەسیان نارد و داوای بارمتەیان لەئێوە کرد، تەنانەت یەك کەس وەك بارمتە تەسلیمی ئەوان مەکەن.

نەعیم ڕۆشتە لای غەتەفان و وتی: ئەی غەتەفانییەکان، ئێوە ڕەگ و ریشەی هۆزەکەی منن و ئێوەم زیاتر لەهەر کەسێك خۆش دەوێت و دڵنیام سەبارەت بەمن گومانی خراپتان نییە.

وتیان: ڕاستە.

وتی: کەواتە ئەوەی باسی دەکەم نهێنی بێت.

وتیان: نهێنی دەبێت.

نەعیم ئەو وتانەی لای سەرکردەکانی قورەیش باسی کردبوو، بەوانی وت و لەفریوی جوولەکەکان ئەوانی ترساند.

کاتێك شەوی شەممە لەمانگی شەوالی ساڵی پێنجەمی کۆچی هات، ئەبوسوفیان وسەرکردەکانی غەتەفان، عیکرمە کوڕی ئەبوجەهل و چەند کەسێك لەسەرکردەکانی قورەیش و غەتەفانیان بۆ لای مناڵەکانی قورەیزە نارد و پەیامیاندا: ئێرە شوێنی مانەوەی ئێمە نییە و چوارپێکانی ئێمە بەرەو لەناوچوون دەڕۆن، بۆ شەڕ خۆتان ئامادە بکەن بۆ ئەوەی محەممەد و موسوڵمانان لەناو بەرین.

جوولەکەکان وەڵامیان دانەوە: ئەمڕۆ شەممەیە و ئێمە هیچ کارێك ناکەین. دەستەیەك لەجوولەکەکان ڕێزیان لەشەممە نەگرت و زیانی گەورەیان پێبڕا. لەگەڵ ئەوەیشدا شان بەشانی ئێوە ناجەنگین تا ئەوەی دەستەیەك لەپیاوەکانی خۆتان وەك بارمتە تەسلیمی ئێمە بکەن و دڵنیابین لەوەی تا لەناوچوونی محەممەد لەگەڵمان دەمێننەوە چوونکە دەترسین ئەگەر شەڕەکە دژوار ببێت، بۆ سەرزەمینی خۆتان بگەڕێنەوە و ئێمە و محەممەد بەتەنیا جێبێڵن و ئێمەیش توانای شەڕ کردن لەگەڵ

ئەومان نییە.

کاتێك نێردراوان پەیامی منداڵەکانی قورەیزەیان لەگەڵ سەرکردەکانی قورەیش و غەتەفان باس کرد، وتیان: سوێند بەخوا ئەوەی نەعیم کوڕی مەسعود باسی دەکرد، ڕاست بوو. کەس بۆ لای منداڵەکانی قورەیزە بنێرن و بڵێن سوێند بەخوا یەك بارمتە بەئێوە نادەین، ئەگەر دەتانەوێت شەڕ بکەن، گۆڕەپان ئاوەڵایە.

کاتێك پەیامی ئەوان بەمنداڵەکانی قورەیزە گەیشت، وتیان: ئەوەی نەعیم کوڕی مەسعود باسی دەکرد، ڕاست بوو، ئەوان دەیانەوێت شەڕەکە هەڵگیرسێنن و ئەگەر دەرفەتیان دەسکەوت، محەممەد لەناو ببەن و ئەگەر پێچەوانەکەی ڕوویدا بۆ سەرزەمینی خۆیان دەگەڕێنەوە و ئێمە و ئەو پیاوە بەتەنیا جێدێڵن. کەس بۆ لای قورەیشییەکان و غەتەفانییەکان ڕەوانە بکەن و بڵێن سوێند بەخوا لەگەڵ ئێوە شەڕی محەممەد ناکەین تا ئەو کاتەی بارمتە تەسلیمی ئێمە دەکەن.

قورەیش و غەتەفانییەکان بەتەسلیم کردنی بارمتەکان ڕازی نەبوون و بەمشێوەیە خواوەند دووبەرەکی لەناو ئەواندا دروست کرد. هەروەها خواوەند لەشەوە ساردەکان زستان بایەکی ڕەوانە کرد و قازانەکانی ئەوانی سەرەوخوار کردەوە و خێوەتەکانی هەڵتەکاند.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەدووبەرەکی ئەوان ئاگادار بوویەوە، حوزەیفە یەمانی نارد تا بزانێت دوژمن، شەوانە بەچییەوە سەرقاڵن.

محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی دەڵێت: گەنجێك لەخەڵکانی کوفە بەحوزەیفەی یەمانی وتك ئەی باوکی عەبدوالله، پێغەمبەرت بینیوە و قسەت لەگەڵ کردووە؟

حوزەیفە وتی: بەڵێ، کوڕی برای من.

وتی: چیتان دەکرد؟

حوزەیفە وتی: سوێندە بەخوا بەسەختییەکان ڕازی دەبووین.

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەڕۆژگاری ئەودا دەبووین، نەماندەهێشت بەسەر زەویدا بڕوات و ئەومان لەسەر شان هەڵدەگرت.

حوزەیفە وتی: کوڕی برام، ئێمە لەشەڕی خەندەك لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بووین. بەشێك لەشەو نوێژی خوێند، دواتر سەیری ئێمەی کرد و فەرمووی: کێ دەڕوات تا بزانێت دوژمن سەرقاڵی چییە و بگەڕێتەوە و خواوەند بەهەشتی پێببەخشێت؟ کەس هەڵنەستا.

دوای ئەوە پێغەمبەر(د.خ) بەشێکی دیکەی شەوی بەنوێژ بەسەر برد، دووبارە سەیری ئێمەی کرد و فەرموودەکانی خۆی دووبارە کردەووە و کەس هەڵنەستا. دووبارە بەنوێژ خوێند سەرقاڵ بوویەوە و سەیری ئێمەی کرد و فەرموودەکەی دووبارە کردەوە، فەرمووی: کێ دەڕوات و لەباروودۆخی دوژمن ئاگادارمان بکاتەوە و بگەڕێتەوە؟ بەمشێوە هەواڵی گەڕانەوەی ئەوی دەدا ( و من داوا لەخوا بکەم، لەبەهەشتا بیکاتە هاورێی من؟ کەس هەڵنەستا چوونکە ترس و برسییەتی و سەرما تەنگی بەخەڵکان هەڵچنیبوو.

کاتێك کەس هەڵنەستا، پێغەمبەر(د.خ) منی بانگ کرد، جگە لەهەستان هیچ ڕێگەچارەیەکم نەبوو، فەرمووی: حوزەیفە، بڕۆ و لەباروودۆخی دوژمن ئاگادارمان بکەرەوە و بێ ئەوەی کارێك بکەیت، بگەڕێرەوە.

دەڵێت: هەستام و ڕۆشتمە ناو دوژمن، با و سوپای خوایی هێرشی کردبووە سەریان، قازان و ئاگر نەدەبینرا و هیچ خێوەتێك بەپێوە نەمابوو، ئەبوسوفیان هەستا و وتی: ئەی قوڕەیشییەکان، هەرکام لەئێوە سەیری هاونشینەکەی خۆی بکات. من دەستی کەسی تەنیشتی خۆمم گرت و وتم: تۆ کێیت؟ وتی: فلاّن کوڕی فلاّنم.

ئەبوسوفیان وتی: ئەی قوڕەیشییەکان سوێند بەخوا ئێرە شوێنی مانەوەی ئێوە نییە، چوارپێ و خواردنەکانمان لەناوچوو، منالّەکانی قوڕەیزە بەڵێنەکەی خۆیان نەبردە سەر و هەواڵە ناخۆشەکان لەوان بەئێمە گەیشت، لەم بایە زیانێکی زۆرمان بەرکەوت بەو شێوەی دەبینن نەقازان لەسەر ئاگرما و نەخێوەتەکان لەشوێنی خۆیان و نەئاگر دەسووتێت، بەرێکەون، من لەپێشتانەوە بەرێدەکەوم.

ئەمەی وت و سوار وشترەکەی خۆی بوو. وشتر بەدەستێکی بەستراو، لەسەر سێ دەست و پێ هەستایە سەرپێ، ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) نەیفەرموو‌بوو هیچ کارێك نەکەم، دەمتوانی بەتیر بیکوژم.

حوزەیفە دەڵێت: گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ)، ئەو لەسەر پارچەیەکی نەخشین کە تایبەت بوو بەیەکێك لەژنەکانی، نوێژی دەخوێند، کاتێك منی بینی، بۆ لای خۆی بردم و بەشێك لەپارچەکەی دا بەمندا، دواتر سەرقاڵی رکوع و سجود بوو، من لەژێر پارچەکەدا بووم و کاتێك سلاّوی نوێژی دایەوە، پێشهاتەکانم بۆ باس کرد.

کاتێك غەتەفانییەکان لەکرداری قوڕەیشییەکان ئاگادار بوونەوە، بۆ دیاری خۆیان

گەڕانەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بەرەبەیان پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ موسوڵمانان لەخەندەکەوە بۆ مەدینە گەڕانەوە و سیلاحەکانی خۆیان دانا.

گێڕانەوەی شەڕی مناڵەکانی قوڕەیزە

لەکاتی نیمەڕۆی هەمانرۆژ، جبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر(د.خ).

کوڕی شیهابی زوهری دەڵێت: جبرەئیل دەستارێکی حەریری لەسەردابوو، سوار لەسەر ئێسترێك کەزینەکەی دیبابوو، هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) سیلاحت دانا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

جبەرئیل وتی: بەڵام فریشتەکان سیلاحیان دانانەوە و لەدوای ئەوانەوە دێم، خواوەند دەفەرمێت هێرش بکەسەر مناڵەکانی قوڕەیزە چوونکە منیش بەرەو ئەو سەرزەمینە دەڕۆم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی تا جارچی لەناو خەڵکان جاڕبدات: هەرکەس دەبیستێت و فەرمانبردارە، نوێژی عەسر لەسەرزەمینی مناڵەکانی قوڕەیزە بخوێنێت. پێغەمبەر(د.خ)ئاڵاکەی خۆی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ سەرزەمینی مناڵەکانی قوڕەیزە ڕەوانە کرد. خەڵکان بەرێکەوتن و کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەقەڵاکانی جوولەکە نزیك کەوتەوە، بیستی جوولەکەکان سەبارەت بەپێغەمبەر(د.خ) بەشێوەیەکی ناشیرین قسە دەکەن. گەڕایەوە و پێغەمبەری لەڕێگەدا بینی، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەم خەڵکە خراپەکارە نزیك مەبەرەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆ؟ ئەگەری هەیە بیستبێتت جوێنیان بەمندابێت؟

وتی: بەڵێ.

فەرمووی: ئەگەر من ببینن، هیچ ناڵێن.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەقەڵاکان نزیك کەوتەوە، فەرمووی: ئەی هاوشانەکانی مەیموون، خواوەند ریسوای کردن و ئازابەکەی خۆی بەسەر ئێوەدا باراند.

وتیان: ئەی باوکی قاسم، تۆ جوێنت نەدەدا.

پێغەمبەر(د.خ) پێش ئەوەی بگاتە مناڵەکانی قوڕەیزە، لەسورین لای هاوەڵانی خۆی گوزەری کرد و فەرمووی: کەستان بینیوە؟

وتیان: بەڵێ، دەحیە کوڕی خەلیفەی کەلبی لێرەوە تێپەڕی، سوار ئێسترێکی سپی و

پارچەیەکی دیبای بەزینی ئێسترەکەیەوە بەستبوو.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوە جبرەئیل بوو، ئەویان بۆ لای منالەکانی قورەیزە ڕەوانە کردووە، تا دیواری قەلاکانیان بلەرزێنێت و دلیان لێوانلێو بکات لەترس.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە منالەکانی قورەیزە، لەسەر چالاوێك بەناوی چالی ئانا دابەزی، خەلك بەردەوام کۆدەبوونەوە، کەسانێك لەکاتی نوێژی ئێواری گەیشتن و نوێژی عەسریان نەخوێندبوو، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) فەرموویبووی نوێژی عەسر لەسەرزەمینی منالەکانی قورەیزە بخوێنن. ئەوان سەرقالی گرفتارییەکانی جەنگ بوون و مەبەستی ئەوەیان کرد بۆ ڕێز گرتن لەفەرموودەکەی پێغەمبەر(د.خ)، نوێژی عەسر لەدیاری منالەکانی قورەیزە بخوێن لەبەر ئەمە دوای نوێژی ئێواری، نوێژی عەسریان خوێند. خواوەند لەقورئاندا سەرکۆنەی ئەم کارەی ئەوانی نەکرد و پێغەمبەریش، سزای نەدان.

عایشە دەلێت: کاتی گەڕانەوە لەخەندەك پێغەمبەر(د.خ) بۆ سەعد خێوەتێکی لەمزگەوت هەلدا، سیلاحی دانا و موسولمانەکانیش سیلاحیان دانا. جبرەئیل هات و وتی: ئێوە سیلاحتان داناوە! سوێن بەخوا فریشتەکان هێشتا سیلاحیان دانەناوە، هێرش بکەنە سەر منالەکانی قورەیزە و شەڕیان لەگەل بکەن. پێغەمبەر(د.خ) داوای زرێی کرد و پۆشی، بەرێکەوت و موسولمانانیش شوێنی کەوتن.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لای منالەکانی غەنەم تێپەڕی، فەرمووی: کێ لێرە تێپەڕی کرد؟

وتیان: دەحیەی کەلبی. ڕوخسار و ریش و قیافەی دەحیە هاوشێوەی جبرەئیل بوو.

پێغەمبەر(د.خ) لەدیاری منالەکانی قورەیزە دابەزی. سەعد لەو خێوەتەی پێغەمبەر(د.خ) لەمەزگەوت بۆی هەلدابوو، مایەوە.

ماوەی یەك مانگ یا بیست و پێنج ڕۆژ جوولەکەکان گەمارۆیان لەسەر بوو، کاتێك تەنگیان پێهەلچنرا، پیان وتن لەسەر فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) تەسلیم بن، باوکی لوبابە کوڕی عەبدولمونزە ئیشارەی کرد کەفەرمانی پێغەمبەر(د.خ) کوشتنە.

جوولەکەکان وتیان: لەسەر فەرمانی سەعد کوڕی مەعاز تەسلیم دەبین.

پێغەمبەر(د.خ) ڕازی بوو، کاتێك جوولەکەکان تەسلیم بوون، پێغەمبەر(د.خ) کەرێکی((کەکۆپانێك لەگەلای خورمای لەسەر بوو)) نارد بۆ ئەوەی سەعد بێنن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماوەی بیست و پێنج ڕۆژ گەمارۆی خستە سەر منداڵەکانی قورەیزە تا ئەوەی گرفتارییەکانی ئەوان زیادی کرد. خواوەند دڵی ئەوانی لێوانلێو کرد لەترس. کاتێك قورەیش و غەتەفانییەکان ڕۆشتن، حەیی کوڕی ئەختەب بەهۆی ئەو پەیمانەی لەگەڵ کەعب کوڕی ئەسەد بەستبووی، ڕۆشتە ناو قەڵای منداڵەکانی قورەیزە. کاتێك دڵنیابوون پێغەمبەر(د.خ) ناگەڕێتەوە تا ئەو کاتەی بەتەسلیم بوون ناچاریان دەکات، کەعب کوڕی ئەسەد وتی: ئەی جوولەکەکان، خواوەند ئەو بەڵای بەسەردا هێناون دەیبینن، ئێستا پێشنیاری چەند شتێکتان پێدەکەم، بەدڵخوازی خۆتان یەکیان هەڵبژێرن.

وتیان: بڵێ.

وتی: یەك ئەوەی باوەڕ بەم پیاوە بێنین و وتەکانی پشتڕاست بکەینەوە کەنێردراوی خواوەندە و ئەو کەسەیە وەسفی ئەوتان لەکتێبی خۆتاندا خوێندوە، بەمشێوەیە گیان و سامانەکانتان پارێزراو دەبێت.

وتیان: هیچ کات پشت ناکەینە ئایینەکەی خۆمان و دینێکی دیکە هەڵنابژێرین.

وتی: ئەگەر ئەم کارە ناکەن، با ژن و منداڵەکانی خۆمان بکوژین و هیچ شتێکی گرنگ بەجێنەهێڵین، شمشێر بەدەستەوە بگرین و هێرش بکەینە سەر محەممەد و هاوەڵانی تا خوا لەنێوان ئێمە داوەری بکات، ئەگەر کوژراین، هیچمان لەدوای خۆمان بەجێنەهێشتووە و ئەگەر سەرکەوتین، دەتوانین دووبارە ژن ومنداڵمان هەبێت.

وتیان: ئەگەر ژن و منداڵەکانمان بکوژین، دوای ئەوان ژیان چ سوودێکی هەیە؟

وتی: ئەگەر بەم کارەیش رازی نابن، ئەمشەو شەوی شەممەیە و محەممەد و هاوەڵانی لەم شەوەدا لەئێمە ناترسن، با بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەینە سەر محەممەد و هاوەڵانی.

وتیان: ڕێزی شەممە بشکێنین و کارێك ئەنجام بدەین کەرابردووان کردیان و لەناوچوون؟

وتی: هیچ کام لەئێوە بەدرێژایی تەمەن یەك ڕۆژ دوروئەندێش نەبوون.

دەڵێت:کەسیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و داوایان کرد باوکی لوبابە بۆ لای ئەوان بنێرێت تا ڕاوێژی لەگەڵ بکەن لەبەر ئەوەی منداڵەکانی قورەیزە هاوپەیمانی ئەوس بوون. پێغەمبەر(د.خ) باوکی لوبابەی ڕەوانە کرد. کاتێك ژن و منداڵەکانی باوکی لوبابەیان بینی، بەگریان لەدەروی کۆبوونەوە. ئەو، بەزەیی بەواندا هاتەوە.

وتیان: ئەی باوکی لوبابە، بەبۆچوونی تۆ لەسەر فەرمانی محەممەد خۆمان تەسلیم بکەین؟

وتی: بەڵێ، و بەدەست قوڕگی خۆی نیشاندا یانی فەرمانەکەی ئەو کوشتنە.

باوکی لوبابە دەڵێت: کاتێك لەوێ هاتمەدەر، زانیم خیانەتم لەخوا و پێغەمبەر(د.خ) کردووە.

دوای ئەوە باوکی لوبابە نەڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، بەڵکو ڕۆشتە مزگەوت و خۆی بەیەکێك لەستوونەکان بەستەوە و وتی: لێرە ناجووڵێم تا خواوەند لەگوناحەکەم خۆش ببێت. نەزری کرد هیچ کات هەنگاو نەنێتە سەرزەمینی منداڵەکانی قورەیزە وتی: خواوەند هیچ کات لەشوێنێکدا من نەبینێت کەخیانەتم لێکردووە.

کاتێك گەڕانەوەی ئەو زۆری خایاند و پێغەمبەر(د.خ) لەکردەوەکەی ئاگادار بوویەوە، فەرمووی: ئەگەر دەهاتە لای من، داوای بەخشینم بۆ دەکرد بەڵام ئێستا کەئەو کارەی کرد، من لەو شوێنی خۆی بەستۆتەوە، نایکەمەوە تا ئەو کاتەی خواوەند بەتۆبەکەی رازی دەبێت.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەماڵی دایکی سەلمە بوو کەئایەی رازی بوون بەتۆبەکەی باوکی لوبابە هاتەخوار.

دایکی سەلمە دەڵێت: بەرەبەیان بیستم پێغەمبەر(د.خ) پێدەکەنی، وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ پێدەکەنی، هیوادارم هەمیشە دەم بەپێکەنین بیت.

فەرمووی: خواوەند بە تۆبەکەی باوکی لوبابە رازی بووە.

وتم: ئەم مژدەی پێبدەم؟

فەرمووی: ئەگەر دەخوازیت.

دەڵێت:دایکی سەلمە لەبەردەم دەرگای ژوورەکەی خۆی وەستا و ئەمە پێش فەرز کردنی پەردە بوو، وتی: ئەی باوکی لوبابە مژدەم بەرێ چوونکە خواوەند بەتۆبەکەی تۆ رازی بووە، خەڵك هاتن بیکەنەوە، بەڵام باوکی لوبابە وتی: سوێند بەخوا نە، دەبێت پێغەمبەر(د.خ) بەدەستی خۆی بمکاتەوە. بەرەبەیان کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لای باوکی لوبابە گوزەری کرد، ئەوی کردەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: سەعلەبە کوڕی سەعییە و ئەسید کوڕی سەعییە و ئەسەد کوڕی عوبەید کە لەمنداڵەکانی هودەل و لەقورەیزە و منداڵەکانی نەزیر نەبوون، هەمان

شەو کەمناڵەکانی قوڕەیزە لەسەر فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) تەسلیم بوون، باوەڕیان بەئیسلام هێنا. لەهەمان شەو عەمرۆ کوڕی سەعدی قوڕەزی هاتەدەر و کاتێك لای پاسەوانەکانی پێغەمبەر(د.خ) تێپەڕی.سەرکردەکەیان محەممەد کوڕی موسلیمەی ئەنساری بوو، کاتێك ئەوی بینی، پرسی: کێیت؟

وتی: عەمرۆ کوڕی سەعد.

عەمرۆ هاورێیەتی خیانەتەکەی مناڵەکانی قوڕەیزەی نەکردبوو، وتبووی: هەرگیز خیانەت لە محەممەد ناکەم.

محەممەد کوڕی موسلیمە کاتێك عەمرۆی ناسییەوە، وتی: خواوەندا من لەهەڵەی چاکەکان بێ بەش مەکە، رێگەی ئەو کردەوە و ڕۆشت. شەوی لەمەدینە و لەمزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) بەسەر برد و بەرەبەیان مەدینەی بەجێهێشت و تا ئێستا کەس نازانێت رووی کردۆتە چ ناوچە و سەرزەمینێك.

کاتێك بەسەرهاتی عەمرۆیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) باس کرد، فەرمووی: خواوەند ئەم پیاوەی رزگاری کرد لەبەر ئەوەی بۆ پەیمانەکەی ئەمەکدار بوو.

دەڵێت: بەوتەیەك ئەویان لەگەڵ خەڵکانی قوڕەیزە بەتەناف بەستەوە، بەڵام تەنافەکەی ئەویان دۆزییەوە و نەیانزانی خۆی بۆ کوێ ڕۆشتووە، پێغەمبەر(د.خ) ئەمەی فەرموو و خواوەند باشتر دەزانێت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بەرەبەیان مناڵەکانی قوڕەیزە لەسەر فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) تەسلیم بوون. ئەوسییەکان هاتن و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئەمانە خزمەکانی ئێمەن، نەك خەزرەجییەکان، سەبارەت بەخزمی خەزرەجییەکان، نەرمیت لەخۆت نیشاندا.

پێغەمبەر(د.خ) پێش مناڵەکانی قوڕەیزە گەمارۆی خستە سەر مناڵەکانی قینقاع و کاتێك لەسەر فەرمانی پێغەمبەر(د.خ) تەسلیم بوون، عەبدوڵلە کوڕی ئەبی سەلوول لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) قسەی کرد و پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بەو بەخشی.

کاتێك ئەوسییەکان سەبارەت بەمناڵەکانی قورەیزە نێوەنجیگەرییان کرد، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی خەڵکانی ئەوس، ئایا رازی دەبن یەکێك لەئێوە سەبارەت بەوان حوکم بدات؟

وتیان: بەڵێ.

فەرمووی: ئەو کارە بەسەعد کوڕی مەعاز دەسپێرم.

پێغەمبەر(د.خ) سەعدی لەمزگەوتەکەی خۆی لەخێوەتی یەکێك لەژنە موسوڵمانەکان بەناوی روفەیدە نیشتەجێ کردبوو. روفەیدە چاککردنەوە و تیمار کردنی برینداەرەکانی لەئەستۆدا بوو. کاتێك سەعد تیری بەرکەوت، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو بۆ خێوەتەکەی رۆفەیدە ببەن، بۆ ئەوەی بۆ چارەسەر کردن لەبەردەستیدا بێت.

کاتێك حوکمدان سەبارەت بەمناڵەکانی قورەیزە بەسەعد سپێردرا، خەڵکەکەی هاتن و ئەویان سوار کەرێك کرد. سەعد پیاوێکی باڵابەرز بوو. ئەویان بردە لای پێغەمبەر(د.خ)، لەرێگەدا پێیان وت: ئەی باوکی عەمرۆ، چاکە لەگەڵ خزمەکانی خۆت بکە، پێغەمبەر(د.خ) ئەم کارەی بەتۆ سپاردووە تا چاکەیان لەگەڵ بکەیت.

کاتێك وتەکانیان دووبارە کردەوە، وتی: کاتی خۆیەتی و سەعد بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خواوەند لەسەرکۆنە کردن ناترسێت. یەکێك لەهاوەڵانی گەڕایەوە و رووی کردە گەڕەکی مناڵەکانی عەبدئەشهەل و پێش ئەوەی سەعد بگاتە شوێنی مەبەست، هەواڵی لەناوچوونی مناڵەکانی قورەیزەی راگەیاند.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك سەعد گەیشتە لای موسوڵمانەکان و پێغەمبەر(د.خ)، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەبەر رێزی سالاری خۆتان هەستنە سەرپێ، یا فەرمووی: لەبەر رێزی باشترین پیاوی خۆتان هەستنە سەرپێ. خەڵکان هەستان و وتیان: ئەی باوکی عەمرۆ، حوکمدان سەبارەت بەخزمەکانی خۆتی بە تۆ سپاردووە.

سەعد وتی:دەبێت هەمووان سوێند بخۆن بەحوکمەکەی من رازی بن؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: ئەو کەسەی لێرە دانیشتووە، رازییە؟ ئیشارەی بۆ شوێنەکەی پێغەمبەر(د.خ) کرد بەڵام بۆ رێز گرتن سەیری نەکرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ. سەعد وتی: حوکمی من ئەوەیە پیاوان بکوژن و سامانەکانیان دابەش بکرێت و ژن و مناڵەکانیان ئەسیر.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: حوکمی تۆ سەبارەت بەجوولەکەکان هاوشێوەی حوکمی خواوەندە کەلەسەرووی حەوت ئاسمانەوە فەرمانی پێدەدات.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: جوولەکەکانیان لەقەڵاکە هێنایەدەر. پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی لەماڵی کچی حارس یەکێك لەژنەکانی مناڵەکانی نەجار زیندانی کرد، دوای ئەوە ڕۆشتە بازاری مەدینە و فەرمووی چەند چاڵێك هەڵکەنن. جوولەکەکانیان هێنا و لەو چاڵانەدا

سەریان پەڕاندن. ژمارەی جوولەکەکان شەشسەد یا حەوتسەد کەس بوو. حەیی کوڕی ئەختەب و کەعب کوڕی ئەسەد لەناویاندا دەبینران.

کاتێك کەعب کوڕی ئەسەدیان لەگەڵ جوولەکەکان دەبردە لای پێغەمبەر(د.خ)، پێیان وت: گومانی چی دەکەیت؟

وتی: هیچ کات بیرناکەنەوە، مەگەر نابینن هەر کەسێك دەبەن، ناگەڕێتەوە؟ سوێند بەخوا دەمانکوژن.

لەکوشتنی ئەوان بەردەوام بوون تا ئەوەی کۆتاییان پێهات.

کاتێك حەیی کوڕی ئەختەبیان هێنا، جلوبەرگێکی رازاوەی لەبەردابوو، هەمووی دڕاندبوو بۆ ئەوەی لێی نەستێنن. دەستی ئەویان بەتەنافێك بەملییەوە بەستبوو، کاتێك پێغەمبەری بینی، وتی: سوێند بەخوا هەرگیز لەدوژمنایەتی کردنی تۆ پەشیمان نیم، بەڵام هەرکەس شکست بخوات، شکست دەخوات. رووی کردە خەڵکان و وتی: لەفەرمانی خواوەند دەربازبوونمان نییە، نووسراوێکە و چارەنووسێك کە بۆ منداڵەکانی ئیسرائیل دیاریکراوە. دانیشت و ملیان پەڕاند.

عایشە دەڵێت: ژنێك لەمنداڵەکانی قوڕەیزە کوژرا، لای من بوو، قسەی دەکرد و پێدەکەنی، پێغەمبەر(د.خ) لەبازار پیاوەکانی دەکوشت و کاتێك ناوی ئەویان برد، وتی: سوێند بەخوا منم.

وتم: تۆیان بۆ چییە؟

وتی: دەیانوێت بمکوژن.

وتم: بۆ؟

وتی: بۆ ئەو کارەی ئەنجامم داوە.

عایشە دەیوت: هەرگیز ئەو لەبیر ناکەم، دەیزانی دەیکوژن بەڵام پێدەکەنی و خۆشحاڵ بوو.

کوڕی شیهابی زوهری دەڵێت: سابت کوڕی قەیسی شەماس ڕۆشتە لای زوبەیر کوڕی باتا کەنازناوەکەی باوکی عەبدولرەحمان بوو. لەرۆژگاری جاهلییەت زوبەیر چاکەی لەگەڵ سابت کوڕی قەیس کردبوو، لەشەڕی بەعاس ئەوی گرت و ناوچاوی تاشی و ئازادی کرد، کاتێك سابت ڕۆشتە لای، پیرەپیاوێکی بەتەمەن بوو، پێی وت: ئەی باوکی عەبدولرەحمان، دەمناسیت؟

وتی: بۆ دەکرێت تۆ نەناسم؟

سابت وتی: دەتەوێت ئەو چاکەی لەگەڵ من کردووتە، قەرەبووی بکەمەوە؟

زوبەیر وتی: جوامێر، وەڵامی جوامێر دەداتەوە.

سابت ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، زوبەیر چاکەیەکی لەگەڵ کردووم، ئارەزوو دەکەم بۆی قەرەبوو بکەمەوە و خوێنی ئەو بەمن ببەخشیت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوم بەتۆ بەخشی.

سابت گەڕایەوە بۆ لای زوبەیر و وتی: پێغەمبەر(د.خ) خوێنی تۆی بەمن بەخشی.

زوبەیر وتی: پیرەپیاوێکی بەتەمەن، بێ ژن و منداڵ چی بکات؟

سابت گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ)، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ژن و منداڵەکانی ئەو بەمن ببەخشە.

فەرمووی: ئەوانم بەتۆ بەخشی.

دوبارە گەڕایەوە بۆ لای زوبەیر و وتی: پێغەمبەر(د.خ) ژن و منداڵەکانی تۆی بەمن بەخشی و منیش بەتۆی دەبەخشم.

زوبەیر وتی: بنەماڵەیەك لەحیجاز بێ سامان بەکەڵکی چی دێن؟

سابت گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سامانی ئەو بەمن ببەخشە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سامانی ئەوم بەتۆ بەخشی.

گەڕایەوە بۆ لای زوبەیر و وتی: پێغەمبەر(د.خ) سامانی تۆی بەمن بەخشی و منیش بەتۆی دەبەخشم.

وتی: ئەی سابت، ئەو کەسەی ڕوخساری وەك ئاوێنەی چینی و من ڕوخساری خۆم تیادەدی، چی بەسەر هات، مەبەستی کەعب کوڕی ئەسەد بوو.

سابت وتی: کوژرا.

وتی: سالاری شاری و وەحشییەکان، حەیی کوڕی ئەختەب چی بەسەر هات؟

سابت وتی: کوژرا.

وتی: پێشەنگ و پشتیوانی ئێمە، عەزال کوڕی شەمویل چی بەسەرهات؟

سابت وتی: کوژرا.

وتی: کوڕەکانی کەعب کوڕی قورەیزە و عەمرۆ کوڕی قورەیزە چییان بەسەرهات؟

سابت وتی: هەموویان کوژران.

وتی: ئەی سابت، راستە من چاکەم لەگەڵ تۆ کردووە، من بۆ لای ئەوان ڕەوانە بکە چوونکە دوای ئەوان ژیان سوودی نییە. دەمەوێت هەرچی زووتر چاوم پێیان بکەوێت.

دەڵێت: سابت ئەوی بردەپێش و ملی پەڕاند.

کاتێك ئەبوبەکر وتەکانی ئەوی بیست، وتی: سوێند بەخوا لەجەهەننەم ئەوان دەبینێت و جەهەننەم هەمیشەییە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا هەموو کەسانی باڵقی دەرکرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: سەما کچی قەیس یەکێك لەپوورەکانی پێغەمبەر(د.خ) و بەیعەتی ژنانی بەستبوو و روو لەهەردوو قیبلە نوێژی خوێندبوو، داوای لە پێغەمبەر(د.خ) کرد ریفاعە کوڕی شەمویل قورزەی پێ ببەخشێت چوونکە پەنای بۆ بردبوو، وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆ بن، ریفاعە کوڕی شەمویل بەمن ببەخشە، دەڵێت نوێژ دەخوێنێت و گۆشتی وشتر دەخوات. پێغەمبەر(د.خ) ریفاعەی بەو بەخشی.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سامان و ژن و مناڵەکانی قورەیزەی دابەش کرد. بەشی ئەسپ و پیاوەکانی دا و پێنج یەکی بۆ خۆی هەڵگرت، هەر سوارەیەك سێ پشکی پێبڕا، دوو بەش بۆ ئەسپەکەی و بەشێك بۆ خۆی، پیاوی بێ ئەسپ یەك بەشی وەرگرت.

لەشەڕی مناڵەکانی قورەیزە سی و شەش ئەسپ بەشدارییان کرد. یەکەم تالانییە بوو بەپێی بەشەکان دابەش و پێنج یەکی لێ هەڵگیرا. لەشەڕەکانی دواتر ئەم شێوەیە بەردەوام بوو بەڵام بۆ ئەسپە بێ سوارەکان بەشیان لەبەرچاو نەگرت مەگەر دوو ئەسپ پێکەوە.

پێغەمبەر(د.خ) سەعد کوڕی زەیدی ئەنساری لەگەڵ دەستەیەك لەئەسیرەکانی مناڵەکانی قورەیزە بۆ نەجد نارد و لەبەرابەر فرۆشتنی ئەوان ئەسپ و سیلاحی کڕی.

پێغەمبەر(د.خ) لەژنە ئەسیرەکان، رێحانە کچی عەمرۆ کوڕی جەنانە لەتایەفەی مناڵەکانی عەمرۆ کوڕی قورەیزەی بۆ خۆی هەڵبژارد و تا کاتی مردن لای پێغەمبەر(د.خ) مایەوە. پێغەمبەر(د.خ) پێشنیاری پێکرد باوەڕ بێنێت تا وەك یەکێك لەژنەکانی حسێبی بۆ بکرێت، بەڵام رێحانە وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، وەك کەنیز رامبگریت، بۆ هەردووکمان باشترە. لەسەر ئایینی یەهوودی مایەوە. پێغەمبەر(د.خ) لێی رەنجا بوو. رۆژێك کە لەگەڵ هاوەڵانی خۆی دانیشتبوو، لەپشت سەرییەوە دەنگی پێی بیست، فەرمووی: سەعلەبە کوڕی سەعییە هاتووە مژدەی موسوڵمان بوونی

رێحانەم پێ بدات. هەمان سات سەعلەبە هات و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، رێحانە باوەڕی هێنا. پێغەمبەر(د.خ) شادمان بوو.

عایشە دەڵێت: سەعد پاڕایەوە و وتی: خواوەندا، حەز دەکەم لەگەڵ خەڵکانێک بجەنگم کە پێغەمبەری تۆ بەدرۆزن دەزانن، ئەگەر بڕیارە دووبارە پێغەمبەر(د.خ) و قوڕەیشییەکان شەڕ بکەن، مەمکوژە و ئەگەر شەڕی نێوان ئەوان کۆتایی پێهاتووە، من بۆ لای خۆت بگەڕێنەرەوە. برینەکەی دەمی کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) لەو خێوەتەی لەمزگەوتەکەدا بۆی هەڵکردبوو، سەردانی کرد.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر و عومەر لەسەر سەری ئامادە بوون، سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، لەژوورەکەی خۆمەوە گریانی ئەبوبەکرم لەگریانی عومەر جیا دەکردەوە.

لەعایشەیان پرسی: پێغەمبەر(د.خ) چی دەکرد؟

وتی: ئەو بۆ هیچ کەس نەدەگریا، کاتێک خەمبار دەبوو، ڕیشی خۆی دەگرت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەشەڕی خەندەك شەش کەس لەموسوڵمانەکان کوژران و لەناباوەڕان سێ کەس. لەشەڕی مناڵەکاتنی قوڕەیزە خیلاد کوڕی سوەید کوژرا. بەرداشێکیان بەسەرا خستەخوار و سەری شکا و مرد. باوکی سەنان کوڕی موحسن لەکاتی گەمارۆی سەر مناڵەکانی قوڕەیزە مرد و لەگۆڕستانی جوولەکەکان بەخاك سپێردرا.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەشەڕی خەندەك گەڕایەوە، فەرمووی: دوای ئەمە ئێمە هێرش دەکەینە سەر قوڕەیشییەکان و ئەوان بۆ شەڕی ئێمە مەککە بەجێناهێڵن. بەمشێوە بوو تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) دەستی بەسەر مەککەدا گرت.

بەوتەی کوڕی ئیسحاق، سەرکەوتن بەسەر مناڵەکانی قوڕەیزە لەزیقەعدە یا سەرەتاکانی زیحەججەدا بوو.

بەڵام واقدی دەڵێت: چەند ڕۆژ بۆ کۆتایی زیقەعدە پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕی مناڵەکانی قورەیزە بەرێکەوت و کاتێك تەسلیم بوون، فەرمووی: چاڵەکان هەڵکەنن و عەلی و زوبەیر بەئامادە بوونی پێغەمبەر(د.خ) سەری ئەوانیان دەپەڕاند.

هەروەها بەوتەی واقدی ژنێك لەو ڕۆژەدا بەفەرمانی پێغەمبەر(د.خ) کوژرا بەناوی بەنانە کەهاوسەری حەکەمی قورزەی بوو. ئەو کەسە بوو بەرداشەکەی بەسەر خیلاد

کوڕی سوەید خستەخوار و کوشتی. وەك قەساس، ئەویان کوشتەوە.

سەبارەت بەغەزای مناڵەکانی موستەلیق کە بەغەزوەی مەریسیع ناوی دەرکرد، گێڕانەوەکان جیاوازن.

مەریسیع ناوی یەکێك لەئاوەکانی خوزاعەیە و لەناوچەی قەدید لەنزیك کەنار جێگیرە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەشەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچی بۆ غەزای مناڵەکانی موستەلیق مەدینەی بەجێهێشت کەتیرەیێکن لەخوزاعە.

بەڵام بەوتەی واقدی غەزای مەریسیع لەشەعبانی ساڵی پێنجەمی کۆچ روویدا. هەروەها بەگوومانی ئەو شەڕی خەندەك و مناڵەکانی قورەیزە دوای غەزای مەریسیع روویدا.

بەوتەی کوڕی ئیسحاق، پێغەمبەر(د.خ) دوای کوشتاری مناڵەکانی قورەیزە کە لەکۆتاییەکانی زیقەعدە یا سەرەتاکانی زیحەججە روویدا، مانگی زیحەججە و موحەرەم و سەفەر و رەبیع الاول و رەبیع الاخری لەمەدینە بەسەر برد. لەو ساڵەدا کافرەکانی مەککە، سەرپەرەستی بەرێوبردنی کاروباری حەجیان دەکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی شەشەمی کۆچی

یەکێك لەڕووداوەکان غەزای مناڵەکانی لەحیان بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەجومادی الاول، شەش مانگ دوای لەناوبردنی مناڵەکانی قورەیزە، بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی خەبیب کوڕی عودەی و هاوەڵانی کە لەرەجیع کوژران، مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ مناڵەکانی لەحیانی کرد بەڵام وای نیشاندا بەرەو شام دەڕوات تا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەریان. مەدینەی بەجێهێشت و بەخێرایی ڕێگەی بڕی تا گەیشتە سەرزەمینی مناڵەکانی لەحیان و بینی خەڵکەکەی ئاگادار بوونەتەوە و پەنایان بۆ لوتکەی کێوەکان بردووە. پێغەمبەر(د.خ) لەبەر ئەوەی نەیتوانی بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەریان، فەرمووی: ئەگەر بەرەو عەسفان بڕۆین، قورەیشییەکان گومان دەکەن دەمانەوێت هێرش بکەینە سەر مەککە.

دواتر لەگەڵ دووسەد سوار لەهاوەڵانی تا عەسفان ئەسپیان غاردا و دووان لەهاوەڵانی بۆ پێشەوە نارد. ئەو دوو کەسە تا کەراع ئەلغەمیم پێشڕەوییان کرد و گەڕانەوە. پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە بۆ مەدینە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: چەند ڕۆژێك بەسەر مانەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەمەدینە تێنەپەڕی کەعۆیەیینە کوڕی حوسنی فەزاری لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی غەتەفان هێرشیان کردە سەر وشترەکانی پێغەمبەر(د.خ) لەبیشە و یەکێك لەمناڵەکانی غەفاریان کوشت کە لەگەڵ ژنەکەی لای وشترەکان بوو، ژنەکە و وشترەکانیان برد.

## گێڕانەوەی غەزوەی زیقەرد

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەکەم کەس کە لەڕووداوەکە ئاگادار بوویەوە، سەلمە کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەکوەع بوو. بەتیر و کەوانەکەی خۆی ڕووی کردە بیشە. کۆیلەکەی تەڵحە کوڕی عوبەیدالله هاوڕێیەتی دەکرد.

بەڵام لەگێڕانەوەی سەلمە کوڕی ئەکوەعدا هاتووە: ڕووداوەکە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەغەزوەی حۆدەیبییە ڕوویدا و ئەگەر ئەم ڕاست بێت ڕووداوەکە یا

لەزیحەججەی ساڵی شەشەم کۆچ یا لە سەرەتاکانی ساڵی حەوتەمی کۆچ روویداوە چوونکە لەساڵی حۆدەیبییە پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی زیحەججەی ساڵی شەشەی کۆچ لەمەککە بۆ مەدینە گەڕایەوە و بەمپێیە لەنێوان ئەو کاتەی کوڕی ئیسحاق بۆ غەزوەی زیقەرد دیاریدەکات و ئەوەی لەگێڕانەوەی سەلمەدا ئاماژەی پێدراوە، شەش مانگ جیاوازی هەیە.

سەلمە دەڵێت: دوای ئاشتی حۆدەیبییە، لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەرەو مەدینە بەرێکەوتین. پێغەمبەر(د.خ) وشترەکانی خۆی بەرەباحی کۆیلەیدا ڕەوانە کرد. منیش ئەسپەکەی تەڵحە کوڕی عوبەیدالله‌م برد. بەرەبەیان ئاگادار بووینەوە کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عۆیەیینە وشترەکانی پێغەمبەری فڕاندووە و شوانەکەی ئەوی کوشتووە. بەرەباحم وت: ئەسپەکە بگرە و بیبە بۆ تەڵحە و پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بکەرەوە کە ناباوەڕان وشترەکانی ئەویان ڕفاندووە. ڕۆشتمە سەر تەپۆڵکەیەك و رووم کردە مەدینە و سێ جار هاوارم کرد: تالآن، تالآن. دواتر شوێن تالآنچییەکان کەوتم و تیرم دەهاویشت. چەند کەسێکیانم بریندار کرد و کاتێك یەکێك لەوان دەگەڕایەوە، پەنام بۆ دارێك دەبرد و بەتیر، بریندارم دەکرد. ڕۆشتن و گەیشتنە تەنگەی کێوەکە. من بەکێوەکەدا سەرکەوتم و بەردبارانم کردن. هەموو وشترەکانی پێغەمبەریان بەجێهێشت لەگەڵ سی ڕم و سی حلە بۆ ئەوەی باریان سووك بێت. هەرچییان فرێدەدا، هەڵم دەگرتەوە و بەردێکم دەخستەسەر بۆ ئەوەی کاتێك پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی دێن، بیبینن.

لەناو تەنگەی کێوەکە، عۆیەیینە کوڕی حوسن فریایان کەوت. دانیشتن و عۆیەیینە سەیری منی کرد و پرسی: ئەمە کێیە؟

وتیان: لەبەرەبەیانەوە شوێنمان کەوتووە و ئەوەی هەمانبوو، لەدەستماندا.

عۆیەیینە وتی: چوارکەستان شوێنی کەون.

کاتێك نزیك کەوتنەوە، وتم: دەمناسن؟

وتیان: کێیت؟

وتم: سەلمە کوڕی ئەکوەع، سوێند بەو خوایەی ڕێزی لە محەممەد گرتووە، شوێن یەك یەکی ئێوە دەکەوم و دەتانگرم بەڵام هیچ کات منتان بۆ ناگیرێت.

یەکیان وتی: گومانم نییە.

ئەو چوار کەسە ڕۆشتن. لەشوێنەکەی خۆمدا بووم تا سوارەکانی پێغەمبەر(د.خ)

هاتن و ڕۆشتنە ناو دارەکان. ئەخرەمی ئەسەدی لەپێشیانەوە بوو، باوکی قتادەی ئەنساری بەدوای ئەو و میقداد کوڕی ئەسوەد لەدوای ئەو. جڵەوی ئەسپەکەی ئەخرەمم گرت و وتم: ئەوان کەمن، ئاگاداربە نەتکوژن تا پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی دەگەن.

ئەخرەم وتی: ئەی سەلمە، ئەگەر باوەڕت بەخوا هەیە و دەزانی بەهەشت و جەهەننەم حەقە، مەبە لەمپەر لەنێوان من و شەهید بوون. جڵەوی ئەسپەکەی ئەوم بەردا. ڕووبەڕووی عەبدولرەحمان کوڕی عۆیەیینە بوویەوە و ئەسپەکەی ئەوی بریندار کرد. عەبدولرەحمان زەربەیەکی لێدا و ئەخرەمی کوشت. دواتر سوار ئەسپەکەی خۆی بوو و باوکی قتادە بە عەبدولرەحمان گەیشت و ئەوی کوشت. بەڵام ئەسپەکەی باوکی قتادە بریندار بوو. سوار ئەسپەکەی ئەخرەم بوو، تالآنچییەکان هەڵاتن و من پیادە شوێنیان کەوتم. بەشێوەیەك رامدەکرد کەچیتر شوێنەوار و تەپوتۆزی هاوەڵانی پێغەمبەرم نەدەبینی.

دەڵێت: تالآنچییەکان دوای ئاوابوونی خۆر لەدۆڵی زیقەرد دابەزین. کانیاوێکی لێ بوو، دەیانویست ئاو بخۆنەوە. تینوو بوون. کاتێك منیان بینی، لەئاوەکەیان نەخواردەوە، لەنزیك بەرزایی زی ئەسیر جێگەیان گرت و یەکیان بەرەو ڕووی من هات. تیرێکم هاویشت و بەرشانی کەوت و وتم: بیگرە من کوڕی ئەکوەعم.

وتی: ئەکوەعی بەرەبەیان؟

وتم: بەڵێ ئەی ئەو کەسەی دوژمنی خۆتیت.

لەنزیك بەرزاییەکە دوئەسپی بێبوو، ئەسپەکانم ڕەم پێکرد تا بیانبەم بۆ پێغەمبەر(د.خ). کەمێك شیرم خواردەوە و بەو ئاوەی پێمبوو، دەسنوێژم گرت و نوێژم خوێند. عامری مامم گەیشت. پێکەوە ڕۆشتینە لای پێغەمبەر(د.خ) کە لەسەر ئاوی زیقەرد دابەزیبوو. هەموو وشتر و ڕم و حلەکانی هەڵگرتبوو. بیلال یەکێك لەوشترەکانی سەر بڕیبوو و لەجەرگ و کۆپاڵەکەی گۆشتی بۆ پێغەمبەر(د.خ) دەبرژاند.

بە پێغەمبەرم وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ڕێگە بدە سەد پیاو هەڵبژێرم و شوێن دوژمن کەوم تا کەسیان بەزیندووی نەهێڵمەوە.

پێغەمبەر(د.خ) پێکەنی بەشێوەیەك دیانەکانی دەرکەوتن و فەرمووی: تۆ بوویت ئەم بەڵات بەسەردا هێنان؟

وتم: سوێند بەو خوایەی ڕێزی پێبەخشیت، بەڵێ.

بەرەبەیان پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەرەو سەرزەمینی غەتەفان دەڕۆین.

پیاوێك لەغەتەفان هات و وتی: وشترێکیان کوشتبوو، کاتێك پێستەکەیان داماڵی تەپوتۆزیان بینی و وتیان: هاتن و هەڵاتن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئێستا باشترین سواری ئێمە باوکی قتادەیە و باشترین پیادەی ئێمە سەلمە کوڕی ئەکوەع. بەشی سوار و پیادەی پێبەخشیم. دوای ئەوە منی لەریزی خۆی سواری وشتر کرد. لەرێگەدا یەکێك لەئەنسارییەکان بەرادەیەك خێرا دەڕۆشت کەس نەیدەتوانی پێیبگاتەوە و دەیوت: کێ دەبێتە رکەبەری من؟ بەردەوام وتەکەی دووبارە دەکردەوە، کاتێك بیستم، وتم: رێز لەبەخشەران ناگریت و لەشەریفەکان ناترسیت؟

وتی: نە، مەگەر پێغەمبەر(د.خ) بێت.

داوام لە پێغەمبەر(د.خ) کرد مۆڵەت بدات کێبرکێی لەگەڵ بکەم. پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی پێدام و خێراتر لەو گەیشتمە مەدینە. سێ رۆژ لەمەدینە ماینەوە و دواتر هێرشمان کردە سەر خەیبەر.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: سەلمە کوڕی ئەکوەع لەگەڵ کۆیلەکەی تەلحە کوڕی عوبەیدالله کەئەسپەکەی ئەوی پێی بوو، ڕۆشتەدەر و کاتێك گەیشتنە سەنییەت ئەلوەداع، ئەسپەکانی دوژمنی بینی، رووی کردە سەلع و هاواری کرد: تالآن کراین، تالآن کراین. شوێن دوژمن کەوت. هاوشێوەی باڵندەیەکی بەهێز بوو. کاتێك لێیان نزیك کەوتەوە، تیرهاویشتنی دەستپێکرد و کاتێك سوارەکانی دوژمن دەگەڕانەوە، هەڵدەهات و دووبارە شوێنیان دەکەوتەوە و تیری دەهاویشت.

دەڵێت: هاواری کوڕی ئەکوەع بەگوێی پێغەمبەر(د.خ) گەیشت و لەمەدینە بانگی ئاگادار کرانەوە لێدرا. سوارەکان لەدەوری پێغەمبەر(د.خ) کۆبوونەوە. یەکەم سوار، میقداد کوڕی عەمرۆ بوو. دوای ئەو عوباد کوڕی بیشر و سەعد کوڕی زەید و ئەسید کوڕی زوهەیر و عوکاشە کوڕی موحسن و موحریز کوڕی نەزلە و باوکی قەتادە گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) . کاتێك لەدەوری پێغەمبەر(د.خ) کۆبوونەوە، سەعد کوڕی زەیدی کردە سەرکردەی ئەوان و فەرمووی: شوێن دوژمن کەون تا لەگەڵ کەسانی دیکە پەیوەستی ئێوە دەبم. منداڵەکانی زەریق دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) بەباوکی عەیاشی فەرموو: ئەسپەکەی خۆت بەکەسێك بدە لەتۆ سوارکارت بێت و بتوانێت بەدوژمن بگاتەوە.

باوکی عەیاش وتی: لەهەموان بەتواناتر و سوارکارترم.

باوکی عەیاش دەڵێت: ئەسپم غاردا و پەنجا زەراع نەڕۆشتبووم منی خستە خوار. لەوتەکانی پێغەمبەر(د.خ) سەرمسوڕما کەفەرمووی: ئەگەر ئەسپەکەی خۆت بەکەسێك دەدا کەسوارکارتر بێت لەتۆ و من وتم: لەهەموان سوارکارترم.

بەوتەی مناڵەکانی زەریق، پێغەمبەر(د.خ) ئەسپەکەی باوکی عەیاشی بەمەعاز کوڕی ماعس یا عائز کوڕی ماعس دا کەهەشتەمین سوار بوو. دەستەیەك سەلمە کوڕی ئەکوەع لەریزی ئەو هەشت کەس لەقەڵەم دەدەن و ئەسید کوڕی زوهەیر باس ناکەن بەڵام سەلمە سوار نەبوو و یەکەم کەس بوو بەدوژمن گەیشتەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەکەم سوار بەدوژمن گەیشتەوە، موحریز کوڕی نەزلە بوو کەپێیان دەوت ئەخرەم و قەمیر. کاتێك بانگی ئاگادار کرانەوە و مەترسی لەمەدینە بەرز کرایەوە، هەستا و ئەسپەکەی مەحمود کوڕی موسلیمە لەماڵەوە بوو، لەدەنگی ئەسپەکان هەڵبەز و دابەزی دەکرد چوونکە بەشێوەیەکی باش ئەسپەکەی دەستەمۆ نەکرابوو. ژنانی مناڵەکانی ئەشهەل کاتێك هەڵبەز و دابەزی ئەسپەکەیان بینی، وتیان: ئەی قەمیر، دەتەوێت سوار ئەم ئەسپە پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی بیت؟

قەمیر وتی: بەڵێ. سوار ئەسپەکە بوو و بەخێرایی بەدوژمن گەیشتەوە و وتی: ئەی خراپەکاران چاوەڕێ بن تا موهاجیر و ئەنسارەکان بێن.

یەکێك لەتاڵانچییەکان هێرشی کردە سەر و کوشتی. ئەسپەکەی هەڵات و نەکەوتە دەستی تاڵانچییەکان و گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. لەو شەڕەدا جگە لەوکەس لەموسوڵمانان نەکوژرا. ناوی ئەسپەکەی مەحمود، زوللمە بوو.

عوبەیدالله کوڕی کەعبی ئەنساری دەڵێت: موحریز یا قەمیر سوار ئەسپەکەی عوکاشە کوڕی موحسن بوو بەناوی جەناح. موحریز کوژرا و ئەسپەکەی ئەویان گرت و کاتێك سوارەکانی دیکە هاتن، باوکی قتادە، حەبیب کوڕی عوێەیینەی کوشت و حلەکەی خۆی خستەسەر. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانەکان هاتن، حەبیبیان بینی حلەی باوکی قتادەیە بەسەرەوەیە. اناالله یان وت و گومانیان کرد باوکی قتادە کوژراوە، بەڵام پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوە باوکی قتادە نییە، کوژراوی دەستی ئەوە، حلەکەی خۆی داوە بەسەردا تا بزانن بکوژەکەی باوکی قتادەیە.

عوکاشە کوڕی موحسن بەئەوبار و کوڕەکەی گەیشت کەسوار وشترێك بوون.

بەشمشێر هەردووکیانی کوشت، موسوڵمانان وشترەکانیان وەرگرتەوە و پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت تا لەنزیک کێوەی زیقەرد دابەزی. بەردەوام ژمارەیەکی زیاتر لەموسوڵمانان لەدەوری کۆدەبوونەوە. پێغەمبەر(د.خ) شەو ورۆژێك لەوێ مایەوە و باوکی سەلمە ئەکوەع وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئەگەر سەد کەس لەگەڵ مندا بنێریت، پاشماوەی وشترەکانیان لێ دەستێنمەوە و ئەسیریان دەکەم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەنووکە گەیشتوونەتە سەرزەمینی غەتەفان.

پێغەمبەر(د.خ) بەهەر چەند کەس لەهاوەڵانی خۆی وشترێکی بەخشی تا لێی بخۆن و دواتر لەگەڵ موسوڵمانان بۆ مەدینە گەڕایەوە و پاشماوەی جومادی الاخر و ڕەجەبی لەو شارەدا بەسەر برد و لەشەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچ بۆ غەزای مناڵەکانی موستەلیق، مەدینەی بەجێهێشت کەتیرەیەکن لەخوزاعە.

## گێڕانەوەی غەزوەی مناڵەکانی موستەلیق

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: هەواڵ هات کە مناڵەکانی موستەلیق بەسەرکردایەتی حارس کوڕی ئەبی زەرار باوکی جویریە کەدواتر بوو بەهاوسەری پێغەمبەر(د.خ)، بۆ شەڕ کۆبوونەتەوە. پێغەمبەر(د.خ) پێشدەستی کرد و هێرشی کردە سەریان و لەمەریسیع کە ناوی یەکێك لەئاوەکانی ئەوانە، لەناوچەی قەدید لەکەنار دەریا، ڕووبەڕوویان بوویەوە و شەڕێکی قورس دەستپێکرد. خواوەند، مناڵەکانی موستەلیقی لەناو برد و پێغەمبەر(د.خ) مناڵ و سامانی ئەوانی وەك تالآنی هەڵگرت؟

دەڵێت: لەم شەڕەدا یەکێك لەموسوڵمانەکان بەناوی هوشام کوڕی سەبابە بەدەستی یەکێك لەئەنسارییەکان کوژرا چوونکە گومانی کرد یەکێکە لەدوژمنان. کاتێك خەڵکان لەسەر ئاوەکە بوون، جەهجاه کوڕی سەعید لەمناڵەکانی غەفار کەبەکرێگیراوی عومەر بوو، ئەسپەکەی خۆی لەئاوەکە نزیك کردەوە و لەگەڵ سەنانی جوهەنی لەسەر ئاوەکە شەڕیان کرد. جوهەنی هاواری کرد و وتی: ئەی ئەنسارییەکان! جەهجاه هاواری کرد: ئەی موهاجیرەکان! عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی سەلوول کەدەستەیەك لەخەڵکەکەی لەدەوری کۆببونەوە، توڕە بوو و وتی: ئەم کارانە دەکەن، لەپێشی خۆیان بەسەر ئێمەدا دەسەپێنن و لەسەرزەمینی خۆمان بەسەرماندا زاڵ دەبن، سوێند بەخوا بەسەرهاتی ئێمە وقوڕەیشەکان ئەوەیە کەدەڵێن سەگەکەت قەڵەو بکە تا بتخوات. سوێند بەخوا

ئەگەر بۆ مەدینە گەڕاینەوە، ئەوەی ئازیزترە، زەلیلەکان دەردەکات. دواتر رووی کردە هاورێکانی و وتی: خۆتان بەخۆتانتان کرد، ئەوانتان لەسەرزەمینی خۆتان جێگە کردەوە و سامانی خۆتان لەگەڵ ئەوان دابەش کرد، سوێند بەخوا ئەگەر سامانی خۆتان بەوان نەدەن، ناچارن بۆ سەرزەمینێکی دیکە بڕۆن.

زەید کوڕی ئەرقەمی نەوجەوان ئەم قسانەی بیست و ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و بۆی گێڕایەوە. ئەمە دوای کۆتایی هاتنی شەڕ لەگەڵ منالّەکانی موستەلیقە بوو. عومەر کوڕی خەتاب لای پێغەمبەر(د.خ) بوو و کاتێك ئەم قسانەی بیست، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بەعوبادە کوڕی بیشر بڵێت بیکوژێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خەڵکان دەڵێن پێغەمبەر(د.خ) هاوەڵانی خۆی دەکوژێت، بڵێ با بەرێکەون. هەرچەند کاتی ڕۆشتن نەبوو، بەڵام جاری ڕۆشتنیان لێدا و بەرێکەوتن.

کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی ئاگادار بوویەوە زەید کوڕی ئەرقەم پێغەمبەری لەوتەکانی ئەو ئاگادار کردەوە، ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و سوێندی خوارد ئەو قسانەی نەهێناوەتە سەرزمان. عەبدوڵڵە لای خەڵکەکەی خۆی کەسێکی ڕێزدار بوو. کەسانێك لەئەنسار ئامادە بوون و بە پێغەمبەریان وت: ئەگەری هەیە ئەو نەوجەوانە لەوتەکان بەجوانی حاڵی نەبووبێت و وتارەکەی عەبدوڵڵەی پێچەوانە کردبێتەوە. بەرگریان لێکرد.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت، ئەسید کوڕی حەزیر خۆی پێگەیاند و سڵاوی بۆنارد و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) لەکاژێرێکی نەگونجاو بەرێکەوتیت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مەگەر نەتبیستووە هاورێکەت چی دەڵێت؟

ئەسید وتی: کام هاورێیە؟

فەرمووی: عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی.

ئەسید وتی: چی وتووە؟

فەرمووی: گومان دەکات ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مەدینە ئەوەی ئازیزە زەلیلەکان دەردەکات.

ئەسید وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئەگەر بخوازیت لەشارەکە دەریبکەیت، دەتوانیت، سوێند بەخوا ئەو زەلیلە و تۆ ئازیز. دواتر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ڕێگەی سازگاری

لەگەڵ ئەو بگرە بەر. سوێند بەخوا کاتێك خواوەند تۆی ڕەوانە کرد، خەڵکەکەی مۆرەیان کۆدەکردەوە تا تاجێکی بۆ دروست بکەن و هەنووکە گومان دەکات پاشایەتیت لەدەستی دەرهێناوە.

پێغەمبەر(د.خ) ئەو ڕۆژە خەڵکانی برد تا شەو داهات. هەمووی شەو تا بەرەبەیان و نیمەڕۆی ڕۆژی دووەم ڕێگەیان بڕی و کاتێك گەرما تەنگی پێهەڵچنین، وەستان و هەرئەوەندی لەسەر زەوی دانیشتن، خەویان لێکەوت. ئەم کارەی کرد تا خەڵکان لەوتەکەی عەبدوللە کوڕی ئەبی دوور بخاتەوە.

دوای ئەوە فەرمانی ڕۆشتنی بەخەڵکاندا و ڕێگەی حیجازی گرتەبەر و لەسەرەوەی نەقیع لەشوێنێك بەناوی نەقعا دابەزی. بایەکی سەخت هەڵیکرد و زیانی زۆری بەخەڵکان گەیاند و دڵی لیپاولیپ کردن لەترس.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مەترسن، ئەم بایە بەهۆی مەرگی یەکێك لەسەرکردەکانی کوفر هەڵیکردووە.

کاتێك گەیشتنە مەدینە، دەرکەوت هەمان ڕۆژ ریفاعە کوڕی زەید کوڕی تابووت یەکێك لەسەرکردەکانی منالەکانی قینقاع و پاڵپشتی ناباوەڕان مردبوو.

دوای ئەوە سوورەی منافقون سەبارەت بە عەبدوللە کوڕی ئەبی و هاودەستەکانی هاتەخوار و خواوەند فەرمووی: کاتێك مونافیقەکان بەرەو لای تۆ دێن. کاتێك ئەم سوورەیە هات، پێغەمبەر(د.خ) گووێچکەی زەید کوڕی ئەرقەمی گرت و فەرمووی: ئەمە کەسێکە خوا وتەکانی پشتڕاست کردەوە.

زەید کوڕی ئەرقەم دەڵێت: لەگەڵ مام بۆ شەڕ بەرێکەوتین و بیستم عەبدوللە کوڕی ئەبی کوڕی سەلول بەهاوەڵانی خۆی دەڵێت: بۆ ئەو کەسانەی هاوڕێی پێغەمبەرن خەرج مەکەن سوێند بەخوا کاتێك گەڕاینەوە بۆ مەدینە، ئەو کەسەی ئازیزە، زەلیلەکان لەشارەکە دەردەکات. مامم لەم وتانە ئاگادار کردەوە و ئەویش بۆ پێغەمبەری باس کرد. پێغەمبەر(د.خ)منی بانگ کرد. وتەکانی عەبدوللەم بۆ پێغەمبەر(د.خ) گێڕایەوە. پێغەمبەر(د.خ) کەسی بۆ لای عەبدوللە و هاوەڵانی نارد و سوێندیان خوارد: وتەی ئەوان نییە. پێغەمبەر(د.خ) منی بەدرۆزن و وتەکانی ئەوانی پشتڕاست کردەوە. هەرگیز بەو ئەندازەیە خەمبار نەبووم. لەخێوەتەکە دانیشتم، مامم وتی: دەتویست پێغەمبەر(د.خ) بەدرۆزن ناوت ببات و بێزاری خۆی لەتۆ دەرببڕێت. کاتێك اذا جائك المنافقون هاتەخوار، پێغەمبەر(د.خ) بانگی کردم و ئایەکەی خوێندەوە و فەرمووی: ئەی زەید، خواوەند

ڕاستی وتەکانی تۆی سەلماند.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی لەوتەکانی باوکی ئاگادار بوویەوە، ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بیستوومە دەتەوێت عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی لەبەر وتەکانی بکوژێت، ئەگەر مەبەستی کوشتنی ئەوت هەیە، ئەو کارە بەمن بسپێرە تا سەری بڕاوی ئەو بێنمە لای تۆ، سوێند بەخوا خەزرەجییەکان دەزانن هیچ کەس بەئەندازەی من بۆ باوکی وەفادار و ئەمەکدار نییە. دەترسم ئەگەر کەسێکی دیکە بیکوژێت، نەتوانم خۆم بگرم و بکوژەکەی باوکم بکوژم و بەم شێوەیە باوەڕدارێکم لەبەرابەر بێ باوەڕێك کوشتبێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ڕێگەی سازان لەگەڵ ئەو دەگرینەبەر و تا ئەوکاتەی لەگەڵ ئێمەدایە، وتەکانی بەخراپ لێکنادەینەوە. دوای ئەوە کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی کارێکی ناڕەوای دەکرد خەڵکەکەی سەرکۆنە و بێزاری خۆیان لەکردەوەکانی دەردەبڕی.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆتایی بەم بەسەرهاتە هێنا،بەعومەری فەرموو: دەبینی، ئەگەر ئەو کاتەی وتت بیکوژە، خوێنی ئەومان ڕشتبوو، کەسانێك لایەنگرییان لێدەکرد بەڵام ئێستا ئەگەر فەرمانی کوشتنی ئەو بدەین، بێ چەند و چوون دەیکوژن.

عومەر وتی: سوێند بەخوا دەزانم بۆچوونی پێغەمبەری خوا، پەسەندتر لەبۆچوونەکەی من بوو.

دەڵێت: مەقیس کوڕی سەبابە لەمەککەوە هات و باوەڕداری خۆی ئاشکرا کرد و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، هاوشێوەی موسوڵمانێك هاتوومە لای تۆ و خوێنبایی براکەی خۆمم دەوێت کە بەهەڵە کوژراوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی خوێنبایی براکەی بدەن و ماوەیەکی کەم لەمەدینە مایەوە، دواتر بکوژی براکەی کوشت و ناباوەڕ بۆ مەککە گەڕایەوە.

لەشەڕی مناڵەکانی موستەلیق ژمارەیەکی زۆر لەدوژمن کوژرا. عەلی کوڕی ئەبی تالیب مالیك و کوڕەکەی ئەوی کوشت و پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەکی ئەسیر و لەناو موسوڵمانانندا دابەشی کرد. جویریە کچی حارس کوڕی زەرار هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) لەناو ئەسیرەکاندا بوو.

عایشە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەسیرەکانی دابەش دەکرد، جویریە کچی حارس کوڕی زەرار بەسابت کوڕی قەیس یا کوڕە مامەکەی ئەو بڕا. کچێکی خوێنگەرم

وئێسك سووك بوو، هەركەس دەیبینی، شەیدای دەبوو، لەگەڵ خاوەنەكەی رێككەوت لەسەر ئەوەی بەهای ئازادی خۆی بدات. ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) تا بۆ وەرگرتنی بەهای ئازادی داوای هاوكاری لێبكات.

دەڵێت: كاتێك ئەوم لەبەردەم ژوورەكەی خۆمدا بینی، بێزاربووم چوونكە دەمزانی پێغەمبەر(د.خ) شەیدای دەبێت. كاتێك ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من جویریە كچی حارس كوڕی زەرار سەركردی مناڵەكانی موستەلیقم، كەوتوومەتە گێژاوێك و دەزانی لەكاتی دابەش كردن بەر سابت كوڕی قەیس كوڕی شەماس یا كوڕە مامەكەی كەوتووم، بەلاّم لەگەڵی رێككەوتم تا خۆم بكڕمەوە و ئێستا هاتووم بۆ ئەوەی هاوكاریم بكەیت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دەخوازیت كارێكی لەمە باشترت بۆ بكەم؟

وتی: چ كارێك؟

فەرمووی: بەهای ئازادی تۆ دەدەم و دەتكەمە هاوسەری خۆم.

جویریە وتی: بەڵێ.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو كارەم كرد.

كاتێك خەڵكان ئاگادار بوونەوە كە پێغەمبەر(د.خ) جویریە كچی حارسی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژاردووە، ئەسیرەكانی خۆیان ئازاد كرد لەبەر ئەوەی چیتر ئەوان خزمی پێغەمبەر(د.خ) بوون. بەمپێیە یەك سەد بنەماڵە لەمناڵەكانی موستلیق ئازاد كران. هیچ ژنێك بەئەندازەی جویریە خێر و خۆشی بۆ خەڵكەكەی نەبرد.

## بوختان هەڵبەستن بۆ عایشە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ)

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەشەڕی مناڵەکانی موستەلیق گەڕایەوە. کاتێك لەمەدینە نزیك کەوتەوە، درۆزنەکان سەبارەت بەعایشە کە لەم سەفەرەدا هاورێیەتی پێغەمبەری دەکرد، قسەی ناڕەوایان هێنایە سەرزمان.

عایشە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەمەدینە دەڕۆشتەدەر، لەنێوان هاوسەرەکانی تیروپشکی دەخست و هەر کەسێك ناوی دەرچووبایە، ئەوی لەگەڵ خۆی دەبرد. لەغەزای مناڵەکانی موستەلیق، ناوی من دەرچوو. پێغەمبەر(د.خ) منی لەگەڵ خۆی برد. لەو کاتەدا ژنان کەمخۆر و کێشیان زۆر نەبوو.

دەڵێت: کاتێك وشترەکەی من ئامادە دەکرا، لەکەژاوەکەی خۆم دادەنیشتم و کەسانێك دەهاتن و کەژاوەکەی منیان دەخستە سەر وشترەکە و بەتەناف دەیانبەستەوە و جڵەوی وشترەکەیان بەدەستەوە دەگرت و بەرێدەکەوتن. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) دوای شەڕ گەڕایەوە، لەنزیك مەدینە لەمەنزڵێك دابەزی. بەشێکی شەو مایەوە و دواتر بەرێکەوتن. کاتێك خەڵکان بەرێکەوتن بەمەبەستی دەست بەئاو گەیاندن جیابوومەوە، گەردنبەندەکەم لەملدا بوو. کاتێك تەواو بووم، گەردنبەندەکە لەملم کەوتە خوار و نەمزانی. کاتێك گەڕامەوە بۆ خێوەتەکەم، گەردنبەندەکەم نەبینی. بۆ دۆزینەوەی گەردنبەندەکە گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی ڕۆشتبووم.

لەم کاتەدا وشترەکەی منیان بۆ ڕۆشتن ئامادە کردبوو، کەژاوەکەیان خستە سەر و گومانیان کرد من لەناو کەژاوەکەدام. ڕۆشتبوون.

دەڵێت: کاتێك گەڕامەوە بۆ ئوردووگا، کەسی لێنەبوو. هەموویان ڕۆشتبوون، ڕوپۆشەکەم لەخۆمەوە ئاڵاند و لەشوێنەکەی خۆمدا خەوتم و زانیم کاتێك لەمنەبوونی من ئاگادار بن دەگەڕێنەوە. خەوتبووم کەسەفوان کوڕی موعەتەلی سولەمی لای من تێپەڕی. ئەویش بەمەبەستێك لەئوردووەکە بەجێمابوو. کاتێك ڕەشایی منی بینی، هاتەپێش و وەستا چوونکە پێش ئەوەی پەردە فەرز بکرێت، منی بینیبوو، کاتێك منی بینی، انا اللەی هێنایە سەرزمان و وتی: خوا بتبەخشێت، بۆ بەجێ ماویت؟

دەڵێت: وەڵامم نەدایەوە.

سەفوان وشترەکەی هێنایە پێش و وتی: سواربە. کاتێك لەوشترەکە دوور کەوتەوە،

سواری بووم. جڵەوی وشترەکەی گرت و بەخێرایی شوێن ئوردووی موسوڵمانان کەوت. بەرەبەیان سەفوان دەرکەوت، جڵەوی وشترەکەی بەدەستەوە بوو. درۆزنەکان بوختانیان هەڵبەست و وتەی ناڕەوایان هێنایە سەرزمان. شایەعە لەناو ئوردودا بڵاو بوویەوە ومن بێ ئاگا لەهەموو شتێك.

کاتێك گەڕاینەوە مەدینە، نەخۆش کەوتم بێ ئەوەی ئاگام لەهیچ شتێك بێت.

پێغەمبەر(د.خ) و باوك و دایکم لەدەنگ و باسەکان ئاگادار ببوونەوە بەڵام کەم تا زۆر هیچیان بەمن نەوت. پێغەمبەر(د.خ) وەك جاران لەگەڵ من مێهرەبان نەبوو چوونکە پێشتر کاتێك نەخۆش دەکەوتم، بەردەوام هەواڵی دەپرسیم بەڵام لەم نەخۆشییەمدا و هەرکاتێك دەهاتە لای من و دایکم بەپەرەستاری کردنی منەوە سەرقاڵ بوو، دەیپرسی، حاڵیان چۆنە؟ زیاتر لەمەی نەدەوت، لەلێنەپرسینی ئەو خەمبار و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئەگەر مۆڵەتم بدەیت، دەڕۆمە لای دایکم تا پەرستاریم بکات.

پێغەمبەر(د.خ) وتی: مۆڵەتت هەیە.

ڕۆشتمە ماڵی دایکم و هیچم نەدەزانی. لەماوەی بیست و چەند رۆژدا چاك تەندروستیم بەدەست هێنایەوە.

دەڵێت: ئێمە خەڵکانێکی سارایی بووین، هاوشێوەی شوێنی دەست بەئاو گەیاندنمان لەناو ماڵەکاندا نەبوو هەرچەندە بەشتێکی ناخۆشمان دەزانی. دەڕۆشتینە کەنارەکانی مەدینە و ژنان بۆ دەست بەئاو گەیاندن دەڕۆشتنەدەرەوە. شەوێك بۆ ئەو مەبەستە ڕۆشتمەدەر و دایکی موسەتیح لەگەڵما بوو. کاتێك بەرێگەدا دەڕۆشتین قاچی لەجلەکانی گیری کرد و کەوت، وتی: ریسوا بێت موسەتیح.

وتم: بۆ جوێن بەیەکێك لەموهاجیرەکان دەدەیت کە بەشداری شەڕی بەدری کردووە؟

دایکی موسەتیح وتی: ئەی کچی ئەبوبەکر! مەگەر نەتبیستووە؟

وتم: چی؟ وتەی دەرۆزنەکانی بۆ باس کردم.

وتم: وایان وتووە؟

وتی: بەڵێ سوێند بەخوا.

دەڵێت: بەڕادەیەك خەمبار بووم نەمتوانی دەست بەئاو بگەیێنم و گەڕامەوە. دەگریام و هەستم دەکرد جەرگم کون دەبێت. بەدایکم وت: خوا لێت خۆش بێت، خەڵکان بەوشێوەیە قسە دەکەن و تۆ دەبیستیت بێ ئەوەی باسی بکەیت؟

دایکم وتی: کچم ئارام بە، هەر ژنێکی جوان کەهاوسەرەکەی خۆشی بوێت و هەوێی

هەبێت، ئەم بوختانانەی بۆ هەڵدەبەستن.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ خەڵکان قسەی کردبوو، بێ ئەوەی بزانم، فەرموو بووی: ئەی خەڵکینە بۆ دەستەیەک بەمشێوەیە ئازارم دەدەن و قسەی ناڕەوا دەهێننە سەرزمان، سوێند بەخوا تەنیا چاوەڕوانی چاکەم لێیان و ئەم قسانە سەبارەت بەپیاوێك دەکەن کەپیاوێکی چاکەکارە و هەرگیز بەتەنیا نەڕۆشتۆتە ماڵی من.

زۆربەی ئەم قسانە دروستکراوی عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی سەلوول بوو. چەند کەسێك لەپیاوەکانی خەزرەج و موسەتیح و حەمنە کچی جەحش کەخوشکەکەی زێنەب هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) بوو، بەهۆی خوشکەکەیەوە بۆ بڵاو کردنەوەی ئەم هەواڵە هەوڵی دەدا. من بەدبەخت ببووم.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) قسەی بۆ خەڵکان کردبوو، ئەسید کوڕی حوزەیر وتبووی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئەگەر ئەوان لەئەوسییەکان بن لەناویان دەبەین و ئەگەر لەبراکانمان لەخەزرەجییەکانن، فەرمانی خۆت بفەرموو چوونکە دەبێت بکوژرێن.

سەعد کوڕی عوبادە وەك کەسێکی چاکەکار ناوی دەرکردبوو، وتبووی: سوێند بەخوا ئەوان ناکوژن بۆیە ئەم قسە دەکەیت چوونکە دەزانی ئەوان لەخەزرەجییەکانن و ئەگەر لەتایەفەکەی خۆت دەبوو، بەمشێوەیە قسەت نەدەکرد.

ئەسید کوڕی حوزەیر وتبووی: سوێند بەخوا درۆدەکەیت و تۆ دووڕوویت و بەرگری لەوان دەکەیت.

ئاژاوە لەناو خەڵکان سەریهەڵدا و زۆری نەمابوو دوو هۆزی ئەوس و خەزرەج پەنا بۆ شمشێر ببەن. پێغەمبەر(د.خ) لەمینبەر هاتەخوار و گەڕایەوە بۆ ماڵ. عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئوسامە کوڕی زەیدی بانگ کرد و راوێژی لەگەڵ کردن. ئوسامە بەچاکە وەسفی منیدابوو، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کەسی تۆن و تەنیا چاوەڕوانی چاکەیان لێدەکەین، ئەمە بوختانە و درۆیەکی هەڵبەستراو.

عەلی وتبووی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ژن فراوانە و دەتوانی کەسێکی دیکە بکەیتە هاوسەری خۆت، لەخزمەتکارەکەی بپرسە چوونکە راستی بەتۆ دەڵێت.

پێغەمبەر(د.خ) بەریرەی بانگ و پرسیاری لێکرد.

عەلی هەستا و لەبەریرەی دەدا و دەیوت: راستییەکان بە پێغەمبەر(د.خ) بڵێ.

بەریرە وەڵامی دایەوە: سوێند بەخوا کەسێکی پاکە، تەنیا رەخنەی سەر عایشە

ئەوەیە کاتێك هەویری دەشێلا، پێم دەوت ئاگای لێ بێت بەڵام خەوی لێدەکەوت و مریشك دەهات و هەویرەکەی دەخوارد.

پێغەمبەر(د.خ) هاتە لای من. دایك و باوکم و یەکێك لەژنە ئەنسارییەکان ئامادە بوون. دەگریام و فرمێسکم دەڕشت. ژنە ئەنسارییەکەیش لەگەڵ من دەگریا. پێغەمبەر(د.خ) دانیشت، سپاسی خوای کرد و فەرمووی: ئەی عایشە قسەکانی خەڵکت بیستووە، لەخوا بترسە و ئەگەر ئەو کارەی خەڵکان باسی دەکەن، ئەنجامت داوە، تۆبە بکە چوونکە خواوەند بەتۆبەی بەندەکانی رازی دەبێت.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەقسەکانی تەواو بوو، فرمێسکم وشکی کرد، چاوەڕوان بووم تا دایك و باوکم وەڵامی پێغەمبەر(د.خ) بدەنەوە بەڵام هیچیان نەوت. سوێند بەخوا خۆم بەکەمتر لەوە دەزانی خواوەند چەندین ئایەی قورئان بەسەبارت بەمن بۆ پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە بکات تا لەمزگەوتەکان و لەنوێژدا بیخوێنن. هیوادار بووم پێغەمبەر(د.خ) خەوێك ببینێت و خواوەند کەئاگاداری بێ گوناحی من بوو، درۆی خەڵکان بۆ پێغەمبەر(د.خ) ئاشکرا بکات بەڵام خۆم بەکەمتر لەوە دەزانی ئایەی قورئانی سەبارەت بەمن بێتە خوار.

کاتێك بینیم دایك و باوکم هیچ ناڵێن، پێم وتن: بۆ وەڵامی پێغەمبەر(د.خ) نادەنەوە؟

وتیان: سوێند بەخوا نازانین چی بڵێین.

دەڵێت: سوێند بەخوا هیچ بنەماڵەیەك وەك بنەماڵەی ئەبوبەکر لەو ڕۆژەدا گرفتاری بەلا نەبوو. کاتێك بینیم دایك و باوکم بێدەنگن، گریام و وتم: سوێند بەخوا هیچ کات تۆبە ناکەم، سوێند بەخوا باوەڕ بەوتەی خەڵکان ناکەم و خواوەند لەبێ گوناحی من ئاگادارە. سوێند بەخوا ئەگەر تۆبە و دان بەقسەی خەڵکاندا بنێم، پشتڕاستم دەکەیتەوە بەڵام وتەیەکی پێچەوانەی راستیم هێناوەتە سەرزمان و ئەگەر حاشا لەقسەی خەڵکان بکەم، باوەڕم پێ ناکەن.

دەڵێت: لەو کاتەدا بەدوای ناوی یەعقوبدا دەگەڕام بەڵام بیرم نەکەوتەوە، وتم: منیش وەك باوکی یوسف دەڵێم: چاوەڕوانی باشترین کردارە و لەو شتانەی باسی دەکەن، پەنا بۆ خوا دەبەم.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەشوێنەکەی خۆی هەڵنەستابوو کەوەحی بۆ هات. کاتێك وەحی بۆ هات، بەپارچەیەك دایانپۆشی و پشتییەکەی چەرمینیان خستە ژێر سەر. کاتێك ئەمەم بینی سوێند بەخوا نەترسام و گرنگیم پێنەدا چوونکە لەبێگوناحی خۆم

ئاسوود و دڵنیا بووم خواوەند ستەمم لێناکات. بەڵام دایك و باوکم بەشێوەیەك بوون کاتێك پێغەمبەر(د.خ) هاتەخۆ، گومانم دەکرد ئارەزووی مەرگی خۆیان دەکەن لەبەر ئەوەی دەترسان خواوەند وتاری خەڵك بەراست بزانێت.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) هاتەخۆ، دانیشت و دڵۆپەی عارەق وەك مرواری بەروخساریدا دەهاتە خوار. ڕۆژێکی سارد بوو، عارەقی لەناوچاوی سڕی و فەرمووی: عایشە دڵخۆشبە چوونکە خواوەند بێ گوناحی تۆی ڕەوانە کرد.

دەڵێت: وتم: سپاس بۆ خوا.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتەدەر و قسەی لەگەڵ خەڵکان کرد. ئایەکانی قورئانی خوێندەوە کە خواوەند سەبارەت بەبێگوناحی من ڕەوانە کردبوو. دوای ئەوە فەرمووی موسەتیح کوڕی ئەساسە و حسان کوڕی سابت و حەمنە کچی جەحش، داری (حەد)یان لێبدرێت چوونکە زیاتر لەهەموان بوختانیان بۆ من هەڵبەستبوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دایکی ئەیووب هاوسەری خالید کوڕی زەید پێی وتبوو: ئەی باوکی ئەییووب بیستووتە خەڵکان سەبارەت بەعایشە چی دەڵێن؟

باوکی ئەییووب وەڵامی دابوویەوە: بەڵێ بیستوومە، درۆ دەکەن، تۆ کاری وات دەکرد؟

دایکی ئەییووب وتی: سوێند بەخوا ئەو کارەم نەدەکرد.

باوکی ئەییووب وتی: عایشە لەتۆ باشترە.

کاتێك ئایەکانی قورئان بۆ بێگوناحی عایشە هاتەخوار، ئەبوبەکر کەپێشتر خەرجیی موسەتیحی دەدا، وتی: سوێند بەخوا چیتر هیچی پێنادەم و دوای ئەو بوختانەی بۆ عایشەی هەڵبەست، هاوکاری ناکەم. ئەم ئایە هاتەخوار:

((و لا یأتل اولوا لفضل منکم و السعة ان یؤتوا اولی القربی و المساکین و المهاجرین فی سبیل الله و لیعفوا و لیصفحوا الا تحبون ان یغفر الله لکم و الله غفور رحیم.

واتاکەی: بەتواناکان و ڕێزدارانی ئێوە سوێند نەخۆن کەهاوکاری هەژاران و کۆچکەرانی ڕێگەی خوا ناکەن. ببەخشن و چاوپۆشن مەگەر ئارەزوو ناکەن خواوەند لێیان خۆش بێت و خواوەند بەخشەر و مێهرەبانە.))

ئەبوبەکر وتی: سوێند بەخوا حەز دەکەم خواوەند بمبەخشێت و خەرجی موسەتیحیدا و وتی هیچ کات هاوکاری خۆم لەو درێغ ناکەم.

حسان کوڕی سابت هۆنراوەیەکی دەربارەی سەفوان کوڕی موعەتەلی سولەمی و خەڵکەکەی هۆنییەوە. سەفوان بەشمشێر لەحسانیدا و سابت کوڕی قەیس کوڕی شەماس، سەفوانی گرت و دەستی ئەوی بەملی بەستەوە و بۆ گەڕەکی مناڵەکانی حارسی برد. عەبدوللە کوڕی ڕەواحەی ئەوی بینی و وتی: بۆ دەستی ئەوت بەستۆتەوە.

سابت وتی: چوونکە بەشمشێر لەحسان کوڕی سابتیدا و گومان دەکەم ئەوی کوشتبێت.

عەبدوللە کوڕی ڕەواحە وتی: پێغەمبەر(د.خ) لەم کارەی تۆ ئاگادارە؟

وتی: نا سوێند بەخوا ئاگادار نییە.

عەبدوللە وتی: سنووری خۆت بەزاندووە، بەرەڵای بکە. سابت، سەفوانی ئازاد کرد.

ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و داستانەکەیان بۆ گێڕایەوە. پێغەمبەر(د.خ) سەفوان و سابتی بانگ کرد و سەفوان وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئازاری دام و بەشێوەیەکی ناشیرین باسی کردووم، تووڕە بووم و لێمدا.

پێغەمبەر(د.خ) بەحسانی وت: بۆ خراپەی خەڵکانێك دەهێنیتە سەرزمان کەخواوەند ڕێگەی ئیسلامی نیشانداون. سەبارەت بەو لێدانەی خواردووتە، چاکە بکە.

حسان وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ، بەخشیم بەتۆ.

پێغەمبەر(د.خ) لەجیاتی ئەم کارەی بیرەحی پێبەخشی کەمەنووکە کۆشکی مناڵەکانی جەدیلەیە. پێشتر بیرەح ملکی باوکی تەڵحە کوڕی سەهل بوو. ئەو، بەخشی بە پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ) لەبەرابەر ئەو زەربەی حسان کوڕی سابت لەسەفوان خواردی، بەحسان بەخشی لەگەڵ کەنیزێکی قیبتی. عەبدولرەحمان کوڕی حسان لەو کەنیزە قیبتیە چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

عایشە دەیوت: سەبارەت بەسەفوان پرسیاریان کرد و دەرکەوت کەلەژنان نزیك ناکەوێتەوە و دوای ئەوە شەهید بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) مانگی شەوال و ڕەمەزانی لەمەدینە بەسەر برد و لەمانگی زیقەعدەی ساڵی شەش بەمەبەستی حەجی عەمرە مەدینەی بەجێهێشت.

## گێڕانەوەی سەفەرەی حۆدەیبییە

موجاهید دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سێ جار حەجی عەمرەی کرد کە هەر سێ جارەکە لەمانگی زیقەعدەدا بوو. دوای ئەنجامدانی هەرکامیان گەڕایەوە بۆ مەدینە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی زیقەعدە بەمەبەستی ئەنجامدانی حەجی عەمرە مەدینەی بەجێهێشت، نەیدەویست شەڕ بکات، داوای هاوکاری لەسارانشینەکان کرد چوونکە دەترسا قوڕەیشییەکان شەڕیان لەگەڵ بکەن یا ڕێگەی کەعبەی لێبگرن بەڵام ژمارەیەکی زۆر لەسارا نشینەکان هاوکاریان نەکرد.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ موهاجیر و ئەنسار و ئەو عەرەبانەی پەیوەستی ببوون، بەڕێکەوت و قوربانی لەگەڵ خۆی برد. جل و بەرگی عەمرەی پۆشی بۆ ئەوەی خەڵکان بزانن مەبەستی شەڕ کردنی نییە و تەنیا خوازیاری زیارەتی کەعبەیە.

محەممەد کوڕی موسلیمی زوهری دەڵێت: لەساڵی حۆدەیبییە پێغەمبەر(د.خ) مەدینەی بەجێهێشت ومەبەستی زیارەتی کەعبەی لەسەردا بوو. حەفتا قوربانی لەگەڵ خۆی برد و حەوتسەد کەس هاوڕێیەتییان دەکرد. بۆ هەردەکەس یەك قوربانی.

حەدیسێکی دیکەیان لەزوهری گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ هەزار و چەند کەس بەرەو مەککە بەڕێکەوت.

موسلیمە دەڵێت: هەزار و چوارسەد کەس بووین و لەسەفەرەی حۆدەیبییە هاوڕێیەتی پێغەمبەرمان دەکرد.

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەو کەسانەی لەژێر داری حۆدەیبییە بەیعەتیان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەست، هەزار و پێنسەد و بیست و پێنج کەس بوون.

عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی ئەوفی دەڵێت: لەڕۆژی بەیعەت لەژێر دارەکەدا هەزار و سێسەد کەس بووین و ئەسلەمەییەکان یەك لەسەر هەشتی موهاجیرەکان بوون.

جابر کوڕی عەبدوڵڵەی ئەنساری ژمارەی موسوڵمانان لەسەفەری حۆدەیبییە بەهەزار و چوارسەد کەس دەزانێت.

زوهری دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە عەسفان، بەشیر کوڕی سوفیانی کەعبی خۆی پێگەیاند و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) قوڕەیشییەکان لەهاتنی تۆ ئاگادار بوونەتەوە و لەمەککە هاتوونەتەدەر. سەرسەرییەکانی خەڵکەکەیان لەگەڵ خۆیان

هێناوە و پێستی پڵنگیان پۆشییوە و لەزی تەوا ئوردوویان لێداوە. سوێندیان خواردووە رێگە نەدەن بڕۆیتە ناو مەککە و خالید کوڕی وەلیدیان لەگەڵ سوارەکاندا بۆ کەراغ ئەلعەمیم ناردووە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: دەستەیەك وتوویانە خالید کوڕی وەلید لەو کاتەدا موسوڵمان و هاورێیەتی پێغەمبەری دەکرد.

## ئاماژەدان بەبێژەری ئەم قسە

کوڕی ئەبزی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ قوربانییەکان بەرێکەوت تا گەیشتە زی ئەلحەلیفە، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بیّ سیلاح و ئەسپ دەڕۆیتە ناو خەڵکانێك کەدوژمنی تۆن. پێغەمبەر(د.خ) کەسی بۆ مەدینە نارد و هەموو سیلاح و ئەسپەکانیان هێنا. کاتێك لەمەککە نزیك کەوتەوە، رێگەیان نەدا بڕواتە ناو شارەکە. بەرەو مەنی ڕۆشت و لەویّ دابەزی. ئاگادار کرایەوە کەعێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل لەگەڵ پێنسەد کەس هاتۆتەدەر. پێغەمبەر(د.خ) بەخالید کوڕی وەلیدی وت: ئەی خالید، کوڕە پوورەکەی تۆ لەگەڵ سوپاکەی دێت.

خالید وتی: من شمشێری خوا و شمشێری پێغەمبەری خوام، بۆ هەر شوێنێك دەخوازیت ڕەوانەم بکە. لەو ڕۆژەوە خالید بەشمشێری خوا ناوی دەرکرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە کرد و لەدۆڵەکەدا ڕووبەڕوی عێکرەمە بوویەوە و سوپاکەی تێکشکاند و بۆ ناو دیوارەکانی مەککە پاشەکشێی پێکردن. جارێکی دیکە عێکرەمە هێرشی بردەوە و دووبارە لەسەر دەستی خالید شکستی خوارد. بۆ جاری سێیەم عێکرەمە گەڕایەوە و دووبارە شکستی خوارد. خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((وهو الذی کف ایدیهم عنکم و ایدیهم عنهم ببطن مکة من بعدان اظفرکم علیهم و کان الله بما تعملون بصیرا. هم الذین کفروا و صدوکم عن المسجد الحرام و الهدی معکوفا ان یبلغ محله و لولارجال مؤمنون و نساء مؤمنات لم تعلموهم ان تطؤهم فتصیبکم منهم معرة بغیر علم لیدخل الله فی رحمته من یشاء لو تزیلوا العذبنا الذین کفروا منهم عذابا الیما.

واتاکەی:ئەوە کە لەنزیك مەککە دوای ئەوە بەسەر ناباوەڕاندا زاڵی کردن، دەستی ئێوەی لەوان و دەستی ئەوانی لەئێوە بەستەوە و خواوەند بینەری کردەوەکانتان بوو.

ئەوان کەسانێك بوون ڕێگەی کوفریان گرتەبەر و ڕێگەیان نەدان لەگەڵ قوربانییەکان بڕۆنە ناو مسجد الحرام. ئەگەر ترسی ئەوەمان نەدەبوو پیاو وژنە موسوڵمانەکان کە نایاننناسن، زیانیان پێبگەیێنن و سەبارەت بەوان بێ ئەوەی بخوازن مەکروهێك بەئێوە بگات (ڕێگەی شەڕتان پێدەدرا بەڵام پێتان نەدرا) تا خواوەند ئەوەی دەخوازێت لەژێر ڕەحمەتی خۆیدا کۆبکاتەوە، ئەگەر لەیەك جیادەبوون، سزامان بەسەر کافرەکاندا دەباراند، سزایەکی بەئازار.))

خواوەند دوای ئەوەی سەرکەوتنی بە پێغەمبەر(د.خ) بەخشی، ڕێگەی نەدا شەڕیان لەگەڵ بکات چوونکە دەستەیەك لەموسوڵمانەکان لەناویاندا بوون و نەیدەخواست شەڕکەرە موسوڵمانەکان نەزانراو زیان لەوان بدەن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك قوڕەیشییەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی پێغەمبەر(د.خ) هاتن، فەرمووی: هاوار لەقوڕەیش، شەڕ لەناویان دەبات، بۆ ڕێگە نادەن من لەگەڵ عەرەبەکانی دیکە بجەنگم. ئەگەر بەسەر مندا سەرکەون، قوڕەیشییەکان بەمەبەستی خۆیان دەگەن و ئەگەر سەرکەوتن بەمن برا، بەئاسوودەییەوە باوەڕ بەئیسلام دێنن و ئەگەر نەیانویست، ئەوسا ڕێگەی شەڕ دەگرنەبەر. قوڕەیشییەکان بیر لەچی دەکەنەوە، سوێند بەخوا لەڕێگەی خوا شەڕیان لەگەڵ دەکەم تا ئەو کاتەی خواوەند سەرکەوتنم پێدەبەخشێت یا لەم ڕێگەیەدا دەکوژرێم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کێ دەتوانێت ڕێگەیەکی جیاواز لەم ڕێگەیەمان نیشان بدات کە قوڕەیشییەکان گرتوویانە؟

یەکێك لەپیاوانی ئەسلەم وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من ئەو کارە دەکەم. پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانانی لەناو دۆڵەکان لەڕێگەی سەخت و دژوارەوە برد و بەمشێوەیە گرفتاری ڕەنجێکی فراوان بوون. کاتێك لەوێ هاتنەدەر، لەکۆتایی دۆڵەکە گەیشتنە زەوییەکی پان و بەرین. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڵێن داوای بەخشین لەخوا و تۆبە دەکەین. موسوڵمانان وتیان.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەمە ئەو وشانە بوو بۆ منداڵەکانی ئیسرائیل هاتەخوار و نەیانوت.

کوڕی شیهابی زوهری دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) موسوڵمانانی لەڕێگەیەکەوە برد کە لەلای سەنییەت ئەلمەرار دەگەیشتە حۆدەیبییە لەخوارەوەی مەککە. کاتێك سوپاکەی

قورەیشی زانییان محەممەد و سوپاکەی لەرێگەیەکی دیکەوە ڕۆشتوون، گەڕانەوە و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە سەنییەت ئەلمەرار، وشترەکەی خەوت و موسوڵمانان وتیان: پەکی کەوت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پەکی نەکەوت، بەڵام ئەو کەسەی ڕێگەی فیلی لەمەککە گرت، ڕێگەی ڕۆشتنی لێگرت. ئێستا ئەگەر قورەیشییەکان پێشنیاری ڕێز گرتن لەپەیوەندی خزمایەتیم پێ بکەن، ڕازی دەبم. بەموسوڵمانانی فەرموو: دابەزن.

وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) لەم دۆڵەدا ئاو نییە.

پێغەمبەر(د.خ) تیرێکی لەتیردانەکەی خۆی دەرهێنا و دای بەیەکێك لەموسوڵمانان کە ڕۆشتە سەر یەکێك لەچاڵاوەکان و تیرەکەی لەبنی چاڵەکەدا و ئاو هەڵقولاَ بەشێوەیەك ناچار بوون حەوزێکی بۆ دروست بکەن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەو کەسەی تیرەکەی پێغەمبەری بردە ناو چاڵەکە، ناجیە کوڕی عومەیر، لێپرسراوی قوربانییەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوو. بەرا کوڕی عازەب دەیوت: من بووم تیری پێغەمبەرم بردە ناو چاڵەکە.

مەروان کوڕی حەکەم دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەکۆتاییەکانی حوّدەیبییە دابەزی. چاڵاوێکی لێبوو. ئاوی کەمی تیابوو و لەزووترین کات ئاوەکەی وشکی کرد. موسوڵمانان لەتینوویەتی سکالآیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەو تیرێکی لەتیردانەکەی خۆی دەرهێنا و فرمووی بیخەنە ناو چاڵەکە. ئاو بەردەوام لەچاڵەکەدا هەڵدەقولاَ تا ئەو کاتەی ئەو شوێنەیان بەجێهێشت.

لەم کاتەدا بودەیل کوڕی وەرقای خوزاعی لەگەڵ چەند کەسێك لەخەڵکەکەی هات— خوزاعییانی تەهامە لەچاکەخوازانی پێغەمبەر(د.خ) بوون– ، وتی:خەڵکانی کەعب کوڕی لوئەی و عامر کوڕی لوئەیم بینی کە لەسەر چاوەکانی حوّدەیبییە دابەزین و دەیانەوێت شەڕ لەگەڵ تۆ بکەن و ڕێگە نەدەن بڕۆیتە ناو کەعبە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئێمە بۆ شەڕ لەگەڵ کەس نەهاتووین، بۆ ئەنجامدانی حەجی عەمرە دەڕۆینە مەککە، قورەیشییەکان لەشەڕ بێزار بوون، ئەگەر بخوازن ماوەیەك دیاری دەکەین تا ئێمە و کەسانیتر بەتەنیا جێبێڵن، ئەگەر دینەکەی من سەرکەوتنی بەدەستهێنا، دەتوانن باوەڕ بێنن وئەگەر نەخوازن باوەڕ بێنن سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە،، بۆ سەرخستنی دینەکەی خۆم شەڕیان لەگەڵ دەکەم تا گیان دەبەخشم یا فەرمانەکانی خوا دەسەپێنرێت.

بودەیل وتی: ئەوان لەوتەکانی تۆ ئاگادار دەکەمەوە.

بودەیل ڕۆشتە لای قورەیشییەکان و وتی: لای محەممەدەوە دێم و بیستم سەبارەت بەئێوە قسەی دەکرد. ئەگەر بخوازن لەوتەکانی ئەو ئاگادارتان دەکەمەوە.

نەزانەکان وتیان: پێویستمان بەوتەکانی ئەو نییە.

کەسانیتر وتیان: ئاگادارمان بکەرەوە.

بودەیل وتی: ئەم و ئەوەی باس کرد. هەموو وتەکانی پێغەمبەری بۆ گێڕانەوە.

کاتێك کۆتایی بەقسەکانی هێنا، عوروە کوڕی مەسعودی سەقەفی وتی: ئەی خەڵکینە مەگەر من باوك نیم؟

وتیان: بۆنا.

وتی: ئایا گومانی خراپ لەمن دەکەن؟

وتیان: نە.

وتی: دەزانن من خەڵکانی عەکازم بۆ لای ئێوە بانگ کرد و کاتێك رازی نەبوون لەگەڵ ژن و منداڵ و هەموو شوێنکەوتەکانی خۆم پەیوەستی ئێوە بووم.

وتیان: راستە.

زوهری دەڵێت: عوروە کوڕی مەسعود منداڵی سەبیعیە کچی عەبدشەمس بوو.

عوروە وتی: ئەم پیاوە پێشنیارێکی عاقڵانەی بەئێوە کردووە، رازی بن و ڕێگەم بدەن بڕۆمە لای تا گفتوگۆی لەگەڵ بکەم.

وتیان: بڕۆ.

عوروە هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و گفتوگۆی لەگەڵ کرد. پێغەمبەر(د.خ) هەمان وتەی هێنایە سەرزمان کە لەگەڵ بودەیل باسی کردبوو.

عوروە پێی وت: ئەی محەممەد، هیچ کام لەعەرەبەکان خەڵکەکەی خۆی لەناو نەبردووە تا تۆ ئەو کارە بکەیت و ئەگەر ئەم کارە بکەیت، کەسانێك لەدەوری تۆ دەبینم دەتوانن هەڵبێن و پشتگوێت بخەن.

ئەبوبەکر وتی: خوارەوەی جەستەی لات بمژە، ئێمە هەڵبێین و پێغەمبەر(د.خ) پشتگوێ بخەین. لات بتی سەقیف بوو کەدەیانپەرەست.

عوروە وتی: ئەوە کێیە؟

وتیان: ئەبوبەکرە.

وتی: سوێند بەو خوایەی گیانم لەدەستی ئەو دایە، ئەگەر قەرزاری تۆ نەدەبووم، وەڵامم دەدایتەوە.

دواتر گفتوگۆی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) درێژە پێدا و کاتێک دەیویست شتێک باس بکات، ریشی ئەوی دەگرت. موغەیرە کوڕی شوعبە کە لەسەر سەری پێغەمبەر(د.خ) وەستابوو، کاتێک عوروە دەستی بۆ ڕیشی پێغەمبەر(د.خ) برد، بەکالآنی شمشێرەکەی لەدەستیدا و وتی: دەستت لەڕیشی ئەو دوور بخەرەوە.

عوروە سەری بەرز کردەوە و وتی: ئەمە کێیە؟

وتیان: موغەیرە کوڕی شوعبە.

وتی: ئەی خیانەتەکار، مەگەر بۆ پاککردنەوەی خیانەتەکەی تۆ هەوڵم نەدا.

موغەیرە لەسەردەمی جاهلییەت هاوڕێی دەستەیەک بوو کەئەوانی کوشت و سامانی ئەوانی فڕاند و هات و باوەڕی هێنا و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەئیسلامەکەت رازی بووم بەلآم سامانەکەت لەخیانەتەوە بەدەست هاتووە و پێویستمان پێی نییە.

عوروە لەکاری هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ورد دەبوویەوە و دەیوت: سوێند بەخوا کاتێک پێغەمبەر(د.خ) تفی ڕۆ دەکرد یەکیان دەستی درێژ دەکرد و لەسەر و روخساری خۆی دەسوو و کاتێک فەرمانێکی دەدا، بۆ ئەنجامدانی کێبڕکێیان دەکرد و کاتێک مەبەستی ئەوەی دەکرد دەستنوێژ بگرێت، لەناو موسوڵمانان شەڕ دروست دەبوو. کاتێک لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ) قسەیان دەکرد، بەشێوەیەک نەرم و بۆ ڕێز گرتن سەیری روخساری ئەویان نەدەکرد.

کاتێک عوروە بۆ لای هاوەڵانی خۆی گەڕایەوە، وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا سەردانی بارەگای پاشاکانم کردووە و دەرباری کەسرا و نەجاشی و قەیسەرم بینیوە، بەلآم هیچ کام لەپاشاکان هاوشێوەی محەممەد لای کەسەکانی رێزدار و ئازیز نییە، ئێستا بەپێشنیارەکانی رازی بن.

دوای ئەو یەکێک لەخەڵکانی کەنانە بەقوڕەیشییەکانی وت: مۆڵەت بدەن منیش سەردانی محەممەد بکەم.

وتیان: برۆ.

کاتێک لە پێغەمبەر(د.خ) وموسوڵمانان نزیک کەوتەوە، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: فلآن کەس دێتە لامان. ئەو لەتایەفەیێکە قوربانییەکان بەگرنگ دادەنێن، قوربانییەکان بەرەلآ بکەن. قوربانییەکانیان بەرەلآ کرد و خەڵک بەدەم تەکبیر وتنەوە، پێشوازییان

لێکرد و کاتێك ئەمەی بینی، وتی: پاك و پیرۆزە خواوەند! نابێت ڕێگە لەچوونی ئەم خەڵکە بۆ کەعبە بگیرێت.

زوهری دەڵێت: دوای ئەو حەلیس کوڕی عەلقەمە یا کوڕی زەبان کەسالاری حەبەشییەکان بوو، هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و کاتێك ئەوی بینی، فەرمووی: ئەمە لەدەستەی ئەو خەڵکانەیە خوا دەپەرەستن، قوربانییەکان بەرەڵا بکەن تا بیانبینێت. کاتێك ئەو قوربانییەکانی بینی، کە لەبەر مانەوەی زۆر تووکی یەکتریان خواردبوو، بۆ ڕێز گرتن لەوەی بینیبووی نەهاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و بۆ لای قورەیشییەکان گەڕایەوە و وتی: ئەی قورەیشییەکان شتێکی ناڕەوام بینی، ڕێگەتان لەو قوربانییانە گرتووە کە لەبەر مانەوەی زۆر تووکی یەکتریان خواردووە.

وتیان: دانیشە تۆ پیاوی سارایت و هیچ شتێك نازانیت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەم کاتەدا حەلیس تورە بوو، وتی: ئەی قورەیشییەکان سوێند بەخوا ئێمە پەیمانمان لەگەڵ نەبەستوون بۆ ئەوەی ڕێگە لەزیارەتکەرانی ماڵی خوا بگرین. سوێند بەو خوایەی گیانی حەلیس لەدەستی ئەودایە یا ڕێگە دەدەن محەممەد زیارەتی کەعبە بکات یا حەبەشییەکان لەگەڵ خۆم دەبەم.

وتیان: ئەی حەلیس بێدەنگ بە و ڕێگە بدەم لەم کارە ورد ببینەوە.

یەکێك لەقورەیشییەکان بەناوی موکریز کوڕی حەفس هەستا و وتی: من دەڕۆمە لای.

کاتێك موکریز نزیك کەوتەوە، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوە موکریز کوڕی حەفسە و پیاوێکی خراپەکارە. موکریز هات و گفتوگۆی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) دەستپێکرد. لەم کاتەدا سوهەیل کوڕی عەمرۆ هات و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کارەکەتان سەهل (ئاسان) بوو.

سەلمە کوڕی ئەکوەع دەڵێت: قورەیشییەکان سوهەیل کوڕی عەمرۆ و حوەیتب کوڕی عەبدولعوزا و حەفس کوڕی فلانیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد تا ئاشتی لەگەڵ بکەن و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بینی لەگەڵ سوهەیلدا دێن، فەرمووی: خوا کارەکەتانی ئاسان کرد. ئەوان وەك خزم دێن و دەیانەوێت پەیمانی ئاشتی ببەستن. قوربانییەکان بەرەڵا بکەن و تەکبیر بڵێن بەڵکو خواوەند دڵیان نەرم بکات.

دەنگی تەکبیری موسوڵمانان بەرز بوویەوە.

سوهەیل و هاوەڵانی هاتن و پێشنیاری ئاشتییان کرد.

سەلمە دەڵێت: لەو کاتەی باسی ئاشتی دەکرا و چەند کەسێك لەناباوەڕان لای موسوڵمانان و کەسێك لەموسوڵمانان لای ناباوەڕان بوو، ئەبوسوفیان ئەو کەسەی کوشت و لەناکاو دۆڵەکە پڕبوو لەپیاوە چەکدارەکان. شەش کەس لەوانم ئەسیر و تەسلیمی پێغەمبەرم(د.خ) کرد. پێغەمبەر(د.خ) نەسیلاحەکانی لێسەندن نەئەوانی کوشت. لێیان خۆش بوو.

دەڵێت: کاتێك لەگەڵ دانیشتووانی مەککە پەیمانی ئاشتیمان بەست، ڕۆشتم و لەژێر سێبەری دار خورمایەك خەوتم. چوار کەس لەناباوەڕان هاتن و جوێنیان بە پێغەمبەر(د.خ) دەدا. من لێیان بێزار و دوور کەوتمەوە. ئەوان سیلاحەکانی خۆیان هەڵواسی و خەوتن. شمشێرم هەڵگرت و هێرشم کردە سەریان و وتم: سوێند بەوخوایەی ڕێزی لە محەممەد گرت، هەرکەسێکتان سەر بەرز بکاتەوە، سەری دەپەڕێنم. ئەوانم بردە لای پێغەمبەر(د.خ). عامری مامم یەکێك لەخەڵکانی عەبەلاتی بەناوی موکریز هێنا کەپۆششی جەنگی لەبەردا بوو. کاتێك ئەوانمان بردە لای پێغەمبەر(د.خ)، حەفتا کەس لەناباوەڕان لەوێ بوون، پێغەمبەر(د.خ) سەیری کردن و فەرمووی: بەرەڵایان بکەن با سەرەتای دەغەڵکاری لەوانەوە بێت. هەموویانی بەخشی.

دەڵێت: خواوەند ئەم ئایەی ناردەخوار:

((وهو الذی کف ایدیهم عنکم و ایدیکم عنهم ببطن مکة.

واتاکەی: ئەوە لەنزیك مەککە دەستی ئێوەی لەوان و دەستی ئەوانی لەئێوە کورت کردەوە.))

سەلمە دەڵێت: ئەو موسوڵمانانەی لای ناباوەڕان بوون، وەرمانگرتنەوە و کەس لەباوەڕداران لای ئەوان نەمایەوە. سوهەیل کوڕی عەمرۆ و خوەیتب بەنوێنەرایەتی قوڕەیشییەکان و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەنوێنەرایەتی پێغەمبەر(د.خ) سەرقاڵی مۆر کردنی پەیمانی ئاشتی بوون.

قتادە دەڵێت: یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەناوی زەنیم لەسەر بەرزاییەکانی حۆدەیبییە دەرکەوت. ناباوەڕان تیریان بۆ هاویشت و کوشتییان. پێغەمبەر(د.خ) کەسی نارد تا دوانزە سوار لەناباوەڕان بێنن، فەرمووی: ئایا پەیمانتان لەگەڵ من هەیە؟ ئایا هیچ بڕیارێك لەنێوان ئێمەدا هەیە؟

وتیان: نە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی ئازاد کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: قوڕەیشییەکان سوهەیل کوڕی عەمرۆیان دوای ئەوە نارد کەپێغەمبەر(د.خ) عوسمان کوڕی عەفانی بەپەیامێك بۆ لای قوڕەیشییەکان ڕەوانە کرد.

دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) خەراش کوڕی ئومەییەی خوزاعی بانگ کرد. ئەوی سوار یەکێك لەوشترەکانی خۆی کرد و بۆ لای قوڕەیشییەکانی مەککە نارد تا پەیامەکەی بەسەرکردەکانی قوڕەیش بگەیێنێت بەڵام وشترەکەی پێغەمبەریان(د.خ) کوشت و مەبەستی کوشتنی خەراشیان کرد بەڵام حەبەشییەکان ڕێگەی ئەو کارەیان گرت و خەراش بۆ لای موسوڵمانەکان گەڕایەوە.

دەڵێن: قوڕەیشییەکان چل یا پەنجا کەسیان نارد تا بەدەوری موسوڵماناندا بسووڕێنە و زیانیان پێبگەیێنن. موسوڵمانان ئەوانیان و گرت و بردیانە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەو، لێیان خۆش بوو و ئازادی کردن. ئەوان بەرد و تیریان بۆ ئوردوگای پێغەمبەر(د.خ) دەهاویشت.

پێغەمبەر(د.خ) عومەر کوڕی خەتابی بانگ کرد تا بڕواتە مەککە و سەرکردەکانی قوڕەیش ئاگادار بکاتەوە کە پێغەمبەر(د.خ) بەمەبەستی زیارەت کردنی کەعبە هاتووە.

عومەر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من لەگیانی خۆم دەترسم، لەمناڵەکانی عودەی کەس لەمەککەدا نییە تا پارێزگاری لەمن بکات، قوڕەیشییەکان دەزانن دوژمنێکی سەرسەختی ئەوان بووم، بەڵام عوسمان کوڕی عەفان پارێزراوترە.

پێغەمبەر(د.خ) عوسمانی بانگ کرد و ئەوی بۆ لای ئەبوسوفیان و سەرکردەکانی قوڕەیش نارد تا لەمەبەستی پێغەمبەر(د.خ) ئاگاداریان بکاتەوە.

عوسمان بەرەو مەککە بەڕێکەوت و کاتێك ڕۆشتە ناو شارەکە، یاکەمێك پێش ئەوە، ئەبان کوڕی سەعید کوڕی عاسی بینی، دابەزی و ئەوی سوار چوارپێکەی خۆی کرد و پەنایدا تا پەیامەکەی پێغەمبەر(د.خ) بگەیێنێت. عوسمان ڕۆشتە لای ئەبوسوفیان و سەرکردەکانی قوڕەیش و لەپەیامەکەی پێغەمبەر(د.خ) ئاگاداری کردنەوە و کاتێك کۆتایی بەقسەکانی هێنا، وتیان: ئەگەر دەخوازیت بەدەوری کەعبەدا بسووڕێیتەوە، ڕێگە پێدراویت.

عوسمان وتی: ئەو کارە ناکەم مەگەر لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ).

قوڕەیشییەکان عوسمانیان هێشتەوە و هەواڵ بە پێغەمبەر(د.خ) وموسوڵمانان گەیشت کەقوڕەیشییەکان عوسمانیان کوشتووە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ناگەڕێینەوە

تا قوڕەیشییەکان لەناو دەبەین. داوای بەیعەتی لەگەڵ خەڵکان کرد و ئەمە بەیعەتی ڕەزوان بوو و لەژێر داردا ئەنجامدرا.

سەلمە کوڕی ئەکوەع دەڵێت: کاتیێ لەحۆدەیبییەوە بەرێکەوتبووین، جارچی پێغەمبەر(د.خ) جارپیدا ئەی خەڵکینە بۆ بەیعەت کۆببنەوە. لەدەروی پێغەمبەر(د.خ) کۆبووینەوە که لەژێر دارێکی خۆڵەمێشی دانیشتبوو، خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە کرد:

((لقد رضی الله عن المؤمنین اذیبایعونك تحت الشجرة.

واتاکەی: خواوەند لەباوەڕداران رازی بوو کاتێك لەژێر دارەکەدا بەیعەتیان لەگەڵ تۆ بەست.))

عامر دەڵێت: یەکەم کەس بەیعەتی کرد، سەنان کوڕی وەهب یەکێك لەخەڵکانی ئەسەد بوو.

جابر کوڕی عەبدوللە دەڵێت: لەڕۆژی حۆدەیبییە هەزار و چوارسەد کەس بووین و بەیعەتمان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەست. ئەو لەژێر دارێکی ڕەشدا دانیشتبوو. عومەر کوڕی خەتاب دەستی ئەوی گرتبوو، هەمووان بەیعەتمان کرد جگە لەجەد کوڕی قەیسی ئەنساری که لەژێر سکی وشترەکەی خۆی شاردەوە.

دەڵێت: بەیعەتمان بەست بۆ ئەوەی گۆڕەپانی شەڕ بەجێنەهێڵین و تا گیاندان بەرگری و خۆڕاگری بکەین.

سەلمە کوڕی ئەکوەع دەڵیچت: پێغەمبەر(د.خ) لەژێر دارێك دانیشتبوو و داوای لەکەسەکانی دەکرد بەیعەت ببەستن. من لەدەستەی یەکەم کەسان بووم بەیعەتم بەست. کەسانێکی زۆر بەیعەتیان بەست و پێغەمبەر(د.خ) بەمنی فەرموو: سەلمە بەیعەت ببەستە.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، یەکێك بووم لەو کەسانەی زووتر لەهەموان بەیعەتی بەست.

فەرمووی: دوبارە. چوونکە سیلاحم نەبوو، قەڵغانێکی پێبەخشیم.

بەیعەت بەردەوام بوو تا کۆتایی پێهات و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سەلمە بەیعەت ناکەیت؟

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) دووجار بەیعەتم بەست.

فەرمووی: دووبارە. بۆ جاریێ سێیەم بەیعەتم بەست و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو قەڵغانەی بەتۆم بەخشی، کوا؟

وتم: مام سیلاحی پێنەبوو، بەخشیم بەو.

پێغەمبەر(د.خ) پێکەنی و فەرمووی: تۆ بەو شێوەی کەرابردووان باسی دەکەن: خواوەندا کەسێك بکەرە هاورێم کەلەخۆم زیاترم خۆش بوێت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ موسوڵمانان بەیعەتی بەست جگە لەجەد کوڕی قەیس.

جابر کوڕی عەبدوللە دەڵێت: ئەوم بینی بەسکی وشترەکەی خۆیەوە نووسابوو بۆ ئەوەی کەس نەیبینێت.

دوای ئەوە هەواڵ هات کەدەنگ و باسی کوشتنی عوسمان کوڕی عەفان درۆ بووە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: قورەیشییەکان سوهەیل کوڕی عەمرۆیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و وتیان: پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ببەستە بەو مەرجەی ئەمساڵ بگەڕێتەوە تا عەرەبەکان نەڵێن محەممەد بەزۆر ڕۆشتە ناو مەککە.

کاتێك سوهەیل لەدوورەوە دەرکەوت و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بینی، فەرمووی: پێشنیاری ئاشتی دەکەم چوونکە ئەم پیاوەیان ناردووە.

کاتێك سوهەیل گەیشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، گفتوگۆکان درێژەی کێشا و بابەتی ئاشتی هاتە ئاراوە و کاتێك تەنیا نووسینی پەیمانەکە مایەوە، عومەر کوڕی خەتاب هەستا و ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و وتی: ئەی ئەبوبەکر مەگەر ئەو پێغەمبەری خوا نییە؟

ئەبوبەکر وتی: بۆ نا.

وتی: مەگەر ئێمە موسوڵمان نین؟

ئەبوبەکر وتی: بۆ نا.

وتی: مەگەر ئەوان ناباوەڕ نین؟

وتی: بۆ نا.

وتی: کەواتە بۆ لەکاری دینەکەی خۆمان بەم ریسواییە رازی دەبین؟

ئەبوبەکر وتی: ئەی عومەر شوێنکەوتەی پێغەمبەر(د.خ) بە، شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خوایە.

عومەر هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی:

مەگەر تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟

فەرمووی: بۆ نا.

وتی: مەگەر ئێمە موسوڵمان نین؟

فەرمووی: بۆ نا.

وتی: مەگەر ئەوان ناباوەڕ نین؟

فەرمووی: بۆ نا.

وتی: کەواتە بۆ لەکاری دینەکەی خۆمان بەم ریسواییە رازی دەبین؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من بەندە و نێردراوی خوام و تەنیا فەرمانەکانی ئەو ئەنجام دەدەم، ئەویش من پشتگوێ ناخات.

عومەر دەیوت: لەترسی وتەکانی ئەو رۆژەم بەردەوام رۆژووم دەگرت و خێرم دەکرد، نوێژم دەخوێند و بەندەکانم ئازاد دەکرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بانگی کردم و وتی: بنووسە، بسم الله الرحمان الرحیم.

سوهەیل کوڕی عەمرۆ وتی: من ئەوە ناناسم بنووسە باسمك اللهم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بنووسە باسمك اللهم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بنووسە ئەمە پەیمانی ئاشتییە لەنێوان محەممەد پێغەمبەری خوا لەگەڵ سوهەیل کوڕی عەمرۆ.

سوهەیل وتی: ئەگەر تۆم بە پێغەمبەردەزانی، شەڕم لەگەڵ نەدەکردیت، ناوی خۆت و باوکت بنووسە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بنووسە، ئەمە پەیمانە لەنێوان محەممەد کوڕی عەبدوللە لەگەڵ سوهەیل کوڕی عەمرۆ.

بڕیاردار بۆ ماوەی دەساڵ شەڕ لەنێوانیاندا روونەدات و هەمووان لەئەماندا بن و دەست لەیەکتر هەڵگرن بەو مەرجەی هەرکام لەقوڕەیشییەکان بێ مۆڵەتی سەرپەرەستی خۆی بڕواتە لای محەممەد، بیگەڕێنێتەوە و هەرکەس لەموسوڵمانان پەیوەستی قوڕەیشییەکان بوو، نەیگەڕێننەوە. ئاشتی لەنیوانیان سەقامگیر بێت و شەڕ و ئەسیرکران لەئارادا نەبێت. هەرکەس دەخوازێت لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمان ببەستێت و هەرکەس دەخوازێت لەگەڵ قوڕەیشییەکان.

خەڵکانی خوزاعە وتیان: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمان دەبەستین.

مناڵەکانی بەکر وتیان: ئێمە لەگەڵ قوڕەیشییەکان.

قوڕەیشییەکان مەرجیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) دانا تا لەم ساڵەدا بگەڕێتەوە و نەڕواتە

ناو مەککە و ساڵێکی دیکە بگەڕێتەوە و ئەوان مەککە چۆڵ دەکەن بۆ ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان بڕۆنە ناو مەککە و تەنیا دەبێت شمشێریان پێبێت ئەویش لەناو کالآن.

لەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) و سوهەیل کوڕی عەمرۆ پەیمان نامەکەیان دەنووسی، باوکی جەندەل کوڕی سوهەیل هەڵات و هاتە لای پێغەمبەر(د.خ).

کاتێك موسوڵمانان هاتنەدەر، لەسەرکەوتن دڵنیا بوون بەهۆی ئەو خەوەی پێغەمبەر(د.خ) بینیبووی و کاتێك بینیان بەپەیمانی ئاشتی و گەڕانەوە کۆتایی هات و پێغەمبەر(د.خ) بەزۆر شت رازی بوو، پەرێشان بوون و زۆری نەمابوو کوفر لەناویاندا بلاّو ببێتەوە.

کاتێك سوهەیل، باوکی جەندەل (کوڕی خۆی) بینی، هەستا و شەقەزللەیەکی لێدا و یەخەی گرت و وتی: ئەی محەممەد پێش هاتنی ئەمە بۆ لای تۆ، پەیمانی ئاشتی لەنێوان من و تۆ واژۆ کراوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: راست دەکەیت.

سوهەیل، باوکی جەندەلی بەدوای خۆیدا رادەکێشا تا بیگەڕێنێتەوە بۆناو قوڕەیشییەکان، ئەویش هاواری دەکرد: ئەی موسوڵمانان دەمبەن بۆ ناو ناباوەڕان تا لەدینەکەم هەڵگەڕێمەوە.

موسوڵمانان لەم رووداوە تووڕە بوون، بەلاّم پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی باوکی جەندەل خۆڕاگری بکە تا ئەو کاتەی خواوەند رێگەی چارەیەك بۆ تۆ و کەسانی وەك تۆ ئامادە دەکات، ئێمە پەیمانمان لەگەڵ ئەم خەڵکە بەستووە و بەڵێنمانداوە و ناتوانین پەیمان بشکێنین.

دەڵێت: عومەر هەستا و لەگەڵ باوکی جەندەل بەرێکەوت، دەیوت: ئەی باوکی جەندەل، چاوەڕوانبە ئەوان ناباوەڕن و خوێنیان وەك خوێنی سەگ وایە. دەسکی شمشێرەکەی لەو نزیك دەکردەوە.

عومەر دەیوت: هیوادار بووم شمشێرەکە بگرێت و باوکی بکوژێت بەلاّم نەیویست خوێنی باوکی بڕێژێت.

کاتێك پەیمانی ئاشتی ئامادە کرا، دەستەیەك لەموسوڵمانان و ناباوەڕان، ئەبوبەکری راستگۆ، عومەر کوڕی خەتاب، عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و عەبدوڵلە کوڕی سوهەیل

کوڕی عەمرۆ و سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و مەحمود کوڕی موسلیمە و موکریز کوڕی حەفصی ئاباوەڕ و عەلی کوڕی ئەبی تالیب، بوونە شایەتی پەیمان نامەکە. نووسەرەکەی عەلی بوو.

بەرا دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی زیقەعدە بەمەبەستی حەجی عەمرە مەدینەی بەجێهێشت بەڵام دانیشتووانی مەککە ڕێگەیان نەدا و ئاشتی سەقامگیر کرا. پێغەمبەر(د.خ) سێ ڕۆژ لەمەککە مایەوە. کاتێك پەیماننی ئاشتییان نووسی، بەمشێوە نووسیان:

ئەمە پەیمانی ئاشتی محەممەد پێغەمبەری خوایە. وتیان: ئەگەر تۆمان بە پێغەمبەر دەزانی، ڕێگەمان لێنەدەگرتیت بەڵام تۆ محەممەد کوڕی عەبدوڵلەیت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من پێغەمبەری خوام و محەممەد کوڕی عەبدوڵلەم. بەعەلی فەرموو: پێغەمبەری خوا بسڕەوە.

عەلی وتی: هەرگیز ئەو کارە ناکەم.

پێغەمبەر(د.خ) پەیمانی ئاشتییەکەی هەڵگرت – ئەو نووسینی بەباشی نەدەزانی– وشەی محەممەدی لەجیاتی پێغەمبەر نووسی و بەمشێوەیە نووسرا: ئەم پەیمانی ئاشتیی محەممەدە، تەنیا بەشمشێر لەناو کالآنەوە بڕواتە ناو مەککە و هیچ یەك لەموسوڵمانانی شارەکە لەگەڵ خۆی نەبات و هەرکەس لەهاوەڵانی بخوازێت لەمەککە بمێنێتەوە، ڕێگەیان لێنەگرێت.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ناو مەککە و ماوەی سێ ڕۆژەکە کۆتایی هات، پێغەمبەر(د.خ) بەهاوەڵانی خۆی وت: هەستن و قوربانی بکەن و مووی سەر بتاشن. بەڵام کەس هەڵنەستا. پێغەمبەر(د.خ) سێ جار وتەکانی دووبارە کردەوە و کاتێك کەس هەڵنەستا، ڕۆشتە لای دایکی سەلمە و ڕووداوەکەی بۆ باس کرد. دایکی سەلمە وتی: ئەگەر دەخوازی ئەو کارە بکەن، برۆ و بێ ئەوەی لەگەڵ کەس قسە بکەیت، قوربانی بکە و داوا لەسەرتاشەکەی خۆت بکە مووی سەرت بتاشێت.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتەدەر و لەگەڵ کەس نەپەیڤی. کاتێك موسوڵمانەکان ئەمەیان بینی، هەستان و قوربانییان کرد و مووی سەری یەکتریان تاشی. ئەوەندەی نەمابوو چەند کەس لەم ناوەدا بکوژرێن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەو کەسەی لەو ڕۆژەدا مووی سەری پێغەمبەری تاشی، خەراش کوڕی ئومەییە کوڕی فەزلی خوزاعی بوو.

کوڕی عەباس دەڵێت: لەرۆژی حۆدەیبییە کەسانێك مووی سەریان تاشی و کەسانێك کورتیان کردەوە، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خوا ئەوکەسانە ببەخشێت مووی سەریان تاشی.

وتیان: ئەوانەیشی کورتیان کردۆتەوە.

فەرمووی: ئەوانەی سەریان تاشی.

وتیان: ئەوانەیشی کورتیان کردەوە.

فەرمووی: ئەوانەی سەریان تاشی.

وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ئەوانەیشی کورتیان کردەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوانەیشی کورتیان کردەوە.

پرسییان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ تەنیا داوای بەخشینت بۆ ئەوکەسانە کرد کەسەریان تاشی؟

فەرمووی: لەبەر ئەوەی گومانیان نەکرد.

زوهری دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە گەڕایەوە، پێشتر سەرکەوتنێکی بەو گەورەییە لەئیسلامدا نەبینرابوو. هەر کاتێك ئەم دوو دەستەیە رووبەرووی یەکدەبوونەوە، شەڕ روویدەدا. کاتێك ئاشتی سەقامگیر کرا و شەڕ باری کرد و خەڵکان لەیەك ئاسوودە بوون، چاویان بەیەك کەوت و گفتوگۆکان دەستپێکرد. ئەوەی توانای تێگەیشتنی ببوایە، پێشنیاری ئیسلامیان پێدەکرد و باوەڕی دەهێنا. لەم ماوەی ئەم دووساڵەدا زیاتر لەهەموو ساڵەکانی دیکە خەڵکان باوەڕان بەئیسلام هێنا.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە مەدینە، باوکی بەسیر، یەکێك لەقورەیشییەکان هات.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ناوی باوکی بەسیر عوتەبە کوڕی ئەسەد و لەو موسوڵمانانە بوو کە لەمەککە ژیانی بەسەر دەبرد. کاتێك هاتە لای پێغەمبەر(د.خ)، ئەزهەر کوڕی عەبدعەوف و ئەخنەس کوڕی شورەیق سەبارەت بەو نامەیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی و یەکێك لەکۆیلەکانی خۆیان لەگەڵ یەکێك لەمناڵەکانی عامر ڕەوانە کرد. کاتێك نامەکەیان تەسلیمی پێغەمبەر(د.خ) کرد، فەرمووی: ئەی باوکی بەسیر ئێمە پەیمانمان لەگەڵ ئەم خەڵکەدا هەیە و دەزانی لەدینەکەی ئێمەدا خیانەت ڕەوا نییە، خواوەند بۆ تۆ وئەو خەڵکانەی لەگەڵ تۆن، ڕێگە چارەیەك دەدۆزێتەوە.

دەڵێت: باوکی بەسیر لەگەڵ ئەو دوانە بەرێکەوت و کاتێك گەیشتنە زوئەلحەلیفە، لای دیوارێك دانیشت. درو هاورێکەیشی لەگەڵدا بوو. بەپیاوی عامری وت: شمشێرەکەت تیژە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: باسەیری بکەم؟

وتی: سەیری بکە.

ئەبوبەسیر شمشێرەکەی دەرکێشا و پیاوی عامری کوشت و کۆیلەکە بەخێرایی گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) لەمزگەوت دانیشتبوو، کاتێك لەدوورەوە کۆیلەکەی بینی، فەرمووی: ئەم پیاوە ترساوە.

کاتێك کۆیلەکە نزیك کەوتەوە، پرسی: چی روویداوە؟

وتی: هاورێکەی ئێوە هاورێکەی منی کوشت.

هەمان سات باوکی بەسیر بەشمشێرە دەرکێشراوەکەی دەرکەوت و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، تۆ پەیمانەکەی خۆتت بردەسەر ومنت تەسلیمی ئەوان کردەوە، بەڵام خواوەند منی لەدەستی ئەوان رزگار کرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دەسپێکی جەنگە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ویا وتی: ئەگەر کەسانێکی لەگەڵدا بن، سەرەتای هەڵگیرسانی جەنگە. کاتێك ئەم وتەی هێنایە سەرزمان، باوکی بەسیر زانی ئەو تەسلیمی نێردراوەکە دەکاتەوە. باوکی بەسیر لای پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و لەعەیس لەکەنار دەریا لەسەر رێگەی کاروانەکانی قورەیش دابەزی. ئەو موسوڵمانانەی لەمەککە زیندانی قورەیشییەکان بوون، وتەکانی پێغەمبەریان(د.خ) بیست کە بەباوکی بەسیر وتبوو: ئەگەر کەسانی دیکەی لەگەڵدا بێت، ئەمە سەرەتای دەسپێکردنی جەنگە. ئەوانیش لەعەیس پەیوەستی باوکی بەسیر بوون. باوکی جەندەل هەڵات و پەیوەستی باوکی نەسیر بوو. نزیکەی حەفتا کەس لەدەوری کۆبوونەوە و تەنگیان بەقورەیشییەکان هەڵچنی. هەرکاروانێك بەرەو شام دەڕۆشت، رێگەیان لێدەگرت و کاروانییەکانیان دەکوشت و سامانی ئەوانیان تاڵان دەکرد.

قورەیشییەکان کەسیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و بەخزمایەتی خۆیان سوێندیاندان تا کەس نەگەڕێنێتەوە و هەرکەس لەمەککەوە پەیوەستی موسوڵمانان بوو، لەمەدینە بمێنێتەوە و لەئەماندا بێت. پێغەمبەر(د.خ) پەنای بەو حەفتا کەسە

بەخشی و ئەوان پەیوەستی موسوڵمانان بوون.

لەحەدیسی کوڕی ئیسحاق ئاماژەی پێدراوە: کاتێك سوهەیل کوڕی عەمرۆ ئاگادار بوویەوە باوکی بەسیر پیاوێ عامری کوشتووە، پشتی بەکەعبەوەدا و وتی: لێرە ناڕۆم تا خوێنبایی ئەو پیاوە بدەن.

ئەبوسوفیان وتی: سوێند بەخوا ئەمە نەزانییە، یەك لەسەر سێی خوێنبایی ئەو نادرێت.

دوای ئەوە چەند ژنێکی موسوڵمان لەمەککەوە پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) بووون و خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((یا ایها الذین آمنوا اذجائکم المؤمنات مهاجرات فامتحنوهن الله اعلم بایمانهن وان علمتوهن مومنات فلاترجعوهن الی الکفار لاهن حل لهم و لاهم یحلون لهن و آتوهم ما انفقوا و لا جناح علیکم ان تنکحوهن اذ آتیتموهن اجورهن و لا تمسکوا بعصم الکوافر.

واتاکەی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کاتێك ژنانی موهاجیر دێنە لای ئێوە، تاقییان بکەنەوە، خواوەند زیاتر ئاگای لەئیمانی ئەوان هەیە، ئەگەر وەك کەسانێکی باوەڕدار ئەوانتان ناسی، تەسلیمی کارفرەکانیان مەکەنەوە چوونکە نەئەوان بۆ کافرەکان حەڵاڵن نەکافرەکان بۆ ئەمان، هەرچی لەڕێگەی پەیوەندی هاوسەرگیری خەرجییان کردووە، بۆیان بگەڕێننەوە و بۆ مارە کردنی ئەم ژنانە، ئەگەر مارەیی ئەوان بدەن، هیچ گوناحێك لەئەستۆی ئێوەدا نییە و گرنگی بەمارەیی کافرەکان مەدەن.))

عومەر کوڕی خەتاب دوو ژنی ناباوەڕی بوو، هەردووکیانی تەڵاقدا. یەکیان بوو بەژنی معاویە کوڕی ئەبوسوفیان و ئەوی دیکەیان بوو بەژنی سەفوان کوڕی ئومەییە. پێغەمبەر(د.خ) ژنە موهاجیرەکانی نەگەڕاندەوە و فەرمووی مارەیی ئەوان بدەن.

لەحەدیسەکەی کوڕی ئیسحاق ئاماژەی پێدراوە: لەم کاتەدا دایکی کولسوم کچی عوقەبە کوڕی ئەبی موعیت هاتە لای پێغەمبەر(د.خ). عومارە کوڕی وەلید و براکانی هاتنە مەدینە و داوایان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد بەپێی بەندەکانی پەیمانی ئاشتی حۆدەیبییە، ژنەکەیان تەسلیم بکاتەوە، بەڵام پێغەمبەر(د.خ) ئەو کارەی نەکرد چوونکە خواوەند نەیدەویست.

دەڵێت: ئەو دوو ژنەی عومەر تەڵاقیدا، یەکیان قەریبە کچی ئەبی ئومەییە کوڕی موغەیرە بوو کەمعاویە کوڕی ئەبوسوفیان لەمەککە ئەوی وەك هاوسەری خۆی

هەڵبژارد. هەردووکیان ناباوەڕ بوون. ئەوی دیکەیان دایکی کولسوم کچی عەمرۆ کوڕی جەرولی خوزاعی دایکی عوبەیدالله کوڕی عەمرۆ بوو کەباوکی جەهم کوڕی حوزافە کوڕی غانم لەمەککە ئەوی کردە هاوسەری خۆی.

واقدی دەڵێت: لەرەبیع الاخری ئەم ساڵە، پێغەمبەر(د.خ) عوکاشە کوڕی موحسنی لەگەڵ چل و کەس و لەناو ئەوان سابت کوڕی ئەقرەم و شوجاع کوڕی وەهب، بۆ غومر ڕەوانە کرد. بەخێرایی ئەسپیان غاردا بەڵام دوژمنان ئاگادار بوونەوە و هەڵاتن. عوکاشە لەسەر ئاوەکەی ئەوان دابەزی و شەڕکەرانی سوپاکەی بۆ هەموو سووچ وکەنارەکان نارد. یەکێك لەسیخوڕەکانی دوژمنیان گرت و شوێنی چوارپێکانی ئەوانی نیشاندا. دووسەد وشتریان دەستکەوت و بۆ مەدینە گەڕانەوە.

دەڵێت: هەروەها لەرەبیع الاوەلی ئەم ساڵە، پێغەمبەر(د.خ) محەممەد کوڕی موسلیمەی لەگەڵ دەکەس بۆ جەنگ ڕەوانە کرد. دوژمن بۆسەیان دانا و کاتێك محەممەد و هاوەڵانی خەوتن، لەناکاو هێرشیان کردە سەریان و هەموو هاوەڵانی محەممەد کوژران و خۆی بریندار رزگاری بوو.

واقدی دەڵێت: لەرەبیع الاخری ئەم ساڵە، پێغەمبەر(د.خ)، باوکی عوبەیدەی جەراحی لەگەڵ چل کەس بەمەبەستی شەڕ کردن بۆ زوئەلقەسە ڕەوانە فەرموو. شەوانە و بەپێ ملی ڕێگەیان گرتەبەر و گەشتنە شوێنی مەبەست. هێرشیان کردە سەر خەڵکان کە بۆ کوێستانەکان هەڵاتن. ژمارەیەك وشتر و بڕێك کاڵای دیکەیان دەستکەوت لەگەڵ پیاوێك کەدواتر باوەڕی هێنا و پێغەمبەر(د.خ) ئازادی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا زەید کوڕی حارسەی بۆ شەڕ لەجەمووم ڕەوانە کرد. زەید یەکێك لەژنەکانی مناڵەکانی مورینەی بەناوی حولەیمە گرت کەبۆ یەکێك لەشوێنەکانی سولەیم ڕێنوێنی کردن. ژمارەیەك مڕ و بزن و ئەسیریان گرت. هاوسەری حولەیمە لەناو ئەسیرەکاندا بوو، پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەحولەیمە بەخشی.

دەڵێت: لەجومادی الاوەلی ئەم ساڵە زەید کوڕی حارس بەمەبەستی شەڕ بەرەو عەیس بەرێکەوت و کاروانی باوکی عاس کوڕی رەبیعی گرت. ئەو پەنای بۆ زێنەبی کچی پێغەمبەر(د.خ) برد و زێنەب، پەنای پێبەخشی.

دەڵێت: لەجومادی الاخری ئەم ساڵە زەید کوڕی حارسەی لەگەڵ پانزە کەس بەمەبەستی شەڕ کردن لەتەرف ڕەوانە فەرموو کەهۆزی مناڵەکانی سەعلەبە لەوێ دەژیان. سارانشینەکان هەڵاتن چوونکە دەترسان لەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)

هێرش بکەنە سەر ئەوان. زیاتر لەبیست وشتری دەسکەوت. ڕۆشتن و گەڕانەوەی ئەو چوار ڕۆژی خایاند.

دەڵێت: لەجومادی الاخری ئەم ساڵە زەید کوڕی حارسە بەمەبەستی شەڕ کردن بەرەو حەسمی بەرێکەوت و هۆکارەکەی ئەوە بوو کەدەحیەی کەلبی لای قەیسەر دەگەڕایەوە. قەیسەر ماڵ و جل و بەرگی گرانبایی زۆری پێبەخشیبوو. کاتێك گەیشتە حەسمی، دەستەیەك لەخەڵکانی جەزام ئەویان تالآن کرد و هیچیان بۆ نەهێشتەوە. دەحیە پێش ئەوەی بڕواتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) زەید کوڕی حارسەی ڕەوانە کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب، جەمیلە کچی سابت کوڕی ئەبی ئەفلەحی وەك هاوسەر هەڵبژارد. لەم هاوسەر گیرییە عاسم کوڕی عومەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا. دواتر تەلآقیدا و یەزید کوڕی جاریە ئەوی کردە هاوسەری خۆی و عەبدولرەحمان کوڕی یەزید چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ئەو لەدایکەوە برای عاسم کوڕی عومەر بوو.

هەروەها لەرەجەبی ئەم ساڵە، زەید کوڕی حارسە بەمەبەستی شەڕ کردن رووی کردە وادی ئەلقورا.

لەشەعبانی ئەم ساڵە، عەبدولرەحمان کوڕی عەوف روویکردە دومەئەلجەندەل. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر خەڵکەکەی ملکەچی تۆ بوون کچی پاشاکەیان وەك هاوسەری خۆت هەڵبژێرە. کاتێك خەڵکەکەی باوەڕیان هێنا، عەبدولرەحمان تەمازور کچی ئەسبەغی کردە ژنی خۆی کە بوو بەدایکی باوکی سەلمە. باوکی ئەو، سەرکردەی و پاشای خەڵکان بوو.

دەڵێت: لەم ساڵەدا وشکەساڵی سەخت و پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی رەمەزان لەگەڵ موسوڵمانان دۆعای بارانی خوێند.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەمەبەستی جەنگ رووی کردە فەدەك.

عەبدوللە کوڕی جەعفەر دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ سەد پیاو رووی کردە فەدەك. تایەفەیەك لەمناڵەکانی سەعد کوڕی بەکر لەوێ نیشتەجێ بوون. هۆکارەکەی ئەوە بوو پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە دەستەیەك لەوان دەیانەوێت هاوکاری جوولەکەکانی خەیبەر بکەن. عەلی شەوانە ڕێگەی دەبڕی و بەڕۆژ خۆی دادەشارد. یەکێك لەسیخوڕەکانی ئەو خەڵکەی دەستگیر کرد. وتی: ئەویان بۆ خەیبەر

ڕەوانە کردووە تا پێشنیاری هاوکاری خۆی بەوان بکات و لەبری ئەمە بەرهەمەکانی خەیبەریان دەستکەوێت.

دەڵێت: سەفەری جەنگی زەید کوڕی حارسە بۆ لای دایکی قورفە لەم ساڵەدا بوو. دایکی قورفە، فاتیمە کچی ڕەبیعە کوڕی بەدری کوشت، کوژرانی ئەو بەشێوەیەکی زۆر قێزەون بوو. دوو قاچیان بەدوو وشترەوە بەستەوە و وشترەکانیان غاردا تا بوو بەدوو کەرت. ئەو پیرێکی پەککەوتە بوو.

هۆکارەکەی ئەوە بوو پێغەمبەر(د.خ) زەید کوڕی حارەسەی بۆ وادی ئەلقورا ڕەوانە کرد. زەید ڕووبەڕووی منداڵەکانی فەزارە بوویەوە و دەستەیەك لەهاوەڵانی کوژران. زەید لەناو کوژراوەکان هەڵات. وەردە کوڕی عەمرۆ یەکێك لەمنداڵەکانی سەعد لەناو کوژراوەکاندا دەبینرا. یەکێك لەمنداڵەکانی بەدر ئەوی کوشت. کاتێك زەید گەڕایەوە، نەزری کرد، لەهیچ ئافرەتێك نزیك نەکەوێتەوە تا شەڕ لەگەڵ منداڵەکانی فەزارە بکات. کاتێك برینەکەی باش بوویەوە، پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەگەڵ سوپایەك بۆ شەڕ لەگەڵ منداڵەکانی فەزارە ڕەوانە و کەسانێکی زۆریان لەوان کوشت. قەیس کوڕی موسحیری یەعمەری لەناو کوژراوەکاندا دەبینرا. دایکی قورفە و کچەکەی ئەسیر و فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد ئەویان بەدوو وشترەوە بەست و کردیان بەدوو کەرت. عەبدوللە کوڕی مەسعەدە کچەکانی دایکی قورفەی بردە لای پێغەمبەر(د.خ). کچەکەی دایکی قورفە ئەسیری سەلمە کوڕی ئەکوەع بوو. دایکی قورفە شەریفی خەڵکەکەی و عەرەبەکان وەك پەند دەیانوت: ئەگەر شەریفتر لەدایکی قورفە دەبوویت، زیاتر لەمە نەدەبوویت. پێغەمبەر(د.خ) داوای کچەکەی لەسەلمە کرد و سەلمە پێی بەخشی. پێغەمبەر(د.خ) ئەو کچەی بەحوزن کوڕی ئەبی وەهبی خاڵی خۆی بەخشی و عەبدولرەحمان کوڕی حوزن چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

گێڕانەوەیەکی دیکە سەبارەت بەم جەنگە لەسەلمە کوڕی ئەکوەع باس کراوە کەسەرکردەی موسوڵمانان ئەبوبەکری راستگۆ بوو.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ئەبوبەکری کردە سەرکردەی ئێمە و بۆ شەڕ لەگەڵ منداڵەکانی فەزارە بەرێکەوتین و کاتێك لەئاوەکەی ئەوان نزیك بووینەوە، ئەبوبەکر وتی: بخەوین وکاتێك نوێژی بەیانیمان خوێند، ئەبوبەکر فەرمانی هێرشی دەرکرد و لەسەر ئاوەکە کەسانێکی زۆرمان کوشت. من دەستەیەکم بینی لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان بەرەو کێوەکە دەڕۆشتن. تیرێکم بۆ نێوان ئەوان و کێوەکە هاویشت و کاتێك تیرەکەیان بینی، وەستا.

ئەوانم هێنایە لای ئەبوبەکر. ژنێك لەمناڵەکانی فەزارە لەناویاندا دەبینرا پێستەیەکی لەبەر کردبوو. کچەکەی هاورێیەتی دەکرد. یەکێك بوو لەجوانترین ژنانی عەرەب.

دەڵێت: گەڕاینەوە بۆ مەدینە و پێغەمبەر(د.خ) منی لەبازار بینی و فەرمووی: ئەی سەلمە، ئەم ژنە بەمن ببەخشە.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سوێند بەخوا عاشقی بووم و هێشتا دەستم لێنەداوە. پێغەمبەر(د.خ) هیچی نەوت و رۆژی دواتر منی لەبازار بینی و فەرمووی: ئەی سەلمە ئەم ژنە بەمن ببەخشە.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) هێشتا دەستم لێنەداوە و پێشکەشە بەتۆ. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ مەککە نارد و چەند ئەسیرێکی موسوڵمانی پێ ئازاد کرد.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: لەمساڵەدا کرز کوڕی جابری فێهری بەمەبەستی شەڕ رووی لەعەرنییان کرد کە لەشەوالی ساڵی شەشەمی کۆچ شوانەکەی پێغەمبەریان کوشت و وشترەکانی ئەویان فڕاند. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەگەڵ بیست کەس ڕەوانە کرد.

دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) نێردراوانی خۆی بۆ لای ئەمیر و پاشاکان ڕەوانە کرد. لەمانگی زیحەججە شەش کەسی نارد. سیانیان پێکەوە بەرێکەوتن، حاتب کوڕی ئەبی بەلتعە رووی کردە مەقوقس، شوجاع کوڕی وەهب کە بەشداری شەڕی بەدری کرد بۆ لای باوکی شیمری غەسانی، دەحیە کوڕی خەلیفەی کەلبی بەرەو دیاری قەیسەر، سەلیت کوڕی عومەری عامری بۆلای هوز کوڕی عەلی حەنەفی، عەبدوللە کوڕی حوزافەی سەهمی بۆ دەرباری خوسرەو و عەمر کوڕی ئومەییەی زەمووری بۆ لای نەجاشی نارد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەزید کوڕی حەبیبی میسری نووسراوێکی دۆزیبوویەوە کەناوی نێردراوان و پێغەمبەر(د.خ) و ئەو وتانەی لەکاتی ڕەوانە کردنیان بۆ لای پاشاکان، بەهاوەڵانی خۆی دەفەرموو، لەو نووسراوەدا تۆمار کرابوو. نووسراوەکەی بەیەکێك لەبڕواپێکراوترین پیاوانی شارەکەی خۆی بۆ کوڕی شیهابی زوهری نارد کەپشتڕاستی کردەوە. لەنووسراوەکەدا هاتبوو، پێغەمبەر(د.خ) بەرەبەیانێك بەهاوەڵانی خۆی وت: منیان وەك پێغەمبەری هەموو خەڵکانی سەرزەوی ڕەوانە کردووە، هاوشێوەی حەوارییەکانی عیسا کوڕی مریەم، دژایەتی مەکەن.

هاوەڵانی وتیان: جیاوازی ئەوان چی بوو.

فەرمووی: عیسا داوای لەحەوارییەکانی کرد پەیامە ئاسمانییەکە بڵاو بکەنەوە، دەستەیەکیان رازی و دەستەیەکیان نارازی بوون. عیسا سکاڵای بۆ لای خوا بەرز کردەوە. بەرەبەیان هەرکام لەحەوارییەکان بەزمانی ئەو خەڵکانە قسەی دەکرد کەبڕیار بوو پەیامەکەی خواوەند لەو سەرزەمینە بڵاو بکاتەوە. عیسا وتی: ئەمە فەرمانی خواوەندە و دەبێت بڕۆن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سەلیت کوڕی عەمرۆی بۆ لای هوزە کوڕی عەلی ئەمیری یەمامە نارد و عەلا حەزرەمی بۆ لای مونزەر کوڕی ساوی ئەمیری بەحرەین. عەمرۆ کوڕی عاسی بۆ لای جیفر کوڕی جەلەندا و عوبادە کوڕی جەلەندا ئەمیرەکانی عەممان نارد و حاتب کوڕی ئەبی بەلتەعەی بۆ مەقوقس بۆ لای ئەمیری ئەسکەندەرییە ڕەوانە کرد. حاتب نامەکەی پێغەمبەر(د.خ) تەسلیمی مەقوقس کرد و ئەو چوار کەنیزی پێشکەی پێغەمبەر(د.خ) کرد کەماریە دایکی ئیبراهیم یەکێک بوو لەوان. دەحیە کوڕی خەلیفەی کەلبی بۆ لای قەیسەری پاشای ڕۆم، هێرقل نارد و کاتێک نامەکەی پێغەمبەری تەسلیم کرد، سەیری کرد و دواتر خستییە ژێر ران و سمتی.

ئوبوسوفیان کوڕی حەرب دەڵێت: ئێمە خەڵکانێکی بازرگان بووین، شەڕ لەنێوان ئێمە و پێغەمبەر(د.خ) بەرپابوو. گەمارۆی خستبووە سەرئێمە و زیانی زۆرمان پێبڕا. کاتێک ئاشتی سەقامگیر بوو، من و دەستەیەک لەقورەیشییەکان بەمەبەستی بازرگانی روومان کردە شام. شوێنی بازرگانی کردنی ئێمە غەزە بوو. کاتێک گەیشتینە شوێنی مەبەست، هێرقل بەسەر فارسەکانی ئەو سەرزەمینە زاڵ و خاچی گەورەی لەوان وەرگرتبوویەوە. کاتێک لەوەرگیرانەوەی خاچەکە ئاگادار بوویەوە، بۆ سپاس کردن لەحمسەوە بەرێکەوت و رووی کردە بیت المقدس تا لەوێ نوێژ بخوێنێت. فەرشەکانیان بۆ ڕاخست و گوڵبارانیان کرد. کاتێک گەیشتە ئیلیا و نوێژی خوێند، بەتریقەکان و سەرکردەکانی ڕۆم، هاورێیەتیان دەکرد. بەرەبەیانێک خەمبار و بەردەوام سەیری ئاسمانی دەکرد.

بەتریقەکان وتیان: ئەی پاشا بەخەمبار دەتبینین.

وتی: بەڵێ، دوێنشەو خەوێکم بینی کەپاشای خەتێنە دەرکەوتووە.

وتیان: ئەی پاشا جگە لەیەهوود هیچ نەتەوەیەک خەتێنە ناکەن و ئەوانیش لەسنوری فەرمانڕەوایەتی تۆدان. دەتوانی نێردراوانی خۆت بۆ هەموو ناوچەکان ڕەوانە بکەیت تا جوولەکەکانی سنووری فەرمانڕەوایەتی تۆ کوشتار و لەم خەمە رزگارت بێت.

بەتریقەکان سەرقاڵی ئەم گفتوگۆیە بوون کەنێردراوی ئەمیری بەسری هاتە لای هێرقل و یەکێك لەعەرەبەکانی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئەمیرەکان هەواڵەکانیان بەیەك رادەگەیاند. نێردراوی ئەمیری بەسری وت: ئەی پاشا ئەم پیاوە لەعەرەبەکانە، وشتر و مەڕیان هەیە و باسی رووداوێکی سەیر دەکات کە لەسەرزەمینەکەی روویداوە، لەمبارەوە پرسیاری لێبکە.

قەیسەر بەوەرگێڕەکەی خۆی وت: لەم عەرەبە بپرسە رووداوە سەرنج راکێشەکەی سەرزەمینەکەیان چییە؟

کاتێك وەرگێڕەکە پرسی، عەرەب وتی: پیاوێك لەناو ئێمەدا دەرکەوتووە و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، دەستەیەك شوێنی کەوتوون و دەستەیەك دژی وەستاون. چەندین شەڕ لەنێوان ئەوان روویداوە و بەردەوامە.

قەیسر فەرمانیدا عەرەبە رووت بکەنەوە و بینی خەتێنە کراوە، وتی: خەوەکەی بینیم، ئەمەیە نەك ئەوەی باستان کرد، عەرەبەکە ڕەوانە بکەن با بڕوات.

دوای ئەوە بانگی سەرکردەی پاسەوانەکانی کرد و وتی: هەموو شام ژێرورووو بکە و یەکێك لەخزمەکانی ئەم پیاوە بێنەرە لای من.

ئەبوسوفیان دەڵێت: لەغەزە بوون کە لەناکاو سەرکردەی پاسەوانەکانی هێرشی کردە سەر ئێمە وتی: ئێوە خزمی ئەو پیاوە حیجازییەن؟

وتم: بەڵێ.

وتی: لەگەڵ من بۆ لای پاشا وەرن.

دەڵێت: لەگەڵیدا ڕۆشتین و کاتێك گەیشتینە لای پاشا، وتی: ئێوە لەخزمەکانی ئەم پیاوەن؟

وتمان: بەڵێ.

وتی: کامتان پەیوەندی خزمایەتی نزیکی لەگەڵ ئەودا هەیە.

وتم: منم، سوێند بەخوا هەرگیز کەسێکی نەگوونجاوی خەتێنە نەکراوی، یانی هێرقل، هاوشێوەی ئەوم نەبینیوە.

پێی وتم: وەرە پێش، منی لای خۆی دانیشاند و هاوەڵانی لەپشت سەری منەوە دانیشاند و وتی: من پرسیار لەم دەکەم، ئەگەر درۆی کرد ئاگادارم بکەنەوە.

دەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر درۆیشم دەکرد، وتەکانی منیان بەناڕاست لەقەڵەم

نەدەدا، بەلاّم من سەرکردەی خەڵکەکەم بووم و درۆ کردنم پەسەند نەکرد و زانیم ئەگەر درۆ بکەم، بەکەسانیتر دەڵێن درۆم کردووە. لەبەر ئەمە راستییەکانم هێنایە سەرزمان.

هێرقل وتی: لەم پیاوەی لەناو ئێوەدا دەرکەوتووە و بانگەشەی پێغەمبەری دەکات، ئاگادارم بکەرەوە.

دەڵێت: هەوڵمدا کارەکانی بەناگرینگ لەقەڵەم بدەم، وتم: ئەی پاشا کارەکانی ئەو لای تۆ چ گرنگییەکی هەیە، باس و خواسەکانی ئەو زۆر کەم بەهاترەوە لەوەی باسیان کردووە.

بەلاّم هێرقل گرنگی بەوتەکەم نەدا و وتی: تەنیا وەلاّمی پرسیارەکانم بدەرەوە.

وتم: هەرچی دەخوازی، بپرسە.

وتی: رەچەڵەکی ئەو لەناو ئێوەدا چۆنە.

وتم: باوەڕپێکراوە.؟

وتی: ئایا کەس لەبنەماڵەکەی تا ئێستا بانگەشەی لەو چەشنەی کردووە؟

وتم: نە.

وتی: ئایا پاشا بووە و لێیان سەندۆتەوە و بۆیە ئەم کارە دەکات تا پاشایەتییەکەی وەربگرێتەوە.

وتم: نە.

وتی: چ کەسێك شوێنکەوتەی ئەون؟

وتم: هەژاران و نەداران و گەنجە کەم تەمەنەکان و ژنان، لەپیاوە بەتەمەنەکان و شەریفەکان، کەس شوێنی نەکەوتوون.

وتی: شوێنکەوتەکانی خۆشیان دەوێت و هەمیشە لەگەڵیدان یا بێزاری لێدەبڕن و لێی جیادەبنەوە؟

وتم: تا ئێستا کەس باوەڕی نەهێناوە و دواتر لێی جیا ببێتەوە.

وتی: شەڕی نێوان ئێوە و ئەو چۆنە؟

وتم: بەردەوام لەشەڕداین، هەندێ کات ئەو سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت و هەندێ کات ئێمە.

وتی: ئایا خیانەت دەکات؟

دەڵێت: لەپرسیارەکاندا هیچ شتێك نەبوو بتوانم رەخنە لە پێغەمبەر(د.خ) بگرم، وتم: نا، بەلاّم ئێستا پەیمانی ئاشتی لەنێوان ئێمە مۆر کراوە بەلاّم لەخیانەتی ئەو دڵنیا نین.

هێرقل دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: سەبارەت بەرەچەڵەکی ئەو پرسیارم کرد و وتت باوەڕپێکراوە، خواوەند کەسێك دەکاتە پێغەمبەر(د.خ) کەرەچەڵەکی باوەڕپێکراو بێت.

پرسیم: ئایا کەس لەبنەماڵەکەی بانگەشەی لەمشێوەی کردووە تا لاسایی ئەوان بکاتەوە؟ وتت: نا.

پرسیم: ئایا پاشا بووە و لێتان سەندۆتەوە و بۆیە ئەم قسانە دەکات تا پاشایەتی وەربگرێتەوە، وتت نا.

سەبارەت بەشوێنکەوتەکانی ئەو پرسیم کەوتت هەژاران و نەداران و ژنان و گەنجە کەمتەمەنەکانن. لەهەموو سەردەمەکان، شوێنکەوتەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئەم کەسانە بوون.

پرسیم ئایا شوێنکەوتەکانی ئەویان خۆش دەوێت یا لیٚ بێزارن. وتت: تا ئێستا کەس لەوانەی باوەڕیان پێی هێناوە، لێی جیانەبوونەتەوە، شیرینی ئیمان بەمشێوەیە و کاتێك لەدڵێکدا جێگەی بوویەوە، ناڕواتەدەر.

پرسیم: ئایا خیانەت دەکات یا نە، وتت: نە. ئەگەر راستت وتبێت ئەو بەسەر وڵاتەکەیدا من سەردەکەوێت و حەز دەکەم لای ئەو بم و قاچەکانی بشۆم. برۆ.

دەڵێت: لای هێرقل هاتمەدەر و دەستم خستە سەردەست و وتی: ئەی بەندەکانی خوا، کاری کوڕی ئەبی کەبشە بەرز بۆتەوە و پاشاکانی مناڵەکانی ئەسفەر لەشام، لەدەسەڵاتەکەی خۆیان دەترسن.

نامەکەی پێغەمبەر(د.خ) کەدەحیەی کەلبی بۆ هێرقلی برد، بەمشێوە بوو:

((بسم الله الرحمان الرحیم. لە محەممەد پێغەمبەری خوا بۆ هێرقل، پاشای رۆم، سڵاو بۆ ئەو کەسەی شوێنکەوتەی رزگار بێت، بەڵام دواتر: باوەڕ بەئیسلام بێنە تا تەندروست بمێنیتەوە و دوو جار پاداشت پێبدەن و ئەگەر باوەڕ نەهێنێت، گوناحی وەرزێران لەئەستۆی تۆدایە.))

کوڕی شیهابی زوهری دەڵێت:

لەرۆژگاری عەبدولمەلیك کوڕی مەروان یەکێك لەئەسقۆفەکانی مەسیحیم بینی کە نامەکەی پێغەمبەر(د.خ) و کاری بیرمەندانەی هێرقل لەسەردەمی ئەودا بووە.

دەڵێت: کاتێك نامەکە بەدەستی هێرقل گەیشت، هەڵیگرت و لەژێر ڕان و سمتی

خۆی داینا، دواتر بۆ کەسێك کە لەرۆم دەژیا و عیبرانی دەخوێندەوە نامەی نووسی و لەکارەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئاگاداری کردەوە. وەڵامی دەستکەوت: بێ گفتوگۆ پێغەمبەرێکە ئێمە چاوەڕوانی دەکەین، باوەڕی پێبێنە و وتەکانی پشتڕاست بکەرەوە.

هێرقل فەرمانیدا بەتریقەکان لەکۆشکەکەیدا کۆببنەوە و فەرماندیدا دەرگاکان دابخەن. لەژوورێکی سەرەوە قسەی لەگەڵ کرد چوونکە لەگیانی خۆی دەترسا، وتی: ئەی رۆمییەکان، ئێوەم بۆ کارێکی چاکە کۆکردۆتەوە، نامەی ئەو پیاوە بەدەستی من گەیشتووە و پێشنیار دەکات باوەڕ بەدینەکەی بێنم، سوێند بەخوا ئەو پێغەمبەرەیە چاوەڕوانی دەکەین، پێویستە باوەڕی پێبێنین و وتەکانی پشتڕاست بکەینەوە بۆ ئەوەی دنیا و رۆژی پەسلاَنمان لەدەست نەدابێت.

بەتریقەکان یەك دەنگ هاواریان کرد و روویان کردە دەرگاکانی کۆشك تا بڕۆنەدەر. بەلاَم دەرگاکان داخرا بوون. هێرقل فەرمانیدا و ئەوانیان گەڕاندەوە چوونکە لەگیانی خۆی دەترسا، وتی: ئەی رۆمییەکان بۆیە ئەو قسانەم کرد تا بزانم ئێوە لەسەر دینەکەی خۆتان پێداگرن یا نە، ویستم بۆچوونی ئێوە سەبارەت بەم رووداوە بزانم و لەکردەوەی ئێوە شادمان بووم. بەتریقەکان سوجدەیان بۆ برد. فەرمانیدا تادەرگاکان بکەنەوە و ئەوان رۆشتن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك دەحیە کوڕی خەلیفەی کەلبی نامەی پێغەمبەری تەسلیمی هێرقل کرد، پێی وت: سوێند بەخوا دەزانم هاورێکەی تۆ پێغەمبەری نێردراوە وئەو کەسەیە چاوەڕوانی دەکەین و لەکتێبەکانی خۆمان ناوی دەبینین، بەلاَم لەڕۆمییەکان بۆ گیانی خۆم دەترسم وگەرنە باوەڕم پێدەهێنا. بڕۆ لای زەغاتێری ئەسقۆف و کارەکانی هاورێکەی خۆتی بۆ باس بکە چوونکە ئەو لەناو رۆمییەکان لەمن گەورەترە و وتەکانی کاریگەری زیاتریان هەیە، بڕۆ بزانە ئەو چی دەڵێت.

دەڵێت: دەحیە رۆشتە لای ئەسقۆفەکە و بەسەر هاتی پێغەمبەر(د.خ) و نامەکەی بۆ هێرقلی باس کرد. پێشنیاری ئیسلام و باوەڕهێنانی پێکرد. زەغاتێر وتی: سوێند بەخوا هاورێکەی تۆ پێغەمبەری نێردراوە، ئێمە بەتایبەتمەندییەکان دەیناسینەوە و ناوی ئەو لەکتێبەکانی خۆماندا دەبینین. دواتر رۆشت و جلەڕەشەکانی داکەند و جل و بەرگی سپی پۆشی، داردەستەکەی هەڵگرت و رۆشتە لای رۆمییەکان کە لەکەنیسەدا کۆببوونەوە، وتی: ئەی رۆمییەکان نامەیەك لە ئەحمەدەوە بەدەستی من گەیشتووە و پێشنیاری باوەڕهێنانمان پێدەکات، شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی

نییە و ئەحمەد بەندە و نێردراوی ئەوە. ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر و بارانی شەق و شەقەزللە بەسەریدا باری و گیانی سپارد.

کاتێك دەحیە بۆ لای هێرقل گەڕایەوە و بەسەرهاتەکەی بۆ باس کرد، وتی: پێم وتی لەرۆمییەکان بۆ گیانی خۆم دەترسم، زەغاتێر لای ئەوان گەورەتر و وتەکانی کاریگەرتر بوون.

خالید کوڕی یەسار دەڵێت: کاتێك هێرقل مەبەستی ئەوەی کرد لەسەرزەمینی شامەوە بەرەو قوستەنتینە بڕوات (بەهۆی ئەو هەواڵەی لە پێغەمبەری بیستبوو)، ڕۆمییەکانی کۆکردەوە و وتی: ئەی ڕۆمییەکان پێشنیاری چەند کارێك بەئێوە دەکەم، لێیان ورد ببنەوە.

وتیان: چین؟

وتی: سوێند بەخوا دەزانن ئەم پیاوە پێغەمبەری نێردراوە و ئێمە ناوی ئەو لەکتێبەکانی خۆمان دەبینین و بەتایبەتمەندییەکان دەیناسینەوە، با باوەڕی پێ بێنین بۆ ئەوەی ئەم دنیا و ئەو دنیامان لەدەست نەچێت.

وتیان: پاشایەتی ئێمە لەهەموان گەورەترە و پیاوی زۆرترمان لەبەردەستایە و دیارەکەمان سازگارترە، چۆن ببینە ژێردەستەی عەرەبەکان؟

وتی: با باجی ساڵانەی پێبدەبن و بەهۆی ئەوماڵ و سامانەی پێی دەدەین، گەورەیی ئەو لەخۆمان دوور دەخەینەوە و لەشەڕی ئەو خۆمان بەدوور دەگرین.

وتیان: ژمارەی شەڕکەرانی ئێمە لەهەمووان زیاتر و پاشایەتیمان بەهێز و دیارەکەمان تۆکمەترە، چۆن بەم ڕیسواییە ڕازی ببین و باجیان پێ بدەین، سوێند بەخوا ڕازی نابین.

وتی: با پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ببەستین و سەرزەمینی سورییەی پێبدەین بۆ ئەوەی سەرزەمینی شام بەئێمە بسپێرێت.

دەڵێت: سەرزەمینی سورییە: فەلەستین و ئەردەن و دیمەش و حیمس و ئەم لای دەربەند بوو و ئەو لای دەربەندیان بەشام ناو دەبرد.

وتیان: چۆن سەرزەمینی سورییەی پێدەدەن کە سەرگوڵی شامە، سوێند بەخوا هیچ کات ئەو کارە ناکەین.

کاتێك بەوتەکانی هێرقل ڕازی نەبوون، وتی: سوێند بەخوا دەبینین لەبەرابەر ئەو

پەنا بۆ شارەکانی خۆتان دەبەن و سەرکوت دەکرێن. سوار ئێسترەکەی بەرێکەوت تا گەیشتە دەربەند و رووی کردە سەرزەمینی شام و وەستا، وتی: سلاو لەسەرزەمینی سورییە، سلاوی ماڵئاوایی. ڕۆشت تا گەیشتە قوستەنتەنییە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) شوجاع کوڕی وەهبی بۆ لای مونزەر کوڕی حارس کوڕی ئەبی شیمر ڕەوانە فەرموو:

واقدی دەڵێت: نامەکەی بەمشێوە بوو:

((سلاو بۆ ئەو کەسەی دەبێتە شوێنکەوتەی رزگاری و باوەڕی پێدێنێت، پێشنیارت پێدەکەم باوەڕ بەخوای تاقانە بێنیت بۆ ئەوەی پاشایەتییەکەت بەردەوام و پارێزراو بێت.

کاتێك شوجاع نامەکەی بەحارسدا، وتی: کێ پاشایەتی لەمن دەستێنێت، بۆ شەڕی ئەو بەرێدەکەوم. پێغەمبەر(د.خ) کاتێك ئەمەی بیست، فەرمووی: پاشایەتییەکەی لەناو بچێت،

کوڕی ئیسحاق دەڵێت:پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری سەبارەت بەجەعفەر کوڕی ئەبی تالیب و هاورێکانی بۆ لای نەجاشی ڕەوانە فەرموو و نامەیەکی نووسی بەم ناوەرۆکە:

((بسم الله الرحمان الرحیم. لە محەممەد پێغەمبەری خوا بۆ نەجاشی ئەسحەم پاشای حەبەشە، سلاو لەتۆ، من سلاو بۆ خوای پاك و تاقانە دەنێرم و شایەتی دەدەم عیسا کوڕی مریەم ڕۆحی خوا و وشەی ئەوە کە بۆمریەمی کچی گواستەوە و بەعیسا دووگیان بوو. خواوەند عیسای لەڕۆحی خۆی ئافراند بەهەمان شێوە کەئادەمی لەڕۆحی خۆی ئافراند، پێشنیاری خواپەرەستی خوای تاقانە و بێ شەریکت پێدەکەم و داوا دەکەم ببیتە شوێنکەوتەی من و باوەڕ بەو خوایە بێنیت کەمنی ڕەوانە فەرمووە. من پێغەمبەری خوام و کوڕە مامەکەی خۆم جەعفەر و دەستەیەك لەموسوڵمانانم بۆ لای تۆ ناردووە، کاتێك هاتن ڕێزیان لێ بگرە و لەلەخۆبایی بوون بەدوور بە چوونکە پێشنیاری خواپەرەستی بەخۆت و سوپاکەت دەکەم، ئاگادارم کردنەوە و هۆشداریم پێدان، بەئامۆژگارییەکانی من رازی بە و سلاو لەو کەسەی دەبێتە شوێنکەوتەی رزگاری.))

نەجاشی لەوەلامی پێغەمبەر(د.خ) نووسی:

((بسم الله الرحمان الرحیم. بۆ محەممەد پێغەمبەری خوا لەنەجاشی پاشای حەبەشە، ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سلاو و ڕەحمەتەکانی خوا لەتۆ بێت، خوای تاقانە منی

بۆ ئیسلام ڕێنوێنی کرد. بەڵام دواتر: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، نامەکەی تۆ و فەرموودەکان سەبارەت بەعیسا بەمن گەیشت، سوێند بەخوای ئاسمان عیسا یەك وشە بەم فەرموودانە زیاد ناکات. ئێمە دینەکەی تۆمان ناسییەوە و ڕێز لەکوڕە مامەکەی تۆ و هاوڕێکانی دەگرین و شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری نێردراو و ڕاستگۆیت. من، بەیعەت لەگەڵ کوڕە مامەکەی تۆ دەبەستم و لەسەر دەستی ئەو باوەڕ بەخواوەندی جیهان دەهێنم. کوڕەکەی خۆم ئەرها بۆ لای تۆ دەنێرم چوونکە تەنیا بەسەر خۆمدا زاڵم و ئەگەر بخوازیت دێمە لای تۆ و شایەتی دەدەم کەدینەکەی تۆ ڕاستە. ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سلاوی خوا لەتۆ بێت.))

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: نەجاشی کوڕەکەی خۆی و شەست پیاوی حەبەشی بەکەشتییەك ڕەوانە کرد و کاتێك گەیشتنە ناوەڕاستی دەریا، کەشتییەکەیان نوقم و هەموویان خنکان.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) کەسی بۆ لای نەجاشی نارد تا دایکی حەبیبی کچی ئەبوسوفیان بکاتە هاوسەری ئەو و لەگەڵ موسوڵمانەکانی حەبەشە ڕەوانەیان بکاتەوە. نەجاشی کەنیزەکەی خۆی بەناوی ئەبرەهەی بۆ لای دایکی حەبیبە نارد و لەخوازبێنی کردنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگاداری کردەوە و پێی وت کەسێك وەك نوێنەری خۆی بۆ مارە برین دەستنیشان بکات. دایکی حەبیبە لەخۆشیدا خشڵەکانی خۆی بەئەبرەهە بەخشی و خالید کوڕی سەعید کوڕی عاسی وەك نوێنەری خۆی دیاری کرد.

نەجاشی لەلایەن پێغەمبەرەوە خوتبەی مارە بڕینی خوێندەوە و خالیدیش بەهەمان شێوە دایکی حەبیبەی کردە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ). نەجاشی چوارسەد دیناری مارەیی دایکی حەبیبەی بەخالید کوڕی سەعیددا و کاتێك دینارەکان بەدەستی دایکی حەبیبە گەیشت، پەنجا مسقالی بەئەبرەهە بەخشی و وتی: کاتێك خشڵەکانی خۆم بەتۆ بەخشی هیچی دیکەم لەدەستا نەبوو بەڵام ئێستا خواوەند ئەمەی بەمن بەخشی.

ئەبرەهە وتی: پاشا فەرمانی پێداوم هیچ لەتۆ وەرنەگرم و ئەوەی وەرم گرتووە، بیگەڕێنمەوە. من لێپرسراوی جل و بەرگی پاشام و باوەڕم هێناوە و داوات لێدەکەم سلاوی منی پێبگەیێنیت.

دایکی حەبیبە ڕازی بوو.

ئەبرەهە وتی: پاشا فەرمانی بەژنەکانی خۆیداوە عوود و عەنبەرت بۆ بنێرن. پێغەمبەر(د.خ) عوود و عەنبەری ژنەکانی نەجاشی لای دایکی حەبیبە دەبینی و قسەی نەدەکرد.

دایکی حەبیبە دەڵێت: سوار دوو کەشتی بووین، کەشتی ئاژۆکان لەگەڵمان بوون تا گەیشتینە جاڕ و سوار لەسەر چوارپێ ڕۆشتینە ناو مەدینە. پێغەمبەر(د.خ) بەرەو خەیبەر بەرێکەوتبوو. کەسانێك بۆ لای ئەو ڕۆشتن ومن لەمەدینە مامەوە تا پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە. ڕۆشتمە لای و سەبارەت بەنەجاشی پرسیاری لەمن کرد. من سڵاوی ئەبرەهەم پێگەیاند و ئەو، وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە. کاتێك ئەبوسوفیان ئاگادار بوویەوە پێغەمبەر(د.خ) دایکی حەبیبەی وەك هاوسەر هەڵبژاردووە، ئەم کارەی پەسەند کرد.

لەمساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) نامەی بۆ خوسرەو نووسی و بە عەبدوللە کوڕی خوزافەی سەهمی ڕەوانە کرد. ناوەڕۆکی نامەکە بەمشێوە بوو:

((بسم الله الرحمان الرحیم. لە محەممەد پێغەمبەری خوا بۆ خوسرەو، پاشای پارسەکان، سڵاو لەو کەسەی دەبێتە شوێنکەوتەی رزگاری و باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی دێنێت و شایەتی دەدات جگە لەخوای تاقانە خوایەکی دیکە بوونی نییە. من پێغەمبەری نێردراوی خوا بۆ لای هەموو جیهانییانم، باوەڕ بێنە تا تەندروست بمێنیتەوە و ئەگەر باوەڕ نەهێنیت، گوناحی ئاگرپەرستەکان لەئەستۆی تۆدایە.))

خوسرەو نامەکەی پێغەمبەری دڕاند. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پاشایەتییەکەی لەت لەت بێت.

یەزید کوڕی ئەبی حەبیب دەڵێت: خوسرەو نامەی بۆ بازان فەرمانرەوای یەمەن نووسی و فەرمانی پێدا دوو پیاوی بوێر بۆ لای ئەم پیاوە حیجازییە بنێرە تا بیهێنن بۆ لای من. بازان بابوویە کەخەتی فارسی دەنووسی و شارەزای ژمێریاری بوو، ڕەوانەی کرد لەگەڵ یەکێك لەفارسەکان بەناوی خوسرەو. نامەیەکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی تا لەگەڵ ئەوان بۆ لای خوسرەو بەرێکەوێت و بەبابوویەی وت: برۆ سەرزەمینی ئەو پیاوە و قسەی لەگەڵ بکە و لەکارەکانی ئاگادارم بکەرەوە.

نێردراوانی بازان ڕۆشتن تا گەیشتنە تاییف. کەسانێك لەقوڕەیشییەکانیان لەوێ بینی و سەبارەت بەپێغەمبەر پرسیاریان کرد. وتیان لەمەدینە و لەهاتنی ئەوان شادمان بوون و بەخۆیان وت: خوسرەو شای شاکان رووبەرووی دەبێتەوە و کۆتایی پێدێنێت.

نێردراوان ڕۆشتن تا گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، بابوویە وتی: شای شاکان، خوسرەو نامەی بۆ بازان نووسیوە و فەرمانی داوە کەسێك ڕەوانە بکات تا تۆ ببات. بازان منی نارد تا لەگەڵ من بێیت و ئەگەر بێیت نامەیەك بۆ شای شاکان دەنووسێت کەسوودی دەبێت و دەست لەتۆ هەڵدەگرێت و ئەگەر رازی نەبیت، تۆ و خەڵکەکەت کوشتار و سەرزەمینەکەت وێران دەکات.

کاتێك ئەو دوانە گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، ڕیشی خۆیان تاشیبوو و سمێڵیان دانابوو، پێغەمبەر(د.خ) ئەم کارەی پەسەند نەکرد و فەرموویی: کێ پێی وتوون ئەو کارە بکەن.؟

وتیان: پەروەردگاری ئێمە فەرمانی ئەو کارەی پێداوین، مەبەستیان خوسرەو بوو.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەلاَم پەروەردگاری من فەرمانی پێداوم ڕیش بێلمەوە و سمێڵم بتاشم.

فەرمووی: بڕۆن و بەیانی وەرنەوە.

لەئاسمانەوە هەواڵ بۆ پێغەمبەر(د.خ) هات کەخواوەند شیرویە کوڕی خوسرەوی بەسەر خوسرەودا زاڵ کردووە و لەمانگی فلاَن لەشەوی فلاَن لەفلاَن کات باوکی خۆی کوشت.

واقدی دەڵێت: شیرویە شەوی سێشەممەی دەی جومادی الاوەلی ساڵی حەوتەمی کۆچ، دوای تێپەڕینی شەش کاژێر لەشەو، باوکی خۆی کوشت.

یەزید کوڕی حەبیب دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دوو نێردراوەکەی بانگ کرد و لەم هەواڵە ئاگاداری کردنەوە.

وتیان: دەزانی چی دەڵێیت؟ ئێمە بەگوناحی بچوکتر لەمەیش لەتۆ خۆش نابین، ئەم هەواڵە بۆ پاشا دەنووسین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ بۆی بنووسن و پێی بڵێن دین و دەسەلاَتی من بەئەندازەی سنووری کەسرا فراوان دەبێت و ئەگەر باوەڕ بەئیسلام بێنیت، پاشایەتی یەمەن بەتۆ دەبەخشم و تۆ دەکەمە پاشای ئەبنە .

پێغەمبەر(د.خ) پشتێنێکی لەزێر و زیو لەلایەن پاشاکانەوە وەك دیاری بۆ هاتبوو، دای بەخوسرەو و نێردراوان گەڕانەوە بۆ لای بازان و ڕووداوەکانیان بۆ باس کرد.

بازان وتی: ئەمە وتەی پاشا نییە، بەگومانی ئەو پێغەمبەرە، دەبێت چاوڕێ بین،

ئەگەر وتەكانی راست بێت، وتەی پێغەمبەری نێردراوە. و ئەگەر راست نەبێت ئەو كات بەشێوەیەكی دیكە مامڵەی لەگەڵ دەكەین.

زۆری نەخایاند نامەی شیرویە بەبازان گەیشت: من خوسرەوم كوشت لەبەر ئەوەی زۆر لەگەورەكانی فارسی كوشت و كەسانێكی زۆری لەسنورەكان زیندانی كردبوو. كاتێك نامەكەی من بەدەستی تۆ دەكات، فەرمانبەری خەڵكانی سنوورەكەی خۆت بۆ من دەستەبەر بكە و سەبارەت بەو پیاوەی خوسرەو نامەی نووسیبوو، هیچ كارێك مەكە تا فەرمانەكانی من بەتۆ دەگات.

كاتێك نامەی شیرویە بەبازان گەیشت، وتی: ئەم پیاوە پێغەمبەرە. باوەڕی هێنا و هەموو دانیشتووانی فارسی یەمەن لەگەڵ ئەو باوەڕیان هێنا. حەمیرییەكان خەر خوسرەویان بەزوئەلموعجیزە ناو دەبرد بەو هۆی ئەو پشتێنەی پێغەمبەر(د.خ) پێی بەخشیبوو. پشتێن لەزمانی حەمیر بەموعجیزە ناو دەبرا.

بابویە بەبازانی وت: هەرگیز لەگەڵ پیاوێكی خاوەن شكۆتر لەو پیاوە قسەم نەكردووە.

بازان وتی: پاسەوانی بوو؟

وتی: نە.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەقوقس گەورەی قبتییەكان نامەی نووسی تا باوەڕ بەئیسلام بێنێت بەڵام باوەڕی نەهێنا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: كاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەغەزای حۆدەیبییە گەڕایەوە مەدینە، زیحەججە و بەشێك لەموحەرەمی لەو شارە بەسەر برد. لەو ساڵەدا ناباوەڕان كاروبارەكانی حەجیا لەئەستۆدا بوو.

## گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی حەوتەمی کۆچی و شەڕی خەیبەر

ساڵی حەوتەمی کۆچ دەستی پێکرد. پێغەمبەر(د.خ) لەکۆتاییەکانی مانگی موحەرەم بەرەو خەیبەر بەرێکەوت و سەباع کوڕی عەرفتەی غەفاری وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد. لەگەڵ سوپاکەی خۆی ڕۆشت و لەدۆڵی ڕەجیع دابەزی. ئەم دۆڵە لەنێوان خەیبەر و غەتەفاندایە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەوێ دابەزی تا لەنێوان خەڵکانی خەیبەر و غەتەفان جیایی دورست بکات بۆ ئەوەی غەتەفانییەکان نەتوانن دژی پێغەمبەر(د.خ) هاوکاری خەڵکانی خەیبەر بکەن. کاتێك غەتەفانییەکان لەهاتنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوونەوە، کۆبوونەوە تا هاوکاری جوولەکەکان بکەن و کاتێك بەرێکەوتن بۆ کار و سامان و ژن و منداڵەکانی خۆیان نیگەران بوون و گومانیان کرد موسوڵمانان هێرشیان کردۆتە سەر سەرزەمینەکەی ئەوان. گەڕانەوە و لەشوێنەکانی خۆیان جێگیر بوون و بەمشێوەیە هاوکاری خەڵکانی خەیبەریان نەکرد.

پێغەمبەر(د.خ) یەك یەك قەڵاکانی گرت. یەکەم قەڵا ناعم بوو کەمەحمود کوڕی موسلیمە بەهۆی ئەو بەرداشەی بەسەریدا خستیانە خوار، لەوێ کوژرا. دوای ئەو قەموس، قەڵای کوڕی ئەبی حەقیق دەستی بەسەردا گیرا.

پێغەمبەر(د.خ) ژمارەیەکی زۆری لەخەڵکانی خەیبەر ئەسیر کرد. سەفییە کچی حەیی کوڕی ئەختەب ژنی کەنانە کوڕی ڕەبیع کوڕی ئەبی حەقیق و دوو کچە مامەکەی لەناو ئەسیرەکاندا دەبینران. پێغەمبەر(د.خ) سەفییەی بۆ خۆی هەڵبژارد.

دەحیەی کەلبی داوای سەفییەی کرد و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ خۆی هەڵبژارد، کچە مامەکەی سەفییەی بەدەحیە بەخشی.

پێغەمبەر(د.خ) دەستی بەسەر قەڵاکانی دیکەیشدا گرت.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: منداڵەکانی سەهم کەتایەفەیەك لەئەسلەم بوون، هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتیان: سوێند بەخوا گرفتارییەکانی سەرشامان زیادی کردووە و هیچمان نییە. پێغەمبەر(د.خ) هیچی نەبوو پێیان ببەخشێت، دۆعای کرد و فەرمووی: خواوەندا حاڵی ئەوان دەزانیت و ئاگاداریت هیچم نییە پێیان ببەخشم، گەورەترین قەڵای خەیبەر کەلێوان لێوە لەڕۆن و دانەوێڵە بۆ ئەوان دابنێ.

ڕۆژی دواتر قەلآی سەعب دەستی بەسەردا گیرا. هیچ کام لەقەلآکان بەئەندازەی ئەم قەلآیە ڕۆن و خواردنی تیا نەبوو.

جوولەکەکان پەنایان بۆ قەلآی وەتیح و سەلالم برد کەدوای هەموو قەلآکانی خەیبەر دەستی بەسەردا گیرا و بۆ ماوەی دە و چەند ڕۆژێك گەمارۆی لەسەر بوو.

جابر کوڕی عەبدوللەی ئەنساری دەڵێت: مەرحەبی جوولەکە لەقەلآی وەتیح هاتەدەر، هۆنراوەی دەخوێند و داوای شەڕکەری کرد، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کێ ڕووبەرووی دەبێتەوە.

محەممەد کوڕی موسلیمە هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) من دروٚم تا تۆڵە بستێنمەوە چوونکە دوێنێکە براکەمیان کوشت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڕۆ. دۆعای بۆ کرد و فەرمووی: خواوەندا دژی دوژمنەکەی هاوکاری بکە. محەممەد کوڕی موسلیمە دوای شەڕێکی کەم مەرحەبی کوشت. دوای ئەو یاسری برای هات، شێعری خوێندەوە و داوای شەڕکەری کرد. زوبەیر کوڕی عەوام ڕووبەرووی بوویەوە. دایکی، سەفییە کچی عەبدولموتەلیب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کوڕەکەم دەکوژێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەخواستی خوا کوڕەکەی تۆ ئەو دەکوژێت. زوبەیر بەدەم هۆنراوە خوێندنەوە ڕۆشت و یاسری کوشت.

بوریدەی ئەسلەمی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لای قەلآی خەیبەرییەکان دابەزی، ئالآکەی بەعومەر کوڕی خەتابدا. شەڕکەران لەگەڵ عومەر بەرێکەوتن و ڕووبەرووی جوولەکەکان بوونەوە. عومەر و هاوەڵانی پاشەکشێیان کرد و گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ). هاوەڵانی عومەریان بەترسەنۆك ناو دەبرد و عومەریش ئەوان. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەیانی ئالآکە بەکەسێك دەسپێرم کەخواوەندی خۆش دەوێت و خوا و پێغەمبەر(د.خ) ئەویان خۆش دەوێت.

بۆ ڕۆژی دواتر ئەبوبەکر و عومەر ویستیان ئالآکە هەڵبگرن، بەلآم پێغەمبەر(د.خ) عەلی بانگ کرد. عەلی چاوی ئازار بوو. پێغەمبەر(د.خ) تفی کردە چاوی و ئالآکەی بەو سپارد. شەڕکەران لەگەڵ ئەو ڕۆشتن و ڕووبەرووی جوولەکەکان بوونەوە. مەرحەب بەدەم هۆنراوە خوێندنەوەو هات. عەلی و مەرحەب شمشێریان ئاڵوگۆڕ کرد و سەرئەنجام عەلی زەربەیەکی لەسەریدا و شمشێر بەدیانەکانی گەیشت. شەڕکەران دەنگی ئەوانیان بیست و هێشتا کۆتایی سوپای موسوڵمانان نەگەشتبوون کەسەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

بوریدە دەڵێت: هەندێ کات پێغەمبەر(د.خ) ژانەسەری دەگرت و یەك یا دوو ڕۆژ نەدەهاتەدەر. کاتێك لەخەیبەر دابەزی، ژانەسەری گرت و نەهاتەدەر. ئەبوبەکر ئاڵای پێغەمبەری هەڵگرت و ڕۆشت. شەڕێکی قورسی کرد و گەڕایەوە. عومەر ئاڵاکەی هەڵگرت و ڕۆشت. شەڕی کرد و گەڕایەوە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە، فەرمووی: سوێند بەخوا بەیانی ئاڵاکە بەکەسێك دەسپێرم خواو پێغەمبەری خۆش دەوێت و خواو پێغەمبەر(د.خ) ئەویان خۆش دەوێت و حەزدەکەن دەست بەسەر قەڵاکاندا بگرێت.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەوێ نەبوو. قورەیشییەکان ئارەزووی وەرگرتنی ئاڵاکەیان دەکرد. بەرەبەیان عەلی بەوشترەکەی خۆی هات و لەنزیك خێوەتی پێغەمبەر(د.خ) وشترەکەی خەواند. چاوی ئێشا، هەردوو چاوی بەپەڕۆیەك بەستبوو. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چیت بەسەر هاتووە؟

وتی: چاوم دێشێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وەرە پێش. کاتێك نزیك کەوتەوە، تفی دەمی کردە سەرچاوی و ئازارەکەی نەما. ئاڵاکەی بەو سپارد. عەلی حیلەیەکی ئەرخەوانی لەبەردا بوو. ئاڵا بەدەست بەرێکەوت تا لەشاری خەیبەر نزیك کەوتەوە. مەرحەب خاوەنی قەڵاکە هات و خودەیەکی یەمەنی لەسەردا بوو. شێعری دەخوێند.

عەلی لەوەڵامی ئەو هۆنراوەیەکی خوێندەوە و شەڕیان دەستپێکرد. عەلی زەربەیەکی لێدا و خودەکەی مەرحەبی شکاند و شمشێر گەیشتە ناو دیانەکانی.

باوکی رافیع کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) عەلی بەئاڵاکەوە ڕەوانە کرد، لەگەڵی بەرێکەوتین و کاتێك لەقەڵاکە نزیك کەوتەوە، خەڵکان رووبەرووی بوونەوە. عەلی شەڕی لەگەڵ کردن و شمشێری لەیەکێك لەجوولەکەکان دا و سەری پەڕاند. یەکێك لەدەرگاکانی قەڵاکەی هەڵگرت و کردی بەقەڵغانی خۆی و بەیەك دەست شەڕی دەکرد تا دەستی بەسەر قەڵاکەدا گرت. دواتر دەرگاکەی فرێدا. من و حەوت کەسی دیکە ویستمان دەرگاکە بەرز بکەینەوە بەڵام نەمانتوانی.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) دەستی بەسەر قەموس قەڵاکەی کوڕی ئەبی حەقیقدا گرت، سەفییە کچی حەیی کوڕی ئەختەبیان لەگەڵ ژنێکی دیکە بردە لای. بیلال ئەوانی لای کوژراوەکانی جوولەکەوە برد. ژنەکەی هاوڕێی سەفییە دەیقیژاند و لەروخساری خۆی دەدا و خۆڵی دەکرد بەسەری خۆیدا. کاتێك

پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بینی، فەرمووی: ئەم شەیتانە لەمن دوور بکەنەوە. فەرمووی سەفییەیان لەپشت سەری ئەو جێگە کردەوە و عاباکەی خۆی پیادا. موسوڵمانان زانییان پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

پێغەمبەر(د.خ) کەکردەوەی ژنە جوولەکەکەی بینی، بەبیلالی فەرموو: مەگەر بەزەییت نییە وا ئەو دوو ژنەت لەناو کوژراوەکانەوە هێنا؟

سەفییە بووکی کەنانە کوڕی حەقیق لەخەودا بینیبووی کەمانگێك کەوتە لای، خەوەکەی بۆ هاوسەرەکەی خۆی باس کرد و ئەو وتی: ئەم خەوە نیشانی دەدات ئارەزووی محەممەد پاشای حیجازت لەسەر دایە. شەقەزللەیەکی لەروخساریدا و شین و مۆری کرد. کاتێك ئەویان بردە لای پێغەمبەر(د.خ)، شوێنەوارەکەی دیار بوو. کاتێك لەمبارەوە پرسیاری کرد، سەفییە بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کەنانە کوڕی رەبیع کوڕی ئەبی حەقیقیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) کەگەنجی منداڵەکانی نەزیر لای ئەو بوو. پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەشوێنی گەنجەکە پرسیاری کرد و کەنانە راستی نەوت. دواتر یەکێك لەجوولەکەکانیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ)، وتی: ئەمڕۆ کەنانەم بینی بەدەوری فلاَن کەلاوەدا دەسووڕایەوە.

پێغەمبەر(د.خ) بەکەنانەی وت: ئەگەر گەنجەکە لای تۆ بێت، بتکوژم؟

کەنانە وتی: بەڵێ.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا و کەلاوەکەیان وێران و سەرەوژێر کرد و بەشێك لەگەنجەکەیان دۆزییەوە. پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەپاشماوەی گەنجەکە پرسی و کەنانە رازی نەبوو راستییەکان بدرکێنێت. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی تەسلیمی زوبەیر کوڕی عەوام کرد و فەرمووی: ئەشکەنجەی بکە تا راستییەکان بدرکێنێت. زوبەیر بەرادەیەك بەمشت کێشای بەسەر سنگیدا کە لەمردن نزیك بوویەوە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی تەسلیمی محەممەد کوڕی موسلیمە کرد تا لەتۆڵەی خوێنی براکەی بیکوژێت.

پێغەمبەر(د.خ) گەمارۆی خستە سەر جوولەکەکانی وەتیح و سەلالم و کاتێك لە لەناچوونی خۆیان دڵنیا بوون، داوایان لێکرد لەدیارەکەی خۆیان دەریانبکات بەلاَم نەیانکوژێت. پێغەمبەر(د.خ) رازی بوو.

پێغەمبەر(د.خ) هەموو ماڵ و سامانی شەق و نەتات و کەتیبە و هەموو قەلاَکانی گرتبوو. تەنیا ئەو دوو قەلاَیە مابوونەوە. کاتێك جوولەکەکانی فەدەك لەم رووداوە ئاگادار بوونەوە، کەسیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد تا ئەوانیش لەسەرزەمینەکەیان

دوور بخاتەوە بەڵام خوێنیان نەرێژێت. پێغەمبەر(د.خ) رازی بوو.

یەکێك لەو کەسانە بۆ ئەم گفتوگۆیە لەنێوان پێغەمبەر(د.خ) و جوولەکەکان هاتوچۆی دەکرد، موحەیسە کوڕی مەسعود بوو.

کاتێك خەڵکانی خەیبەر بەپێی ئەم بڕیارە تەسلیم بوون، داوایان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد لەسەر زەوییەکانی خۆیان کار بکەن و نیوەی داهاتەکەیان بەموسوڵمانان ببەخشن و وتیان: ئێمە باشتر لەئێوە توانای ئاوەدان کردنەوەی زەوییەکانمان هەیە. پێغەمبەر(د.خ) بەم بڕیارە رازی بوو و فەرمووی: بەو مەرجەی هەر کاتێك ویستمان، بتوانین دەرتان بکەین.

سەبارەت بەخەڵکانی فەدەکیش ئەم بڕیارە درا، خەیبەر تاڵانی موسوڵمانەکان بوو بەڵام فەدەك تایبەت کرا بە پێغەمبەر(د.خ) چوونکە سوپا و شەڕکەرانی موسوڵمان نەڕۆشتنە ئەو سەرزەمینە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) جێگیر بوو، زێنەب کچی حارس ژنی سەلام کوڕی مەشکەم، بەرخێکی پێشکەش کرد. پێشتر پرسیاری کردبوو پێغەمبەر(د.خ) گۆشتی کام یەك لەئەندامانی زیاتر حەز لێیە؟ وتبوویان: شانەکانی. ئەو ژنە زیاتر ژەهراوی کرد. بەرخەکە ژەهراوی بوو. کاتێك هێنای و لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ) داینا، پێغەمبەر(د.خ) شانەکەی هەڵگرت و گازێکی لێدا بەڵام پێی خۆش نەبوو. لەو کاتەدا بیشر کوڕی بەرا کوڕی مەعرور لای پێغەمبەر(د.خ) و بەشێك لەگۆشتەکەی هەڵگرتبوو. ئەو بەلایەوە خۆش بوو. پێغەمبەر(د.خ) گۆشتەکەی فڕێدا و فەرمووی: ئەم ئێسقانە دەڵێت ژەهراوی کراوە.

ژنە جوولەکەکەی بانگ کرد و فەرمووی: بۆ ئەو کارەت کرد؟

وتی: بەڵایەکت بەسەر خەڵکەکەم هێنا کەئاگاداری لێی. بەخۆمم وت ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) بێت، ئاگادار دەکرێتەوە و ئەگەر پاشا بێت، لەدەستی رزگارمان دەبێت. پێغەمبەر(د.خ) لێی خۆش بوو.

بیشر کوڕی بەرا کەگۆشتە ژەهراوییەکەی خوارد، گیانی سپارد.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەنەخۆشی مەرگی خۆیدا، کاتێك دایکی بیشر کوڕی بەرا سەردانی کرد، فەرمووی: ئەی دایکی بیشر، هەنووکە دەبینم دەماری پشتم لەو پارووەی لەخەیبەر لەگەڵ کوڕەکەی تۆ خواردم، پچڕاوە.

دەڵێن: موسوڵمانان دەیانوت: جگە لەوەی کە پێغەمبەر(د.خ) بوو، وەك شەهید

کۆچی دوایی کرد.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخەیبەر تەواو بوو، رووی کردە وادی ئەلقورا و گەمارۆی خستە سەر خەڵکەکەی. دواتر بۆ مەدینە گەڕایەوە.

## گێڕانەوەی غەزای وادی ئەلقورا

ئەبو هورەیرە دەڵێت: کاتێك لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) لەخەیبەرەوە بەرەو وادی ئەلقورا بەرێکەوتین، نزیك ئاوا بوونی هەتاو، گەیشتینە ئەو سەرزەمینە. پێغەمبەر(د.خ) کۆیلەیەکەی لەگەڵدا بوو کە ریفاعە کوڕی زەیدی جوزامی پێی بەخشیبوو. ئێمە سەرقاڵی داگرتنی کەل و پەلەکانمان بووین کەتیرێکی نەناسراو بەر کۆیلەکەی پێغەمبەر(د.خ) کەوت و گیانی سپارد. وتمان: بەهەشت جێگەی ئەو بێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نا، ئێستا لەئاگری جەهەننەم دەسووتێت بەهۆی ئەوەی لەشەڕی خەیبەر خیانەتی لەتالأنی موسوڵمانان کرد.

یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) کاتێك ئەم قسەی بیست، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، منیش دووبەندم بۆ پێپۆشەکانی خۆم هەڵگرتووە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هاوشێوەی ئەوە ئاگر بۆ تۆ ئامادە دەکەن.

لەم سەفەرەدا پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی نوێژی بەیانییان نەخوێند تا ئەو کاتەی هەتاو هەڵهات.

سەعید کوڕی موسەییب دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخەیبەر دەگەڕایەوە، کۆتاییەکانی شەو فەرمووی: کێ ئاگای لەبەرەبەیان دەبێت بۆ ئەوەی نوێژی بەیانیمان نەفەوتێت؟

بیلال وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من.

پێغەمبەر(د.خ) دابەزی و خەڵکان بارەکانیان کردەوە و خەوتن. بیلال سەرقاڵی نوێژ خوێندن بوو و ماوەیەکی بەنوێژ بەسەر برد. دواتر پاڵی بەبارەکەی خۆیەوە دا و چاوی بڕییە ئاسۆ و چاوەڕوانی بەرەبەیانی دەکرد. خەو چاوەکانی ئەو بردەوە و پێغەمبەر (د.خ) و موسوڵمانان بەگەرمای نیمەڕۆ ئاگایان بوویەوە. پێغەمبەر(د.خ) یەکەم کەس بوو لەخەو هەستا و فەرمووی: بیلال چیت لەگەڵ ئێمە کرد؟

بیلال وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، منیش هاوشێوەی تۆ خەوم لێکەوت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: راستت وت؟

پێغەمبەر(د.خ) کەمێك ڕۆشت و دابەزی و دەستنوێژی گرت. خەڵکانیش دەستنوێژیان گرت. فەرمانی بەبیلالدا و بانگی فەرموو. لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند و

کاتێك سڵاوی دایەوە، رووی کردە موسوڵمانان و فەرمووی: هەرکاتێك نوێژێکتان فەوتان بیرتان بێت بیگێڕنەوە چوونکە خواوەند دەفەرمێت، نوێژ بۆ بیرهێنانەوەی من بخوێنن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: گرتنی خەیبەر لەمانگی سەفەر روویدا وچەند ژنێکی موسوڵمان لەم شەڕەدا هاورێی موسوڵمانانیان کرد. پێغەمبەر(د.خ) لەتالآنییەکان بەشی دان بەلآم وەك بەش حسێبی بۆ نەکردن.

دەڵێت: کاتێك خەیبەر دەستی بەسەردا گیرا، حەجاج کوڕی عیلاتی سولەمی بە پێغەمبەری وت: لەمەککە لای هاوسەرەکەم دایکی شەیبە، کچی ئەبی تەڵحە، سامانێکم هەیە. کوڕەکەیشم لای ئەوە، بڕێك سامانم لای بازرگانەکانی مەککەیە، مۆڵەتی ڕۆشتنم پێبدە. پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتی پێدا. حەجاج وتی: ناچارم قسەی ناڕەوا بێنمە سەرزمان.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو کارە بکە.

حەجاج دەڵێت: بەرەو مەککە بەرێکەوتم و کاتێك گەیشتمە سەنییەت ئەلبەیزا، کەسانێك لەقوڕەیشییەکانم بینی کە بۆ بەدەست هێنانی دەنگ و باسەکان هاتبوون. سەبارەت بەکارەکانی پێغەمبەر(د.خ) پرسیاریان کرد چوونکە بیستبوویان هێرشی کردۆتە سەرخەیبەر و دەیانزانی خەیبەر بۆ بەهێزی و تۆکمەیی، ناوەندی حیجازە. نەیاندەزانی باوەڕم بەئیسلام هێناوە. کاتێك منیان بینی، وتیان: حەجاج کوڕی عیلات هات و هەواڵەکان لای ئەوە. ئێمە لەکارەکانی محەممەد ئاگادار بکەرەوە چوونکە بیستوومانە هێرشی کردۆتە سەر خەیبەر کەدیار و سەرزەمینی جوولەکە و حیجازە.

وتم: منیش ئاگادار بوومەوە و هەواڵی خۆشم پێیە.

کاتێك لەدەوری وشترەکەم کۆبوونەوە، وتم: بەشێوەیەك شکستیان خوارد کەهەرگیز هاوشێوەی نابیستن. ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان کوژران. محەممەد ئەسیر کرا بەلآم وتیان نایکوژین و ڕەوانەی مەککەی دەکەین تا بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی قوڕەیشییەکان بیکوژن.

دەڵێت: لەناو مەککەدا بلآویان کردەوە و وتیان: هەواڵی خۆشمان بۆ هات و دەبێت چاوەڕوانی محەممەد بین تا بیهێنن و لێرە بیکوژین.

وتم: هاوکاریم بکەن تا سامانەکەی خۆم کۆبکەمەوە چوونکە دەمەوێت بەرەو خەیبەر بڕۆم و زیاتر لەبازرگانەکانی دیکە لەسامانی محەممەد وموسوڵمانان شتم دەستکەوێت.

دەڵێت: قورەیشییەکان بەخێراییەکەی چاوەڕوان نەکراو، سامانی منیان کۆکردەوە.
دواتر ڕۆشتمە لای هاوسەرەکەم و وتم: سامانەکەم بۆ بگەڕێنەرەوە چوونکە دەڕۆمە خەیبەر تا زیاتر لەبازرگانەکانی دیکە کەل وپەلْ بکڕم.

کاتێك عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب ئەم هەواڵەی بیست، هات و لای من وەستا- من لەخێوەتی یەکێك لەبازرگانەکان بووم- وتی: ئەم هەواڵە چییە بلاوت کردۆتەوە؟

وتم: ئایا نهێنییەکەی من دەشاریتەوە؟

وتی: بەڵێ.

وتم: چاوەڕێ بە تا لەکاتێکی دیکەدا بێمە لای تۆ. ئێستا سەرقاڵ کۆکردنەوەی سامانەکەی خۆمم.

عەباس ڕۆشت و کاتێك لەکۆکردنەوەی سامانەکەم لەمەککە تەواو بووم، مەبەستی ڕۆشتنم کرد، عەباسم بینی و وتم: ئەی باوکی فەزل، تا سێ ڕۆژ باسی وتەکانی من مەکە چوونکە دەترسم شوێنم کەون. دوای ئەوە راستییەکان باس بکە.

وتی: ئەو کارە دەکەم.

وتم: سوێند بەخوا برازاکەی تۆ کچی پاشای خەیبەر یانی سەفییە کچی حەیی کوڕی ئەختەبی کردە هاوسەری خۆی و دەستی بەسەر خەیبەردا گرت و هەموو سامانی ئەو شارە بەخۆی و موسوڵمانەکان بڕا.

وتی: حەجاج چی دەڵێیت؟

وتم: سوێند بەخوا ئەوە راستییە، من باوەڕم هێناوە و هاتووم سامانەکەی خۆم کۆبکەمەوە چوونکە دەترسام بفەوتێت، دوای سێ ڕۆژ راستییەکان ئاشکرا بکە. محەممەد بەو شێوەیە کەدەخوازێت.

دەڵێت: لەرۆژی سێیەم عەباس جل و بەرگی جوانی لەبەر کرد، بۆنی لەخۆیدا و داردەستەکەی هەڵگرت و رووی کرد کەعبە و بەدەوریدا سووڕایەوە.

قورەیشییەکان وتیان: بەراستی دەبێت بەمشێوەیە بۆ بەلاّکان خۆڕاگر بین.

وتی: نا، سوێند بەو خوایەی سوێندی پێدەخۆن، محەممەد دەستی بەسەر خەیبەردا گرت و کچی پاشاکەیانی کردە هاوسەری خۆی و سامانەکانی وەك تالأنی کۆکردەوە و بەخۆی و موسوڵمانان بڕا.

وتیان: کێ ئەم هەواڵەی بۆ تۆ هێنا؟

وتی: ئەو کەسەی هەواڵەکەی بۆ ئێوە هێنا. ئەو باوەڕی بە محەممەد هێناوە و هات سامانەکەی خۆی کۆبکاتەوە و ڕۆشت تا پەیوەستی موسوڵمانان بێت.

وتیان: ئەی هاوار، دوژمنی خوا هەڵات، ئەگەر دەمانزانی بەشێوەیەکی دیکە لەگەڵی دەجووڵاینەوە.

زۆری نەخایاند هەواڵی ڕاست لەناو قورەیشییەکان بڵاو بوویەوە.

عەبدوڵلە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: سامانی قەڵای شەق و نەتات و کەتیبە دابەش کرا. شەق و نەتات بەر موسوڵمانەکان کەوت و کەتیبە یەك پێنجی بۆ خوا و یەك پێنجی بۆ پێغەمبەر(د.خ) و بەشی خزمان و هەتیوەکان و هاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ). ئەو کەسانەی بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی فەدەك هاتوچۆیان کرد، یەکیان موحەیسە کوڕی مەسعود بوو کە پێغەمبەر(د.خ) سی بار جۆ و سی بار خورمای پێبەخشی.

هەموو ئەو کەسانەی بەشداری حۆدەیبییەیان کرد ئەگەر لەخەیبەریش ئامادە نەبوون، لەسامانی ئەویٚ بەشی غایبیان وەرگرت جگە لەجابر کوڕی عەبدوڵلە ئەنساری کەئامادە بوو و پێغەمبەر(د.خ) هاوشێوەی کەسانی دیکە بەشی بۆ دیاریکرد.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخەیبەر تەواو و دانیشتووانی فەدەك لەبەسەرهاتی خەیبەرییەکان ئاگادار بوونەوە، خواوەند دڵی لێوانلێو کردن لەترس. کەسیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد تا ئاشتی لەگەڵ بکەن و نیوەی بەرهەمی فەدەکی پێبسپێرن. نێردراوانی ئەوان لەخەیبەر یا لەڕێگەی مەدینە گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) ڕازی بوو. فەدەك تایبەت بوو بە پێغەمبەر(د.خ) چوونکە سوپا و شەڕکەرانی موسوڵمان نەڕۆشتنە ئەو سەرزەمینە.

عەبدوڵلە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) عەبدوڵلە کوڕی ڕەواحەی بۆ لای دانیشتووانی خەیبەر دەنارد و بڕی داهاتەکەی دەخەملاند.

جوولەکەکان وتیان: زوڵمت لەئێمە کرد.

عەبدوڵلە دەیوت: ئەگەر دەخوازن هەڵیگرن و بەشی ئێمە بدەن، وەگەرنە ئێمە هەڵیدەگرین و بەشی ئێوە دەدەین.

جوولەکان وتیان: ئاسمان و زەوی لەسەر ئەمشێوەیە دەسووڕێت.

دەڵێت: کاتێك عەبدوڵلە کوڕی ڕەواحە لەموتە کوژرا، جەبار کوڕی سەخر بۆ خەملاندنی بەرهەمەکان دەڕۆشت. موسوڵمانەکان هیچ شتێکی نەگونجاویان لەکردەوەکانی ئەواندا نەبینی تا ئەو کاتەی عەبدوڵلە کوڕی سەهلیان کوشت و پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان بەدگومان بوون.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەزوهریم پرسی: پێغەمبەر(د.خ) چۆن دارستانی خورمای

خەیبەری بەجوولەکەکان سپارد، ئایا ئەمە بڕیار بوو یا بەپێی پێویست و بەشێوەیەکی کاتی؟

وتی: خەیبەر بەشەڕ دەستی بەسەردا گیرا و خواوەند وەك تالآنی پێغەمبەر(د.خ) هەژماری کرد. پێنج یەکی هەڵگرت و پاشماوەکەی لەناو موسوڵمانان دابەش کرد. خەڵکەکەی بەدوورخرانەوە لەسەرزەمینەکەیان رازی بوون. پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرموون: ئەگەر بخوازن ئەم زەوی و زارە بەئێوە دەسپێرم تا کاری لەسەر بکەن و بەرهەمەکەی لەنێوان ئێمە و ئێوە دابەش بکرێت و تا ئەو کاتەی خواوەند دەخوازێت، لێرە بمێننەوە.

جوولەکەکان بەمە رازی بوون و بەمپێیە کاریان دەکرد. پێغەمبەر(د.خ) عەبدوللە کوڕی رەواحەی دەنارد و بەرهەم و داهاتی زەوی دابەش دەکرد و بۆ دابەش کردن دادپەروەری دەکردە پیشە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، ئەبوبەکر زەوییەکانی لەدەستی ئەواندا هێشتەوە و هاوشێوەی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەوان بەردەوام بوو تا کاتی مردن.

عومەر کوڕی خەتاب لەسەرەتای خەلافەتی خۆی، درێژەی بەکارەکەی ئەواندا. دواتر بیستی پێغەمبەر(د.خ) لەنەخۆشی مەرگی خۆی فەرموویەتی لەدوورگەی عەرەب دوو دین پێکەوە هەڵناکەن. لەمبارەوە پرسیاری کرد و راستییەکەی بۆ دەرکەوت. کەسی بۆلای جوولەکەکان نارد و وتی خواوەند رێگەی پێداوین ئێوە لەسەرزەمینەکەتان دوور بخەینەوە چوونکە بیستوومە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: لەدوورگەی عەرەب دوو دین پێکەوە هەڵناکەن. هەرکەس لەئێوە لەلایەن پێغەمبەرەوە پەیمانێکی پێدراوە، بیهێنێت تا جێبەجێی بکەم و هەرکەس نییەتی، بۆ ڕۆشتن خۆی ئامادە بکات. جوولەکەکانی دەرکرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: دوای خەیبەر پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە گەڕایەوە.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا و لەمانگی موحەرەم پێغەمبەر(د.خ) زێنەبی کچی خۆی کردە هاوسەری ئەبی عاس کوڕی رەبیع.

دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا حاتب کوڕی ئەبی بەلتەعە لای مەقوقسی گەوری ڕۆمەوە هات و ماریە و خوشکەکەی سیرین و دلدل و یەعفور، ئەسپ و کەرەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ جل و بەرگە گرانباییەکان هێنا. کۆیلەیەکیش لەگەڵ دوو خوشکەکەدا بوو. حاتب پێش ئەوەی بگاتە مەدینە پێشنیاری ئیسلامی پێکردبوون. ماریە و خوشکەکەی باوەڕیان هێنابوو. پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی لای دایکی سەلیم کچی

مەلحان جێگە کردەوە. ماریە جوان بوو. پێغەمبەر(د.خ) خوشکەکەی ئەو، سیرینی بەحسان کوڕی سابت بەخشی کە عەبدولرەحمان کوڕی حسان لەو چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا مینبەری پێغەمبەر(د.خ) دروست کرا دوو قادرمە و شوێنی دانیشتنی بوو. بەوتەیەک مینبەر لەساڵی هەشتەم دروست کرا بەڵام گێڕانەوەی راست، ساڵی حەوتەمە.

دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) عومەر کوڕی خەتابی لەگەڵ سی سوار بۆ لای هەوازین ڕەوانە فەرموو. عومەر لەگەڵ ڕێنیشاندەرێك لەمناڵەکانی هیلال بەرێکەوت. شەوانە ڕێگەیان دەبڕی و بەڕۆژ خۆیان دەشاردەوە. خەڵکانی هەوازین ئاگادار بوونەوە و هەڵاتن. شەڕ ڕوووینەدا و عومەر گەڕایەوە.

دەڵێت: ڕۆشتنەدەرەوەی ئەبوبەکری راستگۆ بەمەبەستی شەڕ کردن لەنەجد لەشەعبانی ئەم ساڵەدا بوو.

سەلمە کوڕی ئەکوەع دەڵێت: لەم ساڵەدا لەگەڵ ئەبوبەکر بۆ غەزا نەجد بەرێکەوتین.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێشتر ئاماژەمان بەم شەڕە داوە.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا بەشیر کوڕی سەعید لەگەڵ سی سوار بەمەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ مناڵەکانی موڕە ڕووی کردە فەدەك. هاوەڵانی بەشیر کوژران و خۆی بریندار لەناو کوژراوەکان کەوت و دواتر گەڕایەوە بۆ مەدینە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا و لەرەمەزان غالیب کوڕی عەبدوللە بەمەبەستی شەڕ ڕووی کردە مەیفەعە.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) غالیب کوڕی عەبدوللەی بۆ سەرزەمینی مناڵەکانی موڕە نارد و مێرداس کوڕی نەهیك لەدوژمنان بەدەستی ئوسامە کوڕی زەید کوژرا. یەکێك لەئەنسارییەکانیش گیانی ئەسپەردە کرد.

ئوسامە کوڕی زەید دەڵێت: کاتێك هێرشمان کردە سەر مێرداس، وتی: (لا اله الا الله) بەڵام دەسبەرداری نەبووین تا کوژرا و کاتێك گەڕاینەوە بۆ مەدینە پێغەمبەرمان لەم ڕووداوە ئاگادار کردەوە، فەرمووی: ئەی ئوسامە بۆ ڕێگەت لێگرت؟

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا غالیب کوڕی عەبدوللە بەمەبەستی هێرش کردنە سەر مناڵەکانی عەبد کوڕی سەعلەبە مەدینەی بەجێهێشت. یەسار کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من مناڵەکانی عەبد کوڕی سەعلەبە ناکاوگیر دەکەم.

پێغەمبەر(د.خ) غالیب کوڕی عەبدوڵڵەی لەگەڵ سەد سوار ڕەوانە فەرموو. ئەوان هێرشیان کردە سەر منداڵەکانی عەبد و وشتر و مەڕەکانیان پێش خۆیاندا و گەڕانەوە بۆ مەدینە.

دەڵێت: بەشیر کوڕی سەعد لەشەوالی ئەم ساڵە لەیەمەن شەڕی کرد.

سەعد کوڕی عوبادە دەڵێت: هۆکاری ئەم شەڕە ئەوە بوو حوسەیل کوڕی نەویرەی ئەشجعەی لەشەڕی خەیبەر ڕێنیشاندەری پێغەمبەر(د.خ) بووو. هاتە لای و پرسی: چ هەواڵێکت پێیە؟

حوسەیل وتی: دەستەیەك لەخەڵکانی غەتەفانم لەجەناب بینی. عۆیەیینە کوڕی حوسن ئەوانی ناردووە تا هێرش بکەنە سەر ئێوە.

پێغەمبەر(د.خ) بەشیر کوڕی سەعدی نارد و حوسەیل کوڕی نەویرە بوو بەڕێنیشاندەری ئەو. وشتر و مەڕومالاتی زۆریان دەستکەوت. کۆیلەی عۆیەیینە کوڕی حوسن ڕووبەڕوویان بوویەوە. موسوڵمانان ئەویان کوشت. دواتر ڕووبەڕووی شەڕکەرانی عۆیەیینە بوونەوە و شکستیاندان. حارس کوڕی عەوف عۆیەیینەی لەکاتی هەڵاتن بینی و پێی وت: ئەی عۆیەیینە کاتی ئەوە هاتووە لەکارەکانی خۆت پەشیمان ببیتەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخەیبەرەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، مانگەکانی ڕەبیع الاول و ربیع الاخر و جومادی الاول و جومادی الاخر و ڕەجەب و شەعبان و ڕمەزان و شەوالی لەمەدینە بەسەر برد و کەسانی بۆ غەزا و شەڕەکان ڕەوانە دەکرد. دوای ئەوە لەمانگی زیقەعدە ئەو مانگەی ناباوەڕانی قوریش ڕێگەی چوونە ناو مەککەیان لێگرت، بەمەبەستی ئەنجامدانی حەجی عەمرە بەڕێکەوت. ئەو موسوڵمانانەی ساڵی پێش هاوڕێی بوون، لەگەڵیدا ڕۆشتن. ئەمە لەساڵی حەوتەمی کۆچدا بوو. کاتێك خەڵکانی مەککە ئاگادار بوونەوە، شارەکەیان بەجێهێشت. قوڕەیشییەکان بەخۆیان وت هاوەڵانی محەممەد ریسوا و لاواز بوون.

کوڕی عەباس دەڵێت: قوڕەیشییەکان لای دارئەلندوە ریزیان بەستبوو تا پێغەمبەر(د.خ) و هاوەڵانی ببینن. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ناو مزگەوتەکە دەستی ڕاستی خۆی لەعاباکەی دەرهێناو فەرمووی: خواوەند ببەخشێت ئەو کەسی ئەمڕۆ هێزی خۆی نیشانی ئەوان دەدات. دەستی لەبەردی ڕەشدا و دەستی بەغار کردن کرد، هاوەڵانی بەدوایدا ڕایان کرد تا ئەو کاتەی لەپشت کەعبە لەبەرچاو دیار نەمان. دەستی لەرۆکنی یەمانیدا و بەهێواشی ڕێگەی دەبڕی تا گەیشتە بەردی ڕەش و دووبارە ڕای

کردەوە تا سێ جار بەدەوری کەعبەدا سووڕایەوە. چوار جاری تر بەهێواشی بەدەوری کەعبەدا سووڕایەوە.

کوڕی عەباس دەیوت: خەڵکان گومانیان کرد ئەم کارانە لەسەر ئەوان فەرز نییە چوونکە ئەو کارەی لەبەر وتەی قورەیشییەکان ئەنجامدا کەوتیان محەممەد و هاوەڵانی لاواز و ریسوا بوون بەڵام لەحەجیماڵئاوایی ئەم کارەی دووبارە کردەوە و چیتر بوو بەسونەت.

هەروەها کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەم سەفەرەدا مەیموونە کچی حارسی وەك هاوسەر هەڵبژارد. لەو کاتەی ئیحرامی بەستبوو، عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب ئەوی کردە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ).

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سێ رۆژ لەمەککە مایەوە. رۆژی سێیەم حوەیتب کوڕی عەبدولعوزا لەگەڵ چەندکەسێك لەقورەیشییەکان هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) تا بۆ رۆشتن لەمەککە ناچاری بکەن، وتیان: کاتی تۆ بەسەر چووە، برۆ.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چی دەبێت ئەگەر رێگە بدەن لەنێوان ئێوە پەیوەندی هاوسەرگیری ببەستم و خواردنێك ئامادە و ئێوەیش بەشدار بن.

وتیان: پێویستمان بەخواردنی تۆ نییە، شارەکە بەجێبێڵە.

پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە رۆشتەدەر و باوکی رافیع، کۆیلەکەی، لای مەیموونە بەجێهێشت. باوکی راقیع لەسرف مەیموونەی بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەو، لێی نزیك کەوتەوە.

لەم سەفەرەدا پێغەمبەر(د.خ) مۆڵەتیدا قوربانی بگۆڕن. ئەویش قوربانی گۆڕی لەبەر ئەوەی وشتر کەم بوو، مانگایان سەر بڕی.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە مەدینە، پاشماوەی زیحەججە و موحەرەم و سەفەر و دوو مانگی رەبیع الاولی لەو شارە بەسەر برد و لەمانگی جومادی الاول دەستەیەکی بۆ شام نارد کە لەموتە شکستیان خوارد. ئەو ساڵە ناباوەڕان سەرپەرەستی کاروباری حەجیان دەکرد.

زوهری دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەموسوڵمانانی فەرموو بوو: بۆ قەزای عەمرەی حۆدەیبییە ساڵی داهاتوو عەمرە و قوربانی بکەن.

بەڵام کوڕی عومەر دەڵێت: ئەم عەمرەیە قەزا نەبوو بەڵکو موسوڵمانان بڕیاریاندا بوو لەساڵی داهاتوو لەو مانگەی ناباوەڕانی مەککە رێگەیان لێگرتبوون، عەمرە بکەن.

واقدی دەڵێت: گێڕانەوەی زوهری لای ئێمە پەسەندترە چوونکە لەو ساڵەدا ڕێگەیان لەموسوڵمانان گرت و نەیانتوانی عەمرە بکەن.

محەممەد کوڕی ئیبراهیم دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەعەمرەی قەزا حەفتا قوربانی لەگەڵ خۆی برد.

عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەم سەفەرە سیلاح و خودە و ڕم و سەد ئەسپی لەگەڵ خۆی بردبوو. سیلاحەکانی بەبەشیر کوڕی سەعد و ئەسپەکانی بە محەممەد کوڕی موسلیمە سپارد. کاتێك قورەیشییەکان ئاگادار بوونەوە، ترسان و موکریز کوڕی حەفسیان نارد. ئەو لەمەڕ ئەلزەهران پۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) کەپێی فەرموو: لەبچوکی و گەورەیی بەوەفاداری بەپەیمانەکان بەناو بانگ بووم و نامەوێت بەسیلاحەوە بڕۆمە ناو مەککە بەڵام دەمەوێت لەخۆم نزیك بێت. موکریز گەڕایەوە و قورەیشییەکانی ئاگادار کردەوە.

واقدی دەڵێت: لەزیقەعدەی ئەم ساڵە کوڕی ئەبی عەوجای سولەمی بۆ غەزای مناڵەکانی سولەیم بەرێکەوت و پێغەمبەر(د.خ) لەگەڕانەوە لەمەککە ئەوی لەگەڵ پەنجا کەس ڕەوانە فەرموو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کوڕی ئەبی عەوجا ڕووبەڕووی مناڵەکانی سولەیم بوویەوە و خۆی و هەموو هاوەڵانی کوژران. بەڵام بەوتەی واقدی خۆی ڕزگاری بوو و گەڕایەوە بۆ مەدینە بەڵام هاوەڵانی کوژران.

## ساڵی هەشتەمی کۆچی دەستی پێکرد

لەم ساڵەدا بەوتەی واقدی، زێنەب کچی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد. دەڵێت: لەسەفەری ئەم ساڵە پێغەمبەر(د.خ) غالیب کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی بۆ غەزای مناڵەکانی ئەلمەلوح بۆ کەدید ڕەوانە کرد.

جوندەب کوڕی مەکیسی جوهەنی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) غالیب کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ مناڵەکانی ئەلمەلوح بۆ کەدید نارد و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەریان. منیش یەکێك بووم لەهاورێکانی غالیب. ڕۆشتین و کاتێك گەیشتینە کەدید، حارس کوڕی مالکی لەیسیمان بینی و گرتمان. بەڵام حارس وتی:

هاتووم تا باوەڕ بەئیسلام بێنم.

غالیب وتی: ئەگەر هاتوویت بۆ ئەوەی باوەڕ بێنیت نابێتە کێشە ئەگەر شەو و ڕۆژێك لەبەندا بیت و ئەگەر وتەکانی تۆ ناڕاست بێت، لەتۆ پارێزراوین. ئەوی گرت و پیاوێکی ڕەشپێستی وەك پاسەوان بۆ دانا وپێی وت: ئاگات لێی بێت تا ئێمە دەگەڕێینەوە و ئەگەر شەڕی لەگەڵ تۆ کرد، سەری ببڕە.

دەڵێت: ڕۆشتین تا گەیشتینە دۆڵی کەدید و دوای ئێوارێ لەعەشیشە دابەزین. هاورێکانم منیان بۆ دێدەڤانی نارد. ڕۆشتمە سەر تەپۆڵکەیەك تا بتوانم هەموو شوێنێك بەجوانی ببینم و لەوێ ڕاکشام. دەمەو ئێوارێ بوو، کەسێك هات و منی بینی، بەهاوسەرەکەی خۆی وت: سوێند بەخوا لەسەر تەپۆڵکەکە ڕەشاییەك دەبینم کە سەرەتای ڕۆژ نەمبینی، برۆ بزانە سەگەکان دەفرەکەی تۆیان نەبردبێت بۆ ئەوێ.

ژن سەیری کرد و وتی: سوێند بەخوا هیچ وننەبووە.

پیاو وتی: کەوان و دوو تیرم بۆ بێنە.

کاتێك کەوانەکەی بۆ هێنا، تیرێکی هاویشت و لەکەلەکەم چەقی. تیرەکەم دەرهێنا و فڕمدا بەڵام لەشوێنی خۆم نەجووڵام.

پیاو وتی: دوو تیری منی بەرکەوت ئەگەر دیدڤان دەبوو، دەجووڵا، بەیانی تیرەکانی من بێنەرەوە تا سەگەکان دەمی لێنەدەن.

دەڵێت: چاوەڕێ بووم تا ڕانەمەڕەکە هات و دۆشییان و خواردیانەوە و ئارامیان گرت. بەشێك لەشەو تێپەڕی. هێرشمان کردە سەریان و خەڵکانمان کوشت و مەڕەکانمان پێش خۆماندا و گەڕاینەوە. جارچییەکەیان بۆ بەدەست هێنانی هاوکاری

گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی. ئێمە بەخێرایی ڕێگەمان بڕی و گەیشتینە لای حارس کوڕی مالك و پاسەوانەکە. هەردووی ئەوانمان هەڵگرت. پشتیوانەکانی خەڵك هاتن. نەماندەتوانی لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکەین. کاتێك نزیك بوونەوە وتەنیا دۆڵی کەدید لەنێوان ئێمەدا بوو، خواوەند هەورێکی باراناوی نارد. پێشتر بارانمان نەبینیبوو. بەرادەیەك باران باری ئەگەری پەڕینەوە نەبوو. دوژمنان سەیری ئێمەیان دەکرد و نەیاندەتوانی پێشڕەوی بکەن. بەخێرایی ئەو شوێنەمان بەجێهێشت.

واقدی دەڵێت: هاورێکانی غالیب کوڕی عەبدوللە، دە و چەند کەسێك بوون.

دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) عەلا کوڕی حەزرەمی بۆ لای مونزەر کوڕی ساوی عەبدی نارد و نامەیەکی نووسی بەم ناوەرۆکە:

((بسم الله الرحمان الرحیم. لە محەممەد، نێردراوی خواوەند بۆ مونزەر کوڕی ساوی. سلاو لەتۆ. من خوای تاقانە دەپەرەستم. بەڵام دواتر، نامەی تۆ و نێردراوەکانت گەیشت، هەرکەس نوێژی ئێمە بکات و قوربانی ئێمە بخوات و ڕوو بکاتە قیبلەی ئێمە، موسوڵمانە و ئەرك و لێپرسراویەتی موسوڵمانان لەسەر شانییەتی و هەرکەس رازی نەبێت، دەبێت باج بدات.))

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەوان واژۆ کرد بەو پێیەی ئاگرپەرستەکان باج بدەن و موسوڵمانان لەگۆشتی ئەوان نەخۆن و کەس لەوان نەکەنە هاوسەری خۆیان.

دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ)، عەمرۆ کوڕی عاسی بۆ لای جیفر و عوباد، کوڕەکانی جولەندی ڕەوانە فەرموو. ئەوان وتەکانی پێغەمبەریان پشتڕاست و باوەڕیان بەدینەکەی هێنا. عەمرۆ کوڕی عاس زەکاتی سامانی ئەوانی وەرگرت و لەئاگرپەرستەکان باجی سەند.

دەڵێت: لەرەبیع الاولی ئەم ساڵە شوجاع کوڕی وەهب لەگەڵ بیست و چوار کسە هێرشی کردە سەر مناڵەکانی عامر و وشتر و مەڕی دەستکەوت. هەرکام لەوان پانزە وشتریان پێبڕا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی کەعبی غەفاری لەگەڵ پانزە کەس بەرەو زات ئیفلاح ڕۆشت. ژمارەیان فراوان بوو. پێشنیاری ئیسلامی پێکردن بەڵام رازی نەبوون و هەموو هاوەڵانی عەمرۆیان کوشت. خۆی بەڕەنج و بەدبەختی گەڕایەوە بۆ مەدینە.

واقدی دەڵێت: زات ئیتلاح لەسنووری شامە و خەڵکەکەی لەتایەفەی قوزاعە

وسەرکردەکەیان پیاوێك بەناوی سەدوس بوو.

دەڵێت: لەسەرەتای سەفەری ئەم ساڵە، عەمرۆ کوڕی عاس کەلای نەجاشی باوەڕی بەئیسلام هێنابوو، هاتە لای پێغەمبەر(د.خ). عوسمان کوڕی تەڵحە و خالید کوڕی وەلید هاورێیەتیان دەکرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هۆکاری موسوڵمان بوونی عەمرۆ کوڕی عاس ئەوە بوو کەخۆی دەڵێت: کاتێك لەگەڵ ئەحزاب لەشەڕی خەندەك گەڕاینەوە، دەستەیەك لەقوڕەیشییەکانم کۆکردەوە کەگرنگییان بەوتەکانی من دەدا، وتم: سوێند بەخوا دڵنیام دەسەلآتی محەممەد فراوان دەبێت، بۆچوونێکم هەیە، ئێوە دەڵێن چی؟

وتیان: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتم: دەڕۆینە لای نەجاشی و لای ئەو دەمێنینەوە، ئەگەر محەممەد بەسەر خەڵکەکەی سەرکەوتن، شوێنی دەکەوین و باوەڕی پێدێنین چوونکە ئەگەر لەژێر دەسەلآتی نەجاشیدا بین باشترە لەوەی لەژێر دەسەلآتی محەممەددا بین. ئەگەر خەڵکەکەی ئێمە سەرکەوتن، ئێمە بەباشی دەناسن و هیچ زیانێکمان پێنابڕێت.

وتیان: بۆچوونێکی پەسەندە.

وتم: شتێك ئامادە بکەن وەکو دیاری پێشکەشی نەجاشی بکەین. باشترین دیاری سەرزەمینی ئێمە بۆ ئەو چەرم بوو. چەرمێکی زۆرمان کۆکردەوە و ملی ڕێگەمان گرتەبەر. لەنزیك ئەو بووین کەعەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری هات. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ کاری جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب و هاورێکانی ناردبوو.

دەڵێت: بەهاوەلآنی خۆم وت: عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری هاتووە، دەڕۆمە لای نەجاشی و داوای لێدەکەم ئەو تەسلیم بەمن بکات تا بیکوژم. بەمشێوەیە قوڕەیشییەکان دەزانن تۆڵەم سەندۆتەوە و نێردراوی پێغەمبەرم کوشتووە. بەم مەبەستە ڕۆشتمە لای نەجاشی و سەری کوڕنوشم دانەواند.

نەجاشی وتی: هاورێکەم بەخێر بێیت، لەدیاری خۆتەوە دیاریت هێناوە؟

وتم: بەڵێ، ئەی پاشا چەرمێکی زۆرم بەدیاری بۆ هێناویت. چەرمەکانم پێشکەش کرد. نەجاشی پەسەند و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی. وتم: ئەی پاشا، کەسێکم بینی لای تۆ ڕۆشتەدەر، ئەو نێردراوی پیاوێکە کەدوژمنی ئێمەیە. ئەو بەمن بسپێرە تا خوێنی برێژم چوونکە گەورەکانی خەڵکەکەی منی کوشتووە.

دەڵێت: نەجاشی تورە بوو بەدەست بەشێوەیەك كێشای بەلووتی خۆیدا گومانم كرد شكاندوویەتی. لەو كاتەدا ئەگەر زەوی دەمی دەكردەوە، لەترسا خۆم دەخستە ناوی، وتم: ئەی پاشا سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی دەبێتە هۆی تورە بوونی تۆ، هیچ كات ئەو داوایەم نەدەكرد.

وتی: دەتەوێت نێردراوی كەسێكت تەسلیم بكەم كەناموسی ئەكبەری بۆ دێت، ئەوەی بۆ موسا دەهات، بۆ ئەوەی بیكوژێت؟

وتم: ئەی پاشا ئایا ئەمە ڕاستە؟

وتی: ئەی عەمرۆ لەمنی ببیستە و باوەڕ بێنە چوونكە ئەو لەسەر ڕاستییە و بەسەر نەیارەكانیدا سەردەكەوێت بەهەمان شێوە كەموسا بەسەر فیرعەون و سوپاكەیدا سەركەوت.

وتم: لەلایەن ئەو بەیعەتی ئیسلام لەگەڵ من دەبەستیت؟

وتی: بەڵێ، دەستی خۆی هێنایە پێش و بەیعەتی ئیسلامم لەگەڵ بەست. بۆ لای هاوڕێكانی خۆم گەڕامەوە و لەپێشهاتەكان ئاگادارم كردنەوە بەڵام باوەڕهێنانی خۆم ئاشكرا نەكرد. مەبەستی ڕۆشتن بۆ لای پێغەمبەرم كرد تا بەتەواوی باوەڕ بێنم. لەڕێگەدا خالید كوڕی وەلیدم بینی كە لەمەككەوە دەهات. ئەمە پێش گرتنی مەككە بوو. وتم: ئەی باوكی خالید بۆ كوێ دەڕۆیت؟

وتی: هەموو شتێك دەركەوت، سوێند بەخوا ئەم پیاوە پێغەمبەرە، دەڕۆم باوەڕی پێبێنم تا كەی چاوەڕێ بم.

وتم: سوێند بەخوا منیش دەڕۆم باوەڕی پێ بێنم.

هەردووكمان ڕۆشتینە لای پێغەمبەر(د.خ)، خالید پێشكەوت و بەیعەتی كرد و موسوڵمان بوو. دواتر من لە پێغەمبەر(د.خ) نزیك كەوتمەوە و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بەیعەت لەگەڵ تۆ دەكەم كەهەموو هەڵەكانی ڕابردووی من ببەخشیت. باسی هەڵەكانی داهاتووم نەكرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی عەمرۆ، بەیعەت ببەستە چوونكە ئیسلام هەڵەكانی ڕابردوو دەسڕێتەوە. بەیعەتم كرد و گەڕامەوە.

كوڕی ئیسحاق دەڵێت: عوسمان كوڕی تەڵحە لەگەڵ خالید كوڕی وەلید و عەمرۆدا بوو. لەگەڵ ئەوان باوەڕی هێنا.

## گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی هەشتەمی کۆچ

لەجومادی الاخری ئەم ساڵە پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی عاسی لەگەڵ سێسەد کەس بۆ سەلاسل نارد کەسەرزەمینی قوزاعەیە.

داستانەکەی بەم شێوە بوو: دایکی عاس کوڕی وائل لەتایەفەی قوزاعە بوو. پێغەمبەر(د.خ) دەیویست ئەوان بکاتە هاوپەیمانی خۆی و سەرکردەکانی موهاجیر و ئەنساری لەگەڵ عەمرۆ عاس ڕەوانە کرد.

دوای ئەوە عەمرۆ داوای هاوکاری کرد و ئەبی عوبەیدەی جەراحی لەگەڵ دووسەد کەس لەموهاجیر و ئەنسارەکان و لەناویان ئەبوبەکر، ڕەوانە کرد. ژمارەیان گەیشتە پێنسەد کەس.

عەبدولله کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی عاسی بۆ سەرزەمینی بەلی و عوزرە ڕەوانە فەرموو. پیشنیاری باوەڕهێنانی بەعەرەبە بیابان نشینەکان کرد. هۆکارەکەی ئەوە بوو دایکی عاس کوڕی وائل لەخەڵکانی بەلی بوو. پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆی نارد تا ئەوان بکاتە هاوپەیمانی خۆی و کاتێك لەسەرزەمینی جوزام گەیشتە ئاوێك بەناو سەلاسل و غەزوەکەی بەم ناوەوە ناونرا، ترسا وکەسی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و داوای هاوکاری کرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەبوعوبەیدەی جەراحی لەگەڵ دەستەیەك لەموهاجیر و ئەنسارەکان و لەناویاندا ئەبوبەکر و عومەر، بۆ هاوکاری کردنی ئەو ڕەوانە فەرموو. کاتێك ئەبوعوبەیدەی ڕەوانە کرد، فەرمووی: کێشە لەناوتانا دروست نەبێت. کاتێك گەیشتە لای عەمرۆ کوڕی عاس، عەمرۆ پێی وت: تۆیان بۆ هاوکاری کردنی من ناردووە.

ئەبوعوبەیدە وتی: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێداوم کێشە دروست نەکەین، ئەگەر تۆ بەفەرمانەکانی من رازی نابیت، من گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆ دەبم.

عەمرۆ وتی: من ئەمیر و تۆ بەردەست و هاوکاری منیت.

ئەبوعوبەیدە وتی: رازیم. عەمرۆ کوڕی عاس لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند.

واقدی دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا غەزوەی خەبت ڕوویدا و سەرکردەی موسوڵمانان ئەبوعوبەیدەی جەڕاح بوو. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەمانگی رەجەب لەگەڵ سێسەد کەس لەموهاجیر و ئەنسارەکان ڕەوانەی جۆهەینە کرد. لەوێ گرفتاری سەختی بوون بەشێوەیەك خورمایان بەدانە دابەش دەکرد.

جابر کوڕی عەبدوللەی ئەنساری دەڵێت: بەرێکەوتین و ژمارەمان سێسەد کەس و فەرماندەکەمان ئەبوعوبەیدەی جەراح بوو. گرفتاری برسییەتی بووین و ماوەی سێ مانگ گەڵای دارەکانمان دەخوارد. ئاژەڵێکیان لەدریاوە هێنا پێیان دەوت عەنبەر. پانزە شەو لەگۆشتی ئەو ئاژەڵەمان خوارد. یەکێك لەئەنسارییەکان وشترێکی کوشت و ڕۆژی دواتر چەند وشترێکی دیکەی سەربڕی بەڵام ئەبوعوبەیدە ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت.

زەکوان کوڕی باوکی سالح دەڵێت: ئەو کەسە قەیس کوڕی سەعد بوو.

عەمرۆ کوڕی دینار لەجابر کوڕی عەبدوللە دەگێڕێتەوە: گرفتاری ڕەنج بوون، سەرکردەکەیان قەیس کوڕی سەعد و نۆ وشتری بۆ سەربڕین.

دەڵێت: بەرەو دەریا ڕۆشتبون. دەریا ئاژەڵێکی خستنە بەر دەست و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لێیان خوارد. کاتێ بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕانەوە، لەکردەوەی قەیس ئاگاداریان کردەوە و فەرمووی: بەخشندەیی عادەتی ئەم بنەماڵەیە.

سەبارەت بەماسی دەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی پێش بەڕێکەوتن تەواوی دەکەین، حەزم دەکرد شتێکیم لەوێ پێبێت.

لەگێڕانەوەی کوڕی دینار ئاماژە بەخواردنی گەڵای دار نەدراوە.

باوکی زوبەیر لەجابر دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر(د.خ) یەك دانە خورمای پێدان و ئەبوعوبەیدە مشت مشت بەئێمەی دەبەخشی. دواتر یەك یەك پێی دەداین و دەمانمژی و تا شەو ئاومان دەخواردەوە و کاتێك خورما تەواو بوو، گەڵای دارمان کۆ دەکردەوە. گرفتاری برسیەتییەکی دژوار بووین. دواتر ماسییەکی مردوو لەدەریاوە هاتەدەر، ئەبوعوبەیدە وتی: برسییەکان لێی بخۆن.

دەڵێت: ئەبو عوبەیدە یەکێك لەپەراسووەکانی ماسی دادەنا و وشتر سوارێك بەسەریدا دەڕۆشت. پێنج کەس لەشوێنی چاوەکەی جێگەی دەبوویەوە. لێمان خوارد و ڕۆنەکەیمان گرت و قەڵەو بووین. کاتێك گەڕاینەوە، بەسەرهاتەکەمان بۆ پێغەمبەر(د.خ) باس کرد، فەرمووی: ئەو ڕۆزییەی خواوەند بۆی ناردوون، بیخۆن، هیچتان لەگۆشتەکەی پێماوە؟

کەمێك لەگۆشتەکەیمان پێمابوو، بۆ پێغەمبەریان نارد و لێی خوارد.

واقدی دەڵێت: بۆیە ئەم غەزوەیان بەخەبت ناو بردووە چوونکە تیایدا گەڵای داریان خوارد و دەمیان هاوشێوەی دەمی وشتری ئاڵفخۆری لێهاتبوو.

دەڵێت: لەشەعبانی ئەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەکی بۆ شەڕ ڕەوانە کرد

وسەرکردایەتی ئەوانی بەباوکی قتادە سپارد.

عەبدوللە کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمی دەڵێت: ژنێك لەخەڵکەکەی خۆمم وەك هاوسەر دەستنیشان و دووسەد درەم مارەیی ئەومدا. ڕۆشتمە لای پێغەمبەر(د.خ) تا بۆ هاوسەرگیری خۆم هاوکاری لێوەربگرم. فەرمووی: مارەییەکەی چەندە؟

وتم: دووسەد درەم.

فەرمووی: سبحان الله، ئەگەر درەمەکانتان لەدۆڵەکە کۆدەکردەوە، زیاتر لەمە مارەییتان دەستنیشان نەدەکرد. سوێند بەخوا ناتوانم هاوکاری تۆ بکەم.

دەڵێت: چەند ڕۆژ دواتر یەکێك لەمناڵەکانی جەشم کوڕی معاویە بەناوی ریفاعە کوڕی قەیس کوڕی ریفاعە لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی جەشم هات و لەبیشە دابەزی. دەیویست تایەفەی قەیس بۆ شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کۆبکاتەوە.

دەڵێت: ئەو لەناو تایەفەی جەشم، ناودار و گەورە بوو. پێغەمبەر(د.خ) من و دووان لەموسوڵمانەکانی بانگ کرد و فەرمووی: بڕۆنە لای ئەو پیاوە و بیهێنن یا هەواڵەکانی ئەوم بۆ بێنن. وشترێکی لەڕی بەئێمەدا. یەك کەسمان سوار بوو بەڵام ئەوەندە لاواز بوو نەیتوانی هەستێت و چەند کەسێك لەدواوە هاوکارییان کرد تا هەستایە سەرپێ. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نۆرە نۆرە سواری بن.

دەڵێت: ڕۆشتین. شمشێر و تیروکەوانمان پێ بوو. نزیك ئاوابوونی خۆر گەیشتینە عەشیشە. لەسووچێکدا خۆم داشارد و بەدوو هاورێکەم وت لەشوێنێکی دیکە خۆیان حەشار بدەن. پێم وتن: کاتێك دەنگی تەکبیری منتان بیست و بینیتان هێرش دەکەمە سەریان، تەکبیر بڵێن وهێرش بەرن.

دەڵێت: چاوەڕوان بووین بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەینە سەریان یا هەواڵەکانی تایبەت بەوان کۆبکەینەوە. شەو تێپەڕی و شوانەکەیان دڕەنگی کرد. ترسان و سەرکردەکەیان ریفاعە کوڕی قەیس هەستا، شمشێری دەرکێشا و وتی: بەدوای شوانەکەدا دەڕۆم، پێم وابێت بەڵایەکی بەسەردا هاتووە. چەند کەسێك وتیان: تۆ مەڕۆ، ئێمە دەڕۆین.

ریفاعە وتی: سوێند بەخوا جگە لەخۆم کەس ناڕوات.

وتیان: ئێمەیش لەگەڵ تۆ دێین.

وتی: سوێند بەخوا کەس لەئێوە نایەت.

دەڵێت: بەرێکەوت و لەمن نزیك کەوتەوە. تیرێکم بۆ هاویشت و لەدڵی چەقی. دەنگی دەرنەهات، پەڕیمە سەرجەستەی و سەریم بڕی. دواتر هێرشم کردە سەرسوپاکەی و دوو هاورێکەیشم هێرشیان کرد. هەڵاتن و ژن و منداڵ و سامانەکەیان خۆیان برد. وشتر و مەڕی زۆرمان پێش خۆمان خست و گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ). سەری ریفاعەم بەدەستەوە بوو. سیانزە وشتری پێبەخشیم و بەمشێوەیە توانیم هاوسەرەکەم ببەمە ماڵی خۆم.

بەوتەی واقدی پێغەمبەر(د.خ) ئەبی حەدرەدی لەگەڵ باوکی قتادە بۆ ئەم شەڕە ڕەوانە کرد. شانزە کەس بوون و بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لەسەفەردا بوون. هەرکام شانزە بەشیان وەرگرت و هەر وشترێك بەرابەر لەگەڵ دە مەڕ بوو. چوار ژنیان گرت. یەکیان کچێکی جوان بوو و بەر باوکی قتادە کەوت. مەحمییەت کوڕی جەزٔ سەبارەت بەو لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) قسەی کرد و پێغەمبەر(د.خ) لەباوکی قتادەی پرسی و وتی: ئەوم لەتاڵانییەکانی خۆم کڕیوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بیبەخشە بەمن.

باوکی قتادە کچەکەی بە پێغەمبەر(د.خ) بەخشی و ئەویش بەخشی بەمەحمییەت کوڕی جەزٔ .

دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) باوکی قتادەی بۆ شەڕی دۆڵی ئەزەم ڕەوانە فەرموو.

عەبدوللە کوڕی ئەبی حەدرەد دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ئێمەی بۆ ئەزەم ڕەوانە کرد. لەگەڵ چەند کەسێك لەموسوڵمانان وەك باوکی قتادە و حارس کوڕی ڕێبعی و موحەلیج کوڕی جوسامەی لەیسی بەرێکەوتین. کاتێك گەیشتینە دۆڵەی ئەزەم، ئەم ڕووداوە پێش گرتنی مەککە بوو، عامر کوڕی ئەزبەتی ئەشجەعی لای ئێمە تێپەڕی. سوار وشترەکەی خۆی و کەمێك کەل وپەل و مەشکەیەك شیری پێبوو. هاوشێوەی موسوڵمانان سڵاوی کرد و ئێمە کارمان پێی نەبوو. بەڵام موحەلیم کوڕی جوسامە لەیسی بەهۆی ئەو ڕق و کینەی لەنێوان ئەواندا بوو، پەلاماریدا و خوێنی ڕشت. وشتر و کەل و پەلەکانی ئەوی هەڵگرت. کاتێك بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕاینەوە و ڕووداوەکەمان بۆ باس کرد، ئەم ئایەی قورئان هاتە خوار:

((یا ایها الذین آمنوا اذا ضربتم فی سبیل الله فتبینوا و لاتقولوا لمن القی الیکم السلام لست مؤمناتبتغون عرض الحیوة الدنیا فعندالله مغانم کثیرة کذلك کنتم من قبل فمن الله علیکم

فتبينوا ان الله كان بما تعملون خبيرا.

واتاکەی: ئێوە کەباوەڕتان هەیە، کاتێك لەرێگەی خوا لەسەر زەوی رێگە دەبڕن و لێکۆڵینەوە دەکەن، بەو کەسەی هاوشێوەی موسوڵمانان سڵاو لەئێوە دەکات، مەڵێن کەموسوڵمان نیت چوونکە بەدوای کەل و پەلەکانی دنیادا دەگەڕێن. لای خواوەند تالآنییەکان فراوانن، ئێوە پێشتر بەمشێوە بوون، خواوەند منەتی خستنەسەر، کەواتە لێکۆڵینەوە بکەن چوونکە خواوەند لەوەی ئەنجامی دەدەن، ئاگادارە.))

بەوتەی واقدی پێغەمبەر(د.خ) ئەم دەستەی لەمانگی رەمەزان ئەو کاتەی خۆی بۆ گرتنی مەککە ئامادە دەکرد، ڕەوانە فەرموو.

## گێڕانەوەی غەزای موتە

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەخەیبەر بۆ مەدینە گەڕایەوە، دوومانگی رەبیعی لەو شارە بەسەر برد و لەجومادی الاول دەستەیەکی بۆ شام ڕەوانە کرد کە لەموتە کوژران.

عروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەجومادی الاولی ساڵی هەشتەمی کۆچ، کەسانێکی بۆ موتە نارد و سەرکردایەتی ئەوانی بەزەید کوڕی حارسە سپارد. فەرمووی: ئەگەر زەید کوڕی حارسە کوژرا، جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب سەرکردەی شەڕکەران بێت و ئەگەر جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، عەبدولله کوڕی رەواحە. خەڵکان بۆ ڕۆشتن ئامادە بوون. ژمارەیان سێ هەزار کەس بوو. لەکاتی ڕۆشتنی خەڵکان، ماڵئاواییان لەسەرکردەکان کرد و کاتێك ماڵئاواییان لە عەبدولله کوڕی رەواحە کرد، گریا.

وتیان: بۆ دەگریت؟

وتی: سوێند بەخوا بۆ بینینەوە دووباری ئێوە و تامەزرۆ بوونم بۆ ژیان نییە، بەڵام بیستوومە پێغەمبەر(د.خ) ئایەیەك لەقورئان دەخوێنێت، دەفەرمێت: هیچ کەس لەئێوە نییە مەگەر ئەوەی خستنە جەهەنەمی لەلایەن خواوە بڕیاری لەسەر دراوە. نازانم دوای ئەوەی دەڕۆمە جەهەننەم، چۆن بێمەدەر.

موسوڵمانان وتیان: خواوەند پشتیوانتان بێت و بتانپارێزت و بەسەرفرازی بتانگەڕێنێتەوە بۆ لای ئێمە.

کاتێك خەڵکان بەرێکەوتن عەبدوللە کوڕی ڕەواحە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ماڵئاوایی لێکرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بەرێکرد.

کاتێك گەیشتنە مەعانی شام، ئاگادار بوونەوە کەهێرقل لەگەڵ سەد هەزار سوار لەرۆمییەکان لە (مآب بلقا)دابەزیوە و سەد هەزار کەس لەعەرەبەکانی لەخم و جوزام و بەلقین و بەهرا و بەلی هاورێیەتی دەکەن. مالیك کوڕی رافلە لەنەتەوەی بەلی و هۆزی ئەراشە، سەرکردەی ئەوانە.

موسوڵمانان کاتێك ئەم هەواڵەیان بیست، دوو ڕۆژ لەمەعان مانەوە و لەچۆنییەتی بارودۆخی خۆیان کۆڵییەوە. وتیان: نامەی بۆ دەنووسین و لەژمارەی دوژمنان ئاگاداری دەکەینەوە تا هاوکاریمان بۆ بنێرێت یا فەرمانەکانی خۆی دەربکات.

عەبدوللە کوڕی ڕەواحە دڵنەوایی خەڵکانی دایەوە و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەوەی لێی بێزارن، شەهید بوونە و بۆ ئەو مەبەستە هاتوون. ئێمە شەڕ لەگەڵ ژمارە و هێزی دوژمن ناکەین. بۆ سەرخستنی ئەو دینە شەڕ دەکەین کەخواوەند بەهۆیەوە ڕێزی پێبەخشیوین. با بڕۆین چوونکە یەکێك لەم دوو مەبەستە بەدەست دەهێنین یا سەرکەوتن یا شەهید بوون.

وتیان: سوێند بەخوا عەبدوللە کوڕی ڕەواحە ڕاست دەکات. بەرێکەوتن.

زەید کوڕی ئەرقەم دەڵێت: باوکم نەبوو و لەماڵی عەبدوللە کوڕی ڕەواحەدا دەژیام. کاتێك بۆ سەفەری موتە بەرێکەوت، منی لەگەڵ خۆی برد و لەدوای خۆیەوە سواری کردم. شەوێك لەرێگە هۆنراوەیەکی خوێندەوە و ئاماژەی بۆ مەرگ دەکرد. لەبیستنی هۆنراوەکە دەستم بەگریان کرد، بەقامچی لێیدام و وتی: ئەی خراپەکار، تۆ بۆ دەترسیت، خوا شەهید بوون بەمن دەبەخشێت و تۆ دەگەڕێیتەوە.

دەڵێت: موسوڵمانان تا نزیك بەلقا پێشڕەوییان کرد و هێرقل لەگەڵ سوپاکەی خۆی و عەرەبەکان لەگوندێك بەناوی موشاریف ئوردوی لێدابوو. کاتێك دوژمن نزیك کەوتەوە، موسوڵمانان ڕوویان کردە گوندی موتە. دوو دەستە لەوێ ڕووبەڕوو بوونەوە و موسوڵمانان ریزەکانی خۆیان ڕێکخست. یەکێك لەمناڵەکانی عوزرە بەناوی قوتبە کوڕی قتادەیان لای ڕاست و یەکێك لەئەنساریان بەناوی عوبایە کوڕی مالیك لای چەپ جێگیر کرد. شەڕیان دەستپێکرد و زەید کوڕی حارسە ئاڵای پێغەمبەری لەسەر شان بوو، شەڕی کرد تا کوژرا. دوای ئەو جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب ئاڵاکەی هەڵگرت و دەستی بەشەڕ کرد. کاتێك شەڕەکە ڕووی لەدژواری کرد، لەئەسپەکەی خۆی دابەزی و

قاچی شکاند. پیادە شەڕی کرد تا کوژرا. جەعفەر یەکەم کەس بوو لەئیسلام ئەسپەکەی خۆی کوشت.

یەحیا کوڕی عوبادە دەڵێت: باوکی من یەکێك لەمناڵەکانی مورە وبەشداری شەڕی موتەی کردبوو، دەیوت: سوێند بەخوا وەك بڵێی جەعفەر دەبینم لەئەسپەکەی دابەزی و قاچی شکاند و دەستی بەشەڕ کرد تا کوژرا.

کاتێك جەعفەر کوژرا، عەبدوللە کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت. سوار ئەسپەکەی بوو، دەیویست دابەزێت، دوودڵ بوو، ورەی دایە بەرخۆی و دابەزی. کوڕە مامەکەی هات، لەتەگۆشتێکی پێدا و وتی: کەمێك هێز وەربگرە، ئەم ڕۆژانە زۆر لەزەحمەتا بوویت. عەبدوللە کەمێکی لێخوارد. دەنگی شەڕکەرانی بیست و بەخۆی وت: تۆ هێشتا زیندوویت. گۆشتەکەی فڕێدا، شمشێری هەڵگرت و شەڕی کرد تا کوژرا.

دوای کوژرانی عەبدوللە کوڕی ڕەواحە سابت کوڕی ئەقوەمی عێجلی ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و وتی: ئەی موسوڵمانان کەسێك وەك سەرکردەی خۆتان هەڵبژێرن.

وتیان: تۆ سەرکردە بە؟

وتی: ئەو کارە ناکەم.

خەڵکان بڕیاریاندا خالید کوڕی وەلید بکەنە سەرکردەی خۆیان و کاتێك ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت، پاشەکشێی کرد و موسوڵمانانی لەو گرفتارییە ڕزگار کرد.

باوکی قتادە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سوپای سەرکردەکانی نارد و فەرمووی: زەید کوڕی حارسە سەرکردەی ئێوە بێت و ئەگەر کوژرا، جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب سەرکردەیە وئەگەر جەعفەریش کوژرا، عەبدوللە کوڕی ڕەواحە سەرکردەیە. جەعفەر هەستا و وتی: باوەڕ ناکەم زەید بکەیتە سەرکردەی من.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڕۆ تۆ نازانیت چی بۆ تۆ باشە. خەڵکان بەرێکەوتن وڕۆژەکان تێپەڕی. پێغەمبەر(د.خ) لەسەر مینبەر دانیشت و فەرمووی خەڵکان بۆ نوێژ کۆببنەوە. خەڵکان کۆبوونە، فەرمووی: لەچاکەدایە، لەچاکەدایە، لەچاکەدایە، دەمەوێت لەسوپای شەڕکەران ئاگادارتان بکەمەوە، ڕۆشتن و ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە، زەید کوڕی حارسە شەهید بوو، جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت و هێرشی کردە سەردوژمن تا کوژرا، دوای ئەو عەبدوللە کوڕی ڕەواحە ئاڵای بەدەستەوە گرت و خۆڕاگری کرد تا شەهید بوو. دوای ئەو خالید کوڕی وەلید ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت. ئەو سالار نەبوو،

وەك سالار هەڵیانبژارد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەندا، خالید یەكێك لەشمشێرەكانی تۆیە و تۆ هاوكاری دەكەیت. لەو ڕۆژەوە خالید بەشمشێری خوا ناو دەبەن. فەرمووی: بڕۆن و هاوكاری براكانتان بكەن، كەس لەشاردا نەمێنێتەوە. خەڵكان لەگەرمای سوتێنەر، پیادە و سوار بەرێكەوتن.

عەبدوللە كوڕی ئەبی بەكر دەڵێت: كاتێك هەواڵی كوژرانی جەعفەر گەیشت، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوێشەو جەعفەرم لەخەودا بینی لەگەڵ دەستەیەك لەفریشتەكان بەرەو سەرزەمینی یەمەن دەڕۆشت. دوو باڵی بوو. دەستەكانی پڕ بوو لەخوێن.

دەڵێن:قوتبە كوڕی قتادەی عوزری فەرماندەی باڵی ڕاستی موسوڵمانان بوو، هێرشی كردە سەر مالیك كوڕی رافیلە سەركردەی عەرەبەكان و كوشتی.

كاهینەی منالەكانی غەنەم، تیرەیەك لەهۆزی حەدەس، كاتێك لەهاتنی سوپای پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوونەوە، خەڵكەكەی خۆی لەڕوویەڕووی بوونەوەی ئەوان ترساند. ئەوان خۆیان لەلەخمییەكان بەدوور گرت و دواتر فراوانترین هۆزی حەدەس بوون. منالەكانی سەعلەبە كە بۆ شەڕ دەڕۆشتن، كەمترین تیرەی حەدەس بوون.

خالید كوڕی وەلید پاشەكشێی بەموسوڵمانان كردو ئەوانی بۆ مەدینە گەڕاندەوە.

عوروە كوڕی زوبەیر دەڵێت: كاتێك پاشماوەكانی موتە لەمەدینە نزیك كەوتنەوە، پێغەمبەر(د.خ) پێشوازی كردن. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەو منالانەدا بوو كەبۆ پێشوازی كردنی موسوڵمانان ڕۆشتبوون، دەیفەرموو: منالەكان بگرن و سواریان كەن. منالەكانی جەعفەر بدەن بەمن. كاتێك عەبدوللە كوڕی جەعفەریان بردە لای، ئەوی گرت و لەبەردەم خۆی سواری كرد.

خەڵكانی مەدینە خۆڵبارانی سوپاكەیان كرد و دەیانوت: ئەی هەڵاتووانی ڕێگەی خوا.

پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: سوێند بەخوا هەڵاتوو نین و ئەگەر خوا بخوازێت، هێرشبەرانن.

دایكی سەلمە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) بەژنی سەلمە كوڕی هوشام كوڕی موغەیرەی وتبوو: بۆ سەلمە لەنوێژی پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان بەشداری ناكات.

وتی: سوێند بەخوا ناوێرێت بێت چوونكە كاتێك دێت خەڵكان هاوار دەكەن ئێوە

لەرێگەی خوا هەڵاتوون و لەماڵەوە دانیشتوون.

هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) بەمەبەستی گرتنی مەککە بەرێکەوت.

## گێڕانەوەی غەزای مەککە

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دوای ئەوەی سوپای بۆ موتە نارد، جومادی الاخر و رەجەبی لەمەدینە بەسەر برد. تایەفەی خوزاعە لەخوارەوەی مەککە لەسەر ئاوەکەی خۆیان بەناوی وەتیر ژیانیان بەسەر دەبرد. مناڵەکانی بەکر کوڕی عەبد مەنات هێرشیان کردە سەریان و هۆکاری رووداوەکە پیاوێك لەمناڵەکانی حەزرەم بەناوی مالیك کوڕی عوباد هاوپەیمانی ئەسوەد کوڕی رەزن بوو. کاتێك بەمەبەستی بازرگانی دەرۆشت، لەسەرزەمینی خوزاعە ئەویان کوشت و سامانەکەیان تالآن کرد. مناڵەکانی بەکر لەتۆڵەی خوێنی ئەودا یەکێك لەخوزاعییەکانیان کوشت. خەڵکانی خوزاعە هێرشیان کردە سەر ئەسواد کوڕی رەزنی دەیلی، سەلما و کولسوم و زەیب کەسەران وسەرکردەکانی مناڵەکانی بەکر بوون، خوێنیان ڕشتن. ئەم رووداوە لەنزیك نیشانەکانی حەرەم روویدا.

یەکێك لەمناڵەکانی دەیل دەڵێت: لەرۆژگاری جاهلییەت مناڵەکانی ئەلئەسوەد بەهۆی لەپێشییان، دوو خوێنباییان بوو و ئێمە یەك خوێنبایی. لەم کاتەدا ئیسلام هات و مناڵەکانی بەکر و خوزاعەی سەرقاڵ کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئاشتی حۆدەیبییە لەنێوان پێغەمبەر(د.خ) و ناباوەڕانی قورەیش سەقامگیر کرا، یەکێك لەبەندەکانی پەیمانی ئاشتی ئەوە بوو هەرکەس بیەوێت دەتوانێت لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمان ببەستێت و هەر کەس بیەوێت دەتوانێت لەگەڵ قورەیشییەکان. تایەفەی خوزاعە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمانیان بەست و مناڵەکانی دەیل کوڕی بەکر ئەم هەلەیان قۆستەوە و ویستیان تۆڵەی کوڕە کوژراوەکانی خۆیان لەخەڵکانی خوزاعە وەربگرن. نەوفل کوڕی معاویەی دەیلی سەرکردەی خەڵکان بوو بەڵام هەموو مناڵەکانی بەکر شوێنکەوتەی نەبوون، لەگەڵ خەڵکانی دەیل شەوانە هێرشیان کردە سەر خەڵکانی خوزاعە لەسەر ئاوی وەتیر و یەکێك لەوانیان کوشت. شەڕ لەناو دوو هۆزەکە سەری هەڵدا و قورەیشییەکان بەسیلاح هاوکاری مناڵەکانی بەکریان کرد. چەند کەس لەقورەیشییەکان شەوانە و بەنهێنی لەناو

شەڕکەرانی بەکر شەڕیان لەگەڵ خەڵکانی خوزاعە کرد تا ئەوەی خەڵکانی خوزاعە گەیشتنە حەرەم.

بەوتەی واقدی ئەو شەوە سەفوان کوڕی ئومەییە و عیکرەمە کوڕی ئەبی جەهل و سوهەلی کوڕی عەمرۆ سوار لەسەر ئەسپ و کۆیلەکانیان دژی خەڵکانی خوزاعە بەشداری شەڕەکەیان کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك گەیشتنە حەرەم، منداڵەکانی بەکر بەنەوفلیان وت: هەنووکە گەیشتینە حەرەم، ئەی خوایە، ئەی خوایە.

ئەو، قسەیەکی سەیری هێنایە سەرزمان: ئەی منداڵەکانی بەکر، هەنووکە من باوەڕم بەخوا نییە، تۆڵەی خۆتان بستێنن، ئێوە لەناو حەرەم دزی دەکەن، بۆ لەتۆڵە سەندنەوەی خۆتان دەترسن.

لەو شەوەدا منداڵەکانی بەکر لەسەر ئاوی وەتیر هێرشیان کردە سەر خەڵکانی خوزاعە و کەسێك بەناوی مونەبەیان کوشت. مونەبە پیاوێکی بێ دڵ و هاوڕێی یەکێك لەخەڵکەکەی خۆی بەناوی تەمیم کوڕی ئەسەد بوو، پێی وت: ئەی تەمیم، ڕابکە، من دەکوژن یا دامدەنێن تا بمرم. تەمیم ڕۆشت و مونەبەیان گرت و کوشتیان.

کاتێك خەڵکانی خوزاعە ڕۆشتنە ناو مەککە، پەنایان برد بۆ ماڵی بودەیل کوڕی وەرقای خوزاعی و ماڵی یەکێك لەخزمەکانیان بەناوی رافیع.

دەڵێت: قورەیشییەکان بەهاودەستی دژی خەڵکانی خوزاعە پەیمانەکەی پێغەمبەریان خستە ژێر پێ لەبەر ئەوەی خەڵکانی خوزاعە هاوپەیمانی قورەیش بوون. عەمرۆ کوڕی سالمی خوزاعی کەعبی لەمەدینە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێی وت: خەڵکانی خوزاعە موسوڵمانن و ستەمیان لێکراوە. داوای هاوکاری کرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) وتەکانی ئەوی بیست، فەرمووی: هاوکاری دەکرێن. هەمان سات هەورێك لەئاسمانەوە دەرکەوت و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەم هەورە پێشەکی هاوکاری کردنی منداڵەکانی کەعبە.

بودەیل کوڕی وەرقا لەگەڵ چەند کەسێك لەخەڵکانی خوزاعە لەمەدینە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ڕووداوەکەی بۆ باس کرد و هەموویان بۆ مەدینە گەڕانەوە.

پێغەمبەر(د.خ) بەخەڵکانی فەرموو: بەم زوانە ئەبوسوفیان دێت تاماوەی پەیمانەکە درێژ و بەهێزی بکاتەوە.

بودەیل کوڕی وەرقا و هاوڕێکانی لەعەسفان چاویان بەئەبوسوفیان کەوت.

قورەیشییەکان ئەویان ناردبوو تا بڕواتە لای پێغەمبەر(د.خ) و پەیمانەکە بەهێزتر و ماوەکەی درێژ بکاتەوە چوونکە لەخۆیان دەترسان. کاتێك ئەبوسوفیان بودەیلی بینی، وتی: لەکوێوە دێیت؟ زانی لای پێغەمبەر(د.خ) دەگەڕێتەوە.

بودەیل وتی: لەگەڵ خەڵکانی خوزاعە ڕۆشتبووین بۆ ئەو دۆڵە.

وتی: نەڕۆشتبوونە لای محەممەد؟

بودەیل وتی: نە.

بودەیل ڕێگەی مەککەی گرتەبەر، ئەبوسوفیان وتی: ئەگەر ڕۆشتبێتە مەدینە، خورمای بەوشترەکەی خۆیداوە. کاتێك ڕۆشتنە شوێنی خەوتنی وشترەکە، پشکڵێکی هەڵگرت و شکاندی و دەندوکی خورمای تیا بوو، وتی: سوێند بەخوا لای محەممەد بووە.

ئەبوسوفیان گەیشتە مەدینە، ڕۆشتە ماڵی کچەکەی خۆی دایکی حەبیبە و کاتێك ویستی لەسەر ڕاخەڕەکەی پێغەمبەر(د.خ) دانیشت، کچەکەی کۆی کردەوە و ئەبوسوفیان وتی: کچم، نازانم، ڕاخەرەکە شیاوی من نییە یا من شیاوی ڕاخەڕەکە نیم.

دایکی حەبیبە وتی: ئەمە ڕاخەری پێغەمبەرە و تۆ ناباوەڕ و گڵاویت، نەمویست لەسەر ڕاخەری پێغەمبەر(د.خ) دانیشیت.

وتی: سوێند بەخوا کچم لەو کاتەوەی تۆم نەبینیوە، ئاوزت لەدەستداوە.

ئەبوسوفیان ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و قسەی لەگەڵ کرد. پێغەمبەر(د.خ) وەڵامی نەدایەوە. ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و داوای لێکرد قسە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بکات.

ئەبوبەکر وتی: ئەو کارە ناکەم.

ڕۆشتە لای عومەر و قسەی لەگەڵ کرد. عومەر وتی: شیفاعەتی ئێوە لای پێغەمبەر(د.خ) بکەم؟ ئەگەر تەنیا مێروولەکان هاودەستم بن لەگەڵ ئێوە دەجەنگم.

ئەبوسوفیان ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. فاتیمە کچی پێغەمبەر(د.خ) دانیشتبوو. حەسەن کەمناڵ بوو لەباوەشی فاتیمەدا هەڵبەز و دابەزی دەکرد. بەعەلی وت: پەیوەندی خزمایەتی تۆ لەهەموو خەڵکان بەمن نزیکترە، بۆ مەبەستێك هاتوومەتە لای تۆ و نابێت بێ هیوا بگەڕێمەوە، لای پێغەمبەر(د.خ) شیفاعەتی ئێمە بکە.

عەلی وتی: ئەی ئەبوسوفیان، پێغەمبەر(د.خ) مەبەستێکی هەیە و ناتوانین لەوبارەوە قسە بکەین.

ئەبوسوفیان سەیری فاتیمەی کرد و وتی: ئەی کچی محەممەد، دەتوانی بەم کوڕەی خۆت بڵێی پەنای خەڵکان بدات و تا کۆتایی ڕۆژگار سالاری عەرەبەکان بێت.

فاتیمە وتی: سوێند بەخوا هێشتا کوڕەکەم نەگەشتۆتە تەمەنێك پەنای خەڵکان بدات و کەس بێ ڕەزامەندی پێغەمبەر(د.خ) پەنای کەس نادات.

ئەبوسوفیان وتی: ئەی باوکی حەسەن، کارەکان دژوار بوون، ڕێگە چارەیەکم نیشان بدە.

عەلی وتی: سوێند بەخوا هیچ نازانم بەلاَم تۆ سەرکردەی خەڵکانی کەنانەیت، ئاشتی لەنێوان خەڵکان سەقامگیر بکە و بۆ سەرزەمینەکەی خۆت بگەڕێرەوە.

وتی: ئایا ئەم کارە سوودی هەیە.

عەلی وتی: نە، بەلاَم جگە لەمە ناتوانیت هیچ کارێك بکەیت.

ئەبوسوفیان لەمزگەوت هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، من پەنام بەخەڵکان داوە. دواتر سوار وشترەکەی خۆی ڕێگەی مەککەی گرتەبەر و کاتێك گەیشتە لای قوڕەیشییەکان، وتیان: دەنگ و باس؟

وتی: ڕۆشتمە لای محەممەد و قسەم لەگەڵ کرد بەلاَم وەلاَمی نەدامەوە. ڕۆشتمە لای ئەبوبەکر و هیچیی بۆ نەکردم، دواتر ڕۆشتمە لای عومەر کوڕی خەتاب و لەهەموویان زیاتر دوژمنی من بوو. ڕۆشتمە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەهەموویان نەرمتر بوو، پێشنیاری کارێکی پێکرد بەلاَم نازانم سوودی هەیە یا نە؟

وتیان: چ کارێك؟

وتی: پێی وتم: پەنا بەخەڵکان بدە و ئەو کارەم کرد.

وتیان: ئایا محەممەد ئەم کارەی تۆی پەسەند کرد؟

وتی: نە.

وتیان: سوێند بەخوا گەمەی بەئاوزی تۆ کردووە و وتەکەی تۆ هیچ سوودێك بەئێمە ناگەیەنێت.

وتی: جگە لەمە نەمتوانی هیچ کارێك بکەم.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی خەڵکان خۆیان ئامادە و بەکەسەکانی خۆی وت کەرەستەکانی ئامادە بکەن. ئەبوبەکر ڕۆشتە لای عایشەی کچی تا کەرەستەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئامادە بکات و وتی: کچم، پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی کەرەستەکانی بۆ ئامادە بکەن؟

وتی: بەڵێ، تۆیش خۆت ئامادە بکە.

ئەبوبەکر وتی: بۆ کوێ دەڕوات؟

عایشە وتی: سوێند بەخوا نازانم.

پێغەمبەر(د.خ) بەخەڵکانی ڕاگەیاند مەبەستی هێرش کردنە سەر مەککەی هەیە و پێویستە خۆیان ئامادە بکەن. فەرمووی: خوایە ڕێگە لەسیخوڕەکان و گەیشتنی هەواڵ بەقوڕەیشییەکان بگرە تا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەینە سەریان.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بۆ بەرێکەوتن بەرەو مەککە خۆی ئامادە کرد، حاتب کوڕی ئەبی بەلتەعە نامەیەکی بۆ قوڕەیشییەکان نووسی و ئەوانی ئاگادار کردەوە. نامەکەی بەیەکێك لەژنەکانی مەزینە و بەوتەی دەستەیەك بەسارە موالی یەکێك لەمناڵەکانی عەبدولموتەیب دا ڕەوانە کردو بڕێك بەخششی پێدا. ژنەکە نامەکەی لەناو قژیدا شاردەوە و بەرێکەوت.

پێغەمبەر(د.خ) لەئاسمانەوە لەکارەکەی حاتب ئاگادار کرایەوە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب و زوبەیر کوڕی عەوامی نارد و فەرمووی: ئەوژنە بگرن کەنامەی بۆ قوڕەیشییەکان هەڵگرتووە و لەهێرشەکەی ئێمە ئاگاداریان دەکاتەوە.

عەلی و زوبەیر بەرێکەوتن و لەحەلیفە بەژنەکە گەیشتنەوە و ئەویان لەچوارپێکەی هێنایە خوار و کەل و پەلەکانی گەڕان و هیچیان نەدۆزییەوە. عەلی وتی: سوێند دەخۆم پێغەمبەر(د.خ) درۆی نەکردووە و ئێمەیش درۆ ناکەین یا نامەکەمان پێبدە یا تۆ لەگەڵ خۆمان دەگەڕێیننەوە.

کاتێك ژنەکە پێداگری ئەوانی بینی، وتی: بڕۆ ئەو لاوە. عەلی ڕۆشت و ئەو قژی خۆی کردەوە و نامەکەی دەرهێنا و تەسلیمی کردن. نامەکەیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەو بانگی حاتبی کرد وپێی فەرموو: بۆ ئەم کارەت کرد؟

حاتب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من باوەڕم بەخوا و پێغەمبەرەکەی هەیە و نەگۆڕاوم، بەڵام لەناو قوڕەیشییەکان ریشە وعەشیرەم نییە و ژن و مناڵەکانم لەناو ئەوان ژیان بەسەر دەبەن، بەمشێوەیە ویستم لای قوڕەیشییەکان جێگەیەك بۆخۆم بکەمەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ڕێگە بدەم بیکوژم چوونکە خیانەتی کردووە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی عومەر چووزانی، خواوەند سەیری شەڕکەرانی بەدری

کرد و فەرمووی: هەر کارێك ئەنجام دەدەن بیدەن چوونکە ئێوەم بەخشییوە. خواوەند سەبارەت بەحاتب ئەم ئایانەی ڕەوانە فەرموو:

((یا ایها الذین آمنوا لاتتخذواعدوی و عدوکم اولیاء تلقون الیهم بالمودة و قد کفروا بما جائکم من الحق یخرجون الرسول و ایاکم ان تؤمنوا بالله ربکم ان کنتم خرجتم جهادا فی سبیلی و ابتغاء مرضاتی تسرون الیهم بالمودة و انا اعلم بما اخفیتم و ما اعلنتم و من یفعله منکم فقد ضل سواء السبیل. ان یثقفو کم یکونوا لکم اعداء و یبسطوا الیکم ایدیهم و السنتهم بالسوء وودوا لو تکفرون. لن تنفعکم ارحامکم و لا اولادکم یوم القیامة یفصل بینکم و الله بما تعلمون بصیر. قد کانت لکم اسوة حسنة فی ابراهیم و الذین معه اذقالوا لقومهم انا برآء منکم و مما تعبدون من دون الله کفرنابکم و بدابیننا و بینکم العداوة و البغضاء ابدا حتی تؤمنوا بالله وحده الا قول ابراهیم لابیه لاستغفرن لك و ما املك لك من الله من شیء ربنا علیك توکلنا و الیك انبنا و الیك المصیر.

واتاکەی: ئێوە کەباوەڕتان هەیە، دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە هاوڕێ و پلانی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەوان مەڕێژن. لەکاتێکدا ئەوان بەم ڕاستییەی بۆ ئێوە هاتووە، ناباوەڕن و پێغەمبەر(د.خ) لەولآتەکەیان دەردەکەن و ئێوەیش، چوونکە باوەڕتان بەپەروەردگار هێناوە. ئەگەر بۆ جیهاد لەرێگەی ڕاستی و ڕەزامەندی من دەڕۆن (ئەو کارە مەکەن). ئێوە هاوڕێیەتی ئەوان دەشارنەوە و من بۆ ئەوەی دەیشارنەوە، داناترم. هەر کەس لەئێوە ئەم کارە بکات، ڕێگەی ون کردووە وئەگەر ڕووبەڕووی ئێوە ببنەوە، دوژمنانی ئێوەن و دەست و زمانیان دژی ئێوە درێژ دەکەن و حەز دەکەن وەك خۆیان کافر بن. ڕۆژی هەستانەوە نە خزمەکان و نە منالەکانتان سوودتان پێناگەیێنن. خواوەند دووری لەنێوان ئێوە دروست دەکات و بۆ ئەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن، بینایە. ئیبراهیم و ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەودا بوون بۆ ئێوە پێشەوایەکی شیاون کاتێك بەخەڵکەکەی خۆیان وت: ئێمە لەئێوە و ئەو بتانەی وەك خوا دەیانپەرەستن، بێزارین و بۆ هەمیشە دوژمنایەتی و ڕق و کێنە لەنێوانماندایە تا ئەو کاتەی تەنیا باوەڕ بەخوا بێنن (دۆستایەتی لەنێوان ئەواندا بوونی نەبوو) جگە لەوتاری ئیبراهیم لەگەڵ باوکی کەوتی داوای لێخۆشبوونت لەخواوەند بۆ دەکەم و لەبەرابەر خوا ناتوانم هیچ کارێك بۆ تۆ ئەنجام بدەم، پەروەردگارا، پشت بەتۆ دەبەستین و بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە و سەرئەنجامی هەمووان گەڕانەوە بۆ لای تۆیە.))

کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ڕێگەی سەفەری گرتەبەر و باوکی ڕۆهم کولسوم کوڕی حوسیەنی غەفاری وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا. ڕۆژی دەی ڕەمەزان بوو. پێغەمبەر(د.خ) و خەڵکان بەڕۆژوو بوون و کاتێك گەیشتە کەدید، لەنێوان عەسفان و ئەمیم، ڕۆژووی شکاند. بەرێکەوت تا لەمورئەلزەهران دابەزی و دەهەزار کەس لەموسوڵمانان هاوڕێیەتیان دەکرد. خەڵکانی سەلیم و موزەینە و لەهەر هۆزێك ژمارەیەکی لەموسوڵمانان هاتبوون. هەموو موهاجیر و ئەنسارەکان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بوون و کەسیان لەشارەکە نەمابوویەوە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەموڕەئەلزەهران دابەزی، هێشتا قوڕەیشییەکان بێ ئاگابوون و نەیاندەزانی چی دەکات. لەو شەوەدا ئەبوسوفیان کوڕی حەرب و حەکیم کوڕی حەزام و بەدیل کوڕی وەرقا هاتنەدەر بۆ ئەوەی هەواڵێکیان دەستکەوێت.

عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب لەرێگە چاوی بە پێغەمبەر(د.خ) کەوت و ئەبوسوفیان کوڕی حارس و عەبدوللە کوڕی ئەبی ئومەییە کوڕی موغەیرە لەنیق ئەلعیقاب لەرێگەی نێوان مەککە و مەدینە ویستیان بڕۆنە لای پێغەمبەر(د.خ). دایکی سەلمە سەبارەت بەوان قسەی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کرد، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئامۆزا و کوڕە پوڕ و زاواکانی تۆن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کارم بەوان چییە، کوڕە مامەکەم ڕێزی شکاندم و کوڕە پوور و زاواکەم ئەو کەسانەن لەمەککە زمانیان بۆ جوێندان بەمن دەکردەوە.

کاتێك ئەو دووانە لەوتەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوونەوە، ئەبوسوفیان کوڕی حارس کەمناڵەکە کەم تەمەنەکەی خۆی پێبوو، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ڕێگە نەدات بیبینم، دەستی مناڵەکەم دەگرم و سأەرگەردان لەسەر زەوی دەسوڕێمەوە تا ئەو کاتەی لەبرسییەتی و تینوویەتی دەمرم.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەم قسەیە ئاگادار بوویەوە، بەزەیی بەواندا هاتەوە و مۆڵەتی پێدان بڕۆنە لای و باوەڕیان هێنا.

واقدی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی هێرش کردنە سەر مەککەی کرد، دەستەیەك دەیانوت: مەبەستی قوڕەیشی هەیە. دەستەیەك دەیانوت: دەیەوێت هێرش بکاتە سەرهوازین. دەستەیەك دەیانوت: بەرەو سەقیف دەڕوات. پێغەمبەر(د.خ) نێردراوی خۆی بۆ لای دەستەیەك لەهۆزەکان ڕەوانە کرد کەنەهاتن و ئالأیان نەبەست تا

گەیشتنە قەدید و منداڵەکانی سولەیم بەئەسپ و سیلاحی تەواوە هاتن. عۆیەیینە لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانی لەعەرج پەیوەستی پێغەمبەر(د.خ) بوو. ئەقرەع کوڕی حابس لەسەقیا پەیوەستی بوو. عۆیەیینە بە پێغەمبەری وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، نەکەڕەستەی شەڕت هەیە، نەجل و بەرگی ئیحرامت پۆشیوە، بۆ کوێ دەڕۆیت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەر شوێنێك خوا بیەوێت.

پێغەمبەر(د.خ) دوعای کرد بۆ ئەوەی قوڕەیشییەکان ئاگادار نەبنەوە. عەباس لەسەقیا گەیشتە لای پێغەمبەر(د.خ)و مەخزیمە کوڕی نەوفل لەنیق ئەلعیقاب ڕۆشتە لای. کاتێك لەمورە ئەلزەهران دابەزی، ئەبوسوفیان کوڕی حەرب لەمەککە هاتبووەدەر.

کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەمەدینەوە بەڕێکەوت و لەمورە ئەلزەهران دابەزی، عەباس وتی: سوێند بەخوا ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکاتە سەر مەککە بۆ هەمیشە لەناو دەچن. سوار ئێسترە سپییەکەی پێغەمبەر(د.خ) بوو، بەخۆی وت: بەرەو ئەو ڕەزە دەڕۆم ئەگەری هەیە کۆڵبەرێك یا شیردۆشێك ببینم و بینرێم بۆ مەککە بۆ ئەوەی قوڕەیشییەکان لەهاتنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بکاتەوە تا بێن و داوای ئەمانی لێ بکەن.

دەڵێت: ڕۆشتم و لەناو ڕەزەکەدا دەگەڕام تا کەسێك بدۆزمەوە. لەناکاو دەنگی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب و بودەیل کوڕی وەرقام بیست کە بەمەبەستی بەدەست هێنانی هەواڵەکانی پێغەمبەر(د.خ) هاتبوونەدەر. بیستم، ئەبوسوفیان دەیوت: سوێند بەخوا هیچ کات ئاگرێکی بەو گەورەییەم نەبینیوە، ئەمە ئاگری خەڵکانی خوزاعەیە.

وتی: بەلاّم خەڵکانی خوزاعە لەوە زۆر کەمترن.

کاتێك دەنگی ئەوم ناسییەوە وتم: ئەی باوکی حەنزەلە.

ئەبوسوفیان وتی: باوکی فەزڵیت؟

وتم: بەڵێ.

وتی: دایك و باوکم قوربانت بن، چ هەواڵێکت پێیە؟

وتم: پێغەمبەرە و لەگەڵ دەهەزار موسوڵمان هاتووە ناتوانن لەبەرابەر ئەو خۆڕاگری بکەن.

وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتم: لەپشت سەری من سوار ئەم ئێسترەبە تا ئەمانت لە پێغەمبەر(د.خ) بۆ وەربگرم چوونکە سوێند بەخوا ئەگەر دەستی بەتۆ بگات، دەتکوژێت.

دەڵێت: ئەبوسوفیان لەپشت سەری من سەرکەوت. ئێسترەکەی پێغەمبەرم غاردا وپۆشتینە لای. لەرێگا کاتێك لای ئاگری موسوڵمانان تێدەپەڕیین، سەیریان دەکرد و دەیانوت: مامی پێغەمبەر(د.خ) سوار ئەسپەکەی پێغەمبەر(د.خ) بووە.

کاتێك گەیشتینە لای ئاگرەکەی عومەر کوڕی خەتاب، وتی: ئەوە ئەبوسوفیانە، سپاس بۆخوا چوونکە بێ پەیمان و بەڵێن تۆی خستە بەردەستی من. عومەر بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) رایکرد. منیش ئێسترەکەم غارپێدا تا گەیشتینە خێوەتی پێغەمبەر(د.خ). لەگەڵ عومەر پێکەوە پۆشتینە لای پێغەمبەر(د.خ)، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەوە ئەبوسوفیانی دوژمنی خوایە، بێ بەڵێن هاتۆتە بەردەستی تۆ، رێگە بدەم سەری بپەڕێنم.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من پەنام داوە. لای پێغەمبەر(د.خ) دانیشتم وسەریم گرت، وتم: سوێند بەخوا کەس جگە لەمن بەگوێی ئەودا ناچرپێنێت.

کاتێك عومەر سەبارەت بەکوشتنی ئەبوسوفیان پێداگری دەکرد، وتم: ئەی عومەر، ئارام بە، سوێند بەخوا بۆیە پێداگری دەکەیت چوونکە یەکێکە لەمناڵەکانی عەبدمەناف، ئەگەر لەمناڵەکانی عودەی کوڕی کەعب دەبوو، قسەت نەدەکرد.

عومەر وتی: ئەی عەباس ئارام بە، سوێند بەخوا کاتێك باوەڕت هێنا، بەئەندازەیەك لەباوەڕی تۆ شادمان بووم، ئەگەر باوکم، خەتاب، باوەڕی دەهێنا، بەو ئەندازەیە شادمان نەدەبووم. چوونکە دەمزانی پێغەمبەر(د.خ) لەباوەڕ هێنانی تۆ زیاتر لەباوەڕ هێنانی خەتاب شادمان دەبێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڕۆ، ئەمانمان پێدا و بەیانی بیهێنە.

عەباس ئەبوسوفیانی لەخێوەتەکەی خۆیدا جێگە کردەوە و بەیانی بردی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ). کاتێك سەیری کرد فەرمووی: ئەی ئەبوسوفیان ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە شایەتی بدەیت خوایەك جگە لەخوای محەممەد بوونی نییە؟

ئەبوسوفیان وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆبن، چەند خزمێکی وەفادار و خۆڕاگریت، سوێند بەخوا ئەگەر خوایەکی دیکە بوونی دەبوو، کارێکی بۆ من ئەنجامدەدا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بزانی من پێغەمبەری خوام؟

وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆبن، شتێك لەدڵمدا دروست بووە.

عەباس دەڵێت: پێم وت، پێش ئەوەی بتکوژن، شایەتوومان بێنە. ئەبوسوفیان شایەتوومانی هێنا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی عەباس بیبە و نزیك لووتکەی کێوەکە لەناو دۆڵەکە بیوەستێنە تا سوپای خوا لای ئەو تێپەڕێت.

وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەبوسوفیان پیاوێکە ئارەزووی سەرفرازی دەکات، کارێك بکە لەناو خەڵکەکەی سەرفراز بێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: زۆر باشە، هەرکەس بڕواتە ماڵی ئەبوسفیان لەئەماندایە، هەرکەس بڕواتە مسجد الحرام لەئەماندایە و هەرکەس دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی دابخات، لەئەماندایە.

دەڵێت: ئەبوسوفیانم برد و لەو شوێنە دامنا. هۆزەکان بەبەردەمی تێدەپەڕین، دەیپرسی: ئەی عەباس ئەمانە کێن؟

دەموت: هۆزی سولەیمە.

دەیوت: کارم بەسولەیم چییە؟

هۆزێکی دیکە دەهات و دەیپرسی: ئەمانە کێن.

دەموت: هۆزی ئەسلەمە.

دەیوت: کارم بەئەسلەم چییە؟

هۆزی جوهەینە تێپەڕی وپرسی: ئەوانە کێن؟

وتم: هۆزی جۆهەینە.

دەیوت: کارم بەهۆزی جۆهەینە چییە؟

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ دەستەیەکی سەوز تێپەڕی، کە لەموهاجیر وئەنسار پێکهاتبوون و هەموویان چەکدار و تەنیا چاویان دەبینرا، ئەبوسوفیان پرسی: ئەی باوکی فەزڵ ئەمانە کێن؟

وتم: پێغەمبەر(د.خ) و موهاجیر و ئەنسار.

وتی: ئەی باوکی فەزل، برازاکەت پاشایەتییەکی گەورەی هەیە.

وتم: ئەمە پێغەمبەرییە نەك پاشایەتی.

وتی: ڕاستە.

وتم: بۆ لای سەرکردەکانی خەڵکەکەت بڕۆ وئاگاداریان بکەرەوە.

بەخێرایی ڕۆشت و ڕووی کردە مسجد الحرام و هاواری کرد: ئەی قوڕەیشییەکان،

محەممەد بەسوپایەك هاتووە و ناتوانن لەبەرابەری خۆڕاگری بکەن.

وتیان: چی بکەین؟

وتم: هەرکەس بڕواتە ماڵەکەی من پارێزراوە.

وتیان: ماڵەکەی تۆ بەکەڵکی ئێمە نایەت.

وتم: هەرکەس بڕواتە مسجد الحرام، پارێزراوە و هەرکەس دەرگای ماڵەکەی بەسەر خۆیدا دابخات، پارێزراوە.

هوشام کوڕی عوروە دەڵێت: باوکم بۆ عەبدولمەلیك کوڕی مەروانی نووسی: لەمنت پرسیبوو ئایا خالید کوڕی وەلید لەرۆژی گرتنی مەککە هێرشی برد و هێرشەکەی بەفەرمانی کێ بوو؟ ئەو لەرۆژی گرتنی مەککە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ)بوو. گەیشتە دۆڵی موڕ و مەبەستی مەککەی کرد. قورەیشییەکان ئەبوسوفیان و حەکیم کوڕی حەزامیان نارد تا پێغەمبەر(د.خ) ببینین. لەو کاتەدا نەیاندەزانی مەبەستی پێغەمبەر(د.خ) کوێیە، هێرش دەکاتە سەر ئەوان یا بەرەو تاییف دەڕوات. ئەبوسوفیان و حەکیم کوڕی حەزام بودەیل کوڕی وەرقایان لەگەڵ خۆیان برد چوونکە هاودەمی ئەویان پێخۆش بوو. قورەیشییەکان کاتێك ئەوانیان ڕەوانە کرد، وتیان: بزانن مەترسیمان لەسەرە چوونکە نازانین مەبەستی محەممەد کوێیە، هێرش دەکات سەر ئێمە یا هوازین یا سەقیف.

ئاشتی حۆدەیبییە لەنێوان پێغەمبەر(د.خ) و قورەیشییەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەرپا بوو. مناڵەکانی بەکر پەیوەستی قورەیشییەکان بوون. دەستەیەك لەمناڵەکانی کەعب لەگەڵ تایەفەی مناڵەکانی بەکر شەڕیان کرد. لەپەیمانی ئاشتی حۆدەیبییە باس کرابوو هەردوو لا دەست لەشەڕی یەکترهەڵبگرن. قورەیشییەکان بەسیلاح هاوکاری مناڵەکانی بەکریان کرد و مناڵەکانی کەعب لەم کارە ئاگادار بوونەوە و لەبەر ئەمە پێغەمبەر(د.خ) بۆ گرتنی مەککە بەرێکەوت و لەم شەڕەدا لەموڕەئەلزەهران ئەبوسوفیان و حەکیم و بودەیلی بینی و ئەوان نەیاندەزانی پێغەمبەر(د.خ) لەکوێ دابەزیوە تا لێی نزیك کەوتنەوە. لەموڕ ئەبوسوفیان و حەکیم ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بۆ لای قورەیش نارد و پێشنیاری ئیسلامی پێکردن. بیرمە وتی: هەرکەس بڕواتە ماڵی ئەبوسوفیان پارێزراوە، (ماڵی ئەبوسوفیان لەسەرەوەی مەککە بوو) هەرکەس بڕواتە ماڵی حەکیم، پارێزراوە (ماڵی حەکیم لەخوارەوەی مەککە بوو) هەرکەس دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی دابخات و شەڕ نەکات،

لەئەماندایە.

کاتێك ئەبوسوفیان و حەکیم لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕانەوە و بەرەو مەککە بەڕێکەوتن، پێغەمبەر(د.خ) زوبەیری بەدوای ئەواندا نارد و ئالآکەی خۆی پێدا. ئەوی کردە سەرکردەی موهاجیر و ئەنسارەکان و فەرمانی پێدا ئالآکەی لەسەرەوەی مەککە لەحەجوون هەڵواسێت، فەرمووی: لەو شوێنە بمێنەرەوە مەڕۆ، تا دێمە لات.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ناو مەککەو بەخالید کوڕی وەلیدو موسوڵمانەکانی قوزاعەو مناڵەکانی سولەیم و کەسانێتر کەتازە باوەڕیان بەئیسلام هێنابوو، فەرموو: لەخوارەوەی مەککەوە بڕۆنە ناو شارەکە چوونکە مناڵەکانی بەکر لەوێ بوون. قوڕەیشییەکان ئەوان و مناڵەکانی حارس کوڕی عەبدمەنات و حەبەشییەکانیان بۆ هاوکاری بانگ کردبوو. پێیان وتبوون: لەخوارەوەی مەککە جێگیر بن. خالید کوڕی وەلید لەخوارەوەی مەککە هێرشی کردە سەرئەوان.

بیستم: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) زوبەیر و خالید کوڕی وەلیدی ڕەوانە کرد، فەرمووی: تا کەس شەڕی لەگەڵ ئێوە نەکردووە، شەڕ لەگەڵ کەس مەکەن. کاتێك خالید لەخوارەوەی مەککە لەمناڵەکانی بەکر و حەبەشییەکان نزیك کەوتەوە، شەڕی دەستپێکرد و خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشی. لەم شەڕە زیاتر لەمەککە شەڕ ڕوویندا جگە لەکورز کوڕی جابری موحاربی و کوڕی ئەشعەری کەعبی کە لەناو سوپاکەی زوبەیردا بوون و لەکەدا پەڕینەوە و لەڕێگەی زوبەیر کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدابوون، لەوێوە نەڕۆن، ڕۆشتن و ڕووبەڕوی دەستەیەك لەقوڕیشیەکان بوونەوە و کوژران. لەسەرەوەی مەککە و لەشوێنەکەی زوبەیر شەڕ ڕوویندا. پێغەمبەر(د.خ) لەوێوە ڕۆشتە ناو مەککە، خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و بەیعەتیان بەست. پێغەمبەر(د.خ) نزیکەی پانزە شەو لەمەککە مایەوە تا کاتێك خەڵکی هوازین و سەقیف لەحەنین دابەزین.

عەبدوللە کوڕی ئەبی نەجیح دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) سوپاکەی خۆی لەزی تەوا دابەش کرد، بەزوبەیری فەرموو: لەگەڵ دەستەیەك لەشەڕکەران بڕواتە ناو کەدی و زوبەیر فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاکەی خۆی بوو، فەرمانی بەسەعد کوڕی عوبادەدا لەگەڵ دەستەیەك لەشەڕکەران بەرەو کەدا بڕوات و دەستەیەك لەموسوڵمانان گومانیان کردووە ئەو ڕۆژەی سەعد بەڕێکەوت، دەیوت: ئەمڕۆ ڕۆژی جەنگە، ئەمڕۆ ڕێز نامێنێت.

یەکێك لەموهاجیرەکان ئەم قسەی بیست و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) ببیستە، سەعد

کوڕی عوبادە چی دەڵێت، دەترسم هێرش بکاتە سەر قوڕەیشییەکان.

پێغەمبەر(د.خ) بەعەلی کوڕی ئەبی تالیبی فەرموو: خۆت بەسەعد بگەیێنە و ئاڵاکەی لێوەربگرە و خۆت بەرەو مەککە بەرێکەوە.

هەروەها لە عەبدوللە کوڕی ئەبی نەجیح دەگێڕنەوە:پێغەمبەر(د.خ) بەخالید کوڕی وەلیدی فەرموو لەگەڵ دەستەیەك لەخوارەوە بەرەو مەککە بڕوات. ئەو فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاکەی بوو. نەتەوەی ئەسلەم و غەفار و موزەینە و جۆهەینە و دەستەیەك لەهۆزەکانی دیکە لەناو سوپاکەی خالیددا بوون. باوکی عوبەیدەی جەڕاح لەریزی موسوڵمانان لەپێش پێغەمبەر(د.خ) ڕۆیشتە ناو مەککە و پێغەمبەر(د.خ) لەئەزاخەرەوە ڕۆشتە ناو شارەکە. خێوەتی ئەویان لەسەرەوەی مەککە هەڵدا.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: سەفوان کوڕی ئومەییە و عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل و سوهەیل کوڕی عەمرۆ، دەستەیەکیان لەخێندەمە کۆکردبووەوە تا شەڕ بکەن. حیماس کوڕی قەیسی بەکری پێش ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) بڕواتە ناو مەککە، سیلاحی ئامادە و سەرقاڵی تیژکردنی بوو، هاوسەرەکەی پێی وت: بۆچی ئامادەی دەکەیت؟

حیماس وتی: بۆ محەممەد و هاوەڵانی ئەو.

وتی: گومان ناکەم هیچ شتێك بتوانێت خۆڕاگری لەبەرابەر محەممەد و سوپاکەی ئەودا بکات.

وتی: هیوادارم یەکێك لەوان بێنمە خزمەتی تۆ. حیماس لەگەڵ سەفوان کوڕی ئومەییە و سوهەیل کوڕی عێکرەمە لەخێندەمەدا بوو. کاتێك موسوڵمانان ڕووبەڕوویان بوونەوە، شەڕ دەستی پێکرد و کێرز کوڕی جابر و خونەیس کوڕی خالید کەلەناو سوپاکەی خالیددا بوون، لێی جیابوونەوە و ڕێگەیەکی دیکەیان گرتەبەر وکوژران. خونەیس پێش کێرز کوژرا و کێرز لاشەی کوژراوی ئەوی لەنێوان قاچەکانی خۆیدانا و شەڕی کرد تا کوژرا. لەهۆزی جۆهەینە موسلیمە کوڕی مەیلا کوژرا کەلەناو سوپاکەی خالیددا بوو. لەناباوەڕان نزیکەی دوانزە یا سیانزە کەس کوژران. شکستیان خوارد و حیماس هەڵات تا گەیشتەماڵەوە، بەهاوسەرەکەی وت: دەرگای ماڵەوە ببەستە.

هاوسەرەکەی وتی: ئەی کوا خزمەتکارەکە؟

وتی: ئەگەر دەتبینی سەفوان و ئومەییە هەڵاتن و شمشێری ئەوان لەناوماندا سووڕا و دەست و سەرەکان قرتاند، سەرکۆنەت نەدەکردم.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەسەرکردەکانی سوپاکەی خۆی فەرمووبوو: تا ئەوان شەڕ دەستپێنەکەن، ئێوە شەڕ نەکەن. بەلاّم ناوی چەند کەسێکی برد و فەرمووی: ئەگەر تەنانەت لەژێر پەردەکانی کەعبەدا ئەوانتان گرت، خوێنیان برێژن.

عەبدولله کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح یەکێك بوو لەوان. ئەو، پێشتر باوەڕی بەئیسلام هێنابوو و دواتر پەشیمان بوویەوە. لەرۆژی مەککە هەلاّت و پەنای بۆ عوسمان برد چوونکە بەشیر برای یەکبوون. عوسمان ئەوی شاردەوە و کاتێك مەککە ئارامی گرت، ئەوی بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و داوای ئەمانی بۆ کرد. پێغەمبەر(د.خ) ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، دواتر فەرمووی: ئەمانی هەیە.

کاتێك عوسمان عەبدوللەی برد، پێغەمبەر(د.خ) بەکەسانی دەوروبەری خۆی فەرموو: سوێند بەخوا بۆیە بێدەنگ بووم تا یەکتان هەستێت و خوێنی برێژێت.

یەکێك لەئەنسارییەکان وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئیشارەت نەکرد؟

فەرمووی: پێغەمبەر(د.خ) ئیشارە لەکەس ناکات.

عەبدولله کوڕی خوتەل یەکێك بوو لەوانەی پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی کوشتیندا. ئەو، پێشتر موسوڵمان و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ وەرگرتنی زەکات نارد و یەکێك لەئەنساری کردە هاورێی. عەبدولله کۆیلەیەکی بوو وخزمەتی دەکرد. لەماڵێك دابەزین و بەکۆیلەکەی خۆی وت، بزنێك سەر ببڕێت و خواردنێکی بۆ ئامادە بکات. عەبدولله خەوت و کاتێك هەستا کۆیلەکەی هیچ کارێکی نەکردبوو. ئەوی کوشت و لەموسوڵمانی پەشیمان بوویەوە. دوو کەنیزی بوو گۆرانییان بۆ دەخوێند. یەکیان ناوی فەرتنا و لەگۆڕانییەکانی ئیهانەی پێغەمبەری دەکرد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوو کەنیزەکەیش بکوژن.

حویریس کوڕی نەقیز یەکێك بوو لەو کەسانەی فەرمانی کوشتنی درابوو چوونکە پێغەمبەری لەمەدینە ئەزییەت دەکرد.

مەقیس کوڕی سوبابەیش یەکێك بوو لەوان لەبەر ئەوەی یەکێك لەئەنسار بەهەڵە براکەی کوشت. ئەو ئەنساری کوشت و پەیوەستی قورەیشییەکان بوویەوە و پشتی ئایینی کردە ئیسلام.

عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل و سارەی کەنیز یەکێك لەمناڵەکانی موتەلیب، پێغەمبەریان(د.خ) ئەزەییەت دەکرد، ئەوانیش فەرمانی کوشتنیان درابوو. عێکرەمە بۆ

یەمەن هەڵات و ژنەکەی دایکی حەکیم کچی حارس کوڕی هوشام باوەڕی هێنا و داوای ئەمانی بۆ کرد. پێغەمبەر(د.خ) رازی و ژنەکە ڕۆشت و ئەوی هێنایە لای پێغەمبەر(د.خ).

دەڵێن: هۆکاری ئەوەی عیکرەمە دوای هەڵاتن بۆ یەمەن باوەڕی هێنا، ئەمەیە: وتبووی: ویستم سوار کەشتی بم و بەرەو حەبەشە برۆم. کاتێك لەکەشتییەکان نزیك کەوتمەوە، کەشتی ئاژۆ وتی: ئەی بەندەی خوا، تۆ باوەڕ ناهێنیت و ناباوەڕیت، سوار کەشتییەکەی من مەبە چوونکە گەر سەرکەوتیت، هەمووومان لەناو دەچین.

وتم: کەس سوار کەشتییەکەی تۆ نابێت مەگەر ئەوەی پەشیمان و باوەڕ بێنێت؟

وتی: بەڵێ، کەس سەرناکەوێت جگە لەباوەڕداران.

بەخۆم وت: کەواتە بۆ لە محەممەد جیابوومەوە، ئەو دەڵێت خوای ئێمە لەدەریا و وشکانی یەکێکە، ئیسلامم ناسی و باوەڕم هێنا.

عەبدوللە کوڕی خوتەلیان گرت. سەعید کوڕی حورەیسی مەخزومی و باوکی بوریدەی ئەسلەمی ئەویان کوشت.

مەقیس کوڕی سوبابە بەدەستی نەمیلە کوڕی عەبدوللە کوژرا. یەکێك بوو لەخەڵکەکەی خۆی.

یەکێك لەدوو کەنیزەکەی کوڕی خوتەلیان کوشت و ئەوی دیکەیان هەڵات. دواتر ئەمانیان بۆ وەرگرت.

ئەمانیان بۆ سارەیش وەرگرت. زیندوو مایەوە تا لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب لەژێر سمی ئەسپ گیانیدا.

حویریس کوڕی نەقیز بەدەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا.

واقدی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا بوو شەش پیاو و چوار ژن بکوژن. باسی ئەو پیاوانە دەکات کە لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق باسمان کرد بەڵام ژنەکان هیند کوڕی عوتەبە کوڕی رەبیعەی پێ زیاد دەکات. ئەو، باوەڕی هێنا و بەیعەتی کرد. سارە کەنیزی عەمرۆ کوڕی هاشم کوڕی عەبدولموتەلیب کوژرا، قورەیبە کوژرا و فەرتنا تا رۆژگاری عوسمان زیندوو بوو.

قتادەی سەدووسی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەبەردەم کەعبەدا وەستا و فەرمووی: خوایەك جگە لەخوای تاقانەی بێ شەریك بوونی نییە، بەڵێنەکانی خۆی بردەسەر و

سەرکەوتنی بەبەندەکەی خۆی بەخشی و ئەحزابی شکستدا. بزانن هەر ئیمتیاز و خوێن و سامانێك جگە لەپەردەداری و ئاوەدانی حاجییەکان، چیتر برەویان نابێت. بزانن، کوشتنی بەهەڵە هاوشێوەی کوشتنی بەئەنقەستە. کوژراو بەقامچی و داردەست، خوێنبایی هەیە. ئەی قورەیشییەکان، خواوەند غرووری جاهلییەت و شانازی کردن بەباوکانی لەناو برد. خەڵکان لەئادەمن و ئادەمیان لەگڵ ئافڕاندووە، دواتر ئەم ئایەی خوێندەوە:

((یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر و انثی و جعلناکم سعوبا و قبائل لتعارفوا ان اکرمکم عندالله اتقاکم.

واتاکەی: ئەی خەڵکینە، ئێوەمان لەژن و پیاوێك ئافڕاند بۆ هۆز و دەستەکان دابەشمان کرد تا یەکتر بناسن چوونکە ڕێزدارترینی ئێوە لای خواوەند خۆپارێزترینی ئێوەیە.))

فەرمووی: ئەی قورەیشییەکان، ئەی خەڵکانی مەککە، گومان دەکەن چی لەئێوە دەکەم؟

وتیان: چاکەمان لەگەڵ دەکەیت چوونکە برایەکی ڕێزدار و برازایەکی ڕێزداریت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڕۆن ئێوە ئازادن.

خواوەند پێغەمبەری بەسەر گیانی ئەواندا زاڵ کرد. ئەسیری جەنگ بوون و تالآنی پێغەمبەر(د.خ). بەلآم ئازادی کردن لەبەر ئەمە بەخەڵکانی مەککەیان دەوت: ئازاد بووەکان.

دوای ئەوە خەڵکانی مەککە بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کۆبوونەوە. پێغەمبەر(د.خ) دانیشت و عومەر کوڕی خەتاب لەخوارەوەی ئەو دانیشتبوو. چاودێری کەسەکانی دەکرد. خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەست لەسەر ئەو بنەمای تا ئەو شوێنەی دەتوانن شوێنکەوتەو گوێڕایەڵی فەرموودەکانی خواوەند و پێغەمبەر(د.خ) بن.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەبەیعەت کردن لەگەڵ پیاوەکان تەواو بوو، لەگەڵ ژنان بەیعەتی کرد. دەستەیەك لەژنانی قورەیش بۆ بەیعەت بەستن هاتن. هیند کچی عوتەبە یەکێك بوو لەوان. بەهۆی ئەو کارەی لەگەڵ حەمزە کردی، دەمامکی هەڵبەست و بەشێوەیەکی نەناسراو ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ). دەترسا پێغەمبەر(د.خ)

لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات. کاتێك ژنان بۆ بەیعەت نزیك بوونەوە، فەرمووی: لەگەڵ من بەیعەت بکەن لەسەر ئەو بنەمای شەریك بۆ خواوەند دانەنێن؟

هیند وتی: داوای شتێك لەئێمە دەکەیت کەلەپیاوان داوات کرد. ئەو کارە دەکەین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: و دزی نەکەن.

هیند وتی: سوێند بەخوا لەسامانی ئەبوسوفیانم هەڵگرتووە بەڵام نازانم حەڵاڵ بوون یا نە؟

ئەبوسوفیان ئامادە بوو، وتی: ئەوەی هەڵتگرتووە، حەڵاڵت بێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تۆ هیند کچی عوتەبەیت؟

وتی: من هیند کچی عوتەبەم، لەرابردوو چاوبپۆشە تاخوا لێت خۆش بێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: زینا نەکەن.

هیند وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، مەگەر ژنی ئازادە زینا دەکات؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: منداڵەکانی خۆتان مەکوژن.

هیند وتی: ئێمە بەبچوکی پەروەردەمان کردن و تۆ لەرۆژی بەدر خوێنی ئەوانت رۆشت، تۆ و ئەوان باشتر دەزانن. عومەر کوڕی خەتاب لەقسەکەی ئەو قاقا پێکەنی.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تۆمەتی ناڕەوا هەڵنەبەستن.

هیند وتی: تۆمەت هەڵبەستن کارێکی قێزەون و لێخۆشبوون باشترە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەکارە ڕاستەکان نافەرمانی من نەکەن.

هیند وتی: ئەگەر مەبەستی ئەو کارەمان دەبوو، ئێستا لێرە دانەدەنیشتین.

پێغەمبەر(د.خ) بەعومەری فەرموو: بەیعەتیان لەگەڵ ببەستە و دوای بەخشینی بۆ ژنەکان کرد. عومەر بەیعەتی لەگەڵ بەستن. پێغەمبەر(د.خ) دەستی لەگەڵ ژنان لێنەدەدا مەگەر ئەو ژنەی بۆ ئەو حەڵاڵ یا مەحرەمی بێت.

ئەبان کوڕی سالح دەڵێت: بەیعەتی ژنان دوو جۆر بوو. یەکیان ئەوەی دەفرێکی ئاویان خستە بەردەم پێغەمبەر(د.خ) و کاتێك مەرجەکانی بەیعەتی ژنانی باس کرد و ژنان رازی بوون، دەستی کردە ناو ئاوەکە و ژنانیش دەستیان کردە ناو ئاوەکە بەڵام دوای ئەوە کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەرجەکانی بەیعەتی باس دەکرد، دەیفەرموو: بڕۆن و بەبەیعەتی ئێوە رازی بووم.

زیاتر لەمە نەبوو.

واقدی دەڵێت: لەم ناوەدا خەراش کوڕی ئومەییەی کەعبی جونەید کوڕی ئەدلەعی کوشت و بەوتەی کوڕی ئیسحاق لەبەر تۆڵەیەك بوو کە لەرۆژگاری جاهلییەتەوە لەنێوان ئەواندا مابوویەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خەراش پیاوکوژە، خەراش پیاوکوژە. بەمشێوەیە سەرکۆنەی ئەوی دەکرد. بەخەڵکانی خوزاعەی وت خوێنبایی کوژراوەکە بدەن.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: سەفوان کوڕی ئومەییە بەرەو جەدە رۆشت تا لەوێوە بەکەشتی بۆ یەمەن بڕوات. عومەیر کوڕی وەهب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سەفوان کوڕی ئومەییە سەرکردەی خەڵکەکەیەتی و هەڵاتووە، دەیەوێت خۆی بخاتە ناو دەریا، ئەمانی پێببەخشە، خوات بتبەخشێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەمانی پێبەخشراوە.

عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) شتێك بدە بەمن تا ئەمانەکەی تۆ بناسێتەوە.

پێغەمبەر(د.خ) جامانەکەی خۆی پێدا کە لەکاتی ڕۆشتن لەمەککە لەسەریدا بوو. عومەیر بەرێکەوت تا سەفوانی لەجەدە دۆزییەوە و دەیویست بڕواتە ناو دەریا، وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆ بن، خۆت مەخەرە مەترسییەوە، پێغەمبەر(د.خ) ئەمانی پێبەخشیوی.

سەفوان وتی: دووركەوە و قسەم لەگەڵ مەکە.

عومەیر وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆ بن، کوڕە پوورەکەی تۆ چاکتر و باشتر و خۆڕاگرتر لەهەمووانە، گەورەیی ئەو گەورەیی تۆیە، شەرەفی ئەو شەرەفی تۆیە و پاشایەتی ئەو پاشایەتی تۆ.

وتی: لەگیانی خۆم دەترسم.

عومەیر وتی: ئەو خۆڕاگرتر لەوەیە. ئەوی بردە لای پێغەمبەر(د.خ). سەفوان وتی: ئەمە دەڵێت: تۆ ئەمانت بەمن بەخشیوە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: راست دەکات.

وتی: دوو مانگ مۆڵەتم پێبدە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چوار مانگ مۆڵەتت هەیە.

زوهری دەڵێت: دایکی حەکیم کوڕی حارس کوڕی هوشام، هاوسەری عێکرەمە کوڕی ئەبوجەهل و فاختە کچی وەلید، ژنی سەفوان کوڕی ئومەییە باوەڕیان هێنا ودایکی حەکیم داوای ئەمانی بۆ عێکرەمە کرد. پێغەمبەر(د.خ) رازی بوو. دایکی حەکیم

ڕۆشتە یەمەن و عێکرەمەی گەڕاندەوە. کاتێك عێکرەمە و سەفوان باوەڕیان هێنا، پێغەمبەر(د.خ) مارەکردنی ژنەکانیانی وەك خۆی هێشتەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ناو مەککە، هوبەیرە کوڕی ئەبی وەهبی مەخزومی و عەبدوللە کوڕی زەبعەری سەهمی بۆ نەجران هەڵاتن. حسان کوڕی سابت هۆنراوەیەکی بۆ سەرکۆنە کردنی کوڕی زەبعەری و مانەوەی ئەو لەنەجران هۆنییەوە. کاتێك هۆنراوەکەی بیست، بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و باوەڕی هێنا. هوبەیرە لەنەجران و لەسەر ناباوەڕی خۆی مایەوە و کاتێك ئاگادار بوویەوە دایکی هانی کچی ئەبوتالیب، هاوسەرەکەی، باوەڕی هێناوە، خەمبار بوو. هۆنراوەیەکی سەبارەت بەحەز و تامەزرۆیی خۆی بۆ بینینی دایکی هانی هۆنییەوە.

هەروەها دەڵێت: دەهەزار کەس لەموسوڵمانان لەگرتنی مەککە هاوڕێیەتی پێغەمبەریان کرد:

چوارسەد کەس لەمناڵەکانی غەفار، چوارسەد کەس لەئەسلەم، هەزار و سێ کەس لەموزەینە، حەوتسەد کەس لەمناڵەکانی سولەیم و هەزار و چوارسەد لەجۆهەینە و پاشماوەکەی ئەنسار و موهاجیرەکان و ژمارەیەکیان لەهاوپەیمانەکانیان لەمناڵەکانی تەمیم و قەیس بوون.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) مەلیکە کچی داوودی لەیسی وەك هاوسەر هەڵبژارد. یەکێك لەژنەکانی پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای ئەو ژنە و وتی: شەرم ناکەیت بوویتە هاوسەری پیاوێك کەباوکتی کوشتووە. مەلیکە کاتێك پێغەمبەری بینی، وتی: لەتۆ پەنا بۆ خوا دەبەم. پێغەمبەر(د.خ) لێی جیابوویەوە. ئەو ژنێکی جوان روخسار و باوکی لەرۆژی گرتنی مەککە کوژرا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا خالید کوڕی وەلید لەپێنجی رەمەزان، عوزای لەدۆڵی نەخلە وێران کرد. عوزا بتەکەی مناڵەکانی شەیبان تیرەیەك لەمناڵەکانی سولەیم بوون. مناڵەکانی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزا دەیانوت ئەمە بتەی ئێمەیە و کاتێك خالید بتەکەی شکاند، خزمەتکاری بتەکە وتی: هیچت بینی؟

خالید وتی: نە.

خزمەتکار وتی: بگەڕێرەوە و وێرانی بکە.

خالید گەڕایەوە و ماڵی بتەکەی وێران کرد و بتەکەی شکاند.

خزمەتكار وتی: تورەیی خۆت نیشان بدە. ژنێكی ڕەشی رووت هاتەدەر و خالید كوشتی. خشڵەكانی بتخانەكەی هەڵگرت وبردی بۆ پێغەمبەر(د.خ)كەفەرمووی: ئەمە عوزا بوو، چیتر ناپەرەستن.

كوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) خالید كوڕی وەلیدی بۆ لەناوبردنی عوزا نارد. لەنەخلە لەماڵێكدا بوو و نەتەوەی قوڕەیش و كەنانە و موزێر بەگەورە و پیرۆزیان دەزانی. خزمەتكارانی بتخانەكە لەمناڵەكانی شەیبان و مناڵەكانی سولەیم بوون. كاتێك خزمەتكار لەهاتنی خالید ئاگادار بوویەوە، شمشێری خۆی بەماڵەكەوە هەڵواسی و بەكێوێكی نزیكدا سەركەوت و هاواری دەكرد:

ئەی عوزا، دەمامك لەروخسار لابەرە و هێرش بكە سەرخالید.

ئەگەر ئەمڕۆ خالید نەكوژێت، گوناحبارێت.

خالید ماڵەكەی وێران كرد و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ).

واقدی دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا سواعی خەڵكانی هوزەیل وێران كرا. سواع بەردێك بوو و عەمرۆ كوڕی عاس تێكی شكاند. كاتێك گەیشتە لای بتەكە، خزمەتكارەكەی پێی وت: دەتەوێت چی بكەیت؟

وتی: دەمەوێت سواع تێكبشكێنم.

وتی: توانای وێران كردنی ئەوت نییە.

عەمرۆ وتی: هێشتا گومراییت؟ بەردەكەی شكاند و لەكەلاوەكەدا هیچی دەستنەكەوت. بەخزمەتكارەكەی وت: چیت بینی؟

وتی: ئەمێستا موسوڵمان بووم.

لەم ساڵەدا مەنات لەموشولیل وێران كرا. ئەم كارە لەسەر دەستی سەعد كوڕی زەیدی ئەشهەلی ئەنجامدرا. مەنات بتی ئەوس و خەزرەج بوو.

لەم ساڵەدا خالید كوڕی وەلید بۆ شەڕی مناڵەكانی جەزیمە بەرێكەوت.

كوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) چەندین دەستەی بۆ دەوروبەری مەككە نارد تاپێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵكان بكەن. فەرمانی شەڕی پێنەدان. یەكێك لەنێردراوان خالید كوڕی وەلید بوو. فەرمانی پێدا لەخوارەوەی تەهامە پێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵكان بكات بێ ئەوەی شەڕو ئاژاوە بنێتەوە. بەڵام خالید هێرشی كردە سەر مناڵەكانی جەزیمە وكەسانێكی لێكوشتن.

ئەبوجەعفەر، محەممەد كوڕی عەلی كوڕی حسەین، دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دوای

گرتنی مەککە، خالید کوڕی وەلید لگەڵ منداڵەکانی سولەیم و هۆزەکانی تر بۆ بڵاو کردنەوەی بانگەوازی خواپەرەستی نەك شەڕ، ڕەوانە فەرموو. ئەوان لەنزیك غەمیسا دابەزین کە یەکێك لەئاوەکانی جەزیمەیە. خەڵکانی جەزیمە لەرۆژگاری جاهلییەت عەوف کوڕی عەبدعەوفی باوك، عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و فاکە، کوڕی موغەیەریان کوشت کە لەیەمەن دەگەڕانەوە و سامانی ئەوانیان تالآن کرد و کاتێك ئیسلام بڵاوبوویەوە و پێغەمبەر(د.خ) خالید کوڕی وەلیدی ڕەوانە فەرموو، خالید بەرێکەوت و لەسەر یەکێك لەئاوەکانی ئەوان دابەزی. کاتێك خەڵکان ئەویان بینی، سیلاحیان هەڵگرت. خالید وتی: سیلاحەکان دابنێن چوونکە خەڵکان موسوڵمان بوون.

یەکێك لەخەڵکانی جەزیمە دەڵێت: کاتێك خالید پێی وتین سیلاحەکانمان دابنێین، یەکێك لەئێمە بەناوی جەحدەم وتی: ئەی خەڵکینە ئەمە خالیدە. سوێند بەخوا دوای دانانی سیلاح، ئەسیرمان دەکات و دوای ئەسیر کردن، کوژرانە. من سیلاحی خۆم دانانێم.

دەڵێت: کەسانێك لەخەڵکەکەی ئەویان گرت و وتیان: ئەی جەحدەم دەتەوێت خوێنی ئێمە برێژن، خەڵك موسوڵمان بوون و شەڕ نەماوە و هەمووان لەئەماندا ژیان بەسەر دەبەن. پێداگریانکرد تا سیلاحەکەی دانا. خەڵکان بەفەرمانی خالید سیلاحی خۆیان دانا. خالید فەرمانیدا دەستیان ببەستنەوە و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشتار کرد.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەرووداوەکە ئاگادار بوویەوە، دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و فەرمووی: خواوەندا من لەکردەوەکەی خالید بێزارم. عەلی کوڕی ئەبی تالیبی بانگ کرد و فەرمووی: بڕۆ ناو ئەو خەڵکانە و ڕێ ورەسمەکانی سەردەمی نەزانی لەناو ئەواندا بسڕەوە.

عەلی ڕۆشت و سامانەکەی پێغەمبەری لەگەڵ خۆی برد تا خوێنبایی کوژراوان و قەرەبووی زیانەکانیان بۆ بکاتەوە. عەلی ئەو کارەی کرد تا ئەو ڕادەی قەرەبووی قاپی سەگی ئەوانیشی کردەوە و هیچ خوێن و سامانێك نەمایەوە. کاتێك کۆتایی بەکارەکەی هێنا، وتی: ئایا خوێن یا سامانێك ماوە قەرەبوو نەکرابێتەوە؟

وتیان: نە.

وتی: پاشماوەی ئەم سامانە بەنوێنەرایەتی پێغەمبەر(د.خ) لەجیاتی ئەوەی نایزانن

و پێغەمبەر(د.خ) نایزانێت، بەئێوە دەبەخشم. ئەم کارەی کرد و بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و ڕووداوەکەی بۆ باس کرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کارێکی چاکت کرد. ڕووی کردە قیبلە و دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە بەشێوەیەك سپیەتی ژێر باڵەکانی دەرکەوت، سێ جار فەرمووی: خواوەندا لەوەی خالید کوڕی وەلید ئەنجامیدا، بێزارم.

خالید کوڕی وەلید وتبووی: عەبدوڵڵە کوڕی حوزافەی سەهمی پێی وتم: پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی بیانکوژە چوونکە موسوڵمان نابن.

کاتێك منداڵەکانی جەزیمە سیلاحیان دانا و جەحدەم کردەوەکانی خالیدی بینی، وتی: هەموو شتێکمان لەدەست دەرچوو، دڵنیا بووم لەم پێشهاتە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەنێوان خالید کوڕی وەلید و عەبدولرەحمان کوڕی عەوف دەمەبۆڵەیەك دروست بوو. عەبدولرەحمان پێی وت: لەئیسلامدا شێوازەکانی سەردەمی جاهلییەت بەکار دەبەیت.

خالید وتی: تۆڵەی باوکی تۆم سەندەوە.

عەبدولرەحمان وتی: درۆت کرد، من بکوژی باوکم کوشت، تۆ تۆڵەی مامت فاکە کوڕی موغەیرەت سەند. قسەی ناشیرینیان بەیەك وت و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە، بەخالیدی فەرموو: ئارام بە و دەست لەهاوەڵانی من هەڵبگرە، سوێند بەخوا ئەگەر بەئەندازەی کێوی ئۆحوَد زێرت هەبێت و هەمووی لەڕێگەی خوادا خەرج بکەیت، نابێتە کردەوەیەکی بەرەبەیان یا ئێوارانی هاوەڵانی من.

عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمی دەڵێت: لەناو سوپاکەی خالیددا بووم. یەکێك لەگەنجەکانی منداڵەکانی جەزیمە لەناو ئەسیرەکاندا دەبینرا. دەستیان بەتەناف بەملییەوە بەستبوو، ژنان نەزۆر دوور لەو کۆببوونەوە، پێی وتم: دەتوانی ئەم تەنافە رابکێشیت و بمبەیتە لای ژنەکان، کارێکم هەیە کاتێك گەڕامە، چیت پێخۆشە بیکە.

وتم: ئاسانە. تەنافەکەم گرت و ئەوم بردە لای ژنەکان. گفتوگۆی لەگەڵ یەکێك لەوان کرد و هۆنراوەی عاشقانەی خوێندەوە. ئەوم گەڕاندەوە و کوشتییان.

باوکی فوراس کوڕی ئەبو سونبولەی ئەسلەمی دەڵێت: کاتێك ملیان پەڕاند، ژنەکەی باوەشی پیاکرد و ماچی دەکرد تا لەسەر کوژراوەکەی ئەو گیانی سپارد.

عوبەیدالله کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی عوتەبە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دوای گرتنی مەککە بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لەو شارە مایەوە و نوێژەکانی کورت دەکرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: گرتنی مەککە دە ڕۆژ بۆ کۆتایی ڕەمەزان لەساڵی هەشتەمی کۆچ روویدا.

## گێڕانەوەی شەڕ لەگەڵ خەڵکانی هەوازین لەحەنین

بەسەرهاتی پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان لەگەڵ هۆزی هەوازین بەمشێوەیە کەعوروە باسی دەکات: پێغەمبەر(د.خ) دوای گرتنی مەککە بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لەو شارە مایەوە. هەوازین و سەقیف هاتن و لەدۆڵێك بەناوی حەنین لەنزیك زی ئەلمەجار دابەزین. مەبەستیان بوو لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بجەنگن. کاتێك بیستیان پێغەمبەر(د.خ) لەمەدینەوە بەرێکەوتووە گومانیان کرد پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ ئەوانی لەسەردایە. کاتێك ئاگادار بوونە پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە دابەزیوە، مەبەستی شەڕیان کرد. ژن و مناڵەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنا و سەرکردەکەیان مالیك کوڕی عەوف بوو.

کاتێك هەوازین و سەقیف لەحەنین دابەزین، پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە و بەرێکەوت. لەحەنین ڕووبەڕوویان بوویەوە و خواوەند شکستی پێهێنان. ئایەی قورئان سەبارەت بەم شەڕە هاتەخوار و ژن و مناڵ و چوارپێکانیان وەك تالانی خواوەند بە پێغەمبەری بەخشی. سامانی ئەوانی لەناو قورەیشییە تازە موسوڵمان بووەکان دابەش کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك خەڵکانی هەوازین لەگرتنی مەککە ئاگادار بوونەوە، لەدەوری مالك کوڕی عەوفی ئەنساری کۆبوونەوە. خەڵکانی سەقیف هاتن و هەموو تایەفەی نەسر وجەشم و سەعد کوڕی بەکر و دەستەیەك لەمناڵەکانی هیلال پەیوەسیتان بوون. لەهۆزەکانی قەیس کوڕی عەیلان تەنیا ئەمانە ئامادە بوون. تایەفەی کەعب کوڕی کەلابی هەوازین نەهاتن. دورەید کوڕی سەمە لەگەڵ خەڵکانی جەشم بوو. ئەو، پیرێکی پەککەوتە و پیرۆزییان لەبۆچوونەکانی ئەودا دەبینی. لەاروبارەی جەنگ شارەزابوو. سەرکردەی تەقزییەکان و سەرکردەی تایەفەکانی هاوپەیمانی ئەوان قارب کوڕی ئەسوەد بوو. سەرکردەی مناڵەکانی مالك، سەبیع کوڕی حارس ناسراو بەزوئەلخومار، براکەی ئەحمەر کوڕی حارس سەرکردەی مناڵەکانی هیلال، سالاری هەمووان مالیك عەوفی نەسری بوو. کاتێك مەبەستی پێغەمبەری کرد، ژن و مناڵەکەی

لەگەڵ خۆی هێنا و کاتێك گەیشتە دەشتی ئەوتاس، خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوەو دورەید کوڕی سەمە لەناویاندا دەبینرا. ئەویان لەناو کەژاوەیەکی بیٚ سەرپۆش دانا و کاتێك دابەزی، وتی: ئێمە لەکووێین؟

وتیان: لەئەوتاسین.

وتی: شیاو بۆ سووڕانەوەی ئەسپەکان چوونکە نەسەختە و نەبەردەڵان، بەڵام بۆ دەنگی وشتر و بزن و کەڕ و دەنگی گریانی مناڵەکان دەبیستم.

وتیان: مالیك کوڕی عەوف مناڵ و کەسەکانی خۆی هێناوە.

وتی: مالیك لەکوێیە؟

وتیان: لێرە. مالکیان بانگ کرد. پێی وت: ئەی مالیك، تۆ سەرکردەی خەڵکەکەی خۆتیت، ڕۆژێکمان لەبەردەمدایە و هەزاران ڕۆژی بەدواوەیە، بۆدەنگی وشتر و کەر و بزن و دەنگی گریانی مناڵ دەبیستم؟

مالیك وتی: ژن و مناڵ و هەموو کەسەکانی خۆمانمان هێناوە.

وتی: بۆ؟

وتی: مەبەستی ئەوەم کرد ماڵ و مناڵی شەڕکەران لەپشت سەریانەوە بێت تا سەرسەختانە بەرگری بکەن.

دورەید سەرکۆنەی مالکی کرد و وتی: ئەمە شوانی مەڕەکانە، مەگەر پیاوی هەڵاتوو دەتوانێت شتێك لەگەڵ خۆی بگەڕێنێتەوە. ئەگەر جەنگ لەبەرژەوەندی تۆدابێت، تەنیا پیاوی شمشێر بەدەست بەکەڵکی تۆ دێت و ئەگەر لەزیانی تۆ بێت، ژن و مناڵەکانیشت لەدەستداوە و ریسوا بوویت.

دورەید پرسی: تایەفەی کەعب و کەلاب چییان کرد.

وتیان: لەوان کەس نەهاتووە؟

وتی: گەورەیی و ڕێزی تیا نییە، ئەگەر ڕۆژی ڕێز و گەورەیی دەبوو، کەعب و کەلاب بەشدارییان دەکرد. خۆزگە ئێوەیش وەك کەعب و کەلاب ئامادە نەدەبوون. لەئێوە کیٚ هاتووە؟

وتیان: عەمرۆ کوڕی عامر و عەوف کوڕی عامر.

وتی: بوون و نەبوونی ئەم دوو عامرییە وەك یەك وایە.

بەمالکی وت: کارێکی راستت نەکرد کەڕەگ وریشەی هەوازین و سامانی خەڵکت خستۆتە پێشەوەی سوپاکەت. ئەوان بگەڕێنەرەوە بۆ سەرزەمینەکەی خۆتان و لەسەر

پشتی ئەسپەکان ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە. ئەگەر شەڕەکت بردەوە، کەسەکانت دێن و ئەگەر دۆڕاندت، بنەماڵەی خۆتان پاراستووە.

مالك وتی: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم، تۆ پیر بوویت و بۆچوونەکانت کاریگەری ئەوتۆیان نەماوە. سوێند بەخوا ئەی خەڵکانی هەوازین ئەگەر فەرمانەکانم جێبەجێ نەکەن، بەشمشێرەکەم خۆم دەکوژم.

ئەم قسەی بۆیە هێنایە سەرزمان چوونکە نەیدەویست گرنگی بەبۆچوونەکانی دورەید بدرێت. دورەید وتی: من هەم لێرەم و هەم لێرە نیم.

دورەید سالاری منالەکانی جەشم بوو. بەڵام لەبەر تەمەنی زۆر بەرەو نەمان دەڕۆشت.

مالك بەکەسەکانی خۆی وت: کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە، کالأنی شمشێرەکان بشکێنن و بەیەکجاری هێرش بکەنە سەر دوژمن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: مالك کوڕی عەوف کەسانێکی نارد تا موسوڵمانان ببینن و لەبارودۆخی ئەوان ئاگاداری بکەنەوە. کاتێك گەڕانەوە بەتەواوی ترسا بوون.

مالك پرسی: چیتان بینی؟

وتیان: پیاوە سپیپۆشەکان سوار لەسەر ئەسپە ئەبڵەقەکان، بۆیە ترساوین.

بەڵام ئەم هەواڵانە پێداگری و سووربوونی ئەوی لەناو نەبرد.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەهەوازین و سەقیف ئاگادار بوویەوە، عەبدولله کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمی ڕەوانە کرد تا بڕوات و لەگەڵیان بمێنێتەوە و هەواڵەکانی بۆ بێنێت و بزانێت سەرکردەکەیان کێیە.

کوڕی ئەبی حەدرەد ڕۆشتە ناو خەڵکان و لەگەڵیان دانیشت. لەمەبەست و کاری ئەوان ئاگادار بوویەوە و بیستی و بینی کە بۆ شەڕ کردن لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) هاویەیمان و هاودەنگن. گەڕایەوە و پێغەمبەری ئاگادار کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) عومەری بانگ کرد و هەواڵەکانی کوڕی ئەبی حەدرەدی بۆ باس کرد.

عومەر وتی: درۆ دەکات.

کوڕی ئەبی حەدرەد وتی: تۆ هەمیشە حاشا لەڕاستییەکان دەکەیت.

عومەر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) دەبیستی کوڕی ئەبی حەدرەد چی دەڵێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی عومەر تۆ گومڕا بوویت و خواوەند ڕێگەی

نیشاندایت.

ئەبوجەعفەر، محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین، دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی هەوازینی کرد بیستی سەفوان کوڕی ئومەییە بڕێکی زۆر سیلاح و زرێی هەیە. ئەوی بانگ کرد. سەفوان هێشتا ناباوەڕ بوو. فەرمووی: ئەی باوکی ئومەییە، سیلاحەکانی خۆت بەقەرز بەئێمە ببەخشە تا شەڕی دوژمنی پێبکەین.

سەفوان وتی: ئەی محەممەد بەزۆر وەریدەگریت؟

وتی: بەقەرز وەریدەگرم و بۆتی دەگەڕێنینەوە.

سەفوان وتی: کێشە نییە. سەد زرێ وسیلاحی پێویستی پێدان.

دەڵێت: داوای لەپێغەمبەر کرد هەڵگرتنی سیلاحەکان لەئەستۆ بگرێت و پێغەمبەر(د.خ) رازی بوو.

دەڵێت: ئەمە بوو بەسونەت. قەرز وەك ئەمانەت و دەبێتە بگەڕێندرێتەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت و دوو هەزار کەس لەخەڵکانی مەککە و دەهەزار کەس لەهاوەڵانی خۆی لەگەڵدا بوو. عەتاب کوڕی ئەسیدی وەك فەرمانڕەوای مەککە دانا و بەمەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هەوازین بەرێکەوت.

جابر دەڵێت: کاتێك گەیشتینە دۆڵی حەنین، لەیەکێك لەدۆڵەکانی تەهامە سەرەوخوار بووینەوە. لەتاریکی بەرەبەیان دوژمن کەپێش ئێمە گەیشتبووە دۆڵەکە و بۆسەی دانابوو، هێرشیان کرد و خەڵکان هەڵاتن. کەس بەکەس بوو. پێغەمبەر(د.خ) رووی کردە لای ڕاست و فەرمووی: ئەی خەڵکینە لەدەوری من کۆببنەوە، من پێغەمبەری خوام، من محەممەد کوڕی عەبدوللەم.

دەڵێت: وشترەکان کەوتبوونە یەك، خەڵکان ڕۆشتن و چەند کەسێك لەموهاجیر و ئەنسار و بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ)، لەگەڵی مانەوە. لەناو موهاجیرەکان ئەبوبەکر و عومەر و لەبنەماڵەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب و فەزڵی کوڕی و ئەبوسوفیان کوڕی حارس و رەبیعە کوڕی حارس و ئەیمەن کوڕی عوبەید کوڕی دایکی ئەیمەن و ئوسامە کوڕی زەید مابوونەوە. یەکێك لەپیاوانی هەوازین سوار لەسەر وشترێکی سوور موو، بەئاڵایەکی ڕەش لەدەست ورمێکی درێژ، پێشەنگی هەوازین بوو. بەهەرکەسێك دەگەیشت، بەرم لێیدەدا. کاتێك کەسی لەبەردەمدا نەما، رمەکەی خۆی بۆ پاشماوەی هەوازینییەکان بەرز دەکردەوە تا شوێنی بکەون. کاتێك خەڵکان هەڵاتن و تازە موسوڵمانان ئەمەیان بینی، ئەوەی لەدڵیانا بوو،

هێنایانە سەرزمان.

ئەبوسوفیان وتی: شکستی ئەوان تا دەریا بەردەوام دەبێت. لەم کاتەدا تیرێك لەتیرەکانی تیروپشکی کەعبەی لەتیردانەکەی خۆیدا بینی.

کلدە کوڕی حەنبەل برای (لەدایکەوە) سەفوان کوڕی ئومەییە، هاواری کرد: جادوو بەتاڵ بوویەوە.

سەفوان هێشتا ناباوەڕ و ئەو مۆڵەتی پێغەمبەر(د.خ) پێیبەخشیبوو، بەکۆتا نەهاتبوو، وتی: بێدەنگ بە خوا دەمت بشکێنێت، ئەگەر یەکێك لەقورەیشییەکان فەرمانڕەوای من بێت باشترە ژێردەستەی خەڵکانی هەوازین بم.

شەیبە کوڕی عوسمان دەڵێت: بەخۆم وت ئەمڕۆ تۆڵە دەستێنمەوە (باوکی ئەو لەئوحود کوژرا بوو) ئەمڕۆ محەممەد دەکوژم. رووم کردە پێغەمبەر(د.خ) تا بیکوژم، بەڵام شتێك هات و دڵی گرتم. نەمتوانی ئەم کارە بکەم و زانیم ئەو پارێزراوە.

عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) وجڵەوی ئێسترەکەی ئەوم گرتبوو. پێغەمبەر(د.خ) کاتێك هەڵاتنی خەڵکانی بینی، فەرمووی: ئەی خەڵکینە بۆ کوێ دەڕۆن! کاتێك بینی کەس گرنگی بەوتەکانی نادات، فەرمووی: ئەی عەباس هاوار بکە: ئەی ئەنسارییەکان، ئەی ئەو کەسانەی لەبەیعەتی حۆدەیبییە ئامادە بوون، دەنگم بەرز بوو، هاوارم کرد: ئەی ئەنسارییەکان، ئەی ئەو کەسانەی لەبەیعەتی حۆدەیبییە بەشدار بوون. کەسانێك وەڵامیان دایەوە: ئامادەین. کەسان دەیانویست بگەڕێنەوە بەڵام رێگەیان نەبوو. وشترەکەی خۆیان بەجێدەهێشت و قەڵغان و شمشێر بەدەست دەگەڕانەوە و بەدوای دەنگەکەدا دەهاتن تا دەگەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). کاتێك نزیکەی سەد کەس لەدەوری کۆبوونەوە، شەڕیان دەستپێکرد. سەرەتا بانگی شەڕ (ئەی ئەنسارییەکان بوو) دواتر بۆ ئەی خەزرەجییەکان گۆڕا و خۆڕاگرییان کرد. پێغەمبەر(د.خ) شەڕ کردنی خەڵکانی دەبینی، فەرمووی: تەنووری شەڕ گەرم بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەرۆژی حەنین ئەبوسوفیان کوڕی حارس ئێسترەکەی پێغەمبەری رادەکێشا و کاتێك ناباوەڕان دەوری پێغەمبەریان گرت، دابەزی و هۆنراوەی دەخوێندەوە، دەیفەرموو: من پێغەمبەرم نەك درۆزن، من کوڕی عەبدولموتەلیبم. کەس لەو بوێرتر نەبوو.

جابر کوڕی عەبدولله دەڵێت: لەو کاتەدا کەپیاوی هەوازینی، هەڵگری ئاڵاکە، شەڕی

دەکرد، عەلی کوڕی ئەبی تالیب و یەکێك لەئەنسار مەبەستی کوشتنی ئەویان کرد. عەلی لەپشت سەریەوە هات و وشترەکەی کوشت. ئەنساری هێرشی کردە سەر وشترسوارەکە و قاچی ئەوی قرتاند و لەوشترەکەی کەوتەخوار.

دەڵێت: موسوڵمانان بوێرییان لەخۆیان نیشاندا و خەڵکان دوای شکست گەڕانەوە. ئەسیرە دەست بەستراوەکانی هەوازنیان دەبینی. پێغەمبەر(د.خ) سەیری ئەبوسوفیان کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیبی کرد کەجڵەوی چوارپێکەی ئەوی لەدەستا بوو، فەرمووی: کێیت؟

ئەبوسوفیان یەکێك بوو لەو کەسانەی خۆڕاگری کرد و پێغەمبەری بەجێنەهێشت. یەکێك بوو لەموسوڵمانە باوەڕدارەکان، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، برادەری ڕەزاعی تۆم.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دایکی سەلیم کوڕی مەلحانی بینی کە لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆی باوکی تەڵحەدا وپارچەیەکی لەخۆیەوە ئالآندبوو، بەعەبدوڵڵە کوڕی تەڵحە دووگیان و وشترەکەی باوکی تەڵحەی رادەکێشا. دەترسا وشترەکەی بەسەریدا زاڵ بێت، سەری لەوشترەکە نزیك و دەستی خستبووە ناو لووتی وشترەکە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوە دایکی سەلیمە.

وتی: بەڵێ، دایك و باوکم قوربانی تۆبن، ئەوکەسانەی هەڵدێن وەك ئەو کەسانەی شەڕ لەگەڵ تۆ دەکەن، بکوژە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: یا ئەوەی خواوەند ڕێگە چارەیەك بدۆزێتەوە.

خەنجەرێك لەدەستی دایکی سەلیمدا بوو، باوکی تەڵحە وتی: ئەوە چییە پێتە؟

وتی: خەنجەرە بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێك لەناباوەڕان لێم نزیك کەوتەوە، سکی هەڵدڕم.

باوکی تەڵحە وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) دەبیستیت چی دەڵێت؟

ئەنس کوڕی مالك دەڵێت: باوکی تەڵحە لەرۆژی حەنین بیست کەستی کوشت و ساز و بەرگی ئەوانی هەڵگرت.

جوبەیر کوڕی موتعیم دەڵێت: پێش ئەوەی دوژمن شکست بخوات و موسوڵمانان بۆ جەنگ بڕۆن، شتێکم بینی کەهاوشێوەی قوماشێکی ڕەش لەئاسمانەوە هات و کەوتە نێوان ئێمە و دوژمن. مێروولە ڕەشەکان بڵاوبوونەوە و دۆڵەکەیان پڕکرد. زانیم فریشتەن و بەمشێوەیە شکست لەناو دوژمندا بڵاوبوویەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك خەڵکانی هەوازین شکستیان خوارد، لەمناڵەکانی مالکی سەقیف ژمارەیەکی زۆر کوژرا. حەفتا کەس لەوان لەژێر ئالآکەیان کوژران.

عوسمان کوڕی عەبدوللە کوڕی رەبیعە کوڕی حارس باوەگەورێی دایکی حەکەم، کچی ئەبوسوفیان، لەناو ئەواندا دەبینرا. ئالآی منالّەکانی مالك لەدەستی زوئەلخوماردا بوو، کاتێك کوژرا، عوسمان ئالآکەی هەلّگرت و شەڕی کرد تا کوژرا.

دەلّێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەکوژرانی عوسمان ئاگادار بوویەوە، فەرمووی: خواوەند دووری بخاتەوە چوونکە دوژمنی قورەیشییەکان بوو.

ئەنس دەلّێت: لەرۆژی حەنین پێغەمبەر(د.خ) سوار ئێسترێکی سپی بەناو دولّدولّ بوو. کاتێك موسولّمانان شکستیان خوارد، پێغەمبەر(د.خ) لەسەر ئێسترەکەی خۆی فەرمووی: دولّدولّ لەسەر زەوی بخەوە. دولّدولّ سکی خستە سەرزەوی و پێغەمبەر(د.خ) مشتێ خۆلّی هەلّگرت و پرژاندی بەسەر دوژمندا و فەرمووی: سەرکەوتوو نەبن. دوژمنان بێ ئەوە تیر و شمشێر ورمیان بەرکەوێت، هەلاّتن.

یەعقوب کوڕی عوتەبە دەلّێت: کۆیلەی مەسیحی عوسمان لەگەلّ خۆی کوژرا. خەتێنەی نەکردبوو. یەکێك لەئەنسارییەکان کەجل و بەرگی کوژراوەکانی سەقیفی کۆدەکردە، جل وبەرگی کۆیلەکەی داکەند و بینی خەتێنە نەکراوە. هاواری کرد: خوا دەزانێت خەلّکانی سەقیف خەتێنە ناکەن. موغەیرە کوڕی شوعبە لەوێ بوو، دەلّێت: ترسام ئەم وتەیە لەناو عەرەبەکاندا بلآو ببێتەوە، دەستی ئەنساریم گرت و وتم: دایك و باوکم بەقوربانت بن، ئەم وتەیە دووبارە مەکەرەوە،ئەم کۆیلەیە مەسیحییە. دواتر کوژراوەکانی سەقیفم رووت کردەوە و وتم: سەیرکە هەموویان خەتێنەیان کردووە.

کوڕی ئیسحاق دەلّێت: ئالآی تایەفە هاوپەیمانەکان لەدەستی قارب کوڕی ئەسوەددا بوو. کاتێك شکست لەناو ئەواندا بلآوبوویەوە، ئالآکەی بەدارێکەوە هەلّواسی و لەگەلّ ئامۆزا و کەسەکانی خۆی هەلآت. لەوان زیاتر لە دووکەس نەکوژرا یەکیان لەمنالّەکانی غیرە بەناوی وەهب و ئەوی دیکەیان لەمنالّەکانی کەنە بەناوی جەلاح. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەکوژرانی جەلاح ئاگادار بوویەوە، فەرمووی: ئەمرۆ سەروەری گەنجەکانی سەقیف کوژرا، هەلّبەت جگە لەکوڕی هەنیدە. کوڕی هەنیدە حارس کوڕی ئەوس بوو.

دەلّێت: کاتێك دوژمنان شکستیان خوارد، بەرەو تاییف بەرێکەوتن. مالیك کوڕی عەوف لەگەلّیاندا بوو. دەستەیەکیان لەئەوتاس ئوردویان لێدا و دەستەیەکیان روویان کردە نەخلە. جگە لەمنالّەکانی غیرە کەس بەرەو نەخلە نەڕۆشت. سوپاکانی

پێغەمبەر(د.خ) شوێنیان کەوتن بەڵام ئەوکەسانەی روویان کردبوویەوە بەرزاییەکان، کەس شوێنیان نەکەوت. رەبیعە کوڕی رەفیعی کەوی بەناوی دایکی بەلەزعە ناویان دەبرد. ئەو بەدورەید کوڕی سەمە گەیشت و جڵەوی وشترەکەی گرت. لەبەر ئەوەی لەناو کەژاوەکەیدا بوو، گومانی کرد ژنە و کاتێك بینی پیاوە، وشترەکەی خەواند و بینی پیرەپیاوێکی بەتەمەنە. ئەوی نەناسییەوە.

دورەید وتی: دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: دەتکوژم؟

دورەید وتی: تۆ کێیت؟

وتی: رەبیعە کوڕی رەفیعی سولەمی. ئەمەی وت و بەشمشێرەکەی خۆی لێیدا بەڵام هیچ نەکرد.

دورەید وتی: دایکت بەشێوەیەکی خراپ پەروەردەی کردوویت. شمشێرەکەی من لەناو کەژاوەکە هەڵگرە و لەسەروی ئێسقانەکان و لەخوار سەری من بدە چوونکە من خەڵکان بەو شێوەیە دەکوژم. کاتێك بۆ لای دایکت گەڕایتەوە پێی بڵێ دورەید کوڕی سەمەت کوشتووە چوونکە رۆژگارێکی درێژ بەرگریم لەژنەکانی ئێوە دەکرد.

بەوتەی منداڵەکانی سولەیم، کاتێك رەبیعە دورەیدی کوشت وکەوت، جل وبەرەگەکانی داکەنرا. ناوقەد و نێوان ڕانەکانی وەك کاغەز بوو لەبەر ئەوەی بەزۆری سواری ئەسپی بێ زین دەبوو.

کاتێك رەبیعە بۆ لای دایکی گەڕایەوە و لەکوشتنی دورەید ئاگاداری کردەوە، وتی: سوێند بەخوا سێیان لەدایکانی تۆی ئازاد کردبوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەکی بۆ شوێنکەوتنی هەڵاتووانی دەشتی ئەوتاس ڕەوانە کرد.

ئەبی بەردە لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەحەنین گەڕایەوە، باوکی عامری لەگەڵ دەستەیەك بۆ ئەوتاس نارد. ئەو رووبەرووی دورەید کوڕی سەمە بوویەوە و ئەوی کوشت و خواوەند شکستی بەخۆی و هاوەڵانی بەخشی.

ئەبوموسا دەڵێت: منیش لەناو سوپاکەی باوکی عامردا بووم. یەکێك لەمنداڵەکانی جەشم تیرێکی بۆ باوکی عامر هاویشت و لەڕانی چەقی. لێی نزیك کەوتمەوە و وتم: کێ تیری لێدایت؟

باوکی عامر ئاماژەی بۆ کەسێك کرد و وتی: ئەو بکوژی منە.

دەڵێت: مەبەستی کوشتنی ئەوم کرد و کاتێك منی بینی هەڵات. شوێنی کەوتم و دەموت: مەگەر شەرم ناکەیت، مەگەر عەرەب نیت، بۆ هەڵدێیت؟ گەڕایەوە و پەلاماری منیدا. بەشمشێر کەوتینە گیانی یەك. کوشتم و بۆ لای باوکی عامر گەڕامەوە و وتم: خواوەند بکوژەکەی تۆی کوشت.

وتی: تیرەکە دەربێنە.

کاتێك تیرەکەم دەرهێنا، لەشوێنەکەی ئاو دەهاتەدەر.

باوکی عامر وتی: برازاکەم، بڕۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و سڵاوی بگەیێنە و بڵێ، باوکی عامر دەڵێت: داوای بەخشینم بۆ بکات.

دەڵێت: منی کردە جێگری خۆی و زۆری نەخایاند، مرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: گومانیان کردووە سەلمە کوڕی دورەید تیری بۆ باوکی عامر هاویشت و لەڕانی چەقی و ئەوی کوشت. هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((ئەگەر پرسیاری من دەکەن، سەلمە کوڕی سەمادیرم
بەشمشێر سەری موسوڵمانان دەپەڕێنم))

دەڵێت: مالك کوڕی عەوف دوای شکست ڕۆشت و لەگەڵ چەند کەسێك لەسوارەکانی خەڵکەکەی لەسەر بەرزاییەك وەستا و وتی: بمێننەوە تا لاوازەکان بڕۆن و کەسانیتر کۆببنەوە. مایەوە تا هەڵاتووان گەیشتن.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) کاتێك شەڕکەرانی خۆی ڕەوانە دەکرد، دەیفەرموو: ئەگەر دەستتان بەبەجاد گەیشت، ڕێگە مەدەن دەرباز بێت. بەجاد، یەکێك لەمناڵەکانی سەعد بوو. تاوانێکی ئەنجامدابوو. کاتێ موسوڵمانەکان ئەویان گرت لەگەڵ کەسەکانی بردیانە لای پێغەمبەر(د.خ). شەیما کچی حارس خوشکی شیری پێغەمبەر(د.خ) لەناویاندا دەبینرا و کاتێك موسوڵمانان توندوتیژییان لەگەڵ کرد، وتی: دەزانن من خوشکی شیری هاورێکەی ئێوەم؟ باوەڕیان بەقسەکەی نەکرد تا بردیانە لای پێغەمبەر(د.خ).

ئەبی وەجرە، یەزید کوڕی عوبەیدی سەعدی دەڵێت: کاتێك شەیمایان بردە لای پێغەمبەر(د.خ)، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من خوشکی تۆم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نیشانەکەی چییە؟

وتی: کاتێك لەسەر شان تۆم دەبرد، گازت لەپشتم دەگرت، شوێنکەی تا ئێستایش

ماوەتەوە.

پێغەمبەر(د.خ) نیشانەکەی ناسییەوە و عاباکەی خۆی پان کرد و لەسەری دانیشت و وتی: ئەگەر بخوازیت لای من بمێنیتەوە؛ خۆشەویست و ئازیزیت و ئەگەر دەخوازیت شتێکت پێ دەبەخشم وبۆی لای خەڵکەکەت بگەڕێرەوە.

شەیما وتی: شتێکم پێببەخشە و بۆلای کەسەکانم ڕەوانەم بکە.

پێغەمبەر(د.خ) شتێکی پێبەخشی و ئەوی ڕەوانە کرد.

منداڵەکانی سەعد کوڕی بەکر دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) کۆیلەیەك بەناوی مەحلول و کەنیزێکی بەشەیما بەخشی کەئەوانی کردە ژن و مێرد و هێشتا کەسانێك لەنەوەکانی ئەوان لەناو خەڵکەکەی ئێمە دەژین.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەڕۆژی حەنین لەمناڵەکانی هاشم، ئەیمەن کوڕی عوبەید کوڕی دایکی ئەیمەن کەنیزی پێغەمبەر(د.خ) کوژرا و لەمناڵەکانی ئەسەد، یەزید کوڕی زەمعە گیانی سپارد. لەئەسپەکەی بەناوی جوناح کەوتەخوار و مرد. لەئەنسارییەکان سوراقە کوڕی حارسی عێجلی و لەئەشعەرییەکان باوکی عامری ئەشعەری کوژرا.

ئەسیرەکان و سامانەکانی حەنینیان کۆکردەوە. مەسعود کوڕی عەمرۆی قورئان خوێن لێپرسراوی تاڵانییەکان بوو. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی تاڵانییەکان بەرەو جەعرانە ببەن و لەوێ هەڵیبگرن.

دەڵێت: کاتێك هەڵاتووانی سەقیف گەیشتنە تاییف، دەرگاکانی شارەکەیان داخست و بۆ شەڕ خۆیان ئامادە کرد. عوروە کوڕی مەسعود و غەیلان کوڕی سەلمە لەشەڕی حەنین و گەمارۆی تاییف بەشدار نەبوون و لەجەرش پیشەسازی دەبابە و مەنجەنیقیان دەخوێند.

هوشام کوڕی عورە لەباوکی دەگێڕێتەوە: دەستبەجێ دوای جەنگی حەنین، پێغەمبەر(د.خ) بەرەو تاییف بەڕێکەوت وبۆ ماوەیەك یەك مانگ و نیو شەڕی کرد. خەڵکانی سەقیف لەپشت دیوارەکانەوە دەجەنگان. کەس لەوان نەهاتەدەر و خەڵکانی دەوروبەری تاییف باوەڕیان هێنا و کەسانێکیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد. پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و لە جەعرانە دابەزی. ئەسیرەکانی حەنین لەوێ بوون. دەڵێن: ژمارەی ژن و منداڵ و پیاوەکانی هەوازین شەش هەزارکەس بوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە جەعرانە، نێردراوانی هەوازین هاتن و باوەڕیان هێنا. پێغەمبەر(د.خ) هەموو ژن و منداڵەکانی ئەوانی ئازاد کرد و لەجەعرانەوە بەمەبەستی عەمرە بەڕێکەوت و ئەمە،

لەمانگی زیقەعدەدا بوو.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە گەڕایەوە و ئەبوبەکری وەك جێگری خۆی لەمەککە دانا وفەرمووی: لەگەڵ خەڵکان ڕێ ورەسمەکانی حەج ئەنجام بدات و فێرکارییەکان ئیسلام فێری خەڵکان بکات، هەرکەس بۆ حەج بێت، ئەمانی هەیە. کاتێك گەیشتە مەدینە، نێردراوانی سەقیف هاتن و بەیعەتیان لەگەڵ بەست و نامەیەك نووسرا کە لای سەقیفییەکان ماوەتەوە.

عەمرۆ کوڕی شوعەیب دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەرێگەی نەخلەی یەمانییەوە بەرەو تاییف ڕۆشت و لەبەحرە ئەلرەغا گوزەری کرد. لەوێ مزگەوتێکی دروست کرد و نوێژی تیا خوێند. لەکاتی مانەوەی لەبەحرە ئەلرەغا یەکێك لەمناڵەکانی لەیسی بەقەساس کوشت لەبەر ئەوەی یەکێك لەهوزەیلییەکانی کوشتبوو.

ئەمە یەکم قەساس بوو لەئیسلام ئەنجامدرا. فەرمانیدا قەڵاکەی مالك کوڕی عەوف وێران بکەن. دواتر لەرێگەیەك کەپێیان دەوت تەنگنا، بەرێکەوت و سەبارەت بەناوەکەی پرسیاری کرد و کاتێك وتیان، تەنگنایە، وتی: نە، بەر فراوانە.

پێغەمبەر(د.خ) لەنەخب تێپەڕی و لەژێر داری سەدرێك کەپێیان دەوت سادرە، لەنزیك مڵکی یەکێك لەخەڵکانی سەقیف دابەزی و کەسی نارد و فەرمووی: لێرە بڕۆ وەگەرنە دیوارەکەی تۆ وێران دەکەین. پیاوی سەقیفی بەڕۆشتن رازی نەبوو، پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی وێران کردنی دەرکرد. دواتر بەرێکەوت و لەتاییف نزیك کەوتەوە ئوردووی لێدا. چەند کەسێك لەهاوەڵانی بەتیری دوژمنان کوژران چوونکە ئوردوی موسوڵمانان لەنزیك دیواری شارەکەدا بوو. موسوڵمانان نەیانتوانی بڕۆنە ناو شارەکە، دەرگاکان داخرابوون و کەسانێك کوژران. پێغەمبەر(د.خ) لەوێ ڕۆشت و لەنزیك مزگەوتێك کەئێستا بەناوی پێغەمبەر(د.خ) لەتاییفە، ئوردوی لێدا. چەند رۆژێك گەمارۆی خستە سەرشارکە. دوان لەژنەکانی هاورێیەتیان دەکرد، یەکیان دایکی سەلمە کچی ئەبی ئومەییە و ئەوی دیکەیان لەگەڵ دایکی سەلمەدا بوو.

واقدی دەڵێت: ژنەکەی دیکە زێنەب کچی جەحش بوو. دوو خێوەتیان بۆ هەڵدان و پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی مانەوە لەنێوان دوو خێوەتەکە نوێژی دەخوێند. کاتێك خەڵکانی سەقیف باوەڕیان هێنا، باوکی ئومەییە کوڕی عەمرۆ کوڕی وەهب لەنوێژگەکەی پێغەمبەر(د.خ) مزگەوتێکی دروست کرد. لەم مزگەوتەدا کۆڵەکەیەك دەبینرا و دەیانوت

بەرەبەیانان کاتێك هەتاو لێی دەدات، دەنگێکی لێ بەرز دەبێتەوە.

پێغەمبەر(د.خ) گەمارۆی خستە سەر تاییف و شەڕێکی قورسیان دەسپێکرد. لەهەردوو لاوە تیر دەهاوێژرا تا رۆژی هێرش گەیشتنە ژێر دیواری تاییف و چەند کەسێك لەموسوڵمانان ڕۆشتنە ژێر دەبابەکان وبەرەو دیواری شارەکەیان برد. سەقیفییەکان ئاسنی تواوەیان بەسەردا دەکردن. بەناچاری لەژێر دەبابەکان هاتنەدەر و ژمارەیەکیان بەتیری دوژمن کوژران. پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا ڕەزەکانی سەقیف ببڕنەوە و خەڵکان دەستیان بەو کارە کرد.

ئەبوسوفیان کوڕی حەرب و موغەیرە کوڕی شوعبە لەدیوارەکە نزیك کەوتنەوە و هاواریان کرد: ئەمانمان پێ ببەخشن تا گفتوگۆتان لەگەڵ بکەین. کاتێك ئەمانیان پێدرا داوایان کرد چەند ژنێکی قوڕەیشی لەتاییف بێنەدەر چوونکە دەترسان ئەسیر بکرێن بەڵام ژنەکان رازی نەبوون. یەکێك لەوان ئامینە کچی ئەبوسوفیان ژنی عوروە کوڕی مەسعود بوو. داوود کوڕی عوروە و منداڵەکانی دیکەی هێنابوویە دنیا.

واقدی دەڵێت: کاتێك پانزە رۆژ بەسەر گەمارۆی تاییف تێپەڕی، پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ نەوف کوڕی معاویەی دوئەلی راوێژی کرد و پرسی: بۆچوونی تۆ لەم شەڕەدا چییە؟

نەوفل وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کەمتیارێك لەکوونەکەیدایە، ئەگەر بمێنیتەوە دەیگریت و ئەگەر بڕۆیت، زیانت پێناگەیێنێت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: بیستم پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەگەمارۆی سەر تاییف بەئەبوبەکری وت: خەوم بینی و دەفرێك پڕ رۆنیان پێشکەش کردم، کەڵەشێرێك بەدەنووك لێیدا و هەرچی تیا بوو رژا.

ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) گومانم نییە، دەتوانی بەمەبەستەکەی خۆت سەبارەت بەسەقیفییەکان بگەیت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆچوونی منیش بەهەمان شێوەیە.

خوەیلد کچی حەکیم کوڕی ئومەییەی سولەمی، ژنی عوسمان کوڕی مەزعون بەپێغەمبەری وت: ئەگەر خواوەند تاییفی بۆ تۆ کردەوە، خشڵەکانی بادییە کچی غەیلان کوڕی سەلمە، یا فاریعە کچی عەقیل بەمن ببەخشە. ئەم دوو ژنە زیاتر لەهەموو ژنانی عەرەب زێروزێویان هەبوو.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر فەرمانی گرتنی سەقیفیان بەمن نەدابێت؟

خوەیلد ڕۆشت و ئەم وتەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب گێڕایەوە. ئەو ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەم قسە چییە کەخوەیلد دەڵێت پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وتوومە.

وتی: مۆڵەتی گرتنی سەقیفیان بەتۆ نەداوە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نە.

وتی: کەواتە با بڕۆین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو کارە بکە.

عومەر جاڕی بەرێکەوتنی لەناو خەڵکاندا و کاتێك موسوڵمانان بەرێکەوتن، سەعید کوڕی عوبەیدەی سەقەفی هاواری کرد: شوێنەکەمان لەشوێنی خۆیەتی.

عۆیەیینە کوڕی حوسن وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا بەگەورەیی وریێزداری.

یەکێك لەموسوڵمانان پێی وت: خوا بتکوژێت، تۆ بۆ هاوکاری پێغەمبەر(د.خ) هاتوویت و وەسفی ناباوەڕان دەکەیت کە لەبەرابەر پێغەمبەر(د.خ) خۆڕاگرییان کرد؟

وتی: سوێند بەخوا نەهاتبووم لەگەڵ ئێوە شەڕ لەگەڵ ئەوان بکەم، دەمویست محەممەد دەست بەسەر تاییفدا بگرێت و بتوانم کچێك لەسەقیفییەکان بەدەست بێنم و لەگەڵی بخەوم، لەوانەیە پیاوێك بۆ من بێنێتە دنیا چوونکە سەقیفییەکان خەڵکانێکی شیاون.

لەشەڕی تاییف دوانزە کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) کوژران. حەوتیان لەقوڕەیش، یەکیان لەمناڵەکانی لەیس و چواریان لەئەنسار.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەتاییف ڕۆشت، لەگەڵ موسوڵمانان لەجەعرانە دابەزی. ئەسیرەکانی هەوازینیان لەوێ ڕاگرتبوو. نێردراوانی هەوازین گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەسیرەکانی هەوازین لەژن و منداڵ فراوان بوون. شەش هەزار وشتر و مەڕێکی فراوانیش تالانی موسوڵمانان بوو.

عەبدوللە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاس دەڵێت: نێردراوانی هەوازین لەجەعرانە گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕیان هێنا، وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە خەڵکانێکی ڕەگ وریشەدارین، بەڵایەك بەسەر ئێمەدا هاتووە و ئاگاداری لێی، بەزەییت بەئێمەدا بێتەوە تا خواوەند بەزەیی بەتۆدا بێتەوە. یەکێك لەپیاوانی هەوازین بەناوی زوهەیر کوڕی سەرد لەتایەفەی سەعد کوڕی بەکر کە پێغەمبەر(د.خ) لای ئەوان شیری خواردبوو،

هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، لەم پەرژینەدا پووڕ و خاڵۆژنەکان و پەرەستارەکانی تۆن کە سەرپەرەستی تۆیان دەکرد، ئەگەر شیرخواردنی حارس کوڕی ئەبی شیمر لەگەڵ نەعمان کوڕی مونزەر لای ئێمەدەبوو، چاوەڕوانی بەخششەکانی ئەوانمان دەکرد، تۆ لەهەمووان باشتر و شیاوتریت. هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

(( ئەی پێغەمبەر(د.خ)، منەتمان سەرخە و بەزەییت بەئێمەدا بێتەوە.

چوونکە لەتۆ چاوەڕوانین

لەگەڵ ئەو کەسانەی گیرۆدەی ئەم پێشهاتە بوون

چاکە بکە.))

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ژن و منداڵەکانتان خۆشتر دەوێت یا سامانەکانتان؟

وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) لەنێوان سامان و ژن و منداڵەکانمان سەرپشکمان دەکەیت! ژن و منداڵەکانمان زیاتر خۆش دەوێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوەی تایبەت بەمن و منداڵەکانی عەبدولموتەلیبە بۆ ئێوە بێت و کاتێك لەگەڵ خەڵکان نوێژم خوێند، بڵێن سەبارەت بەژن و منداڵەکانی خۆمان پێغەمبەر(د.خ) لای موسوڵمانان و موسوڵمانان لای پێغەمبەر(د.خ) دەکەینە شەفیع. من بەشی خۆم و منداڵەکانی عەبدولموتەلیب بەئێوە دەبەخشم و داوا دەکەم خەڵکانیش ئەو کارە بکەن.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) نوێژی نیمەڕۆی خوێند، نێردراوانی هەوازین هەستان و وتەکانی پێغەمبەریان هێنایە سەرزمان.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوەی تایبەت بەمن و منداڵەکانی عەبدولموتەلیبە، بۆ ئێوە بێت.

موهاجیرەکان وتیان: ئەوەی تایبەت بەئێمەیە، بۆ پێغەمبەر.

ئەقرەع کوڕی حابس وتی: من و منداڵەکانی تەمیم نایبەخشین.

عۆیەیینە کوڕی حوسن وتی: من و منداڵەکانی فەزارە نایبەخشین.

عەباس کوڕی مێرداس وتی: من و منداڵەکانی سولەیم نایبەخشین.

منداڵەکانی سولەیم وتیان: ئەوەی هی ئێمەیە، تایبەتە بە پێغەمبەر(د.خ).

عەباس وتی: ریسواتان کردم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەرکەس ناخوازێت ئەسیرەکەی خۆی ببەخشێت،

لەبەرابەر هەر ئەسیرێك شەش وشتر لەیەکەم تالأنی کەدەستمان دەکەوێت، وەربگرێت، ژن و منالّی خەڵکان تەسلیم بکەنەوە.

یەزید کوڕی عوبەیدی سەعدی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) کەنیزێك لەئەسیرەکانی حەنین بەناوی ریتە کچی هیلالی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخشی و کەنیزێك بەناوی زێنەب کچی حەییانی کوڕی عەمرۆی بەعوسمان کوڕی عەفان بەخشی و کەنیزێکی بەعومەر کوڕی خەتاب بەخشی و ئەو، بەعەبدوللەی کوڕی بەخشی.

عەبدوللە کوڕی عومەر دەڵێت:پێغەمبەر(د.خ) کەنیزێکی لەئەسیرەکانی هەوازین بەعومەر کوڕی خەتاب بەخشی و ئەویش بەمن. ئەوم لای پوورە جومەحییەکانی خۆم دانا بۆ ئەوەی ئامادەی بکەن. ویستم بەدوری ماڵی خوادا بسوڕێمەوە و دواتر بڕۆمە لایان. دەمویست کاتێك دەگەڕێمەوە لەگەڵی بخەوم.

دەڵێت: لەمزگەوت هاتمەدەر وبینیم خەڵکان بەراکردن هاتن، وتم: چی روویداوە؟

وتیان: پێغەمبەر(د.خ) ژن و منالّەکانی ئێمەی گەڕاندەوە.

وتم: ئەو ژنەی ئێوە لای جومەحیەکانە، بڕۆن و بیبەن. ڕۆشتن و ئەویان هەڵگرت.

عۆیەیینە کوڕی حوسن پیرێژنێکی لەهەوازین گرتبوو، وتی: ئەو لەناو خەڵکان ڕەچەڵەکێکی تایبەتی هەیە، هیوادارم بەهای ئازادی ئەو زۆر بێت. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەسیرەکانی لەبری شەش وشتر بۆ خەڵکان گەڕاندەوە، لەگەڕاندنەوەی ژنەکە خۆی بەدوور گرت. زوهەیر باوکی سەرد، برای عۆیەیینە پێی وت: بیگەڕێنەرەوە، نەدەمی بۆنخۆشە، نەمەمکی ڕەقە و نەسکی منالّ هەڵدەگرێت، نەشیری هەیە و نەهاوسەری دەوڵەمەند.

عۆیەیینە کاتێك ئەمەی بیست، ژنەکەی گەڕاندەوە.

دەڵێن: عۆیەیینە ئەقرەع کوڕی حابسی بینی و لەکارەکەی خۆی پەشیمانی دەربڕی. ئەقرەع وتی: ئەو کچ نەبوو بۆ خەم دەخۆیت؟

پێغەمبەر(د.خ) لەنێردراوانی هەوازینی پرسی: مالك کوڕی عەوف چی دەکات؟

وتیان: لەتاییف لای خەڵکانی سەقیفە.

فەرمووی: بەمالك بڵێن ئەگەر بێتە لای من و باوەڕ بێنێت، ژن و منالّەکەی بۆ دەگەڕێنمەوە و سەد وشتری پێدەبەخشم.

مالك لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و خۆیە گەیاندە لای پێغەمبەر(د.خ).

مالك دەترسا ئەگەر خەڵكانی سەقیف لەوتەکەی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار ببنەوە، رێگە لەڕۆشتنی بگرن. وتی وشترەکەی بۆ ئامادە بکەن و ئەسپەکەیان هێنا. شەوانە بەرێکەوت و سوار ئەسپەکەی بوو. بەخێرایی ڕۆشت تا گەیشتە وشترەکەی. سوار وشترەکەی بوو و بۆلای پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت. لەجەعرانە یا لەمەککە گەیشتە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) ماڵ و منداڵەکەی بۆ گەڕاندەوە و سەد وشتری پێبەخشی. مالك باوەڕی هێنا. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردە سەرکردەی خەڵکانی هەوازین و موسوڵمانەکانی هۆزەکانی دەوروبەری تاییف کەسەماله و سەلمە و فەهم بوون. بەهاوکاری ئەوان لەگەڵ خەڵکانی سەقیف شەڕی کرد و مەڕومالاتەکەی ئەوانی تالان دەکرد. تا ئەوەی بارودۆخیان لێ دژوار و حەبیب کوڕی عەمرۆ سەقەفی هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە هۆنییەوە:

((دوژمنان حسێبمان بۆ دەکەن

بەلام منداڵەکانی سەلمە هێرشمان دەکەنەسەر

مالك لەگەڵ ئەوان دێت

رێز لەئێمە و پەیمانەکان ناگرێت

هێرش دەکەنە سەر مەنزلگەکانی ئێمە.

ئێمە خەڵکانێکی بەهێز بووین.))

عەمرۆ کوڕی شوعەیب دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئەسیرەکانی هەوازینی تەسلیم بنەماڵەکانیان کردەوە، سەرکەوت و خەڵکان شوێنی کەوتن و دەیانوت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، وشتر و مەڕەکان تالانی خۆمان، لەناو ئێمەدا دابەشی بکە. ئەویان بۆ لای دارێك پەلکێش کرد. عاباکەی لەلقی دارێك گیری کرد و کەوت. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی خەڵکینە، عاباکەم بدەنەوە، سوێند بەخوا ئەگەر بەئەندازەی وشترەکانی تەهامە، وشترم هەبێت، هەمووی لەنێوان ئێوەدا دابەش دەکەم چوونکە بەخیل و ترسەنۆك و درۆزن نیم. ڕۆشتە لای وشترێك و کەمێك تووکی لێکردەوە و خستیە نێوان پەنجەکانی خۆی و بەرزی کردەوە و فەرمووی: ئەی خەڵکینە سوێند بەخوا لەتالانییەکانی ئێوە و لەم تووکە، تەنیا یەك پێنجی بۆ منە و یەك پێنجیش بۆ ئێوە دەگەڕێتەوە. دەزوو دەرزی لای خۆتان مەهێڵنەوە چوونکە خیانەت لەتالانی لەرۆژی هەستانەوە هۆکاری ئاگری جەهەننەمە.

یەکێك لەئەنسارییەکان هات و گلۆلەیەك دەزووی دەرهێنا، وتی: ئەی

پێغەمبەر(د.خ)، ئەم گلۆڵە بەنەم هەڵگرت تا کۆپانی وشترەکەمی پێ چاك بکەمەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوەی بەشی منە بۆ تۆ بێت.

ئەنساری وتی: ئەگەر بەمشێوەیە، پێویستم پێی نییە. فڕیدا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەکەسانێك لەسەرکردەکانی بەخشی کەدەیویست دڵ و سەرنجیان بۆ ئیسلام راکێشێت و بە (المولفە قلوبهم) ناویان برد. سەد وشتری بەئەبوسوفیان کوڕی حەرب بەخشی و سەد وشتر بەمعاویەی کوڕی. سەد وشتری بەحەکیم کوڕی حەزامدا. نەزیر کوڕی حارس کوڕی کەلدەی عەبدەری سەد وشتر، عەلا کوڕی حارسەی سەقەفی، سەد وشتر، حارس کوڕی هوشام سەد وشتر. سوهەیل کوڕی عەمرۆ سەد وشتر، خوەیتب کوڕی عەبدولعوزا سەد وشتر، عۆیەیینە کوڕی حوسن سەد وشتر، ئەقرەع کوڕی حابس سەد وشتر، مالك کوڕی عەوف نەسری سەد وشتر و بەدەستەیەك لەقورەیشییەکان کەمتر لەسەد وشتری بەخشی کەمەخریمە کوڕی نەوفلی زوهری و عومەیر کوڕی وەهبی جومەحی و هوشام کوڕی عەمرۆ لەمناڵەکانی عامر کوڕی لوئەی لەناویاندا بوون. کەس نازانێت هەر کام چەند وشتریان وەرگرت.

سەعید کوڕی یەربوعی مەخزومی پەنجا وشتری بەرکەوت. ڕەنجا و هۆنراوەیەکی هۆنییەوە و گلەیی لە پێغەمبەر(د.خ) کرد. فەرمووی: بڕۆن و زمانی ببڕن. ژمارەیەکی زیاتر وشتریان پێبەخشی. بڕینی زمانی ئەمە بوو.

محەممەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی حارس دەڵێت: یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) پێی وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بەعۆیەیینە کوڕی حوسن و ئەقرەع کوڕی حابس سەد وشترت بەخشی و بەجوعەیل کوڕی سوراقەی زەمووری هیچت نەدا؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانم لەدەستی ئەودایە، جوعەیل کوڕی سوراقە هەزاران پیاوی وەك عۆیەیینە و ئەقرەع دەهێنێت. من ویستم سەرنجی ئەوان بۆ ئیسلام رابکێشم و جوعەیلم لەگەڵ ئیسلامەکەی پشتگوێ خست.

باوکی قاسم موالی عەبدوللە کوڕی حارس دەڵێت: من و تەلید کوڕی کەلابی لەیسی ڕۆشتینە لای عەبدوللە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاس. بەدەوری ماڵی خوادا دەسوڕایەوە و پێپۆشەکانی بەدەستەوە بوو، پێمان وت: ئایا کاتێك ئەو پیاوە تەمیمیە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) قسەی کرد، ئامادە بوویت؟

وتی: بەڵێ، کاتێك پێغەمبەر(د.خ) وشتری بەخەڵکان دەبەخشی، یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم بەناوی زوئەلخوەیسەرە هات و وتی: ئەی محەممەد، ئەمڕۆ بینیم چیت کرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چۆن بوو؟

تەمیمی وتی: دادپەروەری تیا نەبوو.

پێغەمبەر(د.خ) تورە بوو، فەرمووی: ئەگەر من دادپەروەری نەکەم، کێ دەیکات؟

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)،بیکوژین؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: وازی لێ بێنن چوونکە شوێنکەوتەکانی فراوان دەبێت وبەڕادەیەك لەدین قووڵ دەبنەوە کەلێی دەچنەدەر بەهەمان شێوە کەتیر لەکەوان دەردەچێت.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەی باوکی سەعیدی خدری ئاماژەی پێدراوە: ئەم قسانەی بە پێغەمبەریان وت سەبارەت بەو سامانە بوو کەعەلی لەیەمەنەوە ڕەوانەی کرد و پێغەمبەر(د.خ) لەناو دەستەیەك لەکەسەکان وەك عوێیەیینە کوڕی حوسن و ئەقرەع و زەید ئەلخەیل دابەشی کرد. یەکێك لەئامادەبووان بەوشێوەیە قسەی کرد.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەشدار لەحەنین، دەیوت: سوار لەسەر وشترەکەی خۆم لای ڕاستی پێغەمبەر(د.خ) ڕێگەم دەبڕی. پێپۆشێکی زبرم لەپێدابوو. وشترەکەم بەر وشتری پێغەمبەر(د.خ) و پێپۆشەکەم بەرپێپۆشەکەی کەوت. قامچییەکی لەقاچمدا و فەرمووی: قاچت ئازاردام، بڕۆ ئەو لاوە. ڕۆژی دواتر بانگی کردم. بەخۆم وت: سوێند بەخوا لەبەر ئازارەکەی دوێنێکەیە، چاوەڕوان بووم سەرکۆنەم بکات. بەڵام پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دوێنێکە قاچت ئازاردام و من قامچیم لەتۆدا، بانگم کردی تا قەرەبووت بۆ بکەمەوە، لەبەرابەر ئەو قامچییە، هەشتا بزنی پێبەخشیم.

باوکی سەعیدی خدری دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بەخششەکانی بەقوڕەیش و خەڵکانی دیکەی عەرەب بەخشی و ئەنسارییەکان هیچیان بەرنەکەوت، سەعد کوڕی عوبادە ڕۆشتە لای و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەنسارییەکان سەبارەت بەدابەش کردنی ماڵ و تاڵانییەکان ڕەنجاون چوونکە بەخەڵکەکەی خۆتت بەخشی و هیچت بەوان نەدا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سەعد تۆ چی دەڵێیت؟

وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، منیش یەکێکم لەوان.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کۆیان بکەرەوە.

دەڵێت: سەعد ڕۆشت و ئەنسارییەکانی کۆکردەوە. چەند کەسێك لەموهاجیرەکان هاتن و لەناویاندا دانیشتن بەڵام دەستەیەکی دیکە هاتن و ئەوانیان گەڕاندەوە. کاتێك ئەنسار کۆبوونەوە، سەعد هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: ئەنسارییەکان ئامادەن.

پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای ئەنسار، سپاسی خوای کرد و فەرمووی: ئەی ئەنسارییەکان ئەو قسانە چییە بیستوومە و هۆکاری ڕەنجانی ئێوە چییە؟ کاتێك هاتم گومڕا بوون و خواوەند ڕێگەی نیشاندان، نیازمەند بوون و خواوەند بێ نیازی کردن، دوژمنی یەك بوون و خواوەند ئاشتی لەنێواندا سەقامگیر کردن.

وتیان: ڕاستە و ئەمە بەزەیی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆ وەڵام نادەنەوە؟

وتیان: چی وەڵام بدەینەوە، بەزەیی و بەخششەکان تایبەتە بەخوا و پێغەمبەر(د.خ).

فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر بڵێن وراست دەڵێن و وتەکانی ئێوە پشتڕاست دەکەنەوە کەکاتێك هاتیت، تۆیان بەدرۆزن دەزانی وئێمە پشتڕاستمان کردیتەوە، لاواز بوویت و هاوکاریمان کردیت، هەلاتوو بوویت و پەنامان دایت، نیازمەند بوویت و ماڵ و سامانی خۆمان لەگەڵ تۆدا بەش کرد ئەی ئەنسارییەکان بەهۆی کەمێك سامانی دنیا کە بەهۆیەوە دڵ و سەرنجی خەڵکانم بۆ ئیسلام ڕاکێشا بۆ ئەوەی باوەڕ بێنن، ڕەنجاون؟ مەگەر ڕازی نین خەڵکان مەڕ و وشتر ببەن و پێغەمبەر(د.خ) لای ئێوە بێت. سوێند بەوخوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، ئەگەر کۆچ نەدەبوو، من یەکێك بووم لەئەنسار، خواوەندا بەزەییەکانی خۆت بەئەنسار و ماڵ و منداڵەکانیان ببەخشە.

دەڵێت: خەڵکان گریان بەڕادەیەك ڕیشیان تەڕ بوو، وتیان: ڕازین بەوەی پێغەمبەر(د.خ) لامان بێت و ڕۆشتن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەجەعرانە مەبەستی حەجی عەمرەی کرد و فەرمانیدا پاشماوەی تالانییەکان لەمەجنە و سنورەکانی مورئەلزەهران رابگرن. کاتێك عەمرەی ئەنجامدا و بەرەو مەدینە بەڕێکەوت، مەعاز کوڕی جەبەلی وەك جێگری خۆی لەمەککە دەستنیشان کرد تا زانستی فیقە و قورئان فێری خەڵکان بکات. پاشماوەی تالانییەکانیان بەدوای پێغەمبەردا برد. عەمرەی ئەو لەمانگی زیقەعدەدا بوو و لەمانگی زیحەجە گەیشتە مەدینە.

لەساڵی هەشتەمی کۆچ کەسان وەك نەریتی عەرەبەکان حەجیان کرد و عەتاب کوڕی ئەسید، سەرپەرەستی حەجی موسوڵمانان بوو. خەڵکانی تاییف لەمانگی زیقەعدە کەپێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە تا مانگی رەمەزانی ساڵی نۆیەم ناباوەڕ بوون و لەشارەکەی خۆیاندا گەمارۆیان لەسەر بوو..

واقدی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەجەعرانە تالآنییەکانی لەنێوان موسوڵمانان دابەش کرد، هەرکەس چوار وشتر و چل سەر مەڕی بەرکەوت. سوارەکان بەشی ئەسپەکانی خۆیان وەرگرت. پێغەمبەر(د.خ) لەکۆتاییەکانی زیحەججە گەڕایەوە بۆ مەدینە.

دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی عاسی بۆ وەرگرتنی زەکات بۆ لای جەیفر و عەمرۆ کوڕەکانی جولەندی ئەزدی نارد. ئەو لەدەوڵەمەندەکانی خەڵك خێری وەرگرت و لەناو هەژاراندا دابەشی کرد. لەئاگرپەرستەکانی ناوشار سەرانەی سەند چوونکە عەرەبەکان لەدەرەوەی شار نیشتەجێ بوون.

دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ)، فاتیمە کچی زوحاکی کەلبی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد و کاتێك سەرپشك کرا، دنیای هەڵبژارد وبەوتەیەك کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە لای، وتی اعوذبالله و پێغەمبەر(د.خ) لێی جیابوویەوە.

دەڵێت: لەزیحەججەی ئەم ساڵە، ماریە، ئیبراهیمی هێنایە دنیا و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەدایکی بەردە کچی مونزەر کوڕی لوبەید سپارد کەژنی بەرا کوڕی ئەوس بوو. مامانی ئیبراهیم سەلما کەنیزی پێغەمبەر(د.خ) بوو. ڕۆشتە لای باوکی رافیع و ئاگاداری کردەوە کەماریە کوڕێکی هێناوەتە دنیا. باوکی رافیع ئەم مژدەی بەپێغەمبەر گەیاند و ئەو، کۆیلەیەکی پێبەخشی. ژنانی پێغەمبەر(د.خ) دوای ئەوەی ماریە کوڕێکی هێنایە دنیا، رژدیان پێبرد و پەرێشان بوون.